# پابەندیەکان
## لەبەر تیشکی مەنتیق و فەلسەفەدا

.

نووسینی
**دکتۆر مصطفی زەڵمی**

وەرگێڕانی
عومەر عەلی غەفور

# کۆبەرهەمی دکتۆر مستەفا زەڵمی لە شەریعەت و یاسادا

سەرپەرشتیاری پرۆژە
ڕێدار ڕەئوف ئەحمەد

الإلتزامات في ضوء المنطق والفلسفة

پابەندیەکان

لەبەر تیشکی مەنتیق و فەلسەفەدا


نووسینی : دکتۆر مصطفی زەڵمی
وەرگێڕانی : عومەر عەلی غەفور
نەخشەسازی : جمعە صدیق کاکە
نۆرەی چاپ : چاپی یەکەم ٢٠١٧

نرخی هەر بیست و شەش بەرگ
٢٥٠,٠٠٠ دینار





لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٧٤٤ ) ساڵی ٢٠١٦ی پێدراوە

الإسراء/١٣

## (ولنفسك عليك حقا)

**فەرموودەی پیرۆز**

# ناوەرۆك

# پێشەکی

لەم پێشەکیەدا باس لەو هۆکانی پشت هەڵبژاردنی ئەم بابەتە و پلانی لێتوێژینەوەی دەکرێ:

أ- ئەو هۆیانەی وایان کرد ئەم کۆششە سادە و لەخۆبوردووانە پێشکەشی خێزانی یاسایی لە وانەبێژان و قوتابیان پێشکەش بکەم، زۆرن لەوانە:

یەکەم- پابەندیەکان (الالتزامات) بێ هیچ گومانێك لە گرنگترین و وردترینی بابەتەکانە لە زانستی یاسادا. سروشتە تایبەتەکەی رێگە بەوە نادات لەنێو دابەشکردنە کلاسیکیەکەدا سەر بە بەشی گشتی یان تایبەت حسێب بکرێ، لەبەرئەوەی ژیانی مرۆڤ هەرهەمووی ئەرك و پابەندییە، هیچ مافێك نیە پابەندیەکی لەبەرانبەردا نەبێ. ئەو دووانە لە بوونی زەینی و دەرەکی و لەسەر ئاستی ناوخۆیی و نێودەوڵەتیدا پێکەوە گرێدراون.

دووەم- سەلماندنی پەیوەندیی پتەوی نێوان پابەندیەکان لەگەڵ هەردوو زانستە عەقڵییە ئامێرییەکە (مەنتیق و فەلسەفە)، چونکە ئەوەی بەبێ ئەو دووانە مامەڵە لەتەك پابەندیەکان بکات، هەر لە رووکەشدا دەمێنێتەوە و دوور دەبێ لە شۆڕبوونەوەی بۆ قووڵایی دەریاکانیان، وەك کە ئەم راستییە پاش خوێندنەوەی ئەم کتێبە لەخۆبوردووە روون دەبێتەوە.

سێیەم- نەبوونی پێناسەیەکی تێروتەسەل بۆ چەمکی پابەندیەکان لە یاساکان و شەرحەکانیاندا، ئەویش لەبەر ئاشنانەبوونی یاساناسان بە پێکهاتەکانی

پێناسەکان، خود و خەسڵەتەکانیان لەبەر تیشکی مەنتیقدا، ئەمە جگە لە ڕەچاونەکردنی مەرجی ئەوەی پێویستە پێناسەکار و پێناسەکراو بە زات یەکگرتوو و بە ئیعتیبار لێك جیاواز بن.

چوارەم- نەهێشتنی تێکەڵکردن لەنێوان سەرچاوەی پابەندی لەگەڵ هۆکانیدا پاش ئەوەی یاسا عەرەبیەکان و شەرحەکانیان گرێبەست و ویستی تاکلایەنە (منفرد) و کاری نارەوا و بەدەستهێنان بەبێ هۆ (یان دەوڵەمەندبوون بەبێ هۆ)یان لە سەرچاوەکانی پابەندی داناوە، لەکاتێکدا لە راستی و واقیعدا ئەوانە هۆی پابەندین، کە (پابەندی) لە حوکمە تەکلیفیەکانە، ئەوەیش تەنها لە دەسەڵاتی یاسادانانەوە دەبێ، لەبەرئەوە سەرچاوەی یاسا تەنیا لە یاسادا قەتیس (حصر) دەبێ.

پێنجەم- نەهێشتنی تێکەڵکردن لەنێوان رەگەزەکانی گرێبەست: (شوێن و هۆ و رەزامەندی) و رەگەزەکانی پابەندی: (پابەندکار (الملزِم)، پابەند (الملتزِم)، بۆ-پابەند (الملتزَم له)، تێدا-پابەند (الملتزَم فیە)، و پێ-پابەند (الملتزَم بە)، هۆی پابەندی (سبب الالتزام). ئەم تێکەڵکردنە شایعە بۆ بەکارنەهێنانی پێوەرەکانی مەنتیق و فەلسەفە لە بواری یاسادا دەگەڕێتەوە.

شەشەم- نەهێشتنی تێکەڵکردن لەنێوان بابەت یاخود شوێنی پابەندی (محل الالتزام) کە کردنی ئەرێنی (ئەنجامدانی کارەکە)یە و نەرێنی (نەکردنی کارەکە)یە، لەگەڵ بابەتی پابەندییەکە کە ئیشی تێدەکا. ئەم تێکەڵکردنەیش بۆ تێکەڵکردنی رەگەزەکانی گرێبەست لەتەك رەگەزەکانی پابەندی دەگەڕێتەوە.

حەوتەم- روونکردنەوەی بەتاڵیی کۆکردنەوەی شت و هاوبەشکە (قسیم)ەکەی کە لێك جیاوازن، هەروەها بەتاڵیی بەکارهێنانی بەشکراو لەجێی بەش و بەپێچەوانەوە، لەکاتێکدا بەشکراو بەرەهایی لە هەر بەشێك لە بەشەکانی گشتیترە. بۆیە بوونی ئەم، بوونی بەشەکەی ناسەپێنێ، جیاواز لە

پێچەوانەکەی، لەبەرئەوەی هەموو بەشێك بەرەهایی تایبەترە، بۆیە لەکوێ بەدیهات بەشکراوەکە لەگەڵی بەدیدێ.

هەشتەم- داننەنانی یاساکان و شەرحەکانیان بە کاریگەریی بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی توانای کڕینی پارە، کە ئەوە بەنیسبەت پابەندیەکانی کەسی قەرزارەوە بابەتی یاساکانە.

نۆیەم- هەوڵدان بۆ راستکردنەوەی دەیان هەڵەی یاساییتر لە روونکردنەوەی پابەندیەکاندا، کە بەشێوەیەکی کلاسیکی لە پێشینانەوە بۆ پاشینان گوێزراوەتەوە بەبێ دەستگرتن بە پێوەرە بابەتیەکان بۆ دۆزینەوە و چاککردنیان.

دەیەم- پوختەی قسە ئەوەیە ئەو ئامانجەهۆیەی پاڵی پێوە نام بۆ دەستبردن بۆ ئەم ئەرکە، روناککردنەوەی رێگە بوو لەبەردەم وانەبێژان و قوتابیاندا بۆ ئاشنابوون بە حەقیقەتی بابەتە یاساییەکان لە بابی پابەندیەکان و رزگاربوون لەو هەڵە تەقلیدیانەی بەبێ ئاگالێبوونیان لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکیتر دەگوێزرێنەوە.

**ب- پلانی توێژینەوە:**

سروشتی بابەتەکە دەخوازێ توێژینەوەی بابەتەکە لەرووی شێوەوە بەسەر دە بەشدا دابەش بکرێ:

بەشی یەکەم: پێناسەی پابەندی، سروشتی، سەرچاوەی.

بەشی دووەم: جۆرەکانی پابەندی.

بەشی سێیەم: پابەند (قەرزار).

بەشی چوارەم: تێدا-پابەند، پێ-پابەند، بۆ-پابەند (قەرزدەر)

بەشی پێنجەم: هۆی پابەندی

بەشی شەشەم: گرێبەند. دابەشکردن و جۆرەکانی

بەشی حەوتەم: ویستی تاکلایەنە (رەفتاری تاکەکەسی)

بەشی هەشتەم: کاری ناڕەوا

بەشی نۆیەم: ڕووداوە سروشتیەکان و پابەندییە یاساییەکان

بەشی دەیەم: هۆکانی کۆتاهاتنی پابەندی

# بەشی یەکەم

## پێناسەی پابەندی، سروشتی، سەرچاوەی

لێکۆڵینەوە لە بابەتەکە بەسەر سێ باسدا دابەش دەبێ، هەریەکەیان تایبەت دەکرێ بۆ لێکۆڵینەوە یەکێك لەو خاڵانەی لە ناونیشانەکەدا هاتوون، بەپێی ریزبەندییان.

# باسی یەکەم:
# پێناسەی پابەندی

پێناسە: گوتەیەکە[1] لە وێناکردنی، وێناکردنی شتێکیتر بەدەست دێ، جا چ بە کاکڵە (کنە)ەکەی بێ[2] یان بەو شتەی لە هیتری جیا دەکاتەوە[3].

گوتە بەدەستهێنەکەیش پێی دەوترێ ناسێنەر (مُعرِف)، پێناسە و گوتەیەکی شیکەرەوە، هەروەك بە بەدەستهاتووەکەیش دەوترێ ناسێنراو (مُعرَف).

**مەرجەکانی پێناسەی راست:**

لە ترازووی مەنتیقدا بۆ راستبوونی پێناسەکردنی زاراوەییانەی هەر زاراوەیەك لە زاراوە ناسراوەکانی زانستەکان لە جیهاندا، پێویستە ئەم مەرجانە هەبن:

١- ناسێنەر و ناسێنراو بە خود یەکگرتوو بن، تا دروست بێ دووەمیان لەسەر یەکەمیان بار بکرێت و پێی راڤە بکرێ. ئەگەر ئەم مەرجە لەئارادا نەبێ، ئەوا دەبێتە ناساندن بە شتێك کە لەو جیاوازە، وەك ناساندنی درەخت بە بەرد.

---

[1] تاك (مفرد) بێ یان ئاوێتە (مرکب).

[2] واتە بە حەقیقەت و چییەتی خۆی. پێناسەکردن بە (کنە) دەبێ ئەگەر سنوورێکی تەواو بێ، ئەگینا بە جیاکردنەوەی لە غەیری خۆی دەبێ.

[3] البرهان للكلنبوي (الشيخ إسماعيل مصطفى المعروف بشيخ زاده الكلنبوي) (ت ١٢٠٥هـ)، مطبعة السعادة، القاهرة، ص١١٤.

٢- هەردووکیان لێك جیاواز دابنرێن، تا نەبێتە پێناسەکردنی شتێك بە خۆی، وەك پێناسەکردنی تاوان بەوەی بریتییە لە تاوان. بۆ بەدیهاتنی ئەم مەرجە پێویستە تاوان بەوە پێناسە بکرێ کە شتێکی قەدەغەکراوە و سزای لەسەرە.

جیاوازی لەم پێناسەیەدا ئەوەیە ناسێنەر لە پێناسەکراو روونتر و زەقترە. هەروەها لەوەدا جیاوازە کە یەکەمیان تاکە، بەڵام دووەمیان ئاوێتەیە.

٣- ئەوەیە ناسێنەر لە ناسێنراو روونتر و زەقتر بێ، ئەگینا پێناسەکردنەکە لەرووی عەقڵی و مەنتیقیەوە دەبێتە شتێکی بێهودە و ناپەسەند.

بۆیە نابێ بە شتێکی (لە خۆی) پەنهانتر یان یەکسان لە روونی و شاراوەییدا، پێناسە بکرێ.

٤- پێناسەکە تێرەتەسەل بێ بەشێوەیەك هەموو ئەو شتانە بگرێتەوە کە ناسێنراو لەخۆیان دەگرێ وەك لە پێناسەی ناوبراو (لە برگەی دووەم)دا هاتووە، بۆیە نابێ شتێکی گشتیتر بە شتێکی لە خۆی تایبەتتر پێناسە بکرێ، وەك پێناسەکردنی رەهای کوشتن بەوەی دەرکردنی گیانی کەسێکە کە لەکاتی دەستدرێژیەکەدا زیندوە، بەمەبەستی بەدیهێنانی ئەنجامەکە (مردن) بەبێ پاساو، لەبەرئەوەی ئەم پێناسەیە کوشتنی هەڵە و کوشتنی بەهەق ناگرێتەوە.

٥- رێگر بێ لەوەی شتێك بێتە ناوی کە لە (ناسێنراو)دا نەبێ، بۆیە نابێ پێناسەی زۆرلێکردن (الاکراه) بکرێ بەوەی بریتییە لە خەوش (عەیب)ێك لە خەوشەکانی رەزامەندی (یان ئیرادە)، لەبەرئەوەی خەوشیتری لەم شێوەیە دەگرێتەوە، وەك فریودان و هەڵەکردن و قۆستنەوە، لەگەڵ ئەوەی هەرکام لەمانە پێیان ناوترێ زۆرلێکردن.

٦- پێناسەکردن نەبێ بە حوکمدان، وەك ئەوەی یاسادانەری عێراقی (م/٣٨)[١] تـەلاقی ناکۆتـا (رجعـی) پێناسـە کـردوە بـەوەی: ئەوەیـە دروسـتە مێـرد بـەبێ گرێبەستێکی نوێ ژنەکەی بگێڕێتەوە.

هەڵەی ئەم پێناسەیە لەوەدایە دادوەر حوکمەکە (واتە حوکمی دروستیی گێڕانەوە بـەبێ گرێبەسـتێکی نـوێ) نـازانێ پـاش ئـەوە نـەبێ کـە سـاغ بکرێتـەوە تەلاقەکـە رەجعییە.

لە روانگەی ئەم پێناسەوە، هەریەك لە ناسێنەر و ناسـێنراو لـە رووی مەعریفـەوە لەسەر یەکتر دەوەستن، ئەمەیش بەتاڵە لەبەرئەوەی بەلای زانایانی یاساوە پێچلێدانە بەدەوری داواکراو و بەلای زانایانی مەنتیقیشەوە مەحاڵیەکی مەنتیقییە، لەبەرئەوەی وەستانی شتێك لەسەر ئەوەی لەسەری دەوەسـتێ، پێویسـت دەکـا شـتەکە پـێش خۆی بکەوێ، لازم هەروەها مەلزومەکەیش بەتاڵن.

بۆیە پێویستە تەلاقی ناکۆتا پێناسە بکرێ بەوەی "هەموو جیابوونەوەیەکە پاش چوونەلای ژن (الدخول) روودات، بەو مەرجەی نە بە برێتیـەك بێـت و نـە بـۆ جـاری سێیەم و نە پاش تەواوبوونی عیددە بێ، حوکمیشـی ئەوەیـە دروسـتە بـۆ مێـرد لـە ماوەی عیددەدا بەبێ گرێبەستێکی نوێ ژنەکەی بگێڕێتەوە لای خۆی".

یاسادانەر سەبارەت بە تەلاقی یەکجاری یاخود کۆتا (البائن)یش کەوتۆتە هـەمان هەڵە و پێناسەی کردوە بەوەی "هەموو جیابوونەوەیەکە تێیدا مێرد بە گرێبەستێکی نوێ نەبێ بۆی نیە ژنەکەی بگێڕێتەوە".

پێناسەکەیش لەبەر ئەو هۆیەی باس کرا بەتاڵە.

راستیەکەی ئەوەیە تەلاقی بائین پێناسە بکرێ بەوەی "هەموو جیابوونەوەیەکـە پێش یان پاش چوونە لای ژن روودات، جا بە برێتی بێ یان بۆ جـاری سـێیەم، یـان پاش تەواوبوونی عیددە".

---

[١] لە یاسای باری کەسێتی ژمارە (١٨٨)ی ساڵی ١٩٥٩ی هەموارکراو.

٧- پێناسە زاراوەییەکە بە یەك تاکە وشە نەبێ، ئەگینا پێناسەکە دەبێتە پێناسەیەکی لەفزیی زمانەوانی وەك پێناسەکردنی (ضرغام) بەوەی شێرە.

**جۆرەکانی پێناسەی لۆژیکی (منطقي):**

پێناسەی لۆژیکیانەی زاراوەکان لە هەموو زمانەکاندا لە رووی سروشتی پێناسەکەوە بۆ چوار جۆر دابەش دەبێ:

١- سنووری تەواو (الحد التام): بریتییە لە پێناسەکردنی زاراوەکە بە رەگەز و پۆلی نزیك لە خۆی، وەك پێناسەکردنی تاوان بەوەی قەدەغەکراوێکە سزای لەسەر دەدرێ، دەستەواژەی قەدەغەکراو (محظور) رەگەزێکی نزیکە کە هەموو کارە ناڕەواکان دەگرێتەوە چ تاوانکاری (جنائي) بن یان مەدەنی. دەستەواژەی (سزای لەسەر دەدرێ)یش پۆلێکی نزیکە و کارە ناڕەوا مەدەنیەکانی لێ دەردەکا.

٢- سنووری ناتەواو (الحد الناقص): بریتییە لە پێناسەکردن بە رەگەزی دوور و پۆلی نزیك، وەك پێناسەکردنی تاوان بەوەی کارێکە سزای لەسەر دەدرێ. دەستەواژەی کار رەگەزێکی دوورە لەبەرئەوەی کارە رەوا و ناڕەواکان دەگرێتەوە.

شایانی باسکردنە لەم دوو بەشەدا پێناسەی هەر زاراوەیەك بە شتە خودییە رووتەکانی خۆی دەبێ، واتە بە رەگەز و پۆلەکەی. لە پێناسە یاساییەکاندا ئەم دوو جۆرە زۆر کەم هەن، لەبەرئەوەی زانایانی یاسا زاراوەی یاسایی بەزۆری بە خاسیەتەکانی پێناسە دەکەن.

٣- وێنەکێشانی تەواو (الرسم التام): بریتییە لە پێناسەکردنی شتێك بە خاسیەتێك لە خاسیەتەکانی لەگەڵ رەگەزە نزیکەکەی، وەك پێناسەکردنی خاوەندارێتی (الملکیة) بەوەی: تایبەتمەندیەکە دەسەڵات دەداتە خاوەن موڵك بۆ هەڵسوڕاندنی موڵکەکە، یان بەکارهێنانی، یان قۆستنەوەی، یان لەدەستدابوونی بەشێوەیەکی رەوا و هێمن.

٤- وێنەکێشانی ناتەواو (الرسم الناقص): بریتییە لە پێناسەکردنی شتێك بە خاسیەتەکانی بەشێوەیەك لەوانیتری جیا بکاتەوە، وەك پێناسەکردنی مرۆڤ بەوەی: بەسروشت ئاوەزدارێکی پێکەنیوە و قابیلیەتی تێدایە فێری نووسین ببێ.

هەموو ئەم شتانە چەند نیشانەیەکن لە خاسیەتەکانی مرۆڤ.

### پێناسەکانی پابەندی:

بۆ گەیشتن بە پێناسەیەکی تێروتەسەل کە ئەو مەرجە باسکراوانەی تێدا بێ، بە گرنگی دەزانین پانۆرامایەکی پێناسەکانی لە هەندێ زانستی ناسراوی بەردەست بخەینە روو:

#### أ- لە زمانی عەرەبیدا :

پابەندی (الالتزام) لە داتاشراوەکانی پێویستبوون (اللزوم)ـە و بەچەند واتایەك هاتووە، لەوانە: جێگیری و بەردەوامی و پێویستبوون، فەرمانەکەیشی لەوانەیە تێنەپەڕ (لازم) بێ وەك: (لزم الشيء)، واتە جێگیر و بەردەوام بوو. هەروەك دەکرێ تێپەڕ (متعدي) بێ بۆ یەك مەفعول وەك: (لزم الدائن غريمه)، واتە (قەرزدەرەکە) شوێنی (قەرزارەکەی) کەوت و لێی جیا نەبوویەوە[1].

#### ب- پابەندی لە زانستی صەرفدا :

وشەی (مطاوعة)ی بۆ بەکار دێ، (بەمانای: خۆشدەستی یان دەستەمۆیی)، واتە بەوە دەناسرێتەوە. ئەم (مطاوعة)یە بۆ سێ بابی فەرمان (فعل)ـە:

١- بۆ موتاوەعەی بابی (فَعَلَ) (فیعلی سیانەی رووت)، وەك: جمعت القوم فاجتمعوا.

٢- بابی (فعَّل) (تەشدیدی عەین) وەك: قرّبت فلانا فاقترب.

٣- بابی (أفعلَ)، وەك: الزمته فالتزم.

---

[1] لسان العرب لإبن منظور (جمال الدين محمد بن مكرم الأنصاري) فصل اللام، حرف الميم، ١٤/١٦.

**ج- پابەندی لە زانستی مەنتیقدا:**

سیفەتی دیلالەتکردنە، لەبەرئەوەی بە پڕاوپڕبوون (المطابقية) وەسف دەکرێ ئەگەر هاتوو لەفز و ماناکەی پڕاوپڕ بوون و هیچیان هیچی لەویتر زیاد نەبوو.

هەروەها بەلەخۆگری (التضمنية) وەسف دەکرێ، ئەگەر مەبەست لە لەفزەکە بەشێك لە واتا لێکدراوەکەی بوو.

وەسفیش دەکرێ بە پابەندکاری (الالتزامية) ئەگەر دیلالەت بوو بۆ مانایەك لە دەرەوەی ئەوەی بۆی دانراوە و وابەستەی بێ.

لە پراکتیزەکردنەکانی ئەم سێ دیلالەتە: دیلالەتی گرێبەست لەسەر کۆی پێدان (ئیجاب) و پەسەندکردن (القبول) دەچێتە خانەی (مطابقي)، دیلالەتی تەنیا لەسەر ئیجاب یان قبولّ لە چوارچێوەی کۆمەڵەکەدا دەچێتە خانەی (تضمني)، هەروەها سەبارەت بەو ئاسەوارانەی لێی دەکەونەوە لە ماف و ئەرك، دەچێتە خانەی (التزامي).

پابەندبوون ئاسەوارێك لە ئاسەوارەکانی گرێبەندەکەیە و بەشێوەیەکی عەقڵیی پابەندکارانەئاماژەی بۆ دەکا.

**د- پابەندی لە فەلسەفەدا:**

لە گرووپی هەڵچوون (انفعال)ـە بە کردارێکی کاریگەر و لە موتاوەعەی زانستی صەرفەوە نزیکە، وەك کشانی ئاسن بە وزەی گەرما و چوونەیەکی بە وزەی سەرما.

**هـ- پابەندی لە زانستی ئوسولّی فیقهدا:**

لەئەستۆگرتنی داوا یاخود تەکلیفێکە کە سەرچاوەکەی شەرعە، بۆ نموونە ئەنجامدانی فەرمان بەچاکە ئەرکێکە پێویستە مرۆڤی بەتوانا پێی هەستێ، سەرچاوەی ئەم تەکلیفە قورئانە وەك خوای گەورە دەفەرموێ ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ﴾[1].

---

[1] سورة آل عمران/١٠٤.

**و- پابەندی لە فیقهی ئیسلامیدا:**

زانایـانی ئیسـلام بەکـەمی نـەبێ ئـەم زاراوەیـەیان بـەکار نـەهێناوە، بـەڵکو هاوماناکەیان بەکارهێناوە وەك (تكلف) و (تحمل) و (تعهد) و ئەو شتانە.

قورئانی پیرۆز لەفزێکی گشتی بۆ بەکارهێناوە هەموو ئەو شتانە دەگرێتـەوە کـە پێویستە مرۆڤ بەرانبەر کەسانیتر پێی هەستێ، ئەویش لەفزی (ئەمانەت)ـە، وەك خوا دەفەرموێ ﴿إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْـأَرْضِ وَالْجِبَـالِ فَـأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَـا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْإِنسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُوماً جَهُولاً﴾[1].

مەبەست لـەم ئایەتـە ئەوەیـە، ئەگـەر ئاسمانـەکان و زەوی و چـیاکان هەسـت و عەقڵیان هەبوایە و پاشان تەکلیفیان لێبکرایە شان بدەنـە ژێـر بـاری ئـەم ئەمانەتـە، رەتیـان دەکـردەوە، نیـارە نـەك وەك رەتکردنـەوەی یـاخیبوون بـەڵکو وەك رەتکردنـەوەی عوزرخـوایی بـەهۆی قورسـیی بارەکـەوە (وأشـفقن منهـا)، واتـە هۆشدارییاندا لێی. بەڵام مـرۆڤ بـەبوونی مافێـك لـەوانیتر جیـا کرایـەوە کـە ئـاوەزە. لەبەرئەوە لەبەرانبەر ئەم مافەدا ئەو پابەندییەی خرایە گەردن. هەربۆیە شـانی دایـە ژێر ئەمانەتەکە و لەوەیشدا ستەم لەخۆی دەکا ئەگەر لە بەجێگەیاندنیدا ناپاکی بکا، هەروەها لە ئەنجامە نەرێنیەکانی ناپاکیەکەی لە شکاندنی بەڵێنەکەی بۆ پابەندبوون، بێئاگایە.

یەکێك لەو زانایانەی پێناسەی پابەندی کردوە (ئەلحەتتاب)ـە[2]، کە لە شەرعناسە مالیکیەکانە. ئەلحەتتاب لە کتێبی (تحرير الكلام في مسـائل الالتـزام)دا پێناسـەیەکی ناتێروتەسەل بۆ پابەندی دەکا، کە تەنها باسی لە پابەندبوون بە ئیرادەی تاکەکەسی لە بەخشینەکان (التبرعات)دا کردوە و دەڵێ "بریتییە لەوەی کەسەکە خۆی بە شتێك لـە چـاکە پابەنـد دەکـا، بـەرەهایی یـان بـە هەڵواسـراوی بـە شـتێکدا"، ئـەوەیش

---

[1] سورة الأحزاب/٧٢.

[2] الإمام أبو عبدالله محمد بن محمد الملقب بالحطاب الفقيه المالكي (ت ٩٥٤هـ)، لە کتێبی: تحرير الكلام في مسائل الالتزام، ص٦٨ و پاشتر.

پێناسەیەکی ناتەواوە لەبەرئەوەی ئەو پابەندیانەی لەخۆ نەگرتووە کە سەرچاوەیان یاسایە و هۆکانیشیان گرێبەستەکانی ئاڵوگۆڕەکان (المعاوضات) یان کارە ئیرادی یاخود نائیرادیەکانە، وەك پاشتر لە بابەتی سەرچاوە و هۆکانی پابەندیدا بەدرێژی باس دەکرێ.

رەحمەتی سەنهوری[1] پێی وابوو فیقهی ئیسلامی پابەندی ناناسێ، هەروەها پابەندی لەم فیقهەدا بریتییە لە (پابەندی + دەستەبەری) یەکسانە بە (پابەندی) لە فیقهی خۆرئاواییدا، لەبەرئەوە ئەگەر بمانەوێ ئەم زاراوەیە بەکار بێنین دەبێ لە فیقهی خۆرئاواییەوە بیخوازین. ئەو لەم گومانەیدا نەیپێکابوو، لەبەرئەوەی پابەندی لە شەریعەتی ئیسلامیدا وەك روبـاری دیجلە وایە، لە یاسایشدا وەك ئاوێکە لە بەلوعەیەکەوە دەربچێ. پابەندی لە ئیسلامدا هەموو ئەوە دەگرێتەوە کە پێویستە مرۆڤ بەرانبەر کەسانیتر پێی هەستێ، وەك لە باسکردنی دەستەواژەی ئەمانەتدا گوتمان.

پاشان وەك باس کرا، زانایانی ئیسلام دەربڕینیتری هاومانای (التزام)یان بەکارهێناوە، وەك (ضمان، تعهد، تكلف، تحمل، المسؤولية) و ئەو جۆرە وشانە.

**ز- پابەندکردن (الالزام) و پابەندی (الالتزام) لە قورئانی پیرۆزدا:**

لە قورئانی پیرۆزدا وشەی (الزام) بەڕاشکاوی هاتووە، وەك خوا دەفەرموێ ﴿وَكُلَّ إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَآئِرَهُ فِي عُنُقِهِ وَنُخْرِجُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كِتَاباً يَلْقَاهُ مَنشُوراً﴾[2].

ئەوە روونە کە ئیلزام و ئیلتیزام بەمانا تایبەتترەکە وابەستەییەکی روونیان هەیە[3]. بوونی یەکێکیان لە زەین و دەرەوەی زەین بوونی ئەویتریان و سووربوون لەسەر وابەستەییان دەسەپێنێ.

---

[1] السنهوري، مصادر الحق، ١/١٤.

[2] سورة الإسراء/ ١٣.

[3] وابەستەیی روون بەواتا تایبەتترەکە (اللزوم البين بالمعنى الأخص): ئەوەیە کە وێناکردنی یەکێکیان بەسە بۆ پێداگری لەسەر وابەستەیی (اللزوم) تێیدا. هەرچی وابەستەییە بە واتای ←

لەم ئایەتەدا مەبەست لە (الطائر) لە بنەڕەتدا لێکەوتەی کارە خێرەنگێز و شەڕەنگێزەکانە، بەڵام بۆ کارە شەڕەنگێزانەکان بەکار هاتووە. هۆی ناونانیشی بە (الطائر) ئەوە بوو پێش ئیسلام عەرەب عادەتیان وابوو ئەگەر کەسێك بیویستایە سەفەرێك بۆ مەبەستێکی دیاریکراو، یان کارێك بۆ بەرژەوەندییەك بکا، تەماشای باڵندەیەکی دەکرد کە بەویستی خۆی یان بە دنەدانی کەسێك دەفڕی، جا ئەگەر بەلای ڕاستدا بفڕیایە، پێیان وابوو سەفەر یان کارەکە خێری تێدایە، ئەگەر بەلای چەپی باڵندەکەیشدا بفڕیایە وا دادەنرا کە سەفەر یان کارەکە لە بەرژەوەندیی ئەو کەسەدا نیە کە بەنیازی سەفەر یان کارێکە.

ئەمە بەو واتایە نیە کە ئیسلام دان بەو بیرۆکە نەفامانەدا دەنێ، بەڵکو بەکارهێنانی (الطائر) لەم ئایەتەدا بۆ کارەکانی مرۆڤ، لەسەر بناغەی دەربڕینی عورفیی عەرەبی بووە.

مەبەست لە گەردن (العنق)یش لەم ئایەتەدا ئەستۆی دارایی و نادارایییە کە پەیوەندی بە مافێکی کەسی (شەخسی)ی داراییانە یان ناداراییانەوە هەبێ.

نهێنیی هەڵبژاردنی ئەم ئەندامەی لەشی مرۆڤیش ئەوەیە، ئەڵقەی پێکەوەبەستنی نێوان دەزگای بیرکردنەوە (مێشك) و دەزگای کارکردنە (دەست و پێکان).

یاساناس ئەستۆ (الذمة)یان پێناسە کردوە بەوەی: کۆی مافە دارایییەکان و پابەندییەکانی سەر مرۆڤە. بە تێڕوانینی لەخۆبوردوانەی ئێمە ئەم پێناسەیە لە چەند ڕوویەکەوە جێی سەرنج و رەخنەیە، لەوانە:

أ- ئەم پێناسەیە تەنها باس لە ئەستۆی دارایی دەکا و بەوەیش پێناسەیەکی تێروتەسەل نیە، لەبەرئەوەی ئەستۆی مرۆڤ دارایی و ناداراییش دەگرێتەوە.

ب- لەم پێناسەیەدا بە زمانی یاسا، پێچلێدان بەدەوری داواکراو (المصادرة على المطلوب) و بە زمانی مەنتیق، سووڕ (مەحالّیی لۆژیکی) هەیە، لەبەرئەوەی بوونی

---

گشتیترەوە ئەوەیە کە بەبێ وێناکردنی هەردوولایەنەکە، وەك جووت بۆ چوار، پێداگری لەسەر وابەستەیی تێیدا تەواو نابێ.

ماف و پابەندیەکان لەسەر بوونی پێشوەختی ئەستۆ دەوەستێ، لەبەرئەوەی مرۆڤ بەر لە بوونی ئەستۆ نە مافی هەیە و نە پابەندی لەسەرە، ئەگەر ئەستۆ لەسەر ئەو ماف و ئەرکانە بوەستایە مەحاڵیی لۆژیکی رووی دەدا، لەبەرئەوەی وەستانی شتێك لەسەر ئەوەی لەسەری دەوەستێ، وەستانی شتەکە لەسەر خۆی دەخوازێ، ئەقڵمەندانیش کۆکن لەسەر ئەوەی لازم و هەروەها مەلزومەکەیش بەتاڵن.

یاساناسان دەرکیان بەم گلۆماندنە کردوە، لەبەرئەوە گوتویانە مەبەست لە ماف و پابەندیەکان باسی ئایندەیە، واتە کەسی خاوەن ئەستۆی دارایی لەباریدا هەیە ئەو ماف و پابەندیانە لە ئایندەدا بەدەست بێنێ، ئەمەیش وەك راستکردنەوەی هەڵەیە بە هەڵە، لەبەرئەوەی ئەم پێناسەیە تێکەڵکردنێکی روونی لەنێوان ئەستۆی دارایی و شیان (ئەهلیەت)ی تەولوی واجببوون تێدایە.

مەبەست لە (الكتاب المنشور)یش ئەو بەڵگەنامەیەیە کردەوەی مرۆڤ دەسەلمێنێ بەشێوەیەك ناتوانێ نکوڵی بکا لەوەی لە ژیانی دنیایدا کردویەتی. ئایەتەکەی سەرەوە ئاماژەی بەوە داوە کە ئەستۆی مرۆڤ گەردنیەتی، لەبەرئەوەی ئەڵقەی پێکەوەبەستنی نێوان دەزگای بیرکردنەوە (مێشك) و دەزگای کارکردنە (دەست و پێکان).

**ح- پابەندی لە یاسای مەدەنیی عێراقیی کارپێکراودا[1]:**

مادەی (١/٦٩): "مافی کەسی پەیوەستیەکی یاساییە لەنێوان دوو کەسدا، قەرزدەر و قەرزار و بەو پێیە قەرزدەر داوا لە قەرزار دەکا مافێکیماڵینە (عەینی) بگوێزێتەوە، یان کارێك بکا، یان کارێك نەکا".

مادەی (٢/٦٩): "پابەندبوون بە گواستنەوەی خاوەندارێتی (الملكيە) بە مافی کەسی دادەنرێ ، جا شێوەکەی هەرچۆن بێ، کاش بێ یان هاوچەشن یان بەها،

---

[1] رقم (٤٠) لسنة ١٩٥١.

هەروەها پابەندبوون بە رادەستکردنی شتێکی دیاریکراویش بە مافی کەسی دادەنرێ".

مادەی (٦٩/٣): "دەربڕین بە لەفزی پابەندی یان بە لەفزی قەرز، هەمان مانا دەگەیەنێ کە دەربڕین بە لەفزی مافی کەسی دەیگەیەنێ".

ئەم سێ بڕگەیە لەڕووی فەلسەفە و مەنتیقەوە جێی سەرنج و رەخنەن، بەم شێوەیە:

١- ئەگەر (مافی کەسی) هاومانای (پابەندی) بێ (بەوەی بە لەفز جیاواز و بە مانا یەك بن)، بەم شێوەیە وەڵام دەدرێتەوە:

أ- مافی کەسی ئەرێنی (ایجابی) و پابەندی نەرێنی (سلبی)یە، ئەگەر یەکەمیان زیادی کرد ئەستۆ قەرزدەر دەبێ، ئەگەر دووەمیشیان زیادی کرد ئەستۆ قەرزار دەبێ.

ب- پابەندی سیفەتێکی تایبەتە بە قەرزار لەکاتێکدا پەیوەستیی یاسایی سیفەتێکی هاوبەشە لەنێوان قەرزدەر و قەرزاردا، وەك پێشتریش باسمان کرد، یەکێك لە مەرجەکانی پێناسە ئەوەیە ناسێنەر و ناسێنراو بەزات یەککرتوو و بەئیعتیبار جیاواز بن. لەم روانگەوە پێناسەی ناوبراو بۆ پابەندی پێچەوانەی لۆژیکی یاساییە.

٢- پابەندی لە گرووپی هەڵچوون (انفعال)ـە، بەڵام پەیوەستی لە گرووپی خستنەسەر (اضافة)یە، ئەو دوو گرووپەیش لێك جیاوازن.

**خستنەسەر لە رووی فەلسەفیەوە:** حاڵەت یان سیفەتێکە لەنێوان دوو شتدا، کە وێناکردنی بۆ یەکێکیان وێناکردنی ئەویتریشیان لازم دەکا لزومێکی روون و بەمانا تایبەتترەکە، وەك باوکایەتی بۆ باوك، هەروەها کوڕ و برایی بۆ براکان، هاوسەری بۆ هاوسەرەکان و بەم شێوەیە.

لەم روانگەیەوە پێناسەی ناوبراو پێچەوانەی فەلسەفەی یاسایی و مەنتیقی یاسایی دەبێ، لەبەرئەوەی پێناسەکردنە بە لێ جیاواز (المباین).

جگە لەمانەی باس کران، پارە لە شتە هاوچەشنەکانە و باسکردنی لەگەڵ هاوچەشندا حەشوە، لە دارشتنی یاساییشدا پێویستە خۆ لە حەشو دوور بگیرێ.

ئەوەیش لە برگەی سێیەمدا هاتووە و مافی شەخسی بە پابەندی داناوە، هەڵەیە، لەبەرئەوەی مافی شەخسی بابەتی پابەندییە، نەك خودی پابەندی.

**ط- پێناسەی پابەندی لە پرۆژەی یاسای مەدەنیی عێراقی ساڵی ١٩٨٥:**

ئەم پرۆژەیە کە تائێستا روناکی نەبینیوە لە مادەی (١١٠)دا پێناسەی "پابەندی" کردوە بەوەی "ئەرکێکی یاساییە بۆ ئەنجامدان (اداء)ێکی دیاریکراو، کە دەکەوێتە سەرشانی کەسێکی دیاریکراو بۆ بەرژەوەندیی کەسێکیتر".

لەم پێناسەیەدا تێبینی دەکرێ ئەرك (الواجب) بریتی نیە لە پابەندی، بەڵکو سیفەتی کردنەکەیە کە شوێنی پابەندیەکەیە. ئەم پێناسەیەیش پێناسەکردنە بە لێ جیاواز (المباین) و بە ترازووی مەنتیق ناپەسەندە.

**ی- پێناسەی پابەندی لە یاسای مەدەنیی میسریی کۆن (هەڵوەشاوە):**

بریتییە لە "بەڵێندان بە کردن یان نەکردنی کارێك". ئەم پێناسەیەش تێروپڕ نیە، لەبەرئەوەی تەنیا پابەندیی خۆویستانە (ارادی) دەگرێتەوە، لەکاتێکدا پابەندی وەك چۆن خۆویستانەیە لەوانەیە ناخۆویستانە (لاارادي)ش بێ.

**ك- پابەندی لە یاسای مەدەنیی میسریی نوێ:**

دۆخێکی یاساییە، بەو پێیە پێویستە کەسەکە مافێکی ماڵینە (عەینی) بگوێزێتەوە، یان کارێك ئەنجام بدات یاخود کارێك ئەنجام نەدات.

ئەم پێناسەیە لە مادەی (١٢١)ی ئەو پرۆژەیەدا هاتووە، پاشان سڕیانەوە لەو روانگەی پێناسەکردن ئەرکی شەرعناسە (الفقیە)، نەك یاسادانەر.

ئەو رەخنەیەی لێی دەگیرێ ئەوەیە، دۆخێکی یاسایی وەك پەیوەستیی یاسایی هەمان ئەو رەخنەی لەسەرە کە لەسەر (یاسا) عێراقیەکە باس کرا.

**ل- پێناسەی پابەندی لای یاساناسان:**

١- سەنهووری رەحمەتی لە الوسیط[1]دا پێناسەی کردوە بەوەی "دۆخێکی یاساییە، بەو پێیە کەسێکی دیاریکراو وابەستە دەبێ بە گواستنەوەی مافێکی ماڵینە، یان بە ئەنجامدانی کارێك یاخود ئەنجامنەدانی کارێك".

ئەم پێناسەیەیش بە هەمان ئەوەی لەسەر پێناسەی یاسای مەدەنیی عێراقی هێنامان، وەڵام دەدرێتەوە.

٢- دکتۆر فەرەج ئەلصدە پێناسەی کردوە بەوەی "پەیوەستیەکی یاساییە، لەسەر کەسێکی دیاریکراو پێویست دەکا مافێکی ماڵینە بگوێزێتەوە، یان کارێك ئەنجام بدات یاخود کارێك ئەنجام نەدات"[2].

ئەم پێناسەیەیش بە هەمان ئەوەی لەسەر پێناسەی یاسای مەدەنیی عێراقی هێنامان، وەڵام دەدرێتەوە.

٣- دکتۆر عەبدولناسر ئەلعەتار پێناسەی کردوە بەوەی: "ئەو ئەرکەیە دەکەوێتە سەر شانی قەرزار بۆ پێدانی شتێك یان ئەنجامدانی کارێك یاخود ئەنجامنەدانی کارێك".

ئەم پێناسەیەیش بە هەمان ئەوەی لەسەر پێناسەی یاسای مەدەنیی عێراقی هێنامان، وەڵام دەدرێتەوە. لەبەرئەوەی واجب سیفەتی ئەنجامدانەکەیە کە شوێن (محل)ی پابەندییە، نەك خودی پابەندی.

بەم شێوەیە ئەوەندەی من ئاگەدار بم، پێناسەیەکی راست و روون و تێروپڕم بۆ پابەندی نەدیوە، نە لە یاساکان و نە لە شەرحەکانی یاسا یان پرۆژەکانیدا. نهێنیەکەیش ئەوەیە زانایانی یاسا لە جیهانی عەرەبی و ناعەرەبی بایەخ بەم سێ زانستە ئامێرییەی خوارەوە نادەن:

---

[1] الوسیط: ١٢٥/١.

[2] مصادر الالتزام، ص٢٠.

١- مەنتیق (لۆژیك): کە یاسای بەدەستهێنانی نەزانراوەکانە لە شتە زانراوەکان، واتە کۆمەڵێ ڕێسای عەقڵییە کە ڕەچاوکردنیان لە پرۆسەی بەدەستهێنانی نەزانراو لە زانراو، عەقڵ لە هەڵەکردن دەپارێزێ.

ئەوە روونە کە شارستانێتیی مرۆڤایەتی و پەرەسەندنی تەکنەلۆژیا و پێشکەوتنەکانیتر، هەرهەموویان بەرهەمی مەنتیقی تیۆری و مەنتیقی کردارین.

٢- ئوسولی فیقە: بریتییە لە یاسای هەڵێنجانی حوکمی شەرعی لە سەرچاوەکانی، واتە کۆمەڵێ ڕێسای گشتین ڕەچاوکردنیان زەینی موجتەهید لە هەڵەکردن لە هەڵێنجانی ئەحکام لە بەڵگە تەفسیلیەکانی، دەپارێزێ.

٣- فەلسەفە: بریتییە لە یاسای شیکردنەوە (التحلیل) و هۆدۆزی (التعلیل) و لێکۆڵینەوە لە راستیەکان تا دەست بە باشترینەوە بگیرێ، هەروەها بریتییە لە ئامانجە هۆ (العلة الغائیة)ی کاری ئیرادی.

پاش خستنەڕووی ئەو تێبینیانە لەسەر ئەو پێناسانەی پابەندی، پێشنیار دەکەم "پابەندی" پێناسە بکرێ بەوەی: "لەئەستۆگرتنی ئەنجامدانی ئەرکێکە بەخۆبەخشانە بێ یان بە ناچاری، کە بەهۆیەوە ئەستۆ بە مافی کەسانیترەوە دەگیرێ، تا (ئەو مافە) بەیەکێك لە هۆکانی نەمان نامێنێ".

**شیکرنەوەی پێناسەکە:**

أ- گرتنەئەستۆ و ئەرکخوازی و پابەندی (التحمل والتكلف والالتزام): لە گوتەی (کارتێکران)ـە. (الزام) کاریگەری و (التزام) کارتێکرانە، وەك گەرمکردن و گەرمبوون، شکاندن و شکان و لەو شێوەیە.

ب- خۆبەخشانە (طوعا): واتە بە ئیرادەیەکی ئازاد و بەئاگایانەی مرۆڤ بێ، وەك ئەو پابەندیانەی لە گرێبەندەکان و ڕەفتارە شەرعیەکان دەکەونەوە بە بەیەکگەیشتنی دوو ئیرادە وەك لە ئاڵوگۆڕەکان (معاوضات)دا، یان بە ئیرادەیەکی تاك وەك دیاری و وەقف و وەسێت و بەخشینەکانیتر، کە بەخشەر (المتبرع) پابەند دەبێ بەوەی بەخشراوەکە بداتە دەست پێبەخشراوەکە، یەکەمیان پابەندە و

دووەمیان (بۆ– پابەند)ـە. هەروەها وەك كارە ئیرادییە سوودبەخش و زیانبەخشەكان و هۆ ئیرادیەكانیتر.

ج– بەناچاری (كرها): واتە پابەندیەكی نائیرادیانە، وەك ئەو پابەندیانەی لە یاسا دەكەونەوە، وەك باجەكان، یان لە كارە ناڕەوا نائیرادیـەكان دەكەونـەوە. هـەروەها وەك پابەندبوون بە جێبـەجێكردنی گرێبەسـتی ملكەچكردن وەك گرێبەسـتی ئـاو و كارەبا و تەلەفۆن و رەسمە گومرگیەكان لە فەرمانگەكانی دەوڵەت و ئـەو هۆیانـەیتر كە پێچەوانەی حەزی كەسەكەن.

د– گیرانی ئەستۆ (انشغال الذمة): كە پێی دەوترێ بەرپرسـیارێتی یـان قـەرزاری (المدیونیة)، جا ئەگەر پابەندییەكـە مـەدەنی بـوو كـابرای پابەنـد بـە ویسـتی خـۆی پابەندییەكەی جێبەجێ دەكا، ئەگینا بەزۆر پێی دەكـرێ. ئەگـەر سروشـتیش بـوو، وەك حاڵـەتی كـەوتنی دەعـوا بـەهۆی بەسەرچـوونی كاتەكـەی واتـە كۆنبـوون (التقـادم)ەوە، قەرزاریەكـە هـەر دەمـێنێ، لەبەرئـەوەی مـاف بـە تێپـەڕبوونی كـات بەسەریدا ناكەوێ. بە دەربڕینێكیتر قەرزارەكە لە رووی دینیەوە داوای لێدەكرێ نەك لەڕووی دادوەریەوە. ماف چەندە كاتی بەسەردا بچێ هەر لە ئەسـتۆدا دەمێنێتـەوە بەڵام ئیتر مافی بەرزكردنەوەی دەعوا و پاراستنی یاسایی نامێنێ.

# باسی دووەم:
# سروشتی پابەندی (گونجاندنی)

لەسەر گونجاندن (تكییف)ی پابەندی و دیاریكردنی سروشتی دوو ڕێباز ململانێیانە: كەسی و ماددی.

**أ- ڕێبازی كەسی (الشخصی):**

ئەم ڕێبازە لە ڕووی كەسیەوە تەماشای پابەندی دەكا (كەسی قەرزدەر و كەسی قەرزار)، بەشێوەیەك یەكەمیان بەسەر دووەمدا زاڵ دەكات و كەسی قەرزارەكە بە دەستەبەر (ضمان)ی قەرزەكەی دادەنێ. لەم بنچینەوە خۆی نەك ماڵەكەی بەجێ ئیعتیبار وەردەگیرێ. جا ئەگەر ملی بە دانەوەی قەرزەكەی نەدا، یان بەهۆی دەستكورتیەوە نەیتوانی بیداتەوە، ئەوا بەلای ڕۆمانەكان و گەلانیتری وەك كۆمەڵگەی عەرەبی پێش ئیسلامەوە خاوەن قەرز بۆی هەبوو قەرزارەكە بكوژێ یان بیكاتە كۆیلە، بگرە بۆی هەبوو ژن و منداڵەكانیشی لەتەكیدا بكاتە كۆیلە و لە بازاڕ بیانفرۆشێ تا قەرزەكەی خۆی لە پارەكەیان وەربگرێتەوە، وەك فرۆشتنی ماڵی ڕەهنكراو لەم سەردەمەدا لەلایەن قەرزدەری ڕەهنكارەوە بۆ وەرگرتنەوەی قەرزەكەی خۆی لە نرخەكەی، كاتێ قەرزارەكە لە كاتی خۆیدا قەرزەكەی نەدایەوە.

پاشان بیرۆكەی نەزعەی شەخسیی ئەم ڕێبازە پەرەی سەند و لەباتیی كوشتن یان بەكۆیلەكردن و فرۆشتن، بیرۆكەی ناچاركردنی قەرزار بە دانەوەی قەرزەكە، یان بەندكردنی یان زەوتكردنی ئازادی ئەگەر نەیدەتوانی بیداتەوە، یاخود بەند و سنووردارکردنی ئازادی ئەگەر هاتوو لەبەر هەر هۆیەك نەیدایەوە، جێی گرتەوە.

جێـی داخــە تائێسـتایش یاسـاکان سـزای زەوتکردنــی ئـازادیی قــەرزار لــەڕێی بەندکردنەوە پەسەند دەکەن کاتێك نەتوانێ لەکاتی دیاریکراودا قەرزەکەی بداتەوە.

ب- ڕێبازی ماددی:

ئەم ڕێبازە پاش ئەوە پەیدا بوو کە ڕێبازی شەخسی ڕووبەڕووی ڕەخنە بوویەوە. ئەم ڕێبازە لە سنووری پەیوەندیی کەسـیدا ناوەسـتێ، بـەڵکو داوا دەکـا بابەتەکـەی بەسەر هەردوو تەرەفی پابەندییەکەدا زاڵ بکرێ، بەشێوەیەك لایەنە داراییەکە بەنرختر و بەبایەختر بژمێردرێ لەوەی پەیوەندیەکی شەخسی بێ. ئەمەیش وایکردوە بابەتی پابەندی ببێتە بەهایەکی دارایی کە دەکرێ لە قەرزدەر و قەرزار جیا ببێتــەوە و ئـەو ڕەفتارانەی بدرێتە پاڵ کە بەزۆری دەدرێنە پاڵ مافیماڵینە (الحق العيني).

**بەرهەمی لێك جیاکردنەوەی نێوان هەردوو ڕێبازەکە:**

ئەو جیاکارییە کۆمەڵێ ئەنجامی لێدەکەوێتەوە، گرنگترینیان ئەمانەن:

١- لەبەرچاوگرتنی بابەتی پابەندیەکە- کە شەرحکارانی یاسا بەهەڵە ناوی دەنێن شوێنی پابەنـدی (محـل الالتـزام)، بـەڵام دەسـتەواژەی بابـەت ڕاسـتە، لەبەرئـەوەی شـوێنەکەی هەمیشـە ئەنجامدانـە- بـەر لـە کەسـەکانی وا دەکـا بکـرێ لایەنـەکانی پابەندیەکــە بگــۆڕێن، وەك گــۆڕینی قەرزدەرەکــە لــەڕێی ڕەوانــە (حەواڵــە)کردنی مافەکەوە، یان گۆڕینی قەرزار لەڕێی گۆڕینی قەرزەکەوە.

أ- لە نموونەی حەواڵەکردنی ماف ئەوەیـە خالیـد، بـۆ نموونـە ملیۆنێـك دینـاری عێراقی قەرزاری بەکر بێ، بەکریش هەمان چەردە پارە قەرزاری زەید بێ، جا زەید و بەکر ڕێك دەکەون لەسەر ئەوەی زەید ئەو چەردە پارەیەی بەکر کـە بەقـەرز لـەلای خالیـدە ببـات، بـەوەیش زەیـد (قــەرزدەر) جێـی بـەکر (قــەزار) دەگرێتــەوە لــە قەرزدانەکەدا، ئەم حەواڵەکردنە وەك فرۆشتنی قەرز بە قەرزە، کە لە یاسـا و بـەلای زۆربەی شەرعناسانی ئیسلامەوە دروستە.

ب- یان گۆڕینی قەرزار لـەڕێی حەواڵـەکردنی قەرزەکـەوە، بـەوەی قـەرزارێك لـە جێگەی قەرزارێکیتر دابنرێ، بۆنموونە ئەگەر زەید قەرزێکی لای بەکر بێ بڕەکەی بۆ

نموونە هەزار دۆلاری ئەمەریکی بێ. جا بەکر، زەید رەوانەی خالید دەکا تا ئەو قەرزەی لای بەکرە لە خالید وەربگرێتەوە، بەوە دەچێتە جێی بەکر. زەید حەواڵەکراو (محال) و خالیدیش حەواڵە بۆسەرکراوە (محال علیه).

شایانی باسە گۆڕینی قەرزدەر بەحەواڵەکردنی مافەکە، رەزامەندی حەواڵە بۆسەرکراوی تێدا نەکراوەتە مەرج، بەپێچەوانەی حاڵەتەکە لە حەواڵەکردنی قەرزدا. لە هەردوو بارەکەدا ئەم گۆڕانکارییە بەلای لایەنگرانی رێبازی کەسیەوە دروست نیە.

نهێنیی بەمەرجدانانی رەزامەندیی حەواڵە بۆسەرکراو لە حەواڵەکردنی قەرزدا، بۆ جیاوازیی ئەستۆکان بەگوێرەی جیاوازیی کەسەکان لەڕووی رێپێدان و توانای دارایی و دەستەبەری و ئەو شتانە، دەگەڕێتەوە.

٢- بەگوێرەی رێبازی ماددی، دەتوانرێ پابەندی بەدیبێ بەبێ بوونی قەرزدەر لەکاتی پەیدابوونی پابەندییەکەدا، هەر ئەوەندە بەسە لەکاتی جێبەجێکردندا هەبێ، وەك لە بەخشینەکانی وەك وەقف یان وەسیەتکردن بۆ منداڵانێك هێشتا لەدایك نەبوون، لەکاتێکدا ئەمە بەگوێرەی رێبازی کەسی ناکرێ، چونکە لەم رێبازەدا پێویستە پەیوەستیەکی یاسایی لەنێوان قەرزدەر و قەرزارێکدا هەبێ کە لەکاتی هێنانەکایەی پابەندییەکەدا هەن.

ئەم ئەنجامەیش ئەمانەی لێ دەکەوێتەوە:

أ- دەکرێ تەسەوری پابەندبوونی قەرزار بە ویستی تاکلایەنەی خۆی بکرێ پێش دەستنیشانکردنی کەسی قەرزدەر، وەك لە جەعالەدا.

ب- دروست بێ بەرژەوەندیی ئەویتر بکرێتە مەرج لە حاڵەتێکدا کابرای سوودمەند کەسێکی دیارنەکراو یان نەبوو بێ لەکاتی ئەو بەمەرجدانانەدا (کاتی هاتنەکایەی پابەندی) وەك لە حاڵەتی بیمەکردن (تأمین)ی ژیانی هەر منداڵێك کە لەدایك دەبێ[1].

---

[1] بڕوانە: الدكتور عبدالمنعم فرج الصدة، مصادر الالتزام، ص١٧-١٨.

**هەڵوێستی فیقهی ئیسلامی لە سروشتی پابەندی:**

ئەوە روونە فیقهی ئیسلامی نەریتی وایە دەست بە هەموو شتێکی ژیرانە و ناوەندەوە دەگرێ، ئەویش وەك جێبەجێکردنی فەرمانی خوای گەورە کە دەفەرموێ ﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطاً لِّتَكُونُواْ شُهَدَاء عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيداً﴾[1].

لەم روانگەیەوە سروشتی ئیسلام لەم فیقهەدا سیفەتێکی میانڕەوانە و ناوەندی هەیە لەنێوان هەردوو رێبازی (کەسی و ماددی)دا. لەڕووی پەیدابوون و داواکاریەوە لایەنی شەخسی پێوە دیارە. لەڕووی پەیدابوونەوە ئیرادەی قەرزار رۆڵێکی زاڵی هەیە، لەڕووی جێبەجێکردنیشەوە قەرزدەر داوا لە قەرزارەکەی یان نوێنەرەکەی دەکا، خۆویستانە پابەندیەکەی جێبەجێ بکا، ئەگینا بۆ ئەوە ناچار دەکرێ.

لە لایەنی ماددیشەوە دەستەبەری قەرزی قەرزدەرەکە ماڵی قەرزارەکەیە و لە ماڵەکەی دەدرێتەوە.

قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ لایەنی یەکەم کردوە و دەفەرموێ: ﴿وَكُلَّ إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَآئِرَهُ فِي عُنُقِهِ﴾[2] ئاماژەی بۆ لایەنی دووەمیش کردوە و دەفەرموێ: ﴿وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ﴾[3].

ئەم سروشتە ناوەندەیش چەند ئەنجامێکی لێ دەکەوێتەوە، گرنگترینیان ئەمانەن:

١- دەکرێ لەکاتی پەیدابوونی پابەندیدا کەسی بۆ-پابەند (الملتزم له) نەبێ یان نەناس بێ، وەك لە جەعالەدا.

---

(1) سورة البقرة/ ١٤٣.

(2) سورة الإسراء/١٣.

(3) سورة البقرة/ ٢٨٠.

٢- دروست نیە ئەو قەرزارەی توانای دانەوەی قەرزەکەی نیە بەند بکرێ، لەبەرئەوەی دەسەڵاتی قەرزدەر لەسەر ماڵ و سامانی قەرزارەکەیە کە دەستەبەری قەرزەکەیەتی، نەك لەسەر کەسەکە خۆی.

٣- دروستە کاتێك قەرزار لەگەڵ ئەوەی لەڕووی دارایییەوە بەتوانایە و دەتوانێ قەرزەکەی بداتەوە و هیچ عوزرێکی نیە، کەچی ئەو قەرزەی لەسەریەتی نایداتەوە، لەسەر ستەمی ئەو قەرزکوێریەی بەند بکرێ، پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی (مَطل الغني ظلم)[١]. (واتە خۆقورسکردنی کەسی دارا لە دانەوەی قەرز ستەمە). لە گێڕانەوەیەکیتردا (ليّ الواجد ظلم يحل عِرضه وعقوبته). (واتە: قەرزکوێریی کەسی دارا ستەمە و باسکردنی عیرز و سزادانی حەڵاڵ دەکا). (العِرض) (بە کەسری عەین) ئەوەیە ستایش یان زەمی کەسێکی پێدەکرێ، بۆیە دروستە لەبەردەم خەڵکدا وا باس بکرێ کە ئەو کەسە لە مامەڵە لەتەککردندا جێمتمانە نیە.

کەواتە بەندکردنی لە ئیسلامدا، لەبەر ستەمکردن و قەرزکوێریەکەیەتی نەك لەبەر ئەسڵی قەرزەکەی.

---

[١] ئیمام ئەحمەد لە مەسنەدەکەیدا لە ئیبن عومەرەوە گێڕاویەتیەوە. ٢/٧١.

# باسی سێیەم:
# سەرچاوەی پابەندی (یان هێزی پابەندکار)

بابەتی ئەم باسە رەگەزی یەکەمە لە شەش رەگەزەکەی پابەندی کە بریتین لە: سەرچاوەی پابەندکار (المصدر الملزم) + پابەند (قەرزار) + بۆ–پابەند (قەرزدەر) + تێدا–پابەند (بابەتی پابەندی) + پێ–پابەند (شوێنی پابەندی) + هۆی پابەندی (سبب الالتزام).

یاسا مەدەنیەکانی ولآتانی عەرەبی کۆکن لەسەر ئەوەی سەرچاوەکانی پابەندی پێنجن، ئەوانیش: (گرێبەند + ویستی تاکلایەنە + کاری نارەوا (کاری زیانبەخش) + دەولەمەندبوون بەبێ هۆ (یان بەدەستهێنان بەبێ هۆ) + یاسا).

ناونانی ئەم شتانە، جگە لە یاسا، بە سەرچاوەی پابەندی بە راستەقینە هەڵەیە، بەڵام لەرووی مەجازەوە دروستە، لەبەرئەوەی سەرچاوەی راستەقینەی پابەندییە مەدەنی و سزاییەکان تەنها یاسا، یاخود رێسای یاسایی ئەم بەڵگە مەنتیقیانەیە:

**یەکەم:** پابەندی بەکۆدەنگیی شەرعناسان و یاسا حوکمێکی تەکلیفییە، حوکمی تەکلیفیش بە کەسەکانەوە نەبەستراوە بەڵکو بە کارەکانەوە بەستراوە، کە پێناسە دەکرێ بەوەی: "ئاماژەی گوتاری شەرعدانەر (الشارع) لە بابەتی پابەندییە شەرعیەکان و گوتاری یاسادانەری وەزعییە لە بابەتی پابەندییە یاساییەکانی پەیوەندار بە کاری داوالێکراوەکان، وەك پێویستبوون یان سەرپشککردن".

**پێویستبوون** (الاقتضاء): بریتییە لە داوای کردن یان نەکردن. داوای کردن یان ئەوەتا بەمانای حەتم و پابەندکردنە، یان بەمانای لەپێشتری و باشتربوونە، لە یەکەمیاندا داواکراو واجبە و لە دووەمیاندا پەسەند و پێخۆشە (واتە مندوب و مستحب) .

داوای نەکردن-یش یان بەمانای حەتم و پابەندکردنە یان بەمانای لەپێشتری و باشتربوونە. ئەو کردەوەیەیش کە داوای نەکردنی کراوە لە یەکەمیاندا حەرام و ناڕەوایە جا چ لەو کارە زیانبەخشانە بێ کە قەرەبوویان تێدا واجبە وەك لە پرسە مەدەنیەکاندا، یان لەو کارە تاوانکاریانەدا بێ کە سزایان تێدا واجبە وەك لە بابەتە سزاییەکاندا، دووەمیشیان پێناخۆش (واتە مەکروهە).

شایانی باسە پێخۆش و پێناخۆش یاسای وەزعی باسی نەکردون لەسەر ئەو بناغەیەی ئەوانە لە پرسە ئاینی و ئەخلاقیەکانن و لە دەرەوەی بازنەی پابەندییە مەدەنی و پابەندییە تاوانکاریەکانن.

حوکمە تەکلیفیەکانیش پێنجن: پێویستبوون (وجوب)، پێخۆشبوون (ندب)، حەرام، پێناخۆشبوون (کراهة)، ڕێپێدان (اباحة).

لە شەریعەت و یاساشدا ئەگەر داواکردن بەمانای سەرپشککردن بوو پێی دەوترێ ڕێپێدان.

**دووەم**: پێوانەکردن لەسەر ڕووداوە سروشتیەکان (الوقائع الطبیعیة): بەکۆدەنگیی یاساناسان، لەپێشیانەوە مامۆستا سەنهوری (ڕەحمەتی خوای لێبێ)، تاکە سەرچاوەی پابەندییە مەدەنیەکان لە ڕووداوەکاندا (الوقائع) تەنها یاسایە. سەنهوری لە الوسیگ[1]دا دەڵێ: "ڕووداوە سروشتیەکان وەك هاوسێیەتی و خزمایەتی، یاسا هەندێ پابەندیی دیاریکراویان لەسەر دادەمەزرێنێ، ئەویش لەبەر ئیعتیباراتێك کە بۆ دادپەروەری و هاوکاریی کۆمەڵایەتی دەگەڕێنەوە، بۆیە دروستە ئەو پابەندیانە ڕاستەوخۆ بدرێنە پاڵ یاسا و ئەو ببێتە سەرچاوەیان".

ئەوە ڕوونە هیچ جیاوازیەك لەنێوان ڕەفتارە یاساییەکان و ڕووداوەکاندا نیە تەنها لەوەدا نەبێ لە یەکەمیان ئیرادە دەست وەردەدا، بەڵام لە دووەمیاندا ئەوە نیە.

پاشان ئەو کارە زیانبەخشانەی بە سەرچاوە دادەنرێن، لەوانەیە ئیرادە هیچ دەستێکی تێیاندا نەبێ، وەك ئەو کارە زیانبەخشانەی لە کەسانی بێ ئەهلیەت

[1] ١٤٥/١.

(نەشیاو) و بێ ئیرادەوە روودەدەن. ئەو کارانە لە ئیدی یاسادا سەرچاوەی پابەندین لەگەڵ ئەوەی ئیرادە هیچ رۆڵێکی لە روودانیاندا نیە.

**سێیەم**: لە هەندێ یاسادا کە گرێبەند بە سەرچاوەی یاسا دادەنرێ، دەقی راشکاو هەیە لەسەر ئەوەی ئەو سەرچاوەیەی شوێنەوار (أثر) لەسەر گرێبەستەکە دروست دەکا، یاسایە. بۆ نموونە یاسای مەدەنیی کوێتی[1] کە لە مادەی (٣١)دا هاتووە: "گرێبەند بریتییە لە پەیوەندیی ئیجاب بە قبوڵەوە لەسەر روودانی ئەسەرێك کە یاسا رێکی دەخا".

ئەم مادەیە راشکاوە لەوەی پابەندی لە گرێبەنددا سەرچاوەکەی ئەو یاسایەیە پابەندی لەسەر هۆکەی -کە گرێبەندە- دروست دەکا. کەواتە گرێبەند هۆیە و سەرچاوەی ئاسەوارەکانیشی لە ماف و پابەندیەکان، بریتییە لە یاسا.

**چوارەم**: یاساکان و یاساناسان کۆکن لەسەر ئەوەی هۆکانی بەدەستهێنانی مافە ماڵینە (عەینی)ـەکان حەوتن، کە بریتین لە: دەستگرتن بەسەر ماڵە موباحەکاندا، میرات، وەسیێت، پێوەنووسان (الالتصاق)[2]، گرێبەند، شەفیعی و لەلابوون (الحیازە).

ئەم هۆیانە هەندێکیان رەفتاری یاسایی و هەندێکیان رووداوی یاسایین و هۆن بۆ بەدەستهێنانی مافە ماڵینەکان سەرچاوەیان یاسایە. ئاشکرایە ماف و پابەندیەکان لە ئەسەرەکانی گرێبەستن، ئەوەیش کە بگوترێ سەرچاوەی ئەو مافانەی لە گرێبەندەوە بەدەست دێن یاسایە و سەرچاوەی ئەو پابەندیانەی لێی دەکەونەوە خودی گرێبەستەکەیە، زۆرەملێ و زاڵکردنی رایەکن بەبێ بەڵگەیەکی زاڵکەر.

**پێنجەم**: ئەگەر مرۆڤ لە ئیرادەیدا ئازاد بکرایە زۆر لەوانەی لە ترسی یاسا پابەندیەکانیان جێبەجێ دەکەن، دەستیان لە جێبەجێکردنیان هەڵدەگرت، بەڵام

---

[1] رقم (٦٧) لسنة ١٩٨٠.

[2] ((إذا جاء النهر بطمي على أرض أحد فهو ملکه)) (واتە: ئەگەر رووبار قوڕی بەسەر زەویی کەسێکدا هێنا، ئەوە موڵکی ئەوە). یاسای مەدەنیی عێراقیی بەرکار (م/١١١٣).

ئەوان پێشوەخت دەزانن ئەگەر بە ویستی خۆیان پابەندییەکانیان جێبەجێ نەکردایە ئەوا بە حوکمی یاسا بەوە ناچار دەکران، ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سەرچاوە یاسایە، لەبەرئەوەی تەنها یاسا هێزی پابەندکاری هەیە.

**شەشەم:** ئەگەر سەرچاوەی پابەندی یاسا نەبوایە بە کۆنبوون (تقادم) نەدەکەوت، لەبەرئەوەی ئەو رەفتارەی پابەندی دروست کردوە بۆ نموونە گرێبەند، بە کۆنبوون ناکەوێ، جا مادام سەرچاوەکە بە کۆنبوون قابیلی کەوتن نیە، ئەوا ئەسڵ وایە ئەو پابەندییەی لێی دەکەوێتەوە بە کۆنبوونی لە مەدەنییبوونیەوە ناگۆڕێ بۆ پابەندیی سروشتی.

**حەوتەم:** ئەگەر گرێبەست سەرچاوەی پابەندی بوایە هیچ پێویست بە مادەی (١٤٥) لە یاسای مەدەنیی عێراقی کارپێکراو نەدەبوو کە دەڵێ: "شوێنی گرێبەندەکە هەرچی بێ بێ گرێبەندوان ناچار بە جێبەجێکردنی پابەندییەکەی دەکرێ". بەڵام زەرورەت بۆ بوونی ئەم مادەیە بەردەوامە، بۆیە لە پێوانەکردنی نائاسایانەی مەنتیقی ئەوە بەرهەم دێ کە گرێبەند سەرچاوەی پابەندی نیە[1].

ئەگەر سەرچاوەی پابەندی ئیرادەی تاك بوایە، هیچ پێویست بە مادەی (١٨٤) لە یاسای مەدەنیی عێراقی نەدەبوو، کە دەڵێ: " ویستی تاکلایەنە خاوەنەکەی پابەند ناکا تەنها لەو دۆخانەدا نەبێ کە یاسا باسی کردوون". بەڵام زەرورەت بۆ بوونی

---

[1] پێوانەکردنی نائاسایانەی مەنتیقی لە مەرجداریی پێکەوەبەسترلو پێکدێ (پێشتر و پاشتر)، دانانی پێشتر (جێگیرکردنی)، دانانی پاشتر بەرهەم دێنێ، لادان پاشتریش (نەفیکردنی) لادانی پێشتر بەرهەم دێنێ نەك بەپێچەوانەوە، واتە دانانی پاشتر دانانی پێشتر بەرهەم ناهێنێ، هەروەها لادانی پێشتر لادانی پاشتر بەرهەم ناهێنێ لەبەر ئەگەری ئەوەی پاشتر لە پێشتر گشتیتر بێ، بۆیە دانانی پاشتر دلنانی پێشتر ناسەپێنێ، چونکە بوونی گشتیتر بوونی تایبەتتر ناسەپێنێ، هەروەها لادانی پێشتر لادانی پاشتر ناسەپێنێ لەبەرئەوەی نەبوونی تایبەتتر نەبوونی گشتیتریش ناسەپێنێ. بروانە: (تهذیب المنطق للسعد التفتازاني وشرحه للشیخ عبیدالله بن فضل الخبیصي، ص٩١). بۆ نموونە لەبارێکدا گوتمان: ئەگەر (أ) زێر بولیە مرۆڤ دەبوو، بەڵام زێرە لەبەرئەوە مرۆڤ دەبێ، جیاواز لەوەی بگوترلیە: ئەگەر مرۆڤ بولیە زێر دەبوو، لەبەرئەوەی مرۆڤ لە زێر گشتیترە، چونکە دەکرێ شێت بێ.

بەردەوامە، بۆیە ویستی تاکلایەنە نابێتە سەرچاوە، لەبەرئەوەی لادانی پاشتر (رفع التالي) لادانی پێشتر (رفع المقدم)ی لێ دەکەوێتەوە. هەروەها هیچ پێویست بە مادەی (٤٠٣) لە پرۆژەی مەدەنیی عێراقی نەدەبوو، کە دەڵێ " ویستی تاکلایەنە خاوەنەکەی پابەند دەکا لەو حاڵەتانەی لە یاسادا باس کراون".

**هەشتەم**: بەر لە پەیدابوونی یاسا سەرچاوەی ماف و پابەندییەکان عورف بوو، پاش پەیدابوونی دەوڵەت و گۆڕینی عورف بە یاسا، یاسا جێی گرتەوە. ئەوەیش روونە جێگرەوە (البدل) هەمان حوکمی جێگیراوە (مبدل منه)ی هەیە.

**نۆیەم**: یاساکان کۆکن لەسەر ئەوەی سەرچاوەی پابەندییە سزاییەکان یاسایە، بەڵگەیەکی مەنتیقی نیە پاساو بێ بۆ جیاکاری لەنێوان پابەندییە مەدەنیەکان و پابەندییە سزاییەکان لەرووی سەرچاوەوە، لەبەرئەوەی هەردوو جۆرەکە لەو حوکمە تەکلیفیانەن کە سەرچاوەیان شەرع یاخود یاسایە.

**دەیەم**: فیقهی نوێ لە یاساکاندا لەسەر ئەو بنچینەیە جێگیر بووە کە هێزی پابەندکاری گرێبەند، یاسایە بەبێ دەسەڵاتی ئیرادە، ئەمەیش بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگرە لەسەر ئەوەی سەرچاوەی هەموو پابەندیەکان یاسایە.

ئەم بەڵگە زانستییە عەقڵییە لۆژیکیانە سەرجەمیان بەڵگەی بنبڕن لەسەر ئەوەی سەرچاوەی تەواوی پابەندیەکان، سزایی بن یان مەدەنی، بریتییە لە یاسا.

جگە لە یاسا و رێسای یاسایی لە گرێبەند و کاری ناڕەوا و بەدەستهێنان بەبێ هۆ (یان زەنگینبوون بەبێ هۆ) ئەوانە هۆی پابەندین و ناوبردنیان بە سەرچاوە، پێچەوانەی لۆژیکی یاسایی و فەلسەفەی یاسایە.

# بەشی دووەم

## جۆرەکانی پابەندی

پابەندی بەپێی بنەمای جیاواز بۆ چەندین جۆر دابەش دەبێ، لەڕووی شوێن (المحل) و وەسفەکان و بابەت و جێبەجێکردن و هۆوە.

هەربۆیە لێکۆڵینەوە لەم جۆرانە بەسەر چوار باسدا دابەش دەبی و هەریەکەیان بۆ بنەمایەك لەو بنەمایانە تەرخان دەکرێ.

# باسی یەکەم:
# جۆرەکانی پابەندی لەرووی شوێنەوە
# (ئەنجامدان)

گرنگترین پابەندیەکان لە رووی شوێن (محل)ەوە ئەمانەن:

**یەکەم: ئەرێنی و نەرێنی[1]:**

١- پابەندی ئەرێنی دەبێ ئەگەر بابەتی پابەندیەکە هەستان بێ بە کارێك، ئیتر سروشتی ئەو کارە هەرچی بێ، وەك پابەندبوون بە پێدانی شتێك، یان گواستنەوەی شتێك، یان رادەستکردن، یان بژاردن یاخود دانەوە (تسدید) و شتی لەو جۆرە.

لە پیادەکردن (تطبیقات)ەکانی: پابەندبوونی فرۆشیار بە رادەستکردنی کالآ فرۆشراوەکە و پابەندبوونی کڕیار بە دانی نرخەکەی بەو شێوەیەی هەردوولا لەسەری رێك دەکەون.

٢- پابەندی نەرێنی دەبێ ئەگەر بابەتی پابەندیەکە نەکردنی کارێك بێ بەگوێرەی یاسا، وەك ئەوەی بەکرێدەر پاش تەواوکردنی گرێبەستی بەکرێدانەکە، بەبێ یاساو ئەو ماڵەی بەکرێی داوە رادەستی بەکرێگرەکە نەکا، یان بەکرێگرەکە بەبێ عوزر ئەو قیستانەی لەسەریەتی نەدات. یان (نەکردنی کارێك بێ) بەگوێرەی رێکەوتن، وەك ئەوەی فرۆشیاری یەکێك لە دوو دوکانە لەتەنیشت یەکترەکەی، لەگەڵ کڕیاری ئەو دوکانە رێك بکەوێ لەو جۆرە کالآیانەی تێدا نەفرۆشێ کە ئەو لە دوکانەکەیدا دەیانفرۆشێ، یان شتی لەم شێوەیە.

---

[1] یاسای مەدەنیی لوبنانی، مادەی (٤٥) و پاشتر.

**بەرهەمی دابەشکردنەکە :**

گرنگترین بەرهەم کە لەم دابەشکردنە دەکەوێتەوە، ئەوەیە نایکاتە مەرج ئەو هەڵەیەی لە تێکدانی پابەندیدا خۆ دەنوێنێ، هەردوو رەگەزە ماددی و مەعنەوییەکەی لە پابەندیی ئەرێنیدا تێدا بن، بەڵکو تەنها رەگەزە مادییەکە بەسە کە تێکدان (الاخلال)ی واجبێکی یاساییە (کاری ناڕەوا)، جا ئاخۆ رەگەزە مەعنەوییەکە (دەرککردنی تێکدەر بەوەی واجبە یاساییەکەی تێکداوە)، بەدیبێ یان بەدینەیەت. بەدەربڕینێکیتر، لە زیانگەیاندن بە کەسانیتردا تەنها دەستدرێژیکردنەکە بەسە، با بەئەنقەستیش نەبووبێ.

بەپێچەوانەی پابەندیی نەرێنی، کە تێیدا بۆ روودانی بەرپرسیارێتیی گرێبەندانە یان کەمتەرخەمیکردن، تەنها بوونی رەگەزە ماددییەکە بەس نیە، بەڵکو پێویستە رەگەزە مەعنەوییەکەیش بەدیبێ، واتە تەنها دەستدرێژیکردن بەس نیە، بگرە پێویستە دەستدرێژییەکە بەئەنقەستیش بووبێ، بەوەی مەبەست زیانگەیاندن بووبێ بە کەسیتر.

**دووەم، پابەندبوون بە بەدیهێنانی ئامانج و پابەندبوون بە بایەخدان:**

١- پێویستە پابەندبوون بە بەدیهێنانی ئامانج، ئەو ئەنجامەی لێ بەدیبێ کە پابەندی بۆ کراوە و تەنها بایەخدان (بذل العناية) و شکستهێنان لە بەدیهێنانی ئامانجەکەدا بەس نیە.

یەکێك لە پیادەکردنەکانی ئەم جۆرە پابەندییە، پابەندبوونە بە ئەنجامدانی تاقیکردنەوە بۆ وەرگیران لە کۆلێژێك، یان دامەزران لە وەزیفەیەکدا، یان ناردن بۆ دەرەوە بۆ تەواوکردنی خوێندن لەرێی زەمالە و شتی لەم شێوەیە. هەر ئەوە بەس نیە تاقیکارەکە بایەخ بدات، بەڵکو دەرچوون داواکراوە.

٢- بەڵام لە پابەندبوون بە بایەخداندا، بۆ رزگاربوون لە بەرپرسیارێتی، ئەوەندە بەسە کەسی پابەند بەئەندازەی کەسێکی ئاسایی بایەخ بدات، یان لە بەدیهێنانی

ئامانجە تايبەتەکەيدا بايەخ بدات، وەك ئـەوەی پزيشـکێك نەشـتەگەری بـۆ نـەخۆش دەكا.

پێـوەری لێـك جياکردنـەوەی هـەردوو پابەندیەکـە ئەوەيـە، ئەگـەر بـەدیهێنانی ئامانجەکە ١٠٠٪ ملکەچی ئیرادەی کەسی پابەند بوو، ئەوە تەنها بايەخدان بەس نيە، بەڵكو پێویستە ئامانجەکە بەدیبێ. لە نموونەکەی سەرەوەدا بەدیهاتنی سەرکەوتنی نەشتەرگەريەکە بەرێژەی ١٠٠٪، لەژێر ئـیرادەی پزیشـکە پسـپۆڕەکەدا نیـە، بـەڵکو فاکتەریتر هەن کە لەوانەیە لە سەرنەکەوتنی نەشـتەرگەريەکەدا رۆڵیـان هـەبێ، وەك بـوونی نەخۆشـیتر لـە جەسـتەی نەخۆشـەکەدا، کـە دەبنـە يارمەتیـدەر بـۆ مردنـی نەخۆشەکە و سەرنەکەوتنی نەشتەرگەريەکە.

**بەرهەمی دابەشکردنەکە :**

لە بەرهەمەکانی ئەم دابەشکردنە لە حاڵەتی پابەنـدبوون بـە بايەخدانـدا ئەوەيـە، نابێ سکاڵا دژی ئەو کەسە پابەندەی شکستی هێناوە لە بەدیهێنانی ئـەو ئەنجامـەی بـەلای ئـەو کەسـەی بـۆی پابەنـد بـووە مەبەسـت بـووە، بـەرز بکرێتـەوە و داوای قـەرەبووی لێبکـرێ، تـا نەسـەلمێ پزیشـکەکە کەمتەرخـەمی کـردوە و رەچـاوی رێوشوێنە تەکنیکیەکانی ئەنجامدانی نەشتەرگەری نەکردوە.

هەروەها بۆی نیە سکاڵا بـەرز بکاتـەوە و داوای ئامانجەکـە يـان بـەدیهێنانی ئـەو ئامانجـەی بايـەخی تێـدا بەخـەرج دراوە، بکـا، وەك گواسـتنەوەی لـە قۆنـاغێکی خوارترەوە بۆ قۆناغێکی باڵاتری خوێندن، يان قبولکردنی لە کۆلێژ يـان دامەزرانـدنی لە وەزیفەدا بەبەڵگەی ئەوەی بايەخی داوە.

**سێیەم: پابەندیی بنچینەیی (أصلی) و پابەندیی شوێنکەوتەیی (التبعی):**

**١- پابەندیی بنچینەیی:** پابەندیەکی سەربەخۆیە کە شوێنکەوتەی پابەندیەکیتر نیە، وەك پابەندی لە گرێبەندی فرۆشتن يان گرێبەندی بەکرێدان و ئـەو شـتانە، ئـەم جۆرە (لە پابەندی) بەهۆکانی بەسەرچوونی پابەندییە سـەربەخۆکان نـەبێ، بەسـەر ناچێ.

**٢- پابەندیی شوێنکەوتەیی:** پابەندییەکی ناسەربەخۆیە، بەڵکو شوێنکەوتەی پابەندیەکیتری بنچینەییە، بە مانی ئەو دەمێنێت و بە نەمانیشی نامێنێ، وەك پابەندیی کەفیل بە دانەوەی قەرزەکە ئەگەر کەفیلدارە ئەسڵیەکە نەیدایەوە، تا ئەوکاتەی پابەندیی کەفیلدارەکە بەردەوام بێ ئەم پابەندیەیش بەردەوام دەبێ، بەڵام ئەگەر بە ڕێگەیەك لە ڕێگەکانی بەسەرچوون بەسەرچوو، وەك دانەوەی قەرزەکە یان قەرزشکاندنەوە (المقاصە) یان یەککگرتنی ئەستۆ و ئەو جۆرە شتانە، لە ڕوانگەی ئەو ڕێسایەی دەڵێ (ئەگەر ئەسڵەکە کەوت لقەکەیش دەکەوێ) خۆبەخۆ پابەندیی کەفیلەکە بەسەردەچێ[١].

بەڵام ئەگەر ئەسڵەکە نەیتوانی بەڵێنەکەی بباتە سەر یان قەرزارە ئەسڵیەکە ئامادە نەبوو تەنانەت بەزۆریش ئەو کارە بکا، ئەوا لەسەر کەفیلەکە پێویستە قەرزەکەی بۆ ببژێرێ.

**بەرهەمی دابەشکردنەکە:**

خاوەن قەرز ناتوانێ داوا لە کەفیلەکە بکا قەرزەکەی بداتەوە مەگەر قەرزارە ئەسڵیەکە مل بە دانەوەی نەدات، یان توانای دانەوەی نەبێ، لەبەرئەوەی کەفیلیکردن تەنها لەبەر دەستەبەریکردنە و پابەندبوونی، لە پلەدا پاش پابەندیی کەسە ئەسڵیەکە دێ.

---

[١] مادەی (٥٠) لە گۆڤاری: الأحكام العدلية.

# باسی دووەم:

# جۆرەکانی پابەندی لەڕووی وەسفەوە[1]

پابەندی لە رووی وەسفەوە بۆ چەند جۆرێك دابەش دەبێ، لەوانە:

**یەکەم: پابەندیی حازری و پابەندیی دواخراو:**

١- ئەسڵ ئەوەیە هەموو پابەندیەك بەپێی یاسا حازری بێ، لەبەرئەوەی هەرکات هۆ بەدیهات بەرهۆ (مسبب)ەکەی بەبێ دواکەوتن بەدیدێ، مەگەر کەسی پابەند و کەسی بۆ-پابەند لەسەر دواخستنی ئەنجامدانەکە بۆ کاتێکی دیاریکراو یان دیارینەکراو رێك بکەون.

٢- پابەندیەکە دواخراو دەبێ ئەگەر (هەردوولا) لەسەر دواخستنێکی دیاریکراو یان دیارینەکراو رێك کەوتن.

**بەرهەمی دابەشکردنەکە:**

کەسی بۆ-پابەند (الملتزم لە) بۆی هەیە هەموو رێگە یاسایی و رێکەوتنەکان بەکاربێنێ تا (کەسی پابەند) بەحازری پابەندیەکەی جێبەجێ بکات و لەڕێی قەزاوە بەوە ناچار بکرێ.

بەڵام لە پابەندیی دواخراودا مافی ئەم بەکارهێنانەی نیە تا ماوەی دواخستنەکە تەواو نەبێ، یان دواخراوەکە بە رێگەیەکیتر بگۆڕێ بۆ حازری، وەك گۆڕانی مارەیی دواخراو بۆ حازری بەنزیکترینی دوو ئەجەلەکە، تەڵاق یان مردن.

---

[1] الأستاذ أنور سلطان: النظرية العامة للالتزام، ص٢١٨ و پاشتر.

**دووەم: پابەندیی رەها و پابەندیی مەرجدار:**

١- **پابەنـــدیی رەهـــا:** ئەســـڵ لـــە هـــەموو پابەندیەکـدا رەهاییـــە، لەبەرئـــەوەی جێبەجێکردن لە سیفەتە لابەلایی (عارض)ەکانە و ئەسڵ نەبوونیانە. جا ئەگەر رەها بوو پێویستە کەسی پابەند بەگوێرەی عورفی باوی وڵاتەکە جێبەجێی بکا.

٢- **پابەندیی مەرجدار:** ئەگـەر جێبـەجێکردنی پابەندیەکـە مەرجـدار کرابـوو بـە مەرجێك کە یاسا دیاریدەکا یان بە مەرجێکی جەعلی کـە هـەردوو لایـەنی گرێبەسـت لەسەری رێك دەکەون، ئەوا پێویستە پابەند لەکاتی جێبەجێکردنیدا[١] بەو مەرجەوە پابەند بێ، ئەگینا دووچاری بەرپرسیارێتیی گرێبەستانە و کەمتەرخەمیکردن دەبێ.

مەرج شتێکە بۆ ئایندەیە و بەدیهاتنی مسۆگەر نیە. بەدیهاتنی مەرج یـان ئـەوەتا بوونی پابەندی لێ دەکەوێتەوە و پێی دەوترێ مەرجی وەسـتاو یـان وەسـتێن، یـان نەمانی پابەندی لێ دەکەوێتەوە و پێی دەوترێ مەرجی هەڵوەشێن، بەم شێوەیە:

أ- لە وێنەکانی پابەندیی مەرجدار بە مەرجێکی وەستاو ئەوەیـە بـاوك بـەڵێن بـە یەکێك لە کوڕەکانی بدات ئۆتۆمبێلێکی بۆ بکڕێ ئەگەر لە تاقیکردنەوەی دوا قۆنـاغی خوێندنەکەیدا بە نمرەیەکی بەرز دەرچوو. لەم بارەدا پابەندیی باوکەکە بەدی نایـەت تا مەرجەکە بەدی نەیەت، ئەگەر بەدیهات ئەسەرەکەی پشت بەو کاتە دەبەستێ کە پابەندیەکەی تێـدا پەیـدا بـووە، مەگـەر لـە ئـیرادەی هـەردوو گرێبەسـتوان یـان لـە سروشتی گرێبەندەکەوە، دەربکەوێ کە بوونی پابەندیەکە یاخود نەمانی لەو کاتـەدا دەبێ مەرجەکەی تێدا هاتۆتە دی[٢].

ب- لـە پیادەکردنـەکانی پابەنـدیی مەرجـدار بـە مـەرجێکی هەڵوەشـێن: وەك پابەندبوونی کەسێکە بە نەفەقەکێشانی ژنی برا کۆچکردووەکەی بەو مەرجەی شـوو نەکاتەوە و برازاکانی بۆ بەخێو بکـا. لێـرەدا پابەندیەکـە لـە مێـژووی بەڵێندانەکـەوە

---

[١] مادەی (٨٣) لە گۆڤاری: الأحكام العدلية.

[٢] یاسای مەدەنیی میسریی بەرکار، مادەی (٢٧٠).

بەردەوام دەبێ و هەرکات براژنەکەی شووی کردەوە هەڵدەوەشێتەوە، بەڵام کاریگەریی هەڵوەشانەوەکە بە پاشئاسەوار (الاثر الرجعی) نابێ (واتە ئەو ماوەیەی پێشتر ناگرێتەوە کە هێشتا شووی نەکردبووەوە).

**بەرهەمی دابەشکردنەکە :**

لە بەرهەمەکانی ئەم دابەشکردنە ئەوەیە کەسی پابەند بەرپرسیار نابێ ئەگەر بەر لە بەدیهاتنی مەرجە وەستاوەکە پابەندیەکەی تێکدا، بەڵام ئەگەر بەر لە بەدیهاتنی مەرجە هەڵوەشێنەکە پابەندیەکەی تێکدا ئەوا بەرپرسیارێتیەکەی بەردەوام دەبێ.

کەسی پابەند بۆی هەیە پاش بەدیهاتنی مەرجە هەڵوەشێنەکە ئەوەی داویەتی بە کەسی بۆ-پابەند، بیگێڕێتەوە.

لە حاڵەتی پابەندیی هەڵواسراو بە مەرجێکی وەستێندا، پابەندیەکە کارپێکراو نابێ تا دوای بەدیهاتنی مەرجەکە، بەڵام پێش لەوە پابەندیەکە قابیل نە بە جێبەجێکردنی زۆرەملێیانەیە و نە جێبەجێکردنی خۆویستانە نیە، بەڵام خاوەن قەرز بۆی هەیە ڕێوشوێنی پێویست بۆ پارێزگاریکردن لە مافی خۆی بگرێتەبەر.

تا ئەو هەڵواسراویەیش بەردەوام بێ پابەندبوون لەئارادا نابێ، لەبەرئەوە قەرزدەر مافی ئەوەی نیە بەگوێرەی ئەوە دەست بە ڕێوشوێنەکانی جێبەجێکردنی پابەندی بکا، هەروەك پابەندبوونی قەرزار بەویستی خۆی بە پابەندبوونێکی شایان نازمێرێ، جگە لەمانەی باس کران، پرۆسەی کۆنبوون (التقادم) دەست پێناکا، لەبەرئەوەی هێشتا نەبووەتە مافێك کە پێویست بێ بدرێ[1].

**سێیەم: پابەندیی مەدەنی و پابەندیی سروشتی:**

١- پابەندیی مەدەنی: پابەندیەکی یاسایی تەواوە و یاسا دەیپارێزێ، گوێ لە سکاڵای یاسایی بۆ جێبەجێکردنی دەگرێت و پێویستە دادوەر بڕیار بدات لەسەر

---

[1] مجموعة الأعمال التحضيرية للقانون المدني المصري القائم، ١٤/٣، الأستاذ الدكتور أنور سلطان، أحكام الالتزام، الموجز في النظرية العامة للالتزام، ص

جێبەجێکردنی بەتەواوی، ئەگەر جێبەجێکردنەکە ناتەواو بوو، یان کەسی پابەند بەبێ پاساوێکی یاسایی ملی بەجێبەجێکردنی نەدەدا، بڕیاری سزادانی دەدرێ، ئەویش قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانەیە بەهۆی دواکەوتنەوە قەوماوە، ئەمە جگە لە فرۆشتنی ماڵ و سامانەکەی بەمەبەستی جێبەجێکردنی زۆرەملێیانەی پابەندیەکە و دانەوەی قەرزی قەرزدەرەکە لە پارەی شتە فرۆشراوەکان.

**٢- پابەندیی سروشتی:** ئەوەیە بەهۆی کۆنبوونی بخەر (التقادم المسقط)ەوە، واتە بەتێپەڕینی ماوەی بەسەرچوون بەسەر وازهێنانی لە داواکردنی مافی خۆی، پاراستنی یاسایی و سیفەتی بەزۆر جێبەجێکردن و بەرپرسیارێتی لەدەست داوە. ماوەی بەسەرچوونیش لە یاساکاندا بەپێی سروشتی ماف و پابەندیەکان لە رووی چۆنایەتی و چەندایەتیەوە جیاوازە و لەنێوان ساڵێك تا پازدە ساڵدایە.

شایانی باسە هۆی پابەندیی سروشتی تەنها لە کۆنبووندا کورت نابێتەوە، بگرە هۆیتریش هەن، لەوانە: ئەوەیە قەرزدەر نەتوانێ بە بەڵگەیەکی رەوا و پەسەند لەبەردەم قەزادا قەرزەکەی بسەلمێنێ. لەوانە پابەندبوونی بەخشەر بەر لە رادەستکردنی شتە بەخشراوەکە بە پێبەخشراو. لەوانە پابەندی لە گرێبەندە ماڵینەکاندا بەر لە وەرگرتنی ماڵەکە (شوێنی گرێبەندەکە)، لەبەرئەوەی لەو گرێبەندانەدا پابەندی تەنها بە ئیجاب، یان ئیجاب و قبوڵ پەیدا دەبێ وەك لە گرێبەستی رەزاییدا. بەڵام تا پاش وەرگرتن نابێتە ماف، جیاواز لەوەی زانایانی یاسا بۆی چوون کە وەرگرتن لەو گرێبەندانەدا پایەیە و هیچ گرێبەندێکی بەبێ وەرگرتن دانامەزرێ.

راستیەکەی ئەوەیە گرێبەندی ماڵینە (عەینی) بەر لە وەرگرتن دادەمەزرێ و پابەندی لەو دەکەوێتەوە نەك لە مافەکە، بەڵام پابەندیەکە بە سروشتی وەسف دەکرێ و کەسی پابەند لەلایەن دادگەوە ناچار بە جێبەجێکردنی ناکرێ، بەڵام

لەڕووی دینیەوە پرسیاری لێ دەکرێ، خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَوْفُواْ بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْؤُولاً﴾[1].

**بەرهەمی دابەشکردنەکە:**

ئەم دابەشکردنە لە رووی کرداریەوە لە چەند روویەکەوە گرنگیەکی گەورەی هەیە، لەوانە:

أ- لەبەرچاوگرتنی سەقامگیریی مامەڵەکان و دانانی سنوورێك بۆ تۆمارکردنی بێسنووری دەعوا، یان بەبێ سەنەدێکی شەرعی.

ب- کەوتنی دەعوا وەك سزادانێکە بۆ قەرزدەر لەسەر خەمساردی و کەمتەرخەمیکردنی لە داواکردنی مافی خۆی، بەبێ ئەوەی لای خۆیەوە هیچ رێگر یان هیچ عوزرێکی شەرعی هەبێ.

ج- لێك جیاکردنەوەی ئەم دوو جۆرە پابەندیە لەرووی ئاسەوارەوە کۆکردنەوەی دوو بەرژەوەندی تێدایە، بەرژەوەندیی قەرزدەر و بەرژەوەندیی گشتی. یەکەمیان لەوەی مافەکەی بە کۆنبوون یان بە نەبوونی بەڵگەنامەی سەلماندن لەبەردەم قەزادا بەسەرناچێت و ناکەوێ، بەڵکو تەنها دەعواکەیە دەکەوێ، هەربۆیە ئەگەر کەسی پابەند بەپابەندبوونێکی سروشتی ئەرکەکەی جێبەجێ کرد و مافەکەی دایەوە بە کەسی بۆ-پابەند (الملتزم لە)، پاش جێبەجێکردنەکە مافی ئەوەی نیە مافەکە بگێڕێتەوە بەبەڵگەی ئەوەی پابەندیەکەی سروشتی بووە.

هەروەها بەرژەوەندیی گشتی کە لەبەرچاوگرتنی سەقامگیریی مامەڵەکانە، لەو روانگەیەشەوە قەرزەکە بە زمانی فیقهی ئیسلامی لەڕووی دینیەوە داواکرلو دەبێ نەك لەڕووی دادوەریەوە و بە دەربڕینی زانایانی یاسا رەگەزی بەرپرسیارێتی دەکەوێت و رەگەزی قەرزاری دەمێنێتەوە[2]. بەڵام ناونانی ئەم دوو زاراوەیە بە رەگەز،

---

[1] سورة الإسراء/ ٣٤.

[2] بۆ نموونە مامۆستا ئیسماعیل غانم کە لە گەورە یاساناسە میسریەکانە لە کتێبی (النظرية العامة للالتزام، لا٢٤٧) دەڵێ: "لە شیکردنەوەی پەیوەستیی پابەندی-دا بۆ هەردوو رەگەزەکەی، ←

سەرپێچیکردنی مەنتیقی یاساییە، لەبەرئەوەی لە جیاکەرەوە و تایبەتمەندی و وەسفەکانی پابەندین، هەروەها ئەو پاش پەیدابوونی پابەندی پێکدێ لەکاتێکدا رەگەزەکانی شت لە بووندا پێشی پابەندی دەکەون.

---

قەرزاری و بەرپرسیارێتی (المديونية والمسؤولية)، رەگەزی یەکەم تەنها باس لەو ئەرکە دەکا کە ئەنجامدانی کارێکی دیاریکرلو بۆ بەرژەوەندیی کەسێکیتر دەسەپێنێ، جا کارەکە چ نەرێنی بێ یان ئەرێنی و بە جێبەجێکردنی خۆویستانە تەولو دەبێ. بەڵام بەپێی رەگەزی دووەم قەرزار بەرپرسە لە دانەوەی قەرزەکەی تا کۆتایی". مامۆستا ئیسماعیل لەم تەفسیرەیدا بۆ قەرزاری و بەرپرسیارێتی، روونی کردەوە کە ئەو دووانە پاش بوونی پابەندی بەدی دێن.

# باسی سێیەم:
# جۆرەکانی پابەندی
# لە ڕووی سروشتی بابەتەکەوە

پابەندی لە ڕووی سروشتی بابەتەکەوە بۆ چەند جۆرێك دابەش دەبێ، لەوانە:

**یەکەم: پابەندیی مالینە و پابەندیی کەسی:**

١- **پابەندیی ماڵینە:** پابەندیەکە بابەتەکەی ماڵ (عین)کی دیاریکراوە بە خود یان وەك کۆبەش(الشیوع). لە جۆری وەپاڵدانی شتە بۆ بابەتەکەی، وەك پابەندیی فرۆشیار بە رادەستکردنی خودی فرۆشراوەکە کە بابەت و وابەستەی پابەندیەکەیە، ئەوە سەبارەت بە کڕیار مافێکی ماڵینەیە، لەبەرئەوەی دەسەلاتێکی راستەوخۆی بەسەریدا هەیە کە دەسەڵاتی بەکارهێنان و قۆستنەوە و بەکارهێنان و لەدەستدابوون (الحیازة) پاش وەرگرتنی پێدەبەخشێ.

سەبارەت بە فرۆشیاریش پابەندیەکی ماڵینەیە و وابەستەی ماڵەکەیە، کە بابەتی پابەندیەکەیە.

٢- **پابەندیی کەسی:** پابەندیەکە بابەتەکەی مافێکی کەسییە لەئەستۆی قەرزاردا، وەك پابەندیی کڕیار بە دانی نرخی کالاکە، کە بابەتی پابەندیەکەیەتی، بە فرۆشیارەکە. هەروەها سەبارەت بە فرۆشیار مافێکی کەسی و سەبارەت بە کڕیاریش پابەندیەکی کەسی دەبێ.

شایانی باسە بابەتی جیاکاری لەنێوان پابەندیی ماڵینە و پابەندیی کەسیدا جێی گەنگەشە و ناکۆکیی نێوان یاساناسان بوو لە فەرەنسا و ولاتانی عەرەبی بە رادەیەك

بە کێشەیەکی ئاڵۆزیان دادەنا، لەو ڕووەوە پێوەرێکی بابەتیی ڕوون بۆ ئەو جیاکارییە نیە[١].

لەو ناکۆکیانە ئەوەیە مامۆستا سەنهوری[٢] پێی وایە ڕای زاڵ ئەوەیە پابەندیی ماڵینە (عيني) هیچ نیە جگە لە درێژەی مافی ماڵینە و پابەندیەکی سەربەخۆ نیە.

مامۆستا عەبدولحەی حیجازی[٣] دەڵێ پابەندیی ماڵینە پەیوەستیەکە لەنێوان قەرزدەر و قەرزاردا کە ڕاستەوخۆ دەقی یاسا دروستی دەکا، بەو پێیە قەرزار لەپێش خاوەن قەرزەکەی پابەند دەبێ بە دانی شتێك یان کردنی کارێك یاخود نەکردنی کارێك.

شتێکی سەیرە ئەم جۆرە جیاوازییە لە بابەتێکدا ببینین کە وەك خۆر لە نیوەڕۆدا ڕوون و ئاشکرایە. ئاخر مافی ماڵینە و پابەندیی ماڵینە هەردووکیان ڕوویان لە ماڵ (عين)ێکی دیاریکراوەوە و بەوەوە پەیوەستە، جیاوازیەکەیش ئەوەیە ئەم

---

[١] دکتۆر عەبدولعەزیز عەبدولقادر لە کتێبی (الالتزام العيني بين الشريعة والقانون، دراسة مقارنة، لا٥) لەژێر ناونیشانی (غموض فكرة الالتزام العيني في الفقهين الوضعي والإسلامي)دا دەڵێ "هێشتا بیرۆکەی پابەندیی ماڵینە لە یاسا وەزعیەکاندا تا ئەمڕۆیش تەمومژاوییە. شەرحکارانی یاسای وەزعی لە تێڕوانینیان بۆ هیچ بیرۆکەیەکی یاسایی بەو شێوەیە جیاواز نەبوون کە لەکاتی وەسفکردنی ئەم جۆرە پابەندیەدا جیاواز بوون، جیاوازیەکەیان مایەی سەرسوڕمان بوو، چونکە هەندێ کەس لە فەرەنسا وەسفیان کردوە بەوەی پابەندیەکی شەخسیی ئاساییە، کۆمەڵێکیتر وەسفیان کردوە بەوەی بریتییە لە خودی مافە ماڵینەکە، کۆمەڵی سێیەم ناوەندیان گرتووە و و گوتویانە پابەندیی ماڵینە پابەندیەکە لەنێوان مافی ماڵینە و مافی شەخسیدا وەستاوە، ڕای چوارەم بۆ ئەوە چووە پابەندیی ماڵینە ئامرازێکە بۆ چارەسەری ناکۆکی لەنێوان مافە ماڵینەکاندا، هەندێ لە شەرحکارانیش لە میسر بۆ ئەوە چوون پابەندیی ماڵینە پەیوەستیەکە لەنێوان قەرزدەر و قەرزاردا، کە دەقێکی یاسایی ڕاستەوخۆ دروستی دەکا".

[٢] الوسيط، ٦٨٨/٨.

[٣] أحكام الالتزامات، ٢٨/١.

پەیوەستییە بەلای بۆ–پابەند (قەرزدەر)ەوە پێی دەوترێ مافی ماڵینە، بەلای پابەند (قەرزار)یشەوە پێی دەوترێ پابەندیی ماڵینە.

هەروەها پابەندیی کەسی بەلای قەرزدەرەوە مافێکی کەسییە، بەلای قەرزاریشەوە پابەندیەکی کەسییە.

بۆ نموونە قەرزی قەرزار پاش مردنی پەیوەندی بە میراتە بەجێماوەکەیەوە هەیە و لە پابەندیی کەسییەوە دەگۆڕێ بۆ پابەندیی ماڵینە لە رووی بڵاویەوە، وەك مافی وەرەسەکە تێیدا.

هەرچی وەسێتکردنە بە ماڵێکی دیاریکراو، ئەوا مافی وەسێت بۆکراو پەیوەندی بە خودی ماڵەکەوە دەبێ و پابەندیی میراتگران بە جێبەجێکردنی پابەندیەکی ماڵینە دەبێ، بۆیە بەبێ رەزامەندیی وەسێت بۆکراو مافی ئەوەیان نیە ماڵەکە بە شتێکیتر بگۆڕن.

**دووەم: پابەندیی قابیل و ناقابیل بە پاشئاسەوار:**

١– پابەندیی قابیل بە پاشئاسەوار: لە پیادەکردنەکانی:

أ– گرێبەندی وەستێنراو پاش مۆڵەت، بە پاشئاسەوار لە مێژووی پەیدابوونیەوە ماف و پابەندی لێدەکەوێتەوە.

ب– گرێبەندی هەڵوەشاوە پاش ئەوەی گرێبەندەکە پاساوەکەی هەڵدەوەشێنێتەوە، بە پاشئاسەوار پابەندی لێدەکەوێتەوە و هەردوو گرێبەندوان دەگەڕێنەوە باری پێش هەڵوەشاندنەوەکە و هەریەکەیان پابەند دەبێ بە گێڕانەوەی ئەوەی لەلایەنی بەرانبەری وەرگرتووە.

٢– پابەندیی ناقابیل بە پاشئاسەوار: لە پیادەکردنەکانی: هەڵوەشاندنەوەی گرێبەندی لە جێبەجێکردن بەردەوام، یان هەڵوەشانەوەی. ئەو پابەندیانەی لە هەڵوەشاندنەوە (فسخ) یان هەڵوەشانەوە (الانفساخ) دەکەونەوە پاشئاسەواریان نیە، بەکرێگر پابەند نابێ بە گێڕانەوەی ئەو سوودانەی لە رابردوو لە سەرەختی

بەردەوامیی گرێبەندەکەدا دەستی کەوتون، هەروەك بەکرێدەریش پابەند نابێ بە گێڕانەوەی ئەو قیستە شایستانەی لەباتیی کرێکە وەریگرتوون.

**بەرهەمی دابەشکردنەکە:**

ئەم بەرهەمە لە کەوتنی هەموو ئەو پابەندیانەدا خۆ دەنوێنێ کە لەو گرێبەستانەی لە جێبەجێکردن بەردەوامن دەکەونەوە، لە ساتی هەڵوەشاندنەوە یان هەڵوەشانەوەوە تەنها بەنیسبەت ئایندەوە.

**سێیەم: پابەندیی قابیل بە گواستنەوە بۆ کەسیتر جا میراتگر (جێگرەوەی گشتی) بێ یان میراتنەگر (جێگرەوەی تایبەت) و ناقابیل بە گواستنەوە:**

١- ئەو پابەندیانەی قابیل بە گواستنەوەن بۆ کەسیتر و پیادەکردنەکانیان:

أ- **گواستنەوەی پابەندی لە ئەستۆیەکەوە بۆ ئەستۆیەکیتر**، وەك لە حەواڵەکردنی قەرزدا. حەواڵەکردنی قەرز بە رێکەوتن دەبێ لەنێوان کەسی قەرزار و کەسێکیتردا و بەوپێیە قەرزەکەی لەباتی هەڵدەگرێ، پێناسەیش دەکرێ بەوەی: گواستنەوەی قەرز و داواکردنیەتی لە ئەستۆی حەواڵەکارەوە بۆ ئەستۆی حەواڵە بۆسەرکراو.

بەدەربڕینێکیتر: رێکەوتنێکە لەنێوان قەرزدەر و کەسێکیتردا، بەوپێیە لە پابەندبوون بە دانەوەی قەرزەکەیدا جێی دەگرێتەوە، بەڵام ئەم حەواڵەیە بەکردەوە ناچێتە ئەستۆی قەرزدەرە حەواڵە بۆکراوەکە (المحال له) تا خۆی دانی پێدا نەنێت و پەسەندی نەکا، فەلسەفەی ئەوەیش جیاوازیی نێوان قەرزارێك و قەرزارێکیترە لە رووی متمانە و نیازپاکی و ئەمانەت و توانای دارایی و ئەو شتانەوە.

حەواڵەکردنی قەرزیش یان رەهایە یان سنووربەند:

**حەواڵەکردن رەها دەبێ**: ئەگەر قەرزارەکە قەرزدەرەکەی رەوانەی حەواڵە بۆسەرکراو کرد بەبێ بەستنەوەی بە دانەوەی قەرزەکە لەو قەرزەی لە ئەستۆیدایە یان ئەوماڵەی لەلایەتی، یان راسپاردەیەك یان ماڵێکی زەوتکراو. یان حەواڵەی کرد بۆ

سەر كەسێك هیچی لەسەری یان لەلای نەبێ. لەم شێوەیەی دوایدا حەواڵەكردنەكە بە بریكاری (وەكالەت) دێتە گونجاندن.

**حەواڵەكردن سنووریەند دەبێ** ئەگەر داوای كردبوو لەو قەرزە بدرێتەوە كە لە ئەستۆیدایە یان لەو ماڵەی ئەمانەت یان زەوتكراوە لەلای. شایانی باسە حەواڵەكار (قەرزاری ئەسڵی) بۆی نیە داوا لە حەواڵە بۆسەركراو بكا قەرزی قەرزدەرەكە بداتەوە مادام ئەمەی دوایی ئەو پابەندیەی بەگوێرەی حەواڵەكە بەرانبەر حەواڵە بۆسەركراو گرتوویەتیە ئەستۆ، ئەنجامی نەدابێ[1].

ب- **گواستنەوە بە مردن**: لە فیقهی لاتینی و ئەو یاسایانەی لەژێر كاریگەریدان كەسایەتیی میراتگر درێژكراوەی كەسایەتیی میراتدەر (مورث)ەكەیەتی، لەم روانگەوە میراتگر پابەندە بەدانەوەی قەرزەكانی میراتدەرەكەی نەك هەر لە سنووری ئەو میراتەی ماوەتەوە بەڵكو لە سامانی تایبەتی خۆیشی ئەگەر هاتوو میراتەكە بەشی ئەوەی نەدەكرد قەرزەكەی بەتەواوی پێ بدرێتەوە، هەروەك بۆی هەیە میراتەكە قبوڵ بكا بەمەرجی ژماردن، لەم حاڵەتەدا بەرپرسیارێتیەكەی لە سنووری ماڵە میراتیەكەدا قەتیس دەبێ، هەروەها بۆی هەیە هەموو میراتەكە رەت بكاتەوە، ئەوكاتە پابەندیەكانی میراتدەرەكەی بۆ ناگوێزرێتەوە[2]. ئەمە جیاواز لە شەریعەتی ئیسلامی و ئەو یاسایانەی لەژێر كاریگەریدان، كە نە لە رووی تاوانكاری نە لە رووی مەدەنیەوە كەسیتر بە بەرپرس لە كاری كەسیتر دانانێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾[3]. واتە كەسێكی بێتاوان بەرپرسیارێتیی كەسێكیتر، كە مافی كەسانیتری لەئەستۆدایە جا تاوانكاری بێ یان مەدەنی، هەڵناگرێ، لەبەرئەوەی لەم

---

[1] بروانە ئەم سەرچاوانە: یاسای مەدەنیی عێراقی (م/٣٣٩ و پاشتر)، میسری (م/٣١٥ و پاشتر)، سوری (م/٣١٥ و پاشتر)، لوبنانی (م/٣٠٣ و پاشتر)، لیبی (م/٢٩٠ و پاشتر)، ئوردنی (م/٣٩٣ و پاشتر) و ئەو یاسایانەیتر كە گواستنەوەی قەرزیان لەرێی حەواڵەكردنەوە چارەسەر كردوە.

[2] الأستاذ إسماعيل غانم، النظرية العامة للالتزام، مصادر الالتزام، ص٣٤٢ و پاشتر.

[3] سورة الأنعام/ ١٥.

شەریعەتەدا ئەستۆی هەر کەسێك لە ئەستۆی کەسێکیتر سەربەخۆیە، ئەمەیش بەلەدایکبوونی ئەو کەسە دەست پێدەکات و بە مردنی کۆتایی دێ.

لەم روانگەوە قەرزەکانی هەر قەرزارێك تا لەژیاندایە لەئەستۆی خۆیدایە و ماڵەکەی گەرەنتی ئەو قەرزانە دەبێ، پاش مردنیشی پابەندیەکە لە پابەندیەکی کەسیەوە کە پەیوەستە بەئەستۆی کەسی قەرزارەوە، دەگۆڕێ بۆ پابەندیەکی ماڵینە کە پەیوەندی بە خودی میراتەکەیەوە هەیە لەرووی کۆبەشی(الشیوع)ەوە وەك میرات و بەر لە جێبەجێکردنی وەسێت و دابەشکردنی بەسەر میراتگرەکاندا، لێی دەدرێتەوە. بۆیە پابەندیەکانی میراتدەر لە سنووری میراتەکەیدا نەبێ بۆ میراتگرانی ناگوێزرێتەوە و میراتگر مەگەر بە خۆبەخشی ئەگینا پابەند نابێ بەوەی قەرزەکانی ماڵی تایبەتی خۆی بداتەوە.

ئەگەر قەرزار مرد و ماڵێکی وای لەشوێن بەجێنەمابوو قەرزەکەی لێ بدرێتەوە، یان بەشی نەدەکرد، لە دارایی گشتی (گەنجینەی گشتی) دەدرێتەوە، ئەویش بەپێی رێسای (الغرم بالغنم) (واتە: رەنج بە گەنج)، لەبەرئەوەی دەوڵەت میراتگری هەر کەسێکە میراتگری نەبێ.

ج- **گواستنەوە بۆ جێگرەوەی تایبەت:** ئەوەی باسمان کرد سەبارەت بە جێگرەوەی گشتی بوو، کە ئەو کەسەیە بەپێی فیقهی لاتینی لە هەموو یان بەشێکی ئەستۆی داراییدا جێگەی پێش خۆی دەگرێتەوە، ئەمە میراتگری هەموو میراتەکە یان بەشێکیەتی، ئەویش پاش مردنی پێشینەکە دەبێ. بەڵام جێگرەوەی تایبەت ئەوەیە لە مافێکی ماڵینە لەسەر شتێکی دیاریکراو یان خاوەندارێتیی شتێکی دیاریکراودا جێگەی پێشینەکەی دەگرێتەوە[1].

نموونە لەبارەی گواستنەوە بۆ جێگرەوەی تایبەت، ئەوەیە ئەگەر کەسێکی قەرزار ئەو ماڵە رەهنکراوەی کە دەستەبەری قەرزی قەرزدەرە رەهنگرەکەیە بەبێ

---

[1] بڕوانە: الأستاذ أنور سلطان، النظرية العامة للالتزام، مصادر الالتزام، ص٣٢١.

مۆڵەتی ئەو فرۆشت، بەگوێرەی فیقهی ئیسلامی بۆ پاراستنی مافی قەرزدەرەكە دەبێ گرێبەندەكە لەسەر ڕەزامەندی ئەو بێ یان قەرزەكەی لە ماڵێكیتر بدرێتەوە، بەپێچەوانەی یاسا كە گرێبەندەكە بە كارپێكراو و لازم دادەنێ[1]. بەڵام قەرزدەری ڕەهنگر مافی چوونەپێش و بەدواداچوون و لێسەندنەوەی خاوەندارێتیی ئەو خانوبەرەیەی هەیە كە وەك دڵنیاییەك لە دەستی ئەو كەسەی ماڵە ڕەهنەكەی لەلایە ڕەهن كراوە[2].

ماڵە ڕەهنكراوەكە لە دەستی هەر كەسێكدا بێ، مافی مامەڵەپێوەكردنی هەیە، بەوەی لەڕێی زیادكردنی ئاشكراوە بیفرۆشێت و لە پارەكەی قەرزەكەی هەڵبگرێتەوە ئەگەر هاتوو قەرزارە ئەسڵیەكە ئامادە نەبوو یان نەیتوانی قەرزەكەی بداتەوە[3]، مەگەر ئەوەی ماڵەكەی لەدەستدایە بڕیار بدات قەرزەكە ببژێرێ، یان خانوبەرەكە لە ڕەهن پاك بكاتەوە یان دەستی لێ هەڵبگرێ. هەر كەسێك بەهەر هۆیەك لە هۆكان خاوەندارێتیی ئەو خانوبەرەیەی بۆ بگوێزرێتەوە، بە خانوبەرەكە لە دەستی ئەودایە.

**ڕەخنە لە ڕای یاسا:**

ڕای یاسا لە گواستنەوەی خاوەندارێتیی ڕەهنكراو بۆ جێگرەوەی تایبەت (الخلف الخاص) لەژێر باری ڕەهندا، لە چەند ڕوویەكەوە جێی ڕەخنەیە، لەوانە:

---

[1] مادەی (١/١٢٩٥) لە یاسای مەدەنیی عێراقی دەڵێ: (ڕەهنكار بۆی هەیە كاری فرۆشتن و هیتر لەو خانوبەرەیەدا بكا كە وەك ڕەهنی دەستەبەر (تأمین) خرلوەتە ڕەهن، ئەم ڕەفتارەیشی كار لە مافی ڕەهنگر ناكا).
میسری (م/١٠٤٦) و پاشتر، هەروەها یاسایتریش وایە.

[2] بڕوانە: یاسای مەدەنیی عێراقی (م/١٣٠٦) و پاشتر. میسری (م/١٠٥٦) و پاشتر، هەروەها یاسایتریش وایە.

[3] بڕوانە: یاسای مەدەنیی عێراقی (م/١٣٦٠) و پاشتر ، میسریش هەروا (م/١٠٥٦) و پاشتر.

أ- گوتنی ئەوەی مافی قەرزدەری رەهنگر لە بەرانبەر جێگرەوەی تایبەتدا دەڕوا، لەگەڵ حوججیەتی مافی ماڵێنەدا لێك دەدا، کە ئەم جێگرەوەیە بەشێوەیەکی یاسایی و رەوا بەدەستی دێنێ.

ب- ئەگەر گوتمان ئەسەری رەهنکردن (واتە بەندکردن) تەنها قەرزاری رەهنکار (الراهن) یان جێگرەوە گشتیەکەی (میراتگر) دەگرێتەوە، ئەوا پاش گواستنەوەی خاوەنداریێتیی رەهنکراوەکە بۆ جێگرەوە تایبەتەکە، رەهنەکە بەها زەمانەتکارانەکەی بۆ قەرزدەرە رەهنگرەکە لەدەست دەدات.

ج- لەوانەیە قەرزدەری رەهنگر بێ ئەهلیەت (نەشیاو)، یان شیان ناتەواو بێ، لەم حاڵەتەشدا هەڵوێستی لە بەرگریکردن لە مافی خۆی بەرێگەی بەدوواداچوون لاواز دەبێ، کە ئەمە لەوانەیە سەریکێشێ بۆ فەوتانی دەستەبەری قەرزەکەی.

لە روانگەی ئەم کەموکوڕیانەی رای یاسا و یاساناسەکانیەوە، بەناوی دادپەروەریەوە داوا دەکەم دەست بە بۆچوونی شەرعناسانی ئیسلامیەوە بگیرێ، کە پێی وایە فرۆشتنی رەهنکراو لەسەر مۆڵەتی قەرزدەری رەهنگر، یان دانەوەی قەرزە بە رەهن دەستەبەرکراوەکە، وەستاوە.

**٢- ئەو پابەندیانەی قابیل بە گواستنەوە نین بۆ کەسیتر، لەبەرئەوەی سروشتی بابەتەکەی قبوڵکردنی گواستنەوە رەت دەکاتەوە، لەوانە:**

أ- پابەندییە نادارایییەکانی هاوسەری: پابەندییە نادارایییەکانی هەریەك لە ژن و مێرد بەرانبەر یەکتر نە لەکاتی ژیان و نە لەکاتی مردنیاندا بۆ کەسیتر ناگوێزرێتەوە. هەر بە مردنی کەسی پابەند، چ ژنەکە بێ یان مێردەکە نامێنێ، وەك سەرجێییکردنی هاوسەری و خەڕۆبوون (المطاوعة) و باقیی پابەندییە نادارایییەکانیتر. (لە کوردەواریدا کاتێ نزا بۆ بەردەوامیی ژیانی هاوسەری بۆ ژن و مێردێك دەکرێ، پێیان دەوترێ: پیر و خەڕۆ بن-وەرگێڕ)

ب- پابەندیەکانی وەزیفە: بۆ وەرەسەی فەرمانبەرەکە ناگوێزرێنەوە.

ج- پابەندیەکانی سەرۆکایەتی: ئەمانە لەڕێی میراتەوە بۆ کەسیتر ناگوێزرێنەوە. سیستمی پاشانشینی و میرنشینی پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامین، لەبەرئەوەی بابەتی ئەم پابەندیانە کۆمەڵە تەکلیفێکن لەسەر بناغەی توانا و لێوەشاوەیی دامەزراون، نەك ماف بن تا لەڕێی میراتەوە بگوێزرێنەوە.

**بەرهەمی دابەشکردنەکە:**

دیاریکردنی بەرپرسیارێتیی کەسی پابەند و روونکردنەوەی ئەو ڕێگایانەی کەسی بۆ-پابەند مافی خۆی لە هەریەك لەو بابەتانەی باس کران، وەردەگرێتەوە.

**چوارەم: پابەندیی پێکەوەیی و پابەندیی سەرپشککاری و پابەندیی بریتی:**

**١- پابەندیی پێکەوەیی (تلازمی):** ئەوەیە بابەتەکەی کۆمەڵێ شت دەگرێتەوە کە پێویستە بەیەکەوە جێبەجێ بکرێن بەشێوەیەك، ئەستۆی کەسی پابەند بەبێ ئەنجامدانی هەموویان ئازاد نابێ، وەك بەشە زەروورییە پێکەوەکان کە هەندێکیان هەندێکیان تەواو دەکەن، بۆ نموونە ئەگەر خانوویەك فرۆشرا پێویستیەکانی ماڵەکەیش دەچنە ناو فرۆشتنەکەوە لەبەرئەوەی ئەوانە لە پێداویستیەکانی ماڵەکەن، بەهەمان شێوە ئەگەر کێڵگەیەك فرۆشرا دینەمۆ و ناعور و شتەکانیتریش دەچنە ناویەوە، لەبەرئەوەی لە شتە پێویستەکانی کێڵگەکەن.

لەم رووەوە حوکمەکانی پابەندیی سادە بەسەر پابەندییە پێکەوەییەکانیشدا جێبەجێ دەبێ[1].

**٢- پابەندیی سەرپشککاری (التخییری):** ئەوەیە بابەتەکەی کۆمەڵە شتێك دەگرێتەوە کە بە ئەنجامدانی یەکێکیان ئەستۆی پابەند بەتەواوی پاك یاخود ئازاد دەبێ[2]. لە تایبەتمەندیەکانی ئەم جۆرە پابەندییە ئەوەیە هەردوو گرێبەندوان

---

[1] یاسای مەدەنیی لوبنانی (م/٥٤) و(م/٥٥).

[2] سەرچاوەی پێشوو (م/٥٦).

بژاردەی ئەوەیان هەیە ماوەیەکی دیاریکراو دیاری بکەن، بەلام ئەسلْ ئەوەیە ئەو بژارەیە بۆ قەرزارەکە بیْ مەگەر یاسا یان ریْکەوتنی هەردوولا شتیْکیتری دانابیْ[1].

بەلام پابەندیەك ئەو ریْگایانەی بژارەی دیاریکردن لەپیْناویاندا دانراوە، تیْدا روون نەکرابیْتەوە، بەتالْ دەبیْ. بژارەکەیش هەر ئەوەندەی بە گریْبەندوانەکەیتر راگەیەنرا دادەمەزریْ.

پاش هەلْبژاردنەکە، وا دادەنریْ وەك ئەوەی پابەندیەکە پابەندیەکی سەرپشککارانە نەبوویْ، بەلْکو پابەندیەکی سادە و خاوەن یەك بابەت بیْ[2].

ئەگەر ئەو کەسەی سەرپشککردن (بژارە)ی بۆ چەسپیوە بەر لەوەی هەلْبژیْریْ مرد، مافی سەرپشکبوونەکە بۆ وەرەسەکەی دەگویْزریْتەوە لە سنووری ئەو ماوەیەی سەرپشککردنەکەدا کە ماوەتەوە.

ئەستۆی کەسی پابەند بە ئەنجامدانی یەکیْك لەو دوو شتەی بەلْیْنیان پیْدراوە، ئازاد دەبیْ، بەلام ناتوانیْ کەسی بۆ–پابەند ناچار بکا کە بەشیْك لەمیان و بەشیْك لەویتریان وەربگریْ.

**٣- پابەندیی بریْتی (البدلی):** ئەوەیە بابەتەکەی هەر لە سەرەتاوە یەك شت بیْ، لەگەلْ سەرپشککردنی قەرزار کە بە بریْتیەك قەرزەکەی بداتەوە، بەوەیش ئەستۆی ئازاد دەبیْ[3].

تەنها پابەندیی ئەسلْی، نەك بەدەلی، بابەتی پابەندییەکەیە و ئەویش سروشتەکەی دیاری دەکا[4].

---

[1] مەدەنیی لیبی (م/٢٦٢).

[2] مەدەنیی مەغریبی (فەسلْی ١٤١ و پاشتر).

[3] مەدەنیی عیْراقی (م/٣٠٢)، مەدەنیی میسری (م/٢٧٨)، مەدەنیی سوری (م/٢٧٨)، مەدەنیی لیبی (م/٢٦٥)، مەدەنیی لوبنانی (م/٦٨-٦٩)، مجموعة الأعمال التحضيرية للمدني المصري ٣/٤٦ و پاشتر.

[4] مەدەنیی عیْراقی (م/٣٠٢).

**لە پیادەکردنەکانی:** قەرزدەر و قەرزکەر لەسەر ئەوە رێك بکەون کە ئەمەی دووایی مافی هەبێ لەباتی ئەو چەردە پارەیەی لێی قەرز کردوە، برێتی-ەکی وەك خانوو یان زەویەکی دیاریکراو و شتێکی لەو شێوەیەی بداتێ، بەوە برە پارەکە بابەتی ئەسڵیی پابەندیەکەیە، خانوو و شتیتریش بەدیلەکەیە. هەروەها دەبێ هەموو ئەو مەرجانەی پێویستە لە بابەتی پابەندیەکەدا هەبن لە بابەتە ئەسڵیەکەدا هەبن، ئەگینا پابەندیەکە بەتاڵ دەبێ[1].

**بەرهەمی دابەشکردنەکە:**

ئەم دابەشکردنە گرنگیەکی گەورەی هەیە لەم رووانەوە:

أ- سەبارەت بە پابەندیی پێکەوەیی، گرنگیەکە یەکلاکردنەوەی کێشەی نێوان دوو گرێبەنوانەکەیە، بەشێوەیەك ئەوەی عورف بە وابەستە بە شوێنی گرێبەندەکەی دادەنێ، بە بەشێکی گرێبەندەکە دابنرێ ئەگەرچی راشکاوانە لەناویشیدا باس نەکرابێ، ئەوەیش بە عورفێکی وابەستە دانانرێ ناچێتە ناو گرێبەندەکەوە تا ناوەکەی راشکاوانە لە گرێبەستەکەدا باس نەکرێ.

ب- سەبارەت بە پابەندیی سەرپشککارانە، ئەگەر شوێنی جێبەجێکردن (محل التنفیذ) لەسەر یەکێك لەو شتانەی شوێنی گرێبەندەکە، بابەتی پابەندیەکەیە، جێبەجێ بکرێ، بۆ ئازادکردنی ئەستۆ ئاسانتر و فراوانتر دەبێ.

ئەگەر هەندێ لەو شتانەی تێیاندا سەرپشك کراوە فەوتان، بواری جێبەجێکردن لە باقیەکەیدا دەمێنێتەوە و وەك جێبەجێکردنی پابەندیی سادە دەبێ.

ج- پابەندیی برێتی ئاسانکاری تێدایە بۆ کەسی پابەند بۆ جێبەجێکردنی پابەندیەکەی، لەبەرئەوەی بوارێکی فراوانی بۆ کارکردن لەسەر بابەتی پابەندیەکە لەبەردەمدایە، لەگەڵ پێدانی بژارەیەك کە بۆی هەبێ بە برێتیەك (قەرزی) بابەتە ئەسڵیەکەی پابەندیەکە بداتەوە.

---

[1] الأستاذ السنهوري/ الوسيط، ١٧٩/٣.

د- بۆ-پابەند مافی ئەوەی نیە بەبێ ڕەزامەندیی پابەند داوای (پابەندیی بڕیتــی) لێبکا، یان یەکێك لەو دوانە بخاتە بەردەمی.

هـ- ئەگەر لە (پابەندیی بڕیتی)دا بابەتە ئەسڵیەکە بەهۆیەکی بێگانە فەوتا، بـەوە پابەندیەکەیش بەسەر دەچێ، جیاواز لەوەی ئەگەر شتە بەدیلەکە بفەوتێ. بەڵام لـە (پابەندیی سەرپشککاری)دا ئەگەر یەکێك لە دوو شتەکەی بابەتی پابەندیەکە فەوتا، پابەندیەکە بەسەر ناچێ بەڵکو دەگۆڕێ بۆ پابەندیی سادەی خاوەن یەك بابەت[1].

ز- لە پابەندیی بڕیتی-دا هەمیشە هەڵبژاردن بۆ کەسی پابەنـدە، بەپێچـەوانەی سەرپشککاری کە تێیدا لەوانەیە هەڵبژاردن بـۆ کەسـی پابەنـد یـان بـۆ-پابەنـد یـان کەسێکی بێگانە بێ.

ح- جێبەجێکردنی پابەندیی بڕیتی پاشئاسەواری نیە و هەر لە سەرەتاوە ناگۆڕێ بۆ پابەندیی سادە، ئەمەیش بەپێچەوانەی پابەندیی سەرپشککاری.

[1] الوسیط، ٢/١٧٩ و پاشتر.

# باسی چوارەم:
# جۆرەكانی پابەندی
# لەڕووی جێبەجێكردنەوە

ئەم جۆرەیان ئەم سێ شێوەیەی خوارەوە لەخۆدەگرێ:

١- تاكلایەنە و چەندلایەنە.

٢- قابیل و ناقابیل بە بەشبوون.

٣- هاوكارانە و ناهاوكارانە (التضامني وغير التضامني).

**یەكەم: بە لەبەرچاوگرتنی لایەنەكان دابەش دەبێ بۆ پابەندیی تاكلایەنە و پابەندیی چەندلایەنە:**

١- **پابەندیی تاكلایەنە (انفرادي):** ئەوەیە هەر بۆ لایەنێك لە دوو لایەنەكە دەبێ، بەشێوەیەك یەكێكیان قەرزدەر و ناقەرزار دەبێ و ئەویتریان قەرزار و ناقەرزدەر دەبێ، وەك لە بەخشیندا (الهبة)، كە بەخشەر پابەند دەكا بە رادەستكردنی بەخشراوەكە بە پێبەخشراو، لەكاتێكدا پێبەخشراو بەهیچ پابەند نابێ.

٢- **پابەندیی چەندلایەنە یاخود ئاڵوگۆڕانە:** ئەوەیە هۆكەی ماف و پابەندیی بەرانبەر دروست دەكا، وەك گرێبەندی فرۆشتن كە تێیدا فرۆشیار پابەند دەكرێ بە رادەستكردنی فرۆشراوەكە و كڕیاریش پابەند دەبێ بە دانی نرخەكەی.

**بەرهەمی دابەشکردنەکە:**

گرنگیی ئەم دابەشکردنە لە زۆر بواردا دەردەکەوێ، لەوانە:

١- زەرورەتی بوونی هۆ لە پابەندیی تاکلایەنە بەنیسبەت یەکێك لە دوو لایەنەکە (قەرزار)، نەك ئەویتریان (قەرزدەر)، بەپێچەوانەی پابەندیی چەندلایەنە کە پێویستە هۆکە بۆ هەمووان هەبێ.

٢- ئیمکانی هەڵوەشاندنەوەی هۆی پابەندی لە پابەندیی چەندلایەنەدا ئەگەر یەکێك لە دوو لایەنەکە (قەرزار) ملی نەدا بەوەی پابەندیی خۆی جێبەجێ بکا بەهۆی ڕێکەوتنێکی ناڕاستەوخۆ (ضمني) ئەگەر لایەنەکەیتر پابەندیی خۆی جێبەجێ دەکرد یان ئامادە بوو جێبەجێی بکا، بەپێچەوانەی پابەندیی تاکلایەنە کە بواری ئەم ئەنجامەی تێدا نیە.

٣- ئەگەری خۆبواردن و جێبەجێنەکردن لە پابەندیی چەندلایەنەدا ئەگەر هاتوو یەکێك لە لایەنەکانی پابەندییەکەی تێکدا، بەپێچەوانەی پابەندیی تاکلایەنە.

**دووەم: پابەندیی جێبەجێکردنی دەستبەجێ و پابەندیی جێبەجێکردنی بەردەوام:**

١- **پابەندیی جێبەجێکردنی دەستبەجێ (فوري التنفيذ):** ئەوەیە کات هیچ ڕۆڵێکی لە دیاریکردنی بابەتەکەیدا نیە یا ڕۆڵیشی لە دیاریکردنی وادەی جێبەجێکردنەکەیدا هەبێ، وەك گرێبەندی فرۆشتن.

٢- **پابەندیی جێبەجێکردنی بەردەوام (مستمر التنفيذ):** ئەوەیە کات لە دیاریکردنی بابەتەکەیدا ڕۆڵی هەیە (بابەتی هۆکە)، هەربۆیە کات ڕەگەزێکی جەوهەری دەبێ تێیدا نەك ڕەگەزێکی لابەلایی، وەك گرێبەندی بەکرێدان.

**بەرهەمی دابەشکردنەکە:**

گرنگیی ئەم دابەشکردنە لەم خاڵانەدا دەردەکەوێ:

١- لە پابەندیی جێبەجێکردنی دەستبەجێدا هەڵوەشاندنەوەی هۆکەی دەبێتە مایەی گێڕانەوەی حاڵەتەکە بۆ باری پێش پەیدابوونی هۆکە، بەپێچەوانەی

پابەنــدیی جێبــەجێکردنی بــەردەوام کــە هەڵوەشــاندنەوەی هۆکــەی هــیچ کاریگەریــەکی بــۆ رابــردوو نــابێ بــەڵکو بــۆ ئایندەیــە، لــە مێــژووی هەڵوەشــاندنەوەکەوە. بـۆ نموونــە گرێبەنــدی فرۆشــتن لەبــەر پاســاوێك هەڵوەشــێنرایەوە، پێویســتە لەســەر هــەردوو لایەنەکــەی چــیبیان لــەویتر وەرگرتــووە بیگێڕنــەوە جــا بەعــەینی بــێ یــان برێتــی، بەپێچــەوانەی هەڵوەشاندنەوەی گرێبەندی بەکرێدان، کـە تێیـدا بـەکرێگر پابەنـد نـابێ بـە گێڕانــەوەی ئــەو ســوودەی بــەر لــە هەڵوەشــاندنەوەکە دەســتی کــەوتووە، لەبەرئــەوەی ئــەوە لــەڕووی کرداریــەوە مەحاڵــە، بــەڵکو جێکــەوت یــاخود ئەسەرەکە تەنها بۆ ئایندە دەبێ.

٢- کایــەی جێبــەجێکردنی بــیردۆزی بارودۆخــە لــەناکاوەکان تــەنها گرێبەســتی جێبەجێکردنی بەردەوامە نەك جێبەجێکردنی دەستبەجێ، بۆ نموونە ئەگــەر بەلایەکی بێئامان رێگەی لەوە گرت گرێبەستی بەڵێندەرایەتی جێبەجێ بکرێ، ئەوە بۆ قەرزار (بەڵێندەر)ەکە تاقەت پڕوکێن دەبێ، بۆیە پێویسـتە چـاو بـە پابەندیەکەدا بخشێنرێتەوە، بۆ بەرزکردنەوەی رێژەی پابەندیی قەرزدەرەکـە یان دابەزاندنی پابەندیی قەرزارەکە بەشێوەیەك ئەو بارە گرانە لەسـەر شـانی قەرزارەکە هەڵبگرێ، لەکاتێکدا بارودۆخی لەناکاو هـیچ کاریگەریـەکی لەسـەر جێبەجێکردنی پابەندی جێبەجێکردنی دەستبەجێ نیە، با جێبەجێکردنەکـە دواخراویش بێ.

٣- لەڕووی پێویستیی عوزرپێدانەوە، ئەسڵ واجبوونیەتی لە پابەندیەکدا هۆکەی جێبــەجێکردنی بــەردەوام بــێ مەگــەر ئــەوەی بــە یاســا یــان بــە رێکــەوتن هەڵاوێردراوە، بەپێچەوانەی پابەندیـەك هۆکـەی جێبـەجێکردنی دەسـتبەجێ بخوازێ، فەلسەفەکەیشی ئەوەیـە ئەسـڵ تێیـدا ئەوەیـە هـەموو دواخسـتنێك زیانبەخشــە لەبەرئــەوەی کــاتێکی لــەکیس دەدا کــە ناگەڕێنرێتــەوە. لــەم رووەیشەوە قەرزار بەگوێرەی سروشتی هۆکەیەوە عوزری بەدەستە.

**سێیەم: پابەندیی دیاریكردن و پابەندیی شیمانەیی:**

١- **پابەندیی دیاریكردن (تحدیدی):** ئەوەیە هەریەك لە دوو لایەنەكەی دەتوانن لەكاتی گرێدانی هۆكەیدا ئەو ئەندازەیەی بڕدوویەتی و ئەوەی دەیداتە لایەنەكەیتر دیاری بكەن، با دوو ئەندازەكەیش هاوتا نەبن وەك گرێبەندی بەكرێدان، بەپێچەوانەی پابەندیی شیمانەیی.

٢- **پابەندیی شیمانەیی (احتمالی):** ئەوەیە ئەندازەی بابەتی پابەندیەكانی هەر لایەنێك لەسەر ڕووداوێك دەوەستێ كە دڵنیا نیە و لەبارێدایە زیاد یان كەمی بكا وەك لە گرێبەندی بیمەكردنی ژیاندا، لەم گرێبەندەدا هەردوو لایەن ناتوانن لەكاتی بەستنیدا ڕادەی ئەو قیستانە بزانن كە بەشایستەیی دەكەونە ئەستۆی بیمەكراو یان ڕادەی پابەندیەكانی بیمەكار لەكاتی دەستپێكردنی دانەوەی قیستەكاندا، چونكە لەوانەیە تەمەنی بیمەكراو درێژ ببێتەوە و ژمارەی قیستەكانی بیمەكردنەكە زیاد بكا، لێرەیشەوە بڕی ئەو پارەیەی دەیدات زیاتر بێ، لەوانەیشە زوو بمرێ و چەند قیستێكی كەم بدات.

**بەرهەمی دابەشكردنەكە:**

ئەم بەرهەمە لەوەدا دێتە بەرچاو كە یەكێك لە دوو لایەنە گرێبەندوانەكە بواری نابێ بە ناوی مافخوران (الغبن) تانە لە گرێبەندەكە بدات، لەبەرئەوەی هەر خواستی سروشتی گرێبەندەكە خۆی لەخۆیدا مافخورانە، لەبەرئەوەی لە گرێبەندە نادڵنیاكانە (عقود الغرر)، واتە گرێبەندێكە قازانج و زیانی نادیارە[1].

---

[1] بڕوانە مامۆستامان دكتۆر سلیمان مرقس، أصول الالتزامات، ص٤١ و پاشتر.

**چوارەم: پابەندیی هاوكارانە و پابەندیی تاكلایەنە (ناهاوكارانە)[1]:**

١- پابەندیی هاوكارانە: هاوكاری چ لەنێوان قەرزدەرەكاندا بێ یان قەرزارەكان بە یەكێك لە رێگەكانی گەرەنتیكردنی قەرز دادەنرێ و لە كەفالەت بەهێزترە، لەبەرئەوەی لە كەفالەتدا ئەگەر كەفیلەكە لەگەڵ قەرزارەكە هاوكار نەبێ قەرزدەر مافی ئەوەی نیە یەخەی كەفیلەكە بگرێ مەگەر پاش بێئومێدبوون لە وەرگرتنەوەی قەرزەكەی لە قەرزارە ئەسڵیەكە، بەپێچەوانەی هاوكاربوون كە قەرزدەر بۆی هەیە بگەرێتەوە بۆ هەردوو قەرزارە هاوكارەكە و داوای هەموو قەرزەكە بكاتەوە، هەروەك دانەوەی هەموو قەرزەكە لەلایەن قەرزارەوە بە هەر قەرزدەرێكی هاوكار، ئەستۆی لای هەمووان ئازاد دەكا[2]. هاوكاربوون وەسفێكە رێگرە لە دابەشبوونی ماف ئەگەر قەرزدەران فرە بوون، یان دابەشبوونی پابەندبوون ئەگەر قەرزاران فرە بوون[3].

پابەندیی هاوكارانە لەوانەیە لەنێوان قەرزدەران، یان لەنێوان قەرزاراندا بێ.

أ- هاوكاری لەنێوان قەرزدەراندا لەوانەیە بەپێی رێكەوتنێك یان دەقێكی یاسا بێ، ئەم هاوكارییە بەدەگمەن لە كاردا روودەدا، لەبەرئەوە تەنها باس لە هاوكاری لەنێوان قەرزاراندا دەكەین, لە گرنگترین هۆكانیشی ئەمانەن:

١- بوونی فرە فزولی لە فوزالەدا: ئەگەر فزولیەكان فرە بوون هاوكاری لەنێوانیاندا لە بەرپرسیارێتی لەو كارەی ئەنجامی دەدەن، دروست دەبێ. ئەم حاڵەتەیش نایەتەدی تەنها لەكاتی فرەییدا نەبێ لە یەك كاردا، جا ئەگەر هەر فزولیەك كارێكی سەربەخۆی وەرگرت، هاوكاری لەنێوانیاندا دروست نابێ[4].

---

[1] یاسای مەدەنی عێراقی (م/٣٠٢ و پاشتر)، میسری (م/٢٧٩ و پاشتر)، سوری (م/٢٧٩ و پاشتر)، لیبی (م/٢٦٦ و پاشتر)، لوبنانی (م/١١ و پاشتر).

[2] الوسیط ١٩٩/٣ و پاشتر.

[3] الأستاذ أنور سلطان، هەمان سەرچاوە، ص٢٥٩ و پاشتر.

[4] الدكتور عبدالمنعم فرج الصدة، مصادر الالتزام، ص٦٣٢.

٢- هاوکاری لەنێوان بەرپرسان لە کارێکی زیانبەخشدا: پێکەوە پابەند دەبن بە قەرەبووکردنەوەی زیانەکە و بەرپرسیارێتیەکە لەنێوانیاندا یەکسان دەبێ، مەگەر قازی بەشی هەریەکەیان لە قەرەبووەکەدا دەستنیشان بکا[١].

٣- هاوکاری لە بەرپرسیارێتیدا لەنێوان ئەندازیاری تەلارسازی و بەڵێندەردا لەو روخانە تەواوەتی یان رێژەییەی لە ماوەیەکی دیاریکراودا، کە یاسا یاخود رێکەوتن دیاری دەکا، لەو بینا و باڵەخانانەی دروستیان کردون، روویداوە[٢].

٤- هاوکاری لەنێوان کۆمپانیا هەرەوەزیەکاندا[٣].

٥- هاوکاری لەنێوان خاوەن کۆمپیاڵە و ئەوەی قبوڵی دەکات و دەریدەخا[٤].

٦- هاوکاری لەو غەرامەیەی لە یەك تاواندا بەسەر تۆمەتباردا دەسەپێنرێ[٥].

٢- پابەندیی ناهاوکارانە: ئەمە لە پابەندییە تاکلایەنە و فرەییەکاندا ئەسڵە و تێیدا یەکێك لە دوو پابەندەکە بەلای ئەوانیترەوە هاوکاری نیە.

**بەرهەمی دابەشکردنەکە:**

لەنێوان پابەندیی هاوکارانە و ناهاوکارانەدا، ئەو ئەدایەی هەریەك لە قەرزارە هاوکارەکان پێوەی پابەند دەبن، چەند ئەنجامێکی لێ دەکەوێتەوە، گرنگترینیان ئەمانەن:

---

[١] یاسای مەدەنیی میسری (م/١٦٩).

[٢] مەدەنیی میسری (م/٦٥١).

[٣] یاسای بازرگانیی میسریی بەرکار (م/٢٢).

[٤] یاسای بازرگانیی میسریی بەرکار (م/٢٢).

[٥] یاسای سزاکانی میسریی بەرکار م/٤٤٤).

١- دانەوەی قەرزەكە لەلایەن یەكێك لە قەرزارە هاوكارەكانەوە ئەستۆی ئەوانیتریان پاك دەكاتەوە، و مافی ئەوەیشی هەیە هەریەكەیان چەندی بەردەكەویْ لێیان وەربگرێتەوە.

٢- قەرزدەر بۆی هەیە دلوای قەرزەكە لە هەریەك لە قەرزارە هاوكارەكان بكا جا هەموو پێكەوە بن یان بە تاك تاك، بە لەبەرچاوگرتنی باروبۆخی تایبەتی هەریەكەیان. ئەگەر یەكێك لە قەرزارەكان مرد هاوكاریەكە لەنێو میراتەكەی و باقیی قەرزارە هاوكارەكاندا هەر دەمێنیْ.

٣- هەریەك لە قەرزارە هاوكارەكان مافی ئەوەی هەیە دەست بە رێگەكانی لەخۆ دوورخستنەوە (دفوع)ی هەمان قەرزەوە بگرن، وەك باسكردن لە بەتاڵیی هۆی پابەندییەكە، یان بە جێبەجێنەكردن یاخود فەوتانی ماڵەكە (بابەتی پابەندیەكە)، یان كۆنبوون. بەڵام ئەو قەرزارەی قەرزدەر دلوای دانەوەی قەرزەكەی لێدەكا بۆی نیە رێگەكانی دلواكردنی بەبەتاڵدانانی تایبەت بە قەرزارانیتر بكاتە بەلگە[1].

٤- هەریەك لە قەرزاران بۆیان هەیە لەگەڵ قەرزدەرەكە لەسەر نوێكردنەوەی قەرزەكە رێك بكەون، ئەوەیش نەمانی قەرزە هاوكارانەكەی لەلایەن باقیی قەرزارەكانەوە لیْ دەكەوێتەوە[2].

**پێنجەم: پابەندیی قابیل و ناقابیل بە دابەشبوون:**

١- **پابەندیی ناقابیل بەدابەشبوون:** گرنگیی ناقابیلبوونی پابەندی بۆ دابەشبوون دەرناكەویْ تا قەرزار یان قەرزدەرەكان چەندانە (متعدد) نەبن، چ هەر لە سەرەتاوە لەكاتی دروستكردنی پەیوەستییە یاساییەكەدا، یان پاش ئەوە

---

[1] یاسای مەدەنیی میسری (م/٢٨٥).

[2] مجموعة الأعمال التحضيرية في المدني المصري، ج٣/ ص٦٤.

ئەگەر میراتگرانی ئەو كەسەی خۆی بەتەنها لایەنێك بووە لە دوو لایەنەكەی پابەندیەكە، چەندانە بوون.

بەڵام ئەگەر نە قەرزدەر و نە قەرزار چەندانە نەبوون، ئەوا پێویستە بەبێ بەشكردن پابەندیەكە بەتەواوی بەجێ بگەیەنرێ، جا چ بابەتەكەی قابیل بە دابەشبوون بێ یان ناقابیل بە دابەشبوون نەبێ. قەرزدەریش ئەوكاتە بۆی هەیە بە دانەوەی بەشەكی رازی نەبێ. پابەندی لەم حاڵەتانەدا قابیل بە دابەشبوون نیە:

أ- ئەگەر پابەندیەكە لەسەر بابەتێك هاتبوو كە بەسروشت دابەشكردن قبوڵ ناكا، وەك ئەسپ.

ب- ئەگەر لەو ئامانجەی هەردوو لایەنی گرێبەندوان مەبەستیان بووە دەركەوت، بەهۆی ئەو ئامانجەوە، نابێ پابەندیەكە وەك مافێك لە مافەكانی هاوشانی (الارتفاق) كە دابەشبوون قبوڵ ناكا، بە بەشبەشی جێبەجێ بكرێ.

ج- ئەگەر نیەتی هەردوو گرێبەندوان بۆ دابەشنەبوون چوو، بەوەی بابەتەكە ئاماژەیە بۆ مەرجێكی ناراستەوخۆ بۆ رەتكردنەوەی بەشبەشكردنی دانەوە.

٢- **پابەندیی قابیل بە دابەشبوون:** ئەم جۆرەیان لە جێبەجێكردنی پابەندییە داراییەكاندا باوە.

**بەرهەمی دابەشكردنەكە:**

١- ئەگەر ئەو قەرزارانەی لە پابەندیەكی ناقابیل بە دابەشبووندا چەندانە (واتە زیاتر لە كەسێك) بوون، هەریەكەیان پابەند دەبێ بە دانەوەی قەرزەكەی بەتەواوی.

٢- ئەو قەرزارەی تەواوی قەرزەکەی بژاردوە مافی ئەوەی هەیە هەریەك بەگوێرەی بەشی خۆی لە باقیی قەرزارەکانی وەربگرێتەوە، مەگەر لە بارودۆخەکەوە شتێکیتر جیا لەوە دەربکەوێ[1].

**شەشەم: لە رووی کران و مەحالبوونەوە جێبەجێکردنی پابەندی بۆ مومکین و مەحالْ دابەش دەبێ:**

١- جێبەجێکردنی کرلو (ممکن)، ئەوەیە بەربەستێك نایەتە بەردەم بەدیهاتنی کە ملکەچی ئیرادەی مرۆڤ نەبێ. زۆریەی جێبەجێکردنەکان لە مامەڵە داراییەکاندا لەم جۆرەن.

٢- جێبەجێکردنی مەحالْ (مستحیل)، ئەوەیە بەهۆی بەڵایەکی بێئامان یان شتێکی لەو شێوەوە قەرزار و کەسیتر مەحاڵە پابەندیەکانیان جێبەجێ بکەن، بەشێوەیەك خۆبەخۆ بەپێی یاسا هۆی پابەندیەکە و لەوێیشەوە خودی پابەندیەکە هەڵدەوەشێتەوە، وەك فەوتانی فرۆشراو بەر لە وەرگرتنی، بەبێ ئەوەی قەرزارەکە یان کەسێکی بێگانە کەمتەرخەمی هەبووبێ.

**بەرهەمی دابەشکردنەکە:**

بەرهەمی ئەم دابەشکردنە لەوەدایە ئەگەر جێبەجێکردنەکە لە توانای قەرزاردا بوو و بەبێ پاساوێکی یاسایی نەیدەدایەوە، ئەوا نەدانەوەکەی شکاندنی پابەندیەکەیەتی. ئەگەر تێکدانی پابەندیی گرێبەندکردنەکە بوو رێوشوێنی بەرپرسیارێتیی گرێبەندانە لەدژی دەگیرێتە بەر، ئەگەر تێکدانی پابەندیەکی گشتیش بوو رێوشوێنی بەرسیارێتیی کەمتەرخەمی بەرانبەری وەردەگیرێ. هەروەها وەك یاسا مەدەنیەکان روونیان کردۆتەوە، ئەگەر ملنەدانی بۆ جێبەجێکردن تێکدانی هەردوو پابەندیەکە (پابەندیی تایبەت و پابەندیی گشتی)

---

[1] القانون المدني المصري (م/٣٠١).

بوو، ئەو ڕێوشوێنانە گرێبەندانە و کەمتەرخەمانە دەبن، بەوەیش لە هەموو ئەو لێکەوتانەی لە تێکدانی پابەندیەکە دەکەونەوە بەرپرس دەبێ.

بەڵام لە حاڵەتی مەحاڵیی جێبەجێکردندا، هۆی پابەندیەکە خۆبەخۆ هەڵدەوەشێتەوە، پاشان ئەو پابەندیەیش لێی کەوتۆتەوە نامێنێ. ئەو ئەنجامە گرنگەی لەم هەڵوەشانەوە دەکەوێتەوە بریتییە لە دیاریکردنی ئەو لایەنەی لێکەوتەکان (تبعات)ی ئەوە دەگرێتە ئەستۆ. پێشتر بەدرێژی روونمان کردەوە کە هەریەك لە قەرزدەر و قەرزار نیوە بەنیوە ئەم ئەنجامانە دەگرنە ئەستۆ، لەبەرئەوەی دادپەروەری ئەوە دەخوازێ.

ئەوەمان بەدرێژی لە شوێنی خۆیدا روون کردۆتەوە و ئەم بیرۆکەی نیوە بەنیوەیەمان بەلاوە راستتر بوو، بۆیە پێویست ناکا لێرەدا دووبارە بکرێتەوە.

# بەشی سێیەم

## پابەند (قەرزار)

پابەند دووەم رەگەزە لە شەش رەگەزەکەی پابەندی جا چ کەسێکی راستەقینە (سروشتی) بێ کە مرۆڤە، یان کەسێکی حوکمی (مەعنەوی) بێ وەك دەوڵەت و دامەزراوە ئابووریەکان وەك کۆمپانیاکان، دامەزراوە مرۆییەکان وەك نەخۆشخانەکان، یان دامەزراوە ئاینیەکان وەك مزگەوتەکان.

پابەندیی مەدەنی دوو جۆرە (تایبەت و گشتی).

أ- پابەندیی مەدەنیی تایبەت:

لەئەستۆگرتنی ئەنجامدانی ئەرکێکە بابەتەکەی مافێکی تایبەتە کە یاسا بەشێوەیەکی راستەوخۆ دەیپارێزێ، وەك لە پابەندیی گرێبەندانەدا. تێکدانی، بەرپرسیارێتیی گرێبەندانەی لێ دەکەوێتەوە، وەك پابەندیی فرۆشیار لە گرێبەندی فرۆشتندا بە رادەستکردنی فرۆشراو بە کڕیار و پابەندیی کڕیار بە دانی نرخەکەی بە فرۆشیار، هەروەها وەك پابەندیی بەخشەر لە ئیرادەی تاکەکەسیدا بە رادەستکردنی بەخشراوەکە بە پێبەخشراو.

ب- پابەندیی مەدەنیی گشتی:

ئەوەیە بابەتەکەی مافێکی تایبەتی کەسێکە کە یاسا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ (واتە بە رێسایەکی گشتیی یاسایی) دەیپارێزێ، تێکدانی ئەمەیش بەحوکمی یاسا بەرپرسیارێتیی کەمتەرخەمی لێ دەکەوێتەوە، وەك پابەندیی هەموو مرۆڤێك بە زیان نەگەیاندن بە کەسیتر بەبێ پاساوێکی شەرعی.

هۆی ئەم پابەندییە ئەوەیە کەسی پابەند ئەندامێکی کۆمەڵگەیە و ئەسڵ وایە کەسێکی باش بێت و زیانبەخش نەبێ بۆ ئەوانەی لە ژیانی رۆژانەدا هەڵسوکەوتیان لەتەکدا دەکا.

شیانی پابەند (أهلية الملتزم):

ئەم شیانە بەپێی جیاوازیی ئەو قۆناغانەی مرۆڤی پێدا تێدەپەڕێ جیاواز دەبێ. مرۆڤ لە رووی دروستبوونەوە پێش لەدایکبوون بە حەوت قۆناغدا تێدەپەڕێ، لەرووی شیانیشەوە پاش لەدایکبوون بە سێ قۆناغدا تێدەپەڕێ.

**یەکەم: قۆناغەکانی پێش لەدایکبوون:**

قورئانی پیرۆز قۆناغەکانی دروستبوون پێش لە لەدایکبوون روون دەکاتەوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَد خَلَقنَا الإنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ، ثُمَّ جَعَلنَاهُ نُطفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ، ثُمَّ خَلَقنَا النُّطفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقنَا العَلَقَةَ مُضغَةً فَخَلَقنَا المُضغَةَ عِظَاماً فَكَسَونَا العِظَامَ لَحماً ثُمَّ أَنشَأنَاهُ خَلقاً آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحسَنُ الخَالِقِينَ﴾[1]

بەگوێرەی ئەم ئایەتە پیرۆزە کە زانستی نوێ راستیی ناوەرۆکەکەی و ئەو قۆناغانەی باسی کردوون سەلماندوە، قۆناغەکانی بەر لە لەدایکبوون ئەم حەوت قۆناغەن:

١- قوڕێکی خۆشەکراو (سلالة من طين): واتە پوختەیەك لە قوڕ بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، لەبەرئەوەی لە سپێرمی نێر و هێلکۆکەی مێ پێکدێ کە هەردووکیان لە پوختەی خوێن پێکدێن، خوێنیش لە پوختەی مادە خۆراکیەکان (خواردن و خواردنەوەکان) پێکدێ، ئەوانیش لە تێکەڵەی ئاو و خۆڵ پێکهاتوون کە پێی دەوترێ قوڕ (سلالة الطين).

٢- ئۆقرەگرتن لە ئۆقرەگایەکی بەهێزدا (قرار مكين) کە رەحمی دایکە پاش پیتاندن لەنێوان هەردوو رەگەزی سپێرم و هێلکۆکەدا.

٣- گۆڕانی تنۆکە ئاوە پیتێنراوەکە (النطفة)، بۆ خوێنی پندر یاخود بەستوو (علقە).

٤- گۆڕانی خوێنە بەستووەکە بۆ گۆشتپارە (مضغة)، (پارچە گۆشتێك بەئەندازەی پارویەك کە مرۆڤ دەیجوێ).

٥- گۆڕانی گۆشتپارە بۆ ئێسك.

٦- داپۆشینی ئێسکەکە بەگۆشت وەك بەرگێك.

٧- گۆڕان لە دۆخی بێگیانەوە بۆ ژیان.

---

[1] سورة المؤمنون/ ١٢-١٤.

لە سەرجەم ئەم قۆناغانەی پێش لەدایکبوونیشدا لەبەر نادیاری پێی دەوترێ کۆرپەلە (جنین).

شایانی باسە هەرچی لە (ج ن) پێکبێ، بەو شتانە دەوترێ کە پەنامەکی و شارلوەین وەك (جن، جنان، جنین، جنة) و ئەو شتانە. (ئەو مانای نادیاربوونە پەیوەندی بە وشەی (جنین)ی عەرەبیەوە هەیە. بەرانبەرە کوردیەکە ئەو مانای نادیاریەی تێدا نیە–وەرگێڕ).

**دووەم: قۆناغەکانی پاش لەدایکبوون:**

١– قۆناغی نەفامی (نەشیان) (عدم الاهلیة).

٢– قۆناغی ناتەواویی شیان (نقص الاهلیة).

٣– قۆناغی کامڵبوونی شیان (کمال الاهلیة).

حوکمەکانی ئەم قۆناغانە لە سێ خاڵی سەرەکیدا بەدرێژی باس دەکەین:

١– شیانی پابەندییە مەدەنیەکان و بەریەستەکانی.

٢– شیانی پابەندییە تاوانکاری (جنائی)یەکان و ڕێگریەکانی.

٣– بەراوردکردن لەنێوان پابەندیی مەدەنی و پابەندیی تاوانکاری (جنائي)دا.

# باسی یەکەم:
# شیانی پابەند و بەربەستەکانی

بۆ هەریەکەیان خواستێکی سەربەخۆ تەرخان دەکرێ.

## خواستی یەکەم:
## شیانی پابەند

**یەکەم:** پابەند بەر لە لەدایکبوونی شیانی ناتەواوی واجببوونی هەیە (کەسایەتیەکی یاسایی ناتەواوە)، شیانی بەدەستهێنانی هەندێ مافی دارایی هەیە کە پێویستیان بە قبوڵکردن نیە وەك وەسێت و وەقف و پشکی میرات، لەبەرئەوەی ئەم پشکە بەپێی نێرینە و مێینە جیاوازە، وەك ئیحتیات زیادەکەیانی بۆ دادەنرێ، هەروەها دروستە لەلایەن بەخێوکەرەکەی یان هەر کەسێکیترەوە بیمەی ژیانی بکرێ کە پێی دەوترێ مەرجدانان بۆ بەرژەوەندیی کەسیتر (الاشتراط لمصلحة الغیر).

هەروەها هەندێ مافی دارایی بۆ دەپارێزرێ وەك پارێزگاریکردن لە ژیانی و دەستدرێژی نەکردنە سەری بە لەباربردن، بۆیە نابێ کۆرپەلە لەبار ببرێ مەگەر کاتێك مەترسی بۆ سەر ژیانی دایکی دروست بکا، ئەگەر لیژنەیەکی پزیشکیی پسپۆڕ بوونی ئەو مەترسیەی سەلماند، پێویستە لەبار ببرێ، ئەویش بەپێی ئەو رێسایەی دەڵێ "ئەگەر بەرژەوەندیەکی حاشاهەڵنەگر لەگەڵ بەرژەوەندیەکی شیمانەییدا تێکگیران، یەکەمیان پێش دووەمیان دەخرێ". بەرژەوەندیی ژیانی دایك بەشەرع و یاسا

شتێکی حاشاهەڵنەگرە، بەپێچەوانەی بەرژەوەندیی کۆرپەلەکە کە ئەگەر و نەگەرە و لەوانەیە بە مردوویی لەدایك ببێ.

کۆرپەلە پێش لەدایکبوون شیانی یاسایی بۆ بەدەستهێنانی ئەو مافانەی باس کران هەیە، هەروەها شیاوە کە (بۆ–پابەند) بێ بەڵام شیاو نیە بۆ ئەوەی پابەند بێ. پێویستە بەخێوکەر (ولي) یاخود سەرپرس (وصی)ێکی بۆ دابنرێ بۆ پاراستنی ئەو مافانە، بەپێچەوانەی ئەوەی لە فقیە و یاسادا جێگیر بووە کە پێش لەدایکبوون ئەوە پێویست نیە.

ئەگەر کۆرپەلەکە لەدایك بوو ئەو مافانەی بۆ جێگیر دەبن، ئەگەر پاش ئەوەیش مرد مافەکان بۆ میراتگرەکانی دەگوێزرێنەوە. بەڵام ئەگەر بە مردوویی لەدایك بوو وا دادەنرێ وەك ئەوەی ئەو مافانە لە بنەڕەتدا نەبووبن.

**دووەم:** شیانی تەواوی واجبنوون بۆ پابەند. مرۆڤ پاش لەدایکبوونی شیانی تەواوی واجببوون (أهلیە الوجوب الكاملة)ی بۆ دەچەسپێ، واتە گونجانی بۆ ئەوەی کۆمەڵێ مافی هەبێ و کۆمەڵێ پابەندی لەسەر بێ. گونجانی بۆ بەدەستهێنانی مافەکان روون و ئاشکرایە و بەخێوکەر یاخود سەرپرس مافی ئەوەی هەیە نوێنەرایەتیەکی یاسایی یان قەزایی بکا، بەوەی لە رووی وەبەرهێنانیانەوە ئەو کار و هەڵوسکەوتانە بکا کە پەیوەندییان بە مافە داراییەکانیەوە هەیە.

هەرچی پابەندیەکانی و دانانیەتی بە پابەند، چوارچێوەکەی تەسکە، چونکە لە هەندێ حاڵەتی سنووردارا پابەند دەبێ، لەوانە:

أ– ئەگەر خاوەن شیانی تەولو و ساماندار بوو، پێویستە نەفەقەی ئەوانە بکێشێ کە نەفەقەیان لەسەریەتی، بۆ نموونە ئەگەر باوك یان دایکی مرد و لە رێی میراتەوە سامانێکی دەستکەوت، نەفەقەی ئەویتریانی لەسەرە کە زیندووە ئەگەر نەدار بوو.

ب– ئەو وەلیەی ماڵەکەی وەبەر دێنێ، ئەو پابەندیانە دەگرێتە ئەستۆ کە لەو وەبەرهێنانە دەکەونەوە و لەبریی ئەو بەجێیان دێنێ.

ج- زەکات لە سامانەکەیدا واجبە ئەگەر دوو مەرجی تێدا بوو: یەکەمیان بوونی مەرجەکانی زەکات لە سامانەکەیدا. دووەم: وەبەرهێنان و گەشەپێدانی ئەو ماڵە لەرێی نوێنەرەکەیەوە، لەبەرئەوەی ئەگەر وەبەرنەهێنرێ و گەشەی پێ نەدرێ زەکات وردە وردە سەری دەخوات. ئەوەیش زیانی پێدەگەیەنێ، زیانیش بەبێ پاساوێکی شەرعی لەڕووی شەرع و یاساوە ناپەسەندە.

مرۆڤ لەکاتی لەدایکبوونیەوە تا تەواوکردنی حەوت ساڵ لە بابەتە مەدەنیەکان و تەواوکردنی نۆ ساڵ لە بابەتە تاوانکاریەکاندا بە نەشیاو دادەنرێت و پێی دەوترێ منداڵی بچوکی نەفام (الصغیر غیر الممیز)، حوکمیشی حوکمی شێتە و هەموو هەڵسوکەوتەکانی بەتاڵن، چ ئاڵوگۆڕ بن یان بەخشین، چ وەلیەکە ڕێگەیان پێ بدات یان نەیدات.

هەروەها بەر لە تەواوکردنی تەمەنی نۆ ساڵ، ئەگەر تاوانێکی ئەنجامدا داوای جەزایی لەسەری بەرز ناکرێتەوە، بەڵام ئەگەر هاتوو ماڵی کەسیتری لەناو برد، لەسەر بنچینەی بەرپرسیارێتیی کەمتەرخەمی -کە رەگەزەکانی (کاری نارەوا + زیان + پەیوەندیی هۆیی) بەدیهاتوون- پێویستە لە ماڵەکەی بۆی ببژێردرێ و پابەندە بە قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانەی گەیاندویەتی. فیقهی ئیسلامی و ئەو یاسایانەی لەژێر کارگەریدان ئەمەیان پەسەند کردوە، لەوانە یاسای مەدەنیی ئوردنی (م/٢٥٦) و عێراقیی کارپێکراو (م/١٩١) . ئەم مادەیەی دوایی دەڵێ:

١- "ئەگەر منداڵێکی بچوکی بەفام (ممیز) یاخود نەفام (غیر ممیز) یان ئەوەی لە حوکمیاندایە ماڵی کەسێکیتری لەناو برد، پێویستە لە ماڵەکەی بۆ ببژێردرێ.

٢- ئەگەر نەتوانرا لە ماڵی ئەو کەسەی زیانەکەی لەدەست قەوماوە جا منداڵێکی نەفام یان شێتێك بێ، دادگە بۆی هەیە بەخێوکەر (وەلی) یان سەرپەرشت (القیم) یان چاودێر (وەصی)ەکەی پابەند بکا بە دانی برە قەرەبووەکە، بەو مەرجەی پاشتر مافی ئەوەی هەبێ ئەوەی بژاردویەتی لەو کەسەی زیانەکەی گەیاندوە وەربگرێتەوە".

شەرحکارانی یاسای مەدەنیی عێراقی پێیان وابوو تێکگیرانێك لەنێوان ئەم مادەیە و مادەی (١٨٦)دا هەیە کە دەڵێ:

"ئەگەر کەسێك ماڵی کەسێکی تەلەف کرد یان نرخەکەی بەراستەوخۆ، یان بەبوونە هۆ کەم کردەوە، دەستەبەر (زامن)ی زیانەکە دەکا ئەگەر ئەو زیانگەیاندنەی بەئەنقەست، یان بە دەستدرێژی کردبێ".

ئەم گومانە لەسەر ئەو بنچینەیەیە کە کەسی نەشیاو دەرکی تەواوی نیە و بەو هۆیەوە هەڵەی نادرێتە پاڵ کە توخمێکی سەرەکییە لە بەرپرسیارێتیی کەمتەرخەمیدا، چونکە ئەوەی دەرکی نەبێ هەڵەی نیە و لێرەیشەوە ناکرێ بە دەستدرێژی یان ئەنقەستکردن وەسف بکرێ.

ئەم گومانە هەڵەیە لەبەر دوو هۆ:

یەکەمیان هەڵەیە لە لێکدانەوەی دەستدرێژی (تعدي)دا، گومانیان وابوو تەعەدی هەڵەیەکە، بە تێکدانی ئەرکێکی مەدەنی لەبارێکدا کەسی تێکدەر دەرك بەو تێکدانە بکا. هەڵە بەم مانایە لەسەر دوو رەگەز دەوەستێ: ماددی و مەعنەوی.

أ- رەگەزی ماددی: تێکدان (اخلال)ی ئەرکێکی یاسایی.

ب- رەگەزی مەعنەوی: تێکدەر بزانێ ئەو ئەرکێکی یاسایی تێکداوە.

ئەوە روونە کە نەشیاو (عديم الاهلية) رەگەزی مەدەنی تێدا نیە.

هۆی دووەم: کاریگەربوونی ئەوانە بە فیقهی خۆرئاوایی کە بۆ ساغکردنەوەی هەڵەکردن بوونی ئەو دوو رەگەزەی سەرەوە بەرمەرج دادەنێ. بەوەیش تێکەڵیان لەنێوان هەڵە لە فیقهی ئیسلامیدا کە بوونی رەگەزە مەعنەویەکە لە هەڵەدا بەمەرج دانانێ، لەگەڵ هەڵە لە فیقهی خۆرئاواییدا، کردوە.

ئەوە روونە کە یاسای مەدەنیی عێراقی -وەك باسمان کرد- لەژێر کاریگەریی فیقهی ئیسلامیدایە.

لە روانگەی ئەم کاریگەریەوە رەگەزەکانی بەرپرسیارێتیی کەمتەرخەمی (کاری ناڕەوا + زیان + پەیوەندیی هۆیی) لە دیدی فیقهی ئیسلامی و ئەو یاسایانەی لەژێر

کاریگەریدان بەردەستە و مەبەست لە لەفزی (تعدي) ئەنجامدانی کارێکی ناڕەوا دەبێ بەڕەهایی، جا چ بکەری ئەو کارە بەوەی زانیبێ یان نا.

شایانی باسە هیچ بەربەستێك لە بەربەستەکانی شیان کار لە شیانی تەواوی واجببوون ناکا، چونکە مرۆڤ لە لەدایکبوونیەوە تا مردنی ئەگەر تووشی بەربەستێك لە بەربەستەکانی شیان بوو کە لە شوێنی خۆیدا روون دەکرێتەوە، هیچ کاریگەریەکی لەسەر مافە دارایی و نادارایییەکانی ئەوانەی تووشی ئەو بەربەستە بوون، نابێ.

بۆ نموونە ئەگەر کەسێك لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیانیدا شێت بوو ژنەکەی هەر بە ژنی دەمێنێتەوە و ماڵ و سامانەکەیشی هەر بە ملکی دەمێننەوە. هەروەها پابەندییە مەدەنیەکانی بەردەوام دەبن، هێندە هەیە لەم حاڵەتەدا بەخێوکەر یان سەرپەرس یان چاودێرێکی بۆ دادەنرێ بۆ پاراستنی مافەکانی و جێبەجێکردنی پابەندیەکانی و وەبەرهێنانی ماڵ و سامانەکەی، کە لە توخمەکانی بەرهەمهێنانن وەك پارە و خانوبەرە (ماڵی نەگوێزراوە).

## دووەم: شیانی ناتەواوی ئەنجامدان (أهلية الاداء الناقصة):

شیانی ئەنجامدان بریتییە لە شیانی مومارەسەکردنی مافەکان لەرێی بەکارهێنانیانەوە و دەبن بە دوو بەشەوە: شیانی ناتەواوی ئەنجامدان و شیانی تەواوی ئەنجامدان.

شیانی ناتەواوی ئەنجامدانی مرۆڤ لە بابەتە مەدەنیەکاندا پاش تەواوکردنی تەمەنی حەوت ساڵی بۆ تەواوکردنی هەژدە ساڵ جێگیر دەبێ[1]. لە پرسە سزاییەکاندا شیانی ناتەواوی کەسەکە بۆ لێپرسینەوەی سزایی پاش تەواوکردنی نۆ ساڵی و پێ خستنە ناو دە ساڵ جێگیر دەبێ[2].

---

[1] لە یاساکانی عێراقدا (م/١٠٦) تەمەنی پێگەیشتن و شیانی تەواو پاش تەواوکردنی هەژدە ساڵ و چوونە ناو نۆزەدە ساڵە.

[2] قانون رعاية الأحداث رقم (٧٦) لسنة ١٩٨٣ المادة (٤٧).

شایانی باسە شیانی ناتەواو لە بەرپرسیارێتیی سزاییدا ماوەکەی بەپێی جیاوازیی یاساکان دەگۆڕێ[1].

**جۆرەکانی رەفتاری شیان ناتەواو:**

رەفتارەکانی شیان ناتەواو لەڕووی لێکەوتنەوەی ئاسەوارە شەرعی و یاساییەکانەوە بۆ سێ جۆر دابەش دەبن، کە بریتین لەمانە:

١- **حوکمی بەخشینەکان (التبرعات):** هەموو بەخشینەکانی شیان ناتەواو بەتاڵە جا وەلیەکەی مۆڵەتی پێدابێ یان نەدابێ، لەو ڕووەوە ئەوە زیانێکی رووتە، لەبەرئەوەی بەخشەر بەبێ بەرانبەر شت بەویتر دەدا. ئەمە جگە لە وەسێت کە دروستە ئەگەرچی لە بەخشینەکانیشە، ئەویش لەبەر دوو هۆ:

یەکەمیان ئەوەیە وەسێتکەر تا پاش مردنی خاوەندارێتیی ئەو شتە لەدەست نادات کە وەسێتی کردوە بدرێتە کەسێکیتر، بۆیە رەفتارەکەی بە زیانێکی رووت دانانرێ. دووەمیان ئەوەیە کەسی شیان ناتەواویش وەك شیان تەواو پێویستی بە پاداشت هەیە لە رۆژی دواییدا.

٢- **حوکمی ئەو رەفتار (تصرف)انەی لەنێوان سوود و زیاندا دەسوڕێنەوە:** ئەو رەفتارانەی شیان ناتەواو کە لەنێوان سوود و زیان یان زەرەر و قازانجدا دەسوڕێنەوە، دادەمەزرێن، بەڵام ئاسەوار (ماف و پابەندی)یان لێناکەوێتەوە و لەسەر مۆڵەتی ئەو کەسە دەوەستن کە مافی مۆڵەتدانی هەیە، ئەگەر مۆڵەتیدا لە مێژووی دامەزرانیەوە ئاسەوارەکانی لێدەکەوێتەوە، ئەگەر مۆڵەتیشی نەدا وا دادەنرێ وەك ئەوەی لە بنەڕەتدا هەر نەبووبێ، ئەویش بۆ چاودێریکردنی بەرژەوەندیی کەسی شیان ناتەواو و تووشنەبوونی بە زیانی ماڵی لەلایەك و رێزگرتنی ئیرادەی لەلایەکیترەوە.

---

[1] بۆ نموونە یاسای سزاکانی لیبي (م/٨٠) والجزائري (م/٤٩)، شیانی ناتەولو لە بەرپرسیارێتیی سزاییدا پاش تەولوکردنی سیازدە ساڵ و چوونە ناو چواردە دەبێ.

ئەگەر بچوك (مندالٚ)ی بەفام پازدە سالٚ تەمەنی تەولو کرد، وەلیەکەی بۆی هەیە بە مۆلەتی دادگە برێك لە مالەکەی رادەست بکات و بەمەبەستی تاقیکردنەوەی رێگەی بازرگانیکردنی پێبدا، مۆلەتەکەیش رەها (مطلق) دەبیٚ یان سنووریەند (مقید). ئەگەر ئەو وەلیەی مۆلەتی بە مندالەکە داوە مرد یان وازی لە بەخێوکردنی هێنا، مۆلەتەکەی بەتالٚ نابێتەوە[1].

شایانی باسە یاسادانەری عێراقی لە مادەی (٣/أ)ی یاسای چاودێریی ناکاماندا[2] وای داناوە هەر کەس تەمەنی پازدە سالی تەواو کرد و بە مۆلەتی دادگە ژنی هێنا، شیان (ئەهلیەت)ی تەواوە. بەلام قەزای عێراقی ئەوەی بەوە لێکداوەتەوە کە لە بابەتە داراییەکانی پەیوەست بە هاوسەرگیریدا پیادە دەکریٚ.

بەلام دەقەکە بەرەهایی هاتووە، رەهایش بە رەهاییەکەی وەردەگیریٚ تا بەلگەیەك پەیدا نەبیٚ جیاواز لەوەی لیٚ بخوێنرێتەوە، بەروالەت هیچ بەلگەیەکی وایش لەئارادا نیە. ئەگەر ژن و مێرد بە مردن یان تەلاق لێك جیابوونەوە، ناگەرێنەوە بۆ ناتەواویی شیان، لەبەرئەوەی مافێکی بەدەستهاتووە.

٣- **شیان تەولو:** هەر کەسێك بگاتە تەمەنی پێگەیشتن بەوەی تەمەنی هەژدە سالٚ تەولو بکات و خاوەنی توانا عەقلیەکانی بیٚ، شیانی ئەوە بەدەست دێنیٚ سوود لە تەواوی مافە مەدەنیەکانی وەربگریٚ و بەرپرسیارێتیی سزایی و مەدەنی بگرێتە ئەستۆ.

شایانی باسە پێوەرەکانی جیاکردنەوەی هەردوو قۆناغەکە (قۆناغی گۆران بۆ شیانی ناتەواو و گۆران بۆ شیانی تەواو)، لە رووی فەلسەفی و مەنتیقیەوە پێوەری ناماقولن، چونکە گۆرانی مرۆڤ لە کەسێکی بیٚ فامەوە بەر لە دوا رۆژی سالی حەوتەم، بۆ فامکردن و شیان ناتەواو لە یەکەم رۆژی سالی هەشتەمەوە عەقلی ساغ قبولی ناکا، ئاخر عەقلی ساغ چۆن ئەوە قبولٚ دەکا مرۆڤ لەنێوان بەرەبەیان و

---

[1] مادەی (٩٨) لە یاسای مەدەنیی عێراقیی بەرکار.

[2] ژمارە (٧٨)ی سالی ١٩٨٠.

چێشتەنگاوێکدا لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکیتری جیاواز لە دروست و نادروستیی ڕەفتارەکان و ڕاستی و ناڕاستیی ئاسەوارەکاندا، بگۆڕێ.

لەو شتە بەرهەستانەی مشتومڕ هەڵناگرن ئەوەیە هەندێ خەڵك دەچنە ناو تەمەنی هەشت ساڵی یان زیاتر و هێشتا ناتوانن سوود و زیان و قازانج و زەرەر لێك جیا بکەنەوە. لەوانەیشە لە حەوت ساڵیدا ئەو توانای جیاکاریەیان هەبێ.

پاش ئەوەی جیهان لەڕووی تەکنەلۆژیەوە پەرەی سەندوە و دۆزینەوە پزیشکی و تەکنیکییە نوێکان گەیشتنە لوتکە، ئیتر کاتی ئەوە هاتووە واز لەم پێوەرە کلاسیکیانە بهێنرێ، تا ڕادەی پێگەیشتنی عەقڵی بەشەری و هێزی دەرککردنی بزانرێ، شانبەشانی دۆزینەوەکانی بواری نەخۆشی و تاوان لەڕێی دەزگا نوێکانەوە.

بۆ نموونە لە ڕابردوودا لە چین بۆ دۆزینەوەی پەیوەندیی تۆمەتبار بەو تاوانەی پێی تۆمەتبار کرابوو، هەندێ دانەوێڵەیان دەخستە ناو دەمی بۆ ماوەی چەند خولەکێك و پاشان دەریاندەهێنا، ئەگەر دانەوێڵەکە وشك دیار بووایە دەکرایە بەڵگە لەسەر ئەوەی تۆمەتبارەکە پەیوەندی بەو تۆمەتەوە هەیە ئاراستەی کراوە، لەبەرئەوەی لەو حاڵەتەدا لیکرژێنەکان لە دەردان دەوەستن. پاش ئەوە ئەم نەریتە گۆڕا و لەڕێی پەرەسەندنی زانستیەوە دەزگای دۆزینەوەی درۆ بەکار هات.

# خواستی دووەم:
# بەربەستەکانی شیان
## (عوارض الاهلیة)

پێشتر باسمان کرد کە بەربەستەکانی شیانی پابەندی (عوارض أهلیة الالتزام) هیچ کاریگەرییەکی ئەرێنی یان نەرێنییان لەسەر شیانی واجببوون نیە. ئەگەر مرۆڤ لە هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی تەمەنیدا شێت بوو، ئەم شێتییە هیچ کاریگەرییەکی لەسەر مافە مەدەنی و پابەندییەکانی نابێ، بەڵکو کاریگەری تەنها لەسەر شیانی ئەنجامدان بەهەردوو جۆرەکەی (ناتەواو و تەواو)ەوە دەبێ، بگرە هەندێ (لەو بەربەستانە) کاریگەرییان تەنانەت لەسەر ئەم دوو جۆرەیش نیە، وەك نەخۆشی مردن.

بەربەستەکانی شیانی کەسی پابەند لە رووی بوون یان نەبوونی رۆڵی ئیرادە لە روودانیدا، بۆ بەربەستە ئیرادیەکان کە پێیان دەوترێ بەدەستهاتوو وەك زۆرلێکردن و سەرخۆشی + نائیرادیەکان کە پێیان دەوترێ ئاسمانیەکان وەك شێتبوون، دابەش دەبن.

هەروەها ئەم بەربەستانە لەرووی پەیدابوونەوە بۆ خودی (وەك تەمەن بچوکی) و لابەلایی (وەك شێتی و دەبەنگی) دابەش دەبن، وەك لە خوارەوە روون کراوەتەوە:

### یەکەم: ئەو بەربەستە نائیرادیانەی کاریگەرییان لەسەر شیانی ئەنجامدان هەیە بە هەردوو جۆرەکەیەوە (تەواو و ناتەواو):

١- **شێتبوون**: نەخۆشیەکە تووشی مرۆڤ دەبێ و کێشە و کەموکوڕی لە توانای عەقڵیدا دروست دەکا، کە بەهۆی ئەو توانایەوە دەتوانێ سوودبەخش و زیانبەخش و کاری جوان و ناشیرین لێك جیا بکاتەوە، هەروەها ئاکام و ئەنجامی باشە و خراپەی ئەو کارانە دەزانێ کە دەیانکا. کاریگەریی ئەم بەربەستە ئەوەیە هەردوو جۆرەکەی

شیانی ئەنجامدان ناهێڵێت و لە هەموو شتێکدا وەك منداڵی نەفامی لێدێ، هەروەها بەر لەوەیش شیانی بەرپرسیارێتیی سزایی ناهێڵێ، ئەوەیش دەبێتە ڕێگر لەبەردەم لێپرسینەوەی سزاییانەیدا ئەگەر لەکاتی ئەنجامدانی تاوانەکەدا شێت بوویێ.

پشت بەخوا لە باسی دووەمدا بەدرێژی باس لە کاریگەریی شێتبوون لەسەر کارە تاونکاریەکان دەکەین.

کەواتە مامەڵە مەدەنیەکانی شێت لە بەخشین و ئاڵوگۆڕەکان بەتاڵن، جا وەلی ڕێگەی پێدابن یان نا.

٢- **تەمەن بچوکی** (الصغر): ناونانی ئەم جۆرە بە بەریەست لەڕووی مەجازەوەیە ئەگینا لەڕاستیدا خودییە و لەگەڵ پەیدابوونیدا پەیدا دەبێت و بەدڵنیاییەوە لەگەڵ پێخستنە ناو تەمەنی فامکردندا نامێنێ، بەڵام بەر لەم تەمەنە لە هەموو ئەو شتانەی باسمان کرد وەك شێت دەبێ.

٣- **لەهۆشخۆچوون**: نەخۆشیەکە لە مێشکدا ڕوو دەدات و هێزە بزوێنەر و بزانەکان پەك دەخا، بەڵام عەقڵ لە بنچینەوە لەناو نابات، بەڵکو لە حاڵەتی لەهۆشخۆچووندا ئیفلیجی دەکا.

٤- **خەوتن**: سستبوونێکی سروشتیانەیە لە هەندێ کاتی ڕێکدا لە مرۆڤ ڕوودەدات و کەسەکە هیچ کاریگەریەکی نیە لەسەر ئەوەی لەکاتی خەوتندا لێی ڕوو دەدات.

حوکمی ئەم دوو بەریەستەیش لەڕووی ئاسەوارە شەرعی و یاساییەکانەوە هەمان حوکمی شێتبوون و بچوکییە.

٥- دەبەنگی یاخود سالۆحەیی (العتە): نەخۆشیەکی نائیرادییە تێکچوونێك لە عەقڵدا دروست دەکات و خاوەنەکەی قسە تێکەڵ دەکا، هەندێکیان لە قسەی کەسانی ژیر دەچن و هەندێکیشیان لە قسەی کەسانی شێت. بەم مانایە دوو جۆری دەبێ:

یەکێکیان دەرك و فام (تمیین)ی نامێنێ و حوکمیشی حوکمی شێت دەبێ لەوەی باسمان کرد.

دووەمیان فامی بەتەولوی لەدەست نادات، بەڵام ئەو توانای دەرککردنە لەدەست دەدا کە کەسانی پێگەیشتووی ئاسایی هەیانە، ئەوەی تووشی ئەمە دەبێ حوکمی منداڵی بەفام (الممیز)ی هەیە و بەخشینەکانی بەتاڵن جا وەلیەکەی رێگەی پێ دابێ یان نەیدابێ، بەڵام ئاڵوگۆڕەکانی بەڕاست دادەنرێن و دادەمەزرێن و لەسەر مۆڵەتی ئەو کەسە دەوەستن کە مافی مۆڵەتپێدانی هەیە، ئەگەر مۆڵەتی پێدا ئاسەوارەکانی بە پاشئاسەوار بەرهەم دێنێ، ئەگەریش مۆڵەتی نەدا وەك ئەوە وایە هەر نەبووبێ.

شایانی باسە منداڵی بچوك و شێت و دەبەنگ لەبەر خودی خۆیان دەستبەندی واتە حیجریان لەسەرە[1].

**دووەم: ئەو بەربەستانەی کار تەنها کار لە شیانی تەواوی ئەنجامدان دەکەن نەك ناتەواو:**

لەوانە بێئەقڵی (السفه): سووکیەکە لە عەقڵدا تووشی مرۆڤ دەبێت و پاڵی پێوە دەنێ بۆ کردنی شتی وا کە پێچەوانەی عەقڵی ساغ و شەرع و یاسایە، سەرباری مانەوەی ئەسڵی گرێبەندەکە وەك خۆی.

بە ترازووی شەرع و یاسا هەر کەس ماڵەکەی شپرزە (تبذیر) بکا، با لە کاری خێریشدا بێ بە بێئەقڵ دادەنرێ، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تُؤْتُواْ السُّفَهَاء أَمْوَالَكُمُ الَّتِي جَعَلَ اللّهُ لَكُمْ قِيَاماً﴾[2]. بۆیە دادگە دەستبەندی (حیجر)ی دەخاتە سەر (واتە دەسەڵاتی بەکارهێنانی ماڵەکەی لێ دەسەنێتەوە) و بە رێگە پەسەندکراوەکان دەستبەندیکردنەکە رادەگەیەنرێ[3].

---

[1] مادەی (٩٤) لە یاسای مەدەنیی عێراقیی بەرکار.

[2] سورة النساء/ ٥.

[3] مادەی (٩٥) لە یاسای مەدەنیی عێراقی بەرکار.

**سێیەم: ئەو بەربەستانەی بەهیچ شێوەیەک کار لە شیان ناکەن بەڵام هەڵسوکەوتی مرۆڤ سنووردار دەکەن:**

گرنگترینیان ئەمانەن:

**١- نەخۆشیی مەرگ:** ئەو نەخۆشییەیە بەپێی راپۆرتی لیژنەی پزیشکیی پسپۆڕ عادەتەن سەری لە مردنەوە دەردەچێ، وەك نەخۆشیی شێرپەنجە و ئایدز لەم سەردەمەدا. دیارە زانست و پزیشکی تائێستا نەیتوانیوە چارەسەرێك بۆ ئەم دوو نەخۆشییە بدۆزنەوە كە شوێنەواریان بنبڕ بكا.

ئەوە روونە ئەم نەخۆشییە هیچ كاریگەرییەكی لەسەر عەقڵ و دەرككردنی نەخۆشەكە نیە، بەڵام هەڵسوكەوتی سنووردار دەكا. هەر هەڵسوكەوتێكی نەخۆش كە خۆی پێویستی پێی بێ وەك خەرجیكێشانی خۆی و ئەوانەی خەرجییان لەسەریەتی و كار لە مافەكانی خاوەن قەرز و میراتگران نەكا، بە راست و كارپێكراو و بەرهەمهێنی لێكەوتە شەرعی و یاساییەكانی دادەنرێ، بەبێ ئەوەی پێویستی بە مۆڵەتی كەس لە میراتگران یان قەرزەدەرەكان هەبێ. جگە لەمانە، باقیی هەڵسوكەوتەكانی لەسەر مۆڵەتپێدانی خاوەن ماف لە قەرزدەر و میراتگرەكان دەوەستێ.

٢- قەرزێك ماڵی قەرزارەكە بەتەواوی دەگرێتەوە: رەفتاری قەرزار پاش ئەوەی لەلایەن دادگەوە دەستبەندی دەخرێتە سەر ، لەسەر مۆڵەتی ئەو كەسانە دەوەستێ كە لەو هەڵسوكەوتانەی زیانیان پێدەگا لە خاوەن قەرز و واریس و كەسانی لەو شێوەیە. ئەگەر دەستبەندیكراو (حیجر لەسەر)، بە ویستی خۆی قەرزەكەی نەدایەوە ماڵەكەی دەفرۆشرێ تا قەرزەكەی پێ بدرێتەوە، جگە لەو شتانەی كە لە پێویستییە بنەڕەتیەكانی ژیانی ئەو كەسەن.

# باسی دووەم:
# پابەندیی تاوانکاری و ڕێگرەکانی

توێژینەوەی ئەم بابەتە بەسەر دوو خواستدا دابەش دەبێ، یەکەمیان تەرخان دەکرێ بۆ پێناسەکردنی پابەندیی تاوانکاریانە و دووەمیان بۆ ڕێگریەکانی بەرپرسیارێتیی تێکدانی ئەو پابەندییە.

## خواستی یەکەم:
## پابەندیی تاوانکاری و مەرجەکانی

پابەندیی تاوانکاری (جنائي): بریتییە لە گرتنەئەستۆی دەرەنجامەکانی تێکدانی ئەرکێکی یاسایی کە یاسای تاوانکاری لەسەر بناغەی بنەمای شەرعیەت کە دەڵێ (لاجريمة و ولاعقوبة الا بنص) (نە تاوان و نە سزا، بەبێ دەق نیە) دیاری کردوە.

زانایانی یاسا ئەم تێکدان (الاخلال)ەیان ناوناوە (هەڵەی تاوانکاری) و مەرجە کە هەردوو ڕەگەزی (ماددی و مەعنەوی) تێدا بێ.

ڕەگەزی ماددی: تێکدانی واجبێکی یاساییە کە یاسای سزاکان دیاری کردوە.

ڕەگەزی مەعنەوی: دەرککرنی کەسی تێکدەر (المخل)ـە بەوەی واجبێکی یاسایی سزاییانەی تێکداوە.

**مەرجەکانی پابەندیی سزایی:**

**یەکەم: لە گرنگترینیان ئەوەیە مرۆڤێکی بەفامی ژیری هەڵبژێر (مختار) بێ.**

مەرجە (رەگەزی) تێکدەر مرۆڤ بێ. لەرووی تاوانکارییەوە لەنێو بوونەوەرە زیندووەکان و بێگیانەکاندا لێپرسینەوە تەنها لە مرۆڤ دەکرێ، بەپێچەوانەی شەریعەتە کۆنەکان کە لێپرسینەوەیان لە بێگیان و ئاژەڵیش دەکرد، دادگەییان دەکردن و پاشان سزایان دەدان. لەوانە شەریعەتی عیبرانیەکان. لە (سفر الخروج)دا هاتووە (ئەگەر گایەك قۆچی لە پیاو یان ئافرەتێکدا و قۆچلێدراوەکە بەهۆی قۆچەکەوە مرد، گاکە بەردباران دەکرێت و خواردنی گۆشتەکەیشی حەرام دەکرێ).

لەوانە شەریعەتی گریکە کۆنەکان کە ئەو بەرپرسیارێتیەی بۆ حەیوان و بێگیان پەسەند کردوە، بەشێوەیەك ئەگەر حەیوانێك مرۆڤێکی کوشت، خێزانی کوژراوەکە بۆی هەبوو لە دادگە شکات لە حەیوانەکە بکات و دادوەری بۆ خۆی لەنێوان جوتیاراندا هەڵدەبژارد، ئەگەر تاوانەکە لەسەری ساغ بوویەوە، دەبوو دادوەرەکە بڕیاری کوشتنی حەیوانەکە و فڕێدانی کەلاکەکەی لە دەرەوەی ئاوەدانیەکە بدایە.

شەریعەتی رۆمانە کۆنەکانیش هەمان رێچکەی گرتبوو و بەرپرسیارێتیی سزایی لەو شەریعەتانەدا تەنها حەیوانی نەدەگرتەوە بگرە بێگیانیشی دەگرتەوە، بۆ نموونە ئەگەر بێگیانێك کەوت بەسەر مرۆڤێکدا و کوشتی، ئیتر هۆی بەربوونەوەکە هەرچی بووبێ، خزمانی کوژراوەکە یان دراوسێیەکی دەکرایە دادوەر تا حوکم لەسەر بێگیانەکە بدات بە فڕێدانی بۆ دەرەوەی سنوور، بەڵام تەن و تەیزکە ئاسمانیەکان کە بەسەر مرۆڤدا بەردەبنەوە و دەیکوژن هەڵاوێر کراون و بەرپرسیارێتییان لەسەر نیە، رەنگە ئەوەیش لەبەر بەپیرۆز زانینیان بووبێ[1].

**بەرپرسیارێتیی سزایی کەسی مەعنەوی:**

شیانی کەسی مەعنەوی بۆ پابەندیی سزایی لەنێوان یار و نەیاردا جێی ناکۆکییە:

---

[1] بڕوانە: موانع المسؤولية الجزائية للدكتور عبدالسلام التونجي، ص١٢-١٨.

**أ- بەلگەکانی لایەنگرانی نەشیاوبوونی کەسی مەعنەوی بۆ پابەندی:**

١- بوونی ئیرادە مەرجێکی حاشاهەڵنەگرە بۆ هەستانی پابەندیی تاوانکاری بە تێکدانی ئەرکێکی یاسایی کە یاسای سزاکان دیاری کردوە، بە کردن یان نەکردنی کارێك کە یاسا بە تاوانی داناوە. کەسی مەعنەوی تەنها خەیاڵێکە و لە واقیعدا وجودی نیە، لەبەرئەوەی ئەو دەرك و ئیرادە ئازادەی نیە کە بناغە و مەرجی بەرپرسیارێتیی سزاییە.

٢- بوونی کەسی مەعنەوی شتێکە یاسا بە گریمانە دایناوە بۆ ئەو ئامانجەی لەبەرچاوی گرتووە، ئەنجامدانی تاوانیش لە دەرەوەی بازنەی ئەو ئامانجە و قەوارە یاساییەکەیەتی.

٣- کەسی مەعنەوی ناکرێ ئەو سزایانەی بەسەردا جێبەجێ بکرێن کە بۆ تێکدانی ئەرکی یاسایی دانراون، وەك لەسێدارەدان و سزاکانی لێسەندنەوەی ئازادی وەك بەندکردن.

٤- باسکردن لەوەی کەسی مەعنەوی پابەندیی سزایی هەیە و لێرەیشەوە شایستەی سزادانی جەستەییە، لەتەك بنەمای کەسیبوونی سزادان (شخصية العقوبة)دا لێکدەدا، لەبەرئەوەی ئەگەر جێبەجێ کرا ئەوا لەسەر کەسە سروشتیەکان جێبەجێ دەکرێ، کە هیچ گوناهێکیان نیە.

**ب- بەلگەکانی لایەنگرانی شیاوبوونی کەسی مەعنەوی بۆ پابەندیی سزایی:**

١- کەسی مەعنەوی تەنها خەیاڵێك نیە بەڵکو لەم سەردەمەدا بووەتە یەکێك لەو راستییە یاساییانەی زەرورەت و پەرەسەندنەکانی ژیان دەیسەپێنن، چونکە ئەو ئەگەر کائینێکیش نەبێ لە جیهانی مادیدا، ئەوا کائینێکە و لە جیهانی مەعنەویی یاساییدا هەیە، بۆیە مافی هەیە و پابەندیشی لەسەرە، هەروەها خاوەن ئیرادەیەکی سەربەخۆیە لە ئیرادەی ئەو تاکانەی نوێنەرایەتی دەکەن و ئیرادەکەی، کۆی رای ئەندامانی یان ئەوانەن تێیدا بەشدارن.

٢- ئەوەی دەگوترێ تـاوان لـەو ئامانجـە دەردەچـێ كـە كەسـی مەعنـەوی بـۆ تەرخان كراوە، پرووپوچە، لەبەرئەوەی تەرخانكردنی كەسێكی مەعنەوی بە شـتێكی دیاریكراو لەگەڵ ئەگەری ئەوەی تاوانێكی بدرێتە پاڵ لێك نادات، پاشان ئەگەر ئـەوە راست بێ، ئەوا ئامانج لە بوونی كەسی سروشتی (مرۆڤ) ئەنجامدانی تاوان نیە و تاوان بەلای ئەوەوە دەرچوونە لەوەی پێویستە ژیانی لەسەری بچێ.

٣- ئەوەی دەگوترێ ئەو سـزایانەی بەسـەر كەسـی سروشـتیدا پیـادە دەكـرێن ناكرێ بەسەر كەسی مەعنەویـدا پیـادە بكـرێن، قسـەیەكی نادروسـتە، لەبەرئـەوەی قورسترین سزا سزای لەسێدارەدانە، بـۆ كەسـی مەعنـەویش هەڵوەشـاندنەوەی وەك لەسێدارەدان وایە، هەروەها پەككخستن و داخستنی بۆ ماوەیـەكی دیـاریكراو بـۆ ئـەو وەك بەندكردنە، بەرتەسككردنەوەی بازنـەی كاریشـی وەك رێوشـوێنی خۆپـارێزی و چاودێرییە لەسەر كەسی سروشتی.

٤- ئەوەی دەگوترێ سزادانی كەسی مەعنەوی ئاسەوارەكەی لە كەسی تاوانكـار تێدەپەرێ بۆ بێتاوانان، بەوە بەرهەڵستی دەكرێ كە ئـەو ئاسـەوارە بەسـەر كەسـی سروشتیشدا جێبەجێ دەبێ. ئەگەر ئەوە لەتەك بنەمای كەسیبوونی تاوان و سزاداندا نـاكۆك بـێ ئەمـەیش بەهـەمان شـێوەیە. كاتێـك حـوكمی بەنـدكردن بـۆ ماوەیـەكی دیاریكراو بەسەر كەسێكدا دەسەپێنرێ، ژن و منداڵەكانی و بگـرە كۆمەڵگـەیش، كـە ئەو حوكمدراوە دەشێ كەسێكی بەسوودی وەك پزیشـك و مامۆسـتای زانكـۆ و ئـەو جۆرانە بێ، زیانیان پێدەگا[1].

**بۆچوونی لەخۆبوردووانەی ئێمە:**

ئەو كەسە سروشتیەی نوێنەرایەتیی كەسی مەعنەوی دەكا، لەو ئەمر و نەهیانەی بۆ جێبەجێكارەكانیان دەردەكا، بەسیفەتی كەسێكی سروشتی و ئاسـایی تەماشـای

---

[1] بڕوانە: د. سمير الجنزوري، المسؤولية الجزائية، ص٤٨٧ و ئاشتر. د. محمد مصطفى القللي، المسؤولية الجزائية، ص٨٧.

ناكرێ، بەڵكو پۆست و پێگە سیاسی و ئیداری و سەربازیەكەی و ئەو شتانەی لەبەرچاو دەگیرێ، بەم مانایە لە رووی سزاییەوە لێی دەپرسرێتەوە و شایستەی سزادانە، بەتایبەت پاش ئەوەی دادگەی تاوانی نێودەوڵەتی بۆ لێپرسینەوە لە بەرپرسان لە تاوانی قڕكردنی مرۆڤایەتی دامەزرا.

ئەوەی لە پێشەكیی سیستمی بنچینەیی دادگەی تاوانی نێودەوڵەتی (سیستمی بنچینەیی رۆمای دادگەی تاوانی نێودەوڵەتی كارپێكراو لە رۆما لە ١٧ی تەمموزی ١٩٨٩)دا هاتووە، ئەمە دووپات دەكاتەوە. لە دیباجەی سیستمی بنچینەیی رۆمای دادگەی تاوانی نێودەوڵەتدا هاتووە: "دەوڵەتانی لایەن لەم سیستمە بنچینەییەدا: لەكاتێكدا دەزانن كۆمەڵێ پەیوەندیی هاوبەش هەیە هەموو گەلان یەك دەخەن و كەلتوری گەلان پێكەوە كەلەپورێكی هاوبەش پێكدێنن، لەكاتێكدا لەوە نیگەرانن كە ئەو تۆڕە ناسكە لەوانەیە لە هەر ساتێكدا بدڕێ، لەكاتێكدا ئەوەیان لەبەرچاوە كە ملیۆنان منداڵ و ئافرەت و پیاو لەم سەدەیەدا بوونەتە قوربانیی تاونی وا گەورە كە بەخەیاڵدا نایەت و بەتوندی ویژدانی مرۆڤایەتیان هەژاندوە، لەكاتێكدا دان بەوەدا دەنێن ئەم تاوانە ترسناكانە هەڕەشە لە ئاشتی و ئاسایش و خۆشگوزەرانی لە جیهاندا دەكەن، لەكاتێكدا جەخت لەوە دەكەن ترسناكترین تاوان كە دەبنە مایەی نیگەرانی تەواوی كۆمەڵگەی نێودەوڵەتی، پێویستە بەبێ سزا تێنەپەڕن و پێویستە لەرێگەی گرتنەبەری كۆمەڵێ رێكار لەسەر ئاستی نیشتمانی و هەروەها لەرێگەی پتەوكردنی هاوهەڵوێستیی نێودەوڵەتیەوە، دادگەییكردنی ئەنجامدەرانی ئەو تاوانانە بەشێوەیەكی كارا، مسۆگەر بكرێ. عەزمیان جەزم كردوە سنوورێك بۆ قوتاربوونی ئەنجامدەرانی ئەو تاوانانە لە سزا دابنێن و لەوێشەوە بەشداریی بەرفراوان لە رێگرتن لەو تاوانانەدا بكەن.

هەروەها لەكاتێكدا ئەوەیان لەبەرچاوە كە ئەركی هەموو دەوڵەتێكە دەسەڵاتی دادوەری و تاوانكارییان بەسەر بەرپرسان لە ئەنجامدانی تاوانی نێودەوڵەتیدا هەبێ، لەكاتێكدا سەرلەنوێ جەخت لەسەر ئامانج و بنەماكانی میساقی نەتەوە

یـەككگرتووەكان دەكەنـەوە، بەتایبـەت كـە پێویسـتە سـەرجەم دەوڵـەتان خـۆ لـە هەڕەشـەكردن بـە بـەكارهێنانی هێـز یـان بـەكارهێنانی دژ بـە ئاشـتیی هـەرێمی و سەربەخۆیی سیاسـیی هـەر دەوڵـەتێك، یـان بـەكارهێنانی بەهـەر شـێوەیەك لەتـەك ئامانجەكانی نەتەوە یەكگرتووەكاندا نـەگونجێ، دووربگـرن. لەكاتێكدا لـەم رووەوە جەخت لەوە دەكەن ئەم سیستمە بنچینەییە هیچ شتێكی تێدا نیە بكرێ بە مۆڵەتدان بە هەر دەوڵەتێك دابنرێ كە وەك لایەنێك دەست بخاتە نێو ململانێیەكی چەكداری كە لە چوارچێوەی كاروباری ناوخۆی هەر دەوڵەتێكدا روو دەدات.

لەپێناو گەیشت بەم ئامانجانە و لەبەر بەرژەوەندیی نـەوەكانی ئێسـتا و ئاینـدە، قۆڵیان لێ هەڵماڵیوە بۆ دامەزرانـدنی دادگەیـەكی تـاوانی نێودەوڵـەتیی سـەربەخۆ و پەیوەنـدار بـە رێكخـراوی نەتـەوە یـەككگرتووەكان و تایبەتمەنـد بـە تاوانـە هـەرە ترسناكەكان كە دەبنە مایەی ورکە و دڵەڕاوكێ بۆ تـەواوی كۆمەڵگـەی نێودەوڵـەتی. هەروەها جەخت لەوە دەكەن ئـەو دادگـەی تـاوانی نێودەوڵەتیـەی بـەگوێرەی ئـەم سیسـتمە بنچـینەییە دادەمـەزرێ، تەواوكـەری دەسـەڵاتە دادوەرییـە تاوانكارییـە نیشتمانیەكان دەبێ.

**دووەم**: شیاو بێ بۆ لێپرسینەوەی تاوانكاری: بەوەی قۆناغی ناشیاوبوونی بڕیبێت و پێی نابێتە قۆناغی فامكردن (التمییز)، ئەوەیش لە رووی ماوەوە لە یاسای سزاكانی دەوڵـەتانی جۆراوجـۆردا جیـاوازە. تەمـەنی فـامكردن لـە پابەندییـە مـەدەنی و تاوانكاریەكان لە یاسا عێراقیەكاندا تـەواوكردنی تەمـەنی حـەوت سـاڵ و چـوونە نـاو هەشت ساڵ بوو، بەڵام پاش دانانی یاسای چاودێریكردنی نەوجەوانان ماوەكە هەموار كرا و لە تەواو كردنی حەوت ساڵەوە كرا بە تەواوكردنی نۆ ساڵ.

لە ماوەی نێوان سـاڵی دەیـەم و نۆزدەیەمـدا نەوجـەوان مامەڵەیـەكی سـزاییانەی چاكسازیانەی لەتەكدا دەكرێ، تا لە تەمەنی پێگەیشتنیش نزیكتر بێتەوە رێوشـوێنە چاكسازیەكان دەرهەق بە كەتنكار (الجانح) توندتر دەبن.

وەك لە یاسای چاودێریی نەوجەوانان ژمارە (٧٦)ی ساڵی ١٩٨٣ی هەموارکراودا هاتووە بەناونیشانی بابی پێنجەم، ڕێکارەکان، مادەکانی (٧٢-٨٦).

**سێیەم: ئاوەز (عقل):** هەر کەس لەبەر شێتیەکەی تاوانێك ئەنجام بدا، لە رووی مەدەنیەوە لە لەناوبردنە ماڵیەکان و زیانگەیاندنی بە کەسانیتر بە بەرپرس دادەنرێ، سزاکەیشی قەرەبووکردنەوەی زیانەکەیە، بەڵام لە رووی سزاییەوە پرسیاری لێناکرێ وەك لە باسی ڕێگریەکاندا دێتەپێش.

**چوارەم:** هەڵبژێر (مختار) بێ (واتە توانای هەڵبژاردنی هەبێ)، هەربۆیە هەریەك لە زۆرلێکراو و ناچار لێپرسینەوەی سزاییانەی تەواویان لەگەڵ ناکرێ، وەك پاشتر ئەوە ورد دەکرێتەوە.

**پێنجەم:** کەسەکە، بەڕاستی یان بەحوکم، پابەندیەکەی تێکبدات، بەوەی کارێك بکات یان خۆی لە کردنی کارێك لابدات کە یاسا بەر لە ئەنجامدانی بەتاوانی داناوە.

تاوانەکە لە حاڵەتی یەکەمدا ئەرێنییە لەبەرئەوەی پایە مادیەکەی کردنە، لە وێنەی دووەمیشدا نەرێنییە لەبەرئەوەی نەکردنەکە (الامتناع) هەڵوێستێکی نەرێنیی تاوانکارەکەیە.

شایانی باسە چوارچێوەی تاوانی نەرێنی لە یاساکاندا بەرتەسکە و لە نەکردنی کارێکدا حەسر دەبێ کە یاسا بەدەق پێویستی کردوە، ئەویش لەسەر بنەمای شەرعیەت (نە تاوان و نە سزا، بەبێ دەق نیە). بەڵام لە شەریعەتی ئیسلامیدا کە بایەخ بە لایەنی مرۆیی و ئەخلاقی دەدا، زۆر پیادەکردنی تاوانی نەرێنی هەن کە بکەر لەڕووی قەزایی یان دینیەوە لێی دەپرسرێتەوە. بۆ نموونە بەخشین لەپێناو بەرژەوەندیی گشتی یان تایبەت لەسەر هەموو کەسێکی دارا واجبە، جا ئەگەر پابەند نەبوو بەم واجبەوە، لەڕووی دینیەوە لێی دەپرسرێتەوە، نەك لە رووی قەزاییەوە.

# خواستی دووەم:
# ڕێگرەکانی پابەندیی تاوانکاری

ڕێگری پابەندیی تاوانکاری سیفەتێکی خودی یان لابەلاییە، کە ئەگەر لەگەڵ هۆیەکی بخواز (مقتض)دا کۆ بوویەوە ڕێدەگرێ لەوەی ئەو هۆیە شوێنەواری لێبکەوێتەوە، ئەویش بەپێی ڕێسای (إذا تعارض المانع والمقتضي يقدم المانع)[1]. (واتە: ئەگەر ڕێگر و بخواز تێکگیران، ڕێگرەکە پێش دەخرێ).

نهێنیی پێشخستنی ڕێگر لە بخواز ئەوەیە بەرژەوەندیەکی گشتی یان تایبەت هەیە ئەگەر ڕێگرەکە پێش نەخرێ، دەفەوتێ، ئەوەیش بەپێی جیاوازیی سروشتی ئەو پرسەی ڕێگر و بخوازەکە تێیدا کۆدەبنەوە.

بەڵام ئەگەر ئەو ڕێگرە نەما کار بە بخواز دەکرێ، ئەویش بەپێی ڕێسای (إذا زال المانع عاد الممنوع)[2]. (واتە ئەگەر ڕێگرەکە نەما قەدەغەکە دەگەڕێتەوە).

ڕێگرەکانی پابەندبوونی تاوانکاری لە رووی سروشتەوە دابەش دەبن بۆ ڕێگری زاتی (تەمەن بچوکی) و ڕێگری لابەلایی (وەك شێتی). هەروەها لە رووی مەوداوە دابەش دەبن بۆ ڕێگری قەتیسکار (المانع القاصر) (وەك بچوکی و شێتی) و شەریکی تاوانکارەکە سوودی لێ نابینێ + ڕێگری تێپەڕ (المانع متعدی) (وەك بەرگریی شەرعی) و ئەو کەسە سوودی لێ دەبینێ کە یارمەتی دەستدرێژی لەسەرکراو دەدات.

---

[1] مادەی (٤٦) لە گۆڤاری: الأحكام العدلية.

[2] مادەی (٢٥) لە گۆڤاری: الأحكام العدلية.

لــە رووی کاریگەریشــیەوە، یــان ئــەوەتا کــردارە تاوانکاریەکــە لــە ســیفەتە تاوانکاریەکەی رووت دەکاتــەوە بەشـێوەیەك لــەوە دەریــدەکات دەقــی بەتاوانــدانان بیگرێتەوە، وەك لە هۆکانی رێپێدان (الاباحة)دا، یان رێگە لە لێپرسینەوەی سزاییانە دەگرێ وەك لە حاڵەتی تەمەن بچوکی و شێتی و ئــەو شــتانەی حــوکمی ئەوانــەیان هەیە، یان رۆڵی تەنها رێگرتنە لە سزادان، وەك لەم روونکردنەوەیەدا:

**یەکەم: ئەو رێگرەی پابەندیی تاوانکاری ناهێڵێ بەشێوەیەک دەیگێڕێتەوە بۆ حاڵەتی رێپێدان-ی پێش بوونی**

**ئەم رێگرە لە هۆکانی رێپێدانە (الاباحة)، کە بریتییە لە بەرگریکردنی شەرعی و جێبەجێکردنی ئەرك و بەکارهێنانی ماف: وەك خوارەوە:**

**أ- بەرگریی شەرعی:**

بریتییە لە لادان یاخود نەهێشتنی مەترسیەکی دەستەویەخە کە رووی لە مافێك کردوە کە یاسا دەیپارێزێ، بە رێگەیەکی گونجاو.

لە روانگەی ئەم پێناسەوە پایەکانی بەرگریکردنی شەرعی سیانن، کە بریتین لە: (مەترسـی + ئــەو مافــەی دووچــاری مەترسـی بــووە + وەڵامدانەوەیــەکی شــایانی مەترســیەکە). هەریــەك لــەم ســێ پایــەیش مــەرجی خۆیــان هەیــە، وەك لــەم روونکردنەوەیەدا:

**مەرجەکانی پایەی یەکەم (مەترسی):**

١- سەرچـاوەی مەترسـیەکە لەخۆیـدا کـارێکی نـاڕەوا بـێ، ئـەو سـەربازەی لـە مەیدانی جەنگدایە مافی ئەوەی نیە جێبەجێکردنی فەرمانی ئامرەکەی رەت بکاتەوە بەبەڵگەی ئەوەی دووچاری مەترسی دەبێ، چونکە لەم حاڵەتــەدا بــەرگریکردن دژی دەستدرێژکار واجبە لەسەری.

٢- مەترسیەکە دەستەویەخە واتە حازری بێ، لەم دوو حاڵەتەدا دەستەویەخەیە: یەکەمیان ئەوەیە ڕوودانی لە ئان و ساتدا بێ و هێشتا ڕوونەدابێ. دووەمیشیان ئەوەیە ڕوویدات، بەڵام هێشتا لە ڕوودانیش بەردەوام بێ.

٣- ئەوەیە دەستدرێژیکار بەجدی بیەوێ دەستدرێژی بکا، جا ئەگەر گاڵتە یاخود سوعبەتی دەکرد، یان بەربەستێك هەبوو ڕێگەی لە ڕوودانی مەترسیەکە دەگرت، وەك ڕووبار یان دیوارێك یان شتێکی لەو جۆرە، مەترسیەکە بە بەرکار (قائم) دانانرێ.

٤- مەترسیەکە ڕاستەقینە بێ یا بە گومانی بەرگریکارەکەیش وابێت و حساب بۆ مەترسیی وەهمی ناکرێ تا لەسەر بناغەی ماقوڵ دانەمەزرابێ.

٥- نەڕەوینەوەی مەترسیەکە بەر لە دەستکردن بە بەرگری، ئەگەر بەر لەوە ڕەویەوە پاساو بۆ بەرگریکردنی شەرعی نامێنێ.

٦- دەستدرێژی لەسەرکراو ڕۆڵی لە ڕوودانی دەستدرێژیەکەدا نەبووبێ، خۆ ئەگەر ئەو خۆی بەر لە دەستدرێژیەکە دەستدرێژیکاری ئاڵۆسکاند، ئەوا بوار بۆ بەرگریی شەرعی نامێنێ.

٧- دەستدرێژیەکە کارێکی ناڕەوا بێ، کەواتە بازرگان بۆی نیە بەرگری لە مادە بەکاربراوە بەسەرچووەکانی بکا ئەگەر دەسەڵاتێکی بەرپرس لەناوی بردن، هەروەها دەرمانساز مافی نیە بەرگری لە دەرمانە ئێکسپایەرەکان بکا ئەگەر لایەنی بەرپرس لەناوی بردن.

**مەرجەکانی پایەی دووەم (ئەو مافەی تووشی مەترسی بووە):**

لەم پایەدا مەرجە ئەو مافەی دەستدرێژی دەکرێتە سەر لەو مافانە بێ یاسا دەیانپارێزێ، ئەوەی حوکمی سزایەکی بەسەردا دەدرێ، مافی بەرگریکردن دژی جێبەجێکردنی نیە چونکە ئەو سزایە، وەك سزای بەندکردن، یاسا مافی جێبەجێنەکردنی نەپاراستووە، لەبەرئەوەی لەوەدا ملکەچی شتێك دەبێ کە شەرع و یاسا ڕێگەیان پێداوە.

**مەرجەکانی پایەی سێیەم (وەڵامێکی شایان بۆ مەترسیەکە):**

١- پێویستە ئەو هێزەی لە بەرگریکردنی شەرعیدا بەکار دێ لەرووی چەندێتی و چۆنایەتیەوە لەگەڵ دەستدرێژیەکەدا بگونجێ.

٢- هیچ رێگەیەکتر بۆ دوورخستنەوەی مەترسیەکە نەبێ.

**ب- ئەنجامدانی ئەرك (الواجب):**

دەسەڵاتدارانی گشتی کۆمەڵێ دەسەڵاتیان هەیە کە دەستوور یاخود یاسا دیاریان دەکا. ئەنجامدانێکی هەندێکیان راستەوخۆ دەستبردن بۆ ماف و بەرژەوەندیی تاکەکانیان تێدایە، وەك لە بەکارهێنانی دەسەڵاتەکانی هەردوو دەسەڵاتی دادوەری و جێبەجێکردندا، یان ناڕاستەوخۆ وەك لە دەسەڵاتەکانی دەسەڵاتی یاسادانان و بەتایبەت لە یاسادانانە سزاییەکاندا.

جا ئەگەر ئەندامانی یەکێك لەو دەسەڵاتانە کارێکیان کرد کە یاسا بەتاوانی دادەنێ بەدەر لە حاڵەتەکانی ئەنجامدانی ئەرك، هیچ پابەندیەکی تاوانکاری لێناکەوێتەوە بۆ داماڵینی کردەوەکە لە سیفەتە تاوانکاریانەکەی بەبیانووی ئەنجامدانی ئەرك.

**ج- بەکارهێنانی ماف:**

بەکارهێنانی مافی شەخسییە کە شەرع و یاسا بە مرۆڤیان بەخشیوە، وەك تەمێکرنی منداڵەکانی لە سنووری داواکراودا، هەروەها وەك ئەنجامدانی ئەو کارە وەرزشیانەی مەرجەکانیان بەردەستە و هەستانی پزیشکی پسپۆڕ بە ئەنجامدانی کارە پزیشکیەکانی بەبێ کەمتەرخەمی. ئەگەر بەکارهێنانی هەرکام لەو مافانە بووە مایەی کارێك کە یاسا بەتاوانی دادەنێ بۆ جگە لەوانەی ماف بەکار دێنن، ئەوا هیچ پابەندیەکی تاوانکاری لێناکەوێتەوە ئەگەر مەرجەکانی هەموو بەکارهێنانێکیان تێدا بوو کە لە شوێنی خۆیاندا بەدرێژی روون کراونەتەوە، لەبەرئەوەی بابەتی پابەندی بەهۆی یەکێك لەو هۆیانەوە دەبێتە کارێکی داڕنراو لە سیفەتە تاوانکارانەکەی.

# باسی سێیەم:
# بەراوردکردنی پابەندیی مەدەنی و پابەندی تاوانکاری

هەردوو پابەندیی مەدەنی و تاوانکاری لەوەدا کۆکن کە هەردوو جۆرەکە دەچنە ژێر خانەی یەك رەگەز، ئەویش رەهای پابەندبوونە، بەڵام لە رووی چیەتی و جیاکەرەوە و سیفەتە جەوهەریەکاندا لێك جیاوازن، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

**یەکەم: لە رووی چییەتیەوە (الماهیة):**

چییەتیی پابەندیی مەدەنی، ئەنجامدانی ئەرکێك بە خۆویستانە یان بەناچاری هەڵدەگرێ کە گێرانی ئەستۆ بە مافی کەسانیتری لێدەکەوێتەوە تا ئەو مافە دەدرێتەوە، لەکاتێکدا چییەتیی پابەندیی تاوانکاری سزای تێکدانی ئەرکێکی یاسایی هەڵدەگرێ کە یاسایەکی سزایی وەك یاسای سزاکان و یاسای دادڕەویی سزایی (بنەمای رێکارە سزاییەکان) دیاری دەکا.

**دووەم: لە رووی بابەتەوە:**

بابەتی پابەندیی مەدەنی مافێکی ماڵینەی دارایی یان مافێکی کەسییە کە پێویستە کەسی پابەند بە ویستی خۆی ئەو مافە بداتەوە ئەگینا بەزۆر پێی دەکرێ، مەگەر رێگرێکی یاسایی وەك کۆنبوونی بخەر (التقادم المسقط) لەئارادا هەبێ. بۆ نموونە ئەگەر بەکر ئۆتۆمبێلەکەی بە زەید فرۆشت، بابەتی پابەندیەکەی ئۆتۆمبێلەکەیە و پابەند دەبێ بە رادەستکردنی بە کڕیارەکە مەگەر رێگرێك لەئارادا

هەبێ، بابەتی پابەندیی کڕیارەکەیش نرخی ئۆتۆمبێلەکەیە و پێویستە بەپێی ئەو نرخەی هەردوولا لەسەری رێك کەوتوون، بداتە فرۆشیارەکە.

ئەمە لەکاتێکدا بابەتی پابەندیی تاوانکاری سزایەکە ئازادیی مرۆڤ زەوت دەکا، یان غەرامەیەکی دارایی بەسەردا دەسەپێنێ و تاوانبار بە ملکەچبوونی بۆ جێبەجێکردنی ئەو سزایە، پابەند دەبێ، بابەتی پابەندیەکەیشی جێبەجێکردنە.

**سێیەم: لە رووی شوێن (المحل)ەوە:**

شوێنی پابەندیی مەدەنی ئەنجامدانە (الاداء) بە مانا گشتییە سەرتاپاگیرەکەی کردەوەکە، وەك رادەستکردنی ئۆتۆمبیلەکە بە کڕیار و رادەستکردنی پارەکە بە فرۆشیار. هەروەها وەك نەکردنی کردەوەیەك کە پێویستە نەیکا، وەك پابەندیی فرۆشیار بە رێنەگرتن لە کڕیار واتە ئەوەی پێی دەوترێ دەستەبەری رێگرتن (چمان التعرج) و پابەندیی کڕیار بە رکابەرینەکردن لەگەڵ فرۆشیارەکە. ئەگەر خالید کە دوکانەکەی تەنیشتی دوکانەکەیتری بە دراوسێ دوکانەکەی فرۆشت و کردیە مەرج لەسەر کڕیارەکە لەو جۆرە کاڵایانەی تێدا نەفرۆشێ کە ئەو دەیانفرۆشێ، ئەوا دەبێ کڕیارەکە پابەندی ئەو مەرجە بێ کە لەسەری دانراوە و خۆی لابدات لە رکابەریکردنی نادروستی فرۆشیارەکە، بەپێچەوانەی بابەتی پابەندیی تاوانکاری، کە هەمیشە ملکەچبوون و خۆبەدەستەوەدانە بۆ جێبەجێکردنی ئەو سزایەی دەرچووە تا تەواوبوونی ماوەی ئەو حوکمە.

**چوارەم: لە رووی هۆوە:**

هۆی پابەندیی مەدەنی بەزۆری گوفتار یان کردارێکی رەوا دەبێ وەك فرۆشتن لەو گرێبەندانەی بۆ هەردوولا پابەندکارن، ویستی تاکلایەنە وەك وەقف و بەخشین (الهبة)، لە گرێبەندی پابەندکار بۆ هەردوولادا هەردوولا قەرزدەر و قەرزار لە یەك کاتدا (پابەند و بۆ-پابەند)ن، بۆ نموونە فرۆشیار پابەندە بە رادەستکردنی فرۆشراو و بۆ-پابەندە سەبارەت بە نرخەکەی، کڕیاریش پابەندە بە رادەستکردنی نرخەکە و بۆ-پابەندە بە وەرگرتنی فرۆشراوەکە.

بەڵام لە ویستی تاکلایەنەدا یەکێکیان تەنها قەرزارە و ئەویتریان قەرزدەرە، وەك لە بەخشیندا، هەر تەنها بە دامەزرانی بەخشینەکە بەدروستی، بەخشەرەکە پابەند دەبێ بە رادەستکردنی بەخشراوەکە بە پێبەخشراو، بەڵام قەرزدەری (ئەو کەسە) نیە، پێبەخشراویش هەمیشە بۆ–پابەندە نەك پابەند (قەرزار).

ئەوەی لەنێو شەرحکەرانی یاسادا بڵاوە کە بەخشینی گوێزراوە (المنقول) دانامەزرێ پاش وەرگرتنی نەبێ، لەبەرئەوەی لە گرێبەندەماڵینە (عینی)ەکانە کە وەرگرتن یەکێکە لە رەگەزەکانی، هەڵەیەکی شایعە.

لێکدانەوەی دەستەواژەی (لا تتم) لە مادەی (٦٠٣) لە یاسای مەدەنیی عێراقی بەرکار کە دەڵێ "لا تتم الهبة في المنقول إلا بالقبض" (بەخشین لە گوێزراوەدا تەواو نابێ بە وەرگرتن نەبێ)، بە (لاتنعقد) واتە دانامەزرێ، هەڵەیەکی شایعە، لەبەرئەوەی مەبەست لە (لا تتم) تەواونەبوونی ئاسەوارەکانە نەك تەواونەبوونی رەگەزەکان، کە تەنها بە گرێبەستەکە نیوەی ئاسەوارەکەی (کە پابەندییە) لێ دەکەوێتەوە بەبێ نیوەکەیتر (کە مافەکانە)، کە ئەمەی دواییان بەبێ وەرگرتن دروست نابێ، چونکە پێبەخشراو تا پاش وەرگرتنی بۆی نیە مامەڵە بە بەخشراو بکا. دەستەواژەی (لا تتم) روو لە ئاسەوارەکان دەکا نەك رەگەزەکان، چونکە وەرگرتن (القبض) نە پایە و نە مەرجە لە دامەزرانی بەخشین و باقیی گرێبەستە ماڵینەکاندا (رەهن و قەرز و پێدان (اعارة) و سپاردە).

هەروەها لەوانەیە هۆی پابەندیی مەدەنی کارێکی ناڕەوا بێ وەك تەلەفکردنی ماڵی کەسانیتر بەبێ پاساوێکی شەرعی و کەسی تەلەفکەر پابەند دەبێ بە پێدانی قەرەبوویەك بە خاوەن ماڵەکە، کە بارتەقای قەبارەی زیانەکە بێ.

بەڵام هۆی پابەندیی تاوانکاری هەمیشە کارێکی ناڕەوا دەبێ وەك کوشتن و دزی و ناپاکیکردن لە ئەمانەت و لرفدانی ماڵی گشتی و ئەو جۆرە شتانە.

**پێنجەم: لە رووی بنچینەوە:**

بنچینەی پابەندیی مەدەنی لادانی زیانە بەر لە روودانی وەك خۆلادان لە رکابەریکردنی نامەشروع، یان نەهێشتنیەتی پاش روودانی زیانەکە بە قەرەبوویەکی دادپەروەرانە، وەك لەو زیانانەی لە تەلەفکردنی نامەشروع یان دواخستنی جێبەجێکردن بەبێ هۆ، یان جێبەجێکردنی نیوە و ناتەواو یان خەوشدار و ئەو شتانە دەکەوێتەوە.

لەکاتێکدا بنچینەی پابەندیی تاوانکاری لادانی مەترسییە بەپشتبەستن بە ئامرازەکانی خۆپاراستن، یان نەهێشتنی ئەو مەترسییە وەك لە حاڵەتی بەرگریکردنی شەرعی لە مەترسیەکدا کە رووی داوە، بەڵام هێشتا مەترسیەکە بەردەوامە، وەك لە تاوانە بەردەوامەکاندا.

**شەشەم: لەرووی شیان (ئەهلیەت)ەوە:**

شیانی پابەندیی مەدەنی هەمان شیانی تەواوی واجبوونە، ئەویش گونجانی مرۆڤە بۆ ئەوەی مافی هەبێ و ئەرکیشی لەسەر بێ. ئەم شیانە لەگەڵ دەسپێکی کەسایەتیی تەواوی یاسایی مرۆڤ لە ساتی لەدایکبوونیەوە بە زیندوویی دەچەسپێ، تەنانەت ئەگەر ئەم لەدایکبوونە نەخۆشیی شێتبوونێکی زکماك (ولادی)شی لەگەڵدا بێ، هەر لەسەریەتی خەرجی ئەوانە بکێشێ کە خەرجیان لەسەریەتی ئەگەر هاتوو لەرووی داراییەوە بەتوانا بوو، وەك نەفەقەی دایك و باوکی هەژاری، یان خوشك و برای لەکاتی پێویستیدا.

هەروەها دەرکردنی زەکاتی ماڵەکەی واجبە ئەگەر هاتوو لەو ماڵانە بوو زەکاتیان تێدا واجبە و گەیشتبووە رادەی زەکاتکەوتن (واتە: حەدی نیصاب)، کە بڕی چل درهەمی زیوە، باجی لەسەرە ئەگەر باجەکە پاساوی هەبوو، هەروەها دانەوەی ئەو قەرزانەی لە بازرگانیکردن بە ماڵەکەی کەوتوونەتەوە و قەرەبووکردنەوەی ئەو ماڵی خەڵکەی لەناوی بردوە، لەرێی وەلی یان چاودێرەکەی و ئەو جۆرە پابەندییە مەدەنیانە کە هۆی شەرعی و یاساییان هەیە.

بەپێچەوانەی پابەندیی تاوانکاری ، کەسی نەشیاو (نائەهل) یان شێتبوو، لەڕووی سزاییەوە لێپرسینەوەی لەگەڵ ناکرێ، ئەویش لەبەر نەبوونی شیانی تاوانکارانە کە لە ڕێگرەکانی بەرپرسیارێتیی تاوانکارییە ئەگەرچی کردارە تاوانکاریەکەی هەڵگری سیفەتە تاوانکارانەکەیەتی.

یاساکان و یاساناسان سەبارەت بە لای خواری ئەو شیانە ناکۆکن، لە یاسا عێراقیەکاندا شیانی بەرپرسیارێتیی سزایی بۆ هەر کەسێك پاش فامکردن، دەچەسپێ، ئەویش تەواوکردنی تەمەنی نۆ ساڵییە[1].

ئەوە لە باسی ڕێگریەکانی پابەندیی تاوانکاریدا بەدرێژی روون کرایەوە.

نهێنی لەو جیاوازیەی نێوان هەردوو پابەندیەکەدایە ئەوەیە مەرجی پابەندیی تاوانکاری فامکردن و ئاوەزە (التمییز و العقل)، لەکاتێکدا مەرجی پابەندیی مەدەنی بریتییە لە کەسایەتیی یاسایی کە پاش لەدایکبوونی بەزیندوویی بۆ کەسی پابەند جێگیر دەبێ.

**حەوتەم: پابەندیی مەدەنیی کەسی مەعنەوی:**

پابەندیی مەدەنیی کەسی مەعنەوی شتێکە لە شەرع و یاسادا کۆدەنگی لەسەرە، هەر کەسێکی مەعنەوی، وەك دەوڵەت و کۆمپانیا و زانکۆ و ئەو شتانە، کۆمەڵێ مافی هەیە و کۆمەڵێ پابەندیشی لەسەرە. بەڵام سەبارەت بە پابەندیی تاوانکاریی کەسی مەعنەوی، هێشتا جێی مشتومڕە و وەك باس کرا تائێستا را نە لەسەر قبولکردن و نە لەسەر رەتکردنەوە جێگیر نەبووە.

**هەشتەم: لە رووی بۆ-پابەندەوە:**

ئەو کەسە لە پابەندیی مەدەنیدا لەوانەیە تاکە کەسێك بێ، لەوانەیە دەستەیەکی دیاریکراوی قەرزدەران بێ، هەروەها دەشکرێ کەسێکی مەعنەوی بێ وەك دەوڵەت.

---

[1] مادەی (٤٧) لە یاسای چاودێریی نەوجەوانانی بەرکار.

بەڵام لە پابەندیی تاوانکاریدا بۆ-پابەند بەزۆری کۆمەڵگەیە، لەبەرئەوەی تاوانکار دەستدرێژی دەکاتە سەر مافێکی گشتی یان مافێکی هاوبەش لەنێوان گشتی و تایبەتدا، لایەنە گشتیەکەیش زاڵە.

جگە لەمە، لەوانەیە بۆ-پابەند لە پابەندیی مەدەنیدا نەبێ یان نادیار (مجهول) بێ، بەپێچەوانەی بۆ-پابەند لە پابەندیی تاوانکاریدا کە پێویستە هەمیشە مەوجود و ناسراو بێ، لەبەرئەوەی ئەو تاوان لەسەرکراو (مجنى عليه)یە.

**نۆیەم: لەرووی رەگەزی زیانی کردارییەوە:**

بوونی لە پابەندیی تاوانکاریدا داواکراو نیە، چونکە لەوانەیە ئەو پابەندییە بەبێ بوونی هیچ زیانێك بێتەدی، وەك پێسلان (الشروع) کە ئەنجامدانی تاوانەکەی بەکردەوە بەدوادا نەهاتبێ.

پێسلان وەك مادەی (٣٠) لە یاسای سزادانی عێراقی بەرکار پێناسەی کردوە بریتییە لە "دەستکردن بە جێبەجێکردنی کردارێك بەمەبەستی ئەنجامدانی تاوان (الجناية) یان کەتن (الجنحه)یەك ئەگەر لەبەر هۆگەلێك کە پەیوەندییان بە ئیرادەی بکەرەکەوە نەبووە وەستێنرا، یان ئاسەوارەکەی نەما".

تاوان ئەو تاوانەیە ئەنجامدەرەکەی بە لەسێدارەدان یان بەندکردنی هەتاهەتایی یان بەندکردن بۆ زیاتر لە پێنجساڵ بۆ پازدە ساڵی سزا دەدرێ[1]. کەتنیش ئەو تاوانەیە ئەنجامدەرەکەی بە بەندکردن بۆ زیاتر لەسێ مانگ یان بەغەرامەکردن سزا دەدرێ[2]. جگە لەمانە (سەرپێچی)یە و لەرووی یاساوە پێسلانی تێدا نیە. وەك لە رێکەوتنی تاوانکاری بەر لە جێبەجێکردن، ئەویش رێکەوتنی دوو کەس یان زیاترە لەسەر ئەنجامدانی تاوان یان کەتنێك لە کەتنەکانی دزی و فێڵ و ساختەکارییەوە[3].

---

[1] مادەی (٢٥) لە یاسای سزاکانی عێراقیی بەرکار.

[2] مادەی (٢٦)ی هەمان یاسا.

[3] مادەی (٥٥)ی هەمان یاسا.

بەلگەنەویستە هیچکام لەو تاوانانە هیچ زیانێکیان بۆ تاك یان کۆمەلگە لێناکەوێتەوە، لەبەرئەوەی زیانەکە پاش جێبەجێکردنی ئەو تاوانەی نیازی ئەنجامدانی هەبووە روو دەدا، بەپێچەوانەی پابەندیی مەدەنی کە وجودی نیە تا بەکردەوە زیانێك نەقەومابێ، لەبەرئەوەی توخمێکی سەرەکییە لە توخمەکانی بەرپرسیارێتیی گرێبەندانە یان کەمتەرخەمی، بەڵام لەوانەیە پابەندی لەسەر بنچینەی زیانەکە بەبێ بوونی هەڵە بێتە دی، وەك لە پابەندیی شوێنکەوتوو لە زیانەکانی ئەوانەی شوێنی کەوتوون، هەروەها پابەندیی خاوەنی ئەو ئاژەڵەی ماڵی کەسانیتری فەوتاندوە بەقەرەبووکردنەوەی ماڵە فەوتاوەکە، پابەندیی خاوەن کارگە بە قەرەبووکردنەوەی ئەو کرێکارەی لەئەنجامی کارکردنی لە کارگەکە، یان بەکارهێنانی ئەو ئامێرانەی لە کارگەکەدا ئیشیان پێدەکرێ، تووشی نەخۆشیەکی درێژخایەن بووە، ئەویش لەسەر بنچینەی رێسای: رەنج بە گەنج (الغرم بالغنم)، ئەوەی گەنجینەی دەست بکەوێ دەبێ رەنج و باجیش بدات. مادام ئەو قازانجەی لە کۆششی ئەو کرێکارە بەدەست هاتووە بۆ خاوەن کارگەکەیە، یاسا و شەرع و دادپەروەری پابەندی دەکەن بەوەی بەرپرسیارێتیی ئەو زیانەی تووشی کرێکارەکە بووە بگرێتە ئەستۆ.

**دووەم: لەرووی مەبەستی تاوانکارانە (واتە قەسدی جینائی)ەوە**

ئەمە پایەیێکی بنچینەییە لە تاوانەکانی دەستدرێژیکردنە سەر سامان و ئاسایش و هیتر بەدەر لە تاوانەکانی دەستدرێژیکردنە سەر کەسەکان، کە لەوانەیە ئەمە بەبێ مەبەستی تاوانکارانە (قەسدی جینائی) روویدا وەك کوشتنی بەهەڵە یان لێدانێك کە بەهەڵە ببێتە هۆی کوشتن. بەڵام بەدەر لە تاوانەکانی دەستدرێژیکردنە سەر گیان یان خوار گیان هیچ تاوانێك بەبێ بەدیهاتنی رەگەزی قەسدی جینائی نیە، کە پێی دەوترێ پایەی مەعنەوی. ئەو کەسەی ماڵی کەسێکیتر ببات بەبێ مۆڵەتی خۆی بەبێ ئەوەی بیکاتە هی خۆی، بە دز دانانرێ. ئەوەی زینا لەتەك ئافرەتێکدا بکات و وابزانێ

ژنەکەی خۆیەتی ئەوە بە تاوانی زینا حسێب نیە، لەبەرئەوە تاوانەکانی دژ بە جگە لە گیان و خوار گیان ناونراون تاوانی بەمەبەست (قصدي).

**یازدەیەم: لە رووی جوڵاندنی داواوە**

لە پابەندیی مەدەنیدا جگە لە بۆ-پابەند یان هەر کەسێك نوێنەرایەتی بکا بە نوێنەرایەتیەکی بە رێکەوتن یان بە بڕیاری قەزا یان یاسا، کەسیتر دەعوا دژی پابەند ناجوڵێنێ. ئەگەر ئەو کەسەی مافی جوڵاندنی داوای مەدەنی هەیە بێدەنگی هەڵبژارد، کەس مافی نیە بەبێ مۆڵەت یان بە نوێنەرایەتیی ئەو، ئەو داوایە دژی قەرزار بجوڵێنێ، بەپێچەوانەی پابەندیی تاوانکاری کە ئەگەر تاوان لەسەرکراو خۆی یان نوێنەرەکەی داواکەی نەجوڵاند، دەستەی داواکاری گشتی دەیجوڵێنێ و کێشەکە بۆ دادگە بەرز دەکاتەوە، تا بەشێوەیەکی دادپەروەرانە بڕیاری تێدا بدات.

نهێنیی ئەم جیاوازیەیش ئەوەیە مافی دەستدرێژی لەسەرکراو لە پابەندیی مەدەنیدا مافێکی تایبەتی تاك یان تاقمێکی دیاریکراوە، بەپێچەوانەی پابەندیی تاوانکاری کە بابەتەکەی مافێکی گشتیی رووتە، یان لایەنی گشتی تێیدا زاڵە.

**دوازدەیەم: لەرووی سزاوە**

سزا لە پابەندیی مەدەنیدا ماڵێکی هاوچەشن (مثلي)ـە لەبەرانبەر ئەوەی کەسی پابەند تەلەفی کردوە ئەگەر هاوچەشنی هەبوو، ئەگینا لەسەریەتی بارتەقای قەبارەی ئەو زیانەی داوێتی، قەرەبووی دارایی بکاتەوە، بەپێچەوانەی پابەندییە سزاییەکان کە کۆمەڵە سزایەکن بەگوێرەی سروشت و قەبارەی تاوانەکە دەگۆڕێن.

**سیازدەیەم: لە رووی فەلسەفەی سزاوە**

لە پابەندیی مەدەنیدا فەلسەفەی سزا پڕکردنەوەی زیانێکە بە کەسی بۆ-پابەند گەیشتووە، یان قەرەبووکردنەوەی قازانجێکە کەسی پابەند بووەتە بایسی لەکیسدانی، بەڵام فەلسەفەی سزا لە پابەندیی سزایی لەسەردەمی نوێدا چاککردنی تاوانکار و سڵەماندنەوە (الردع)ی تایبەت (بەرگرتنە لە تاوانکار کە جارێکیتر

بگەڕێتەوە سەر تاوانەکە)، هەروەها سڵەماندنەوەی گشتییە (بەرگرتن لە کەسانیتر کە شوێنپێی هەڵبگرن).

**چواردەیەم: لەڕووی بیمەکردنەوە:**

لە پابەندیی مەدەنیدا دەکرێ بیمە دژی زیانێك بکرێ، وەك بیمەکردن دژی سوتان و ڕووداوە سروشتیەکانی وەك لافاو و تێکشکانی فڕۆکە لە ئاسمان و ڕووداوی ئۆتۆمبێل لە ڕێگە وشکانیەکان و کەشتی لە گەشتی دەریاییدا، بەپێچەوانەی پابەندیی جینائی کە بیمەکردن دژی تاوانی دەستدرێژیکردنە سەر ژیانی خۆی یان ژیانی ئەوانەی بیمەیان بۆ دەکرێ دروست نیە، لەبەرئەوەی سروشتی بابەتەکە ئەوە هەڵناگرێ.

**پازدەیەم: لەڕووی دیاریکردنی کارە ناڕەواکانەوە:**

لە پابەندیی تاوانکاریدا یاسا لە سەرجەم دەوڵەتانی دنیا لەسەر بنەمای ڕێسای (نە تاوان و نە سزا، بەبێ دەق نیە) کارە تاوانکاریەکانی دیاریکردوە و قازی بۆی نیە لەڕێی تەفسیرکردنەوە دەقی تاوانبارکردن یاخود بەتاواندانان فراوان بکا بەشێوەیەك ببێتە مایەی داهێنانی تاوانێکی نوێ کە یاسا بەدەق تاوانباری نەکردوە، یان سزایەك کە لە یاسای سزاکاندا دیاری نەکراوە. بەپێچەوانەی کارە ناڕەوا زیانبەخشەکان کە قەرەبوو واجب دەکەن، کە ئەمانە لە یاسادا سنووردار نەکراون. هەموو کارێکی زیانبەخش بەبێ پاساو، یاسا پابەندی لەسەر دروست دەکا بە دانی بەدەڵێك بۆ ئەو قەرەبووە، چ بە ماڵێکی هاوچەشن بێ یان نرخ لە ماڵی نرخدار (المال القيمي).

**شازدەیەم: لەڕووی قەبارەی سزای پابەند لەسەر تێکدانی ئەرکێکی یاسایی:**

سزا لە پابەندییە جینائیەکاندا بە چەند سزایەکی تایبەت لە یاسای سزاکاندا دیاری کراوە. بەڵام لەوانەیە یاسا لای خوار و لای سەروو بۆ ئەم سزایە دابنێ و دەسەڵاتی مەزەندەکردن بە قازی دەدرێ بۆ حوکمدان بە لای خواری یان نزیك لەوە ئەگەر هاتوو ئەو هەلومەرجەی پەیوەندی بە تاوانەکە یان بە کەسی تاوانکارەوە هەیە لەڕووی ئەو

مەترسیەی تێیدایە، لە بەرژەوەندیی تاوانکار بوو، یان حوکمدان بە لای سەرووی سزاکە یاخود نزیك لەو ئەگەر هەلومەرجەکە دژی بەرژەوەندیی تاوانکار بوو. قەبارەی سزاکە بە یاسا دیاری کراوە و لەنێوان ئەو دوو جەمسەرەدایە، بەپێچەوانەی قەبارەی سزا لە پابەندیی مەدەنیدا کە ناتوانرێ پێشوەخت و بەر لە روودانی زیانەکە بە یاسا دیاری بکرێ، لەبەرئەوەی قەبارەی ئەم سزایە، جا چ ماڵێکی هاوچەشن بێ یان نرخێك بێ لە ماڵی نرخدار، پاش قەومان و مەزەندەکردنی لەلایەن کەسانی شارەزاوە، جیاوازە.

**حەڤدەیەم: لەرووی پێیەیوەستی سکاڵاکەوە (متعلق الدعوى):**

لە پابەندیی تاوانکاریدا شتێکی سروشتییە پێیەیوەستی دەعواکە کە داوا لەسەرکراو (مدعى عليه)ـە کەسی تاوانکارە ، جا ئەگەر ئەو کەسە بە مردن یان شێتی، بەو مەرجەی لەکاتی تاوانەکەدا شێت بووبێ، شیانی لەدەستدا داواکەیش دەکەوێ، بەڵام ئەگەر شێتبوونەکە پاش ئەنجامدانی تاوانەکە روویدابێ، رێوشوێنە قەزاییەکان رادەگیرێن. ئەگەر شێتیەکە تا مردن بەردەوام بوو داواکە دەکەوێ، بەپێچەوانەی پابەندیی مەدەنی کە دەستەبەری بابەتی پابەندیەکە سامانی قەرزارەکەیە، داواکە ئەگەرچی روو لە کەسی قەرزار دەکرێ، بەڵام لە واقیعدا پێپەیوەستەکەی سامانی قەرزارەکەیە و پاش مردنی پەیوەندی بە میراتە بەجێماوەکەیەوە هەیە و پێویستە بەر لە دابەشکردنی، قەرزەکەی لێ دەربکرێ، بەڵام رێگر نیە لە گواستنەوەی خاوەندارێتیەکەی بۆ وەرەسەکە بەباری گرانی قەرزەکەوە. میرات وەك ماڵی رەهنکراوە بۆ زەمانکردنی قەرزەکە، هەربۆیە دەست تێخستنی بەر لە دانەوەی قەرزی خاوەن قەرزەکان، لەسەر مۆڵەتی خاوەن قەرزەکان یان دانەوەی قەرزەکە دەوەستێ.

شێخ مارفی نۆدێ (رەحمەتی خوای لێبێ) کە ئەحکامی میراتی لە کتێبی(فکر العارج)دا رێك خستووە دەڵێ:

والدين لا يمنع من أن يملكا　　　　ورثة الميت ما قد تركـــــا

لكن به عُلـق كالمرهـــون | لأنه أحوط للمدفـــون
فلم يكن تصرف فيه نفـذ | من وارث إذن الغريم ما أخذ
أما إذا تصرف منه جـرى | فلم يكن إذ ذاك دين فطرى
بالرد بالعيب أو التـــردي | في بئر عدوان مع التعـــدي
لتلف فنافذاً قد رســـخا | إن أودّيَ الدين وإلا فســخا

**هەژدەیەم: لەرووی هەڵەی گریمانەكراوەوە**

لە پابەندیی تاوانكاریدا حساب بۆ هەڵەی گریمانەكراو ناكریٚ، هەربۆیە بـۆ نموونـە لێپرسینەوە لە شوێنكەوتوو ناكریٚ لەسەر تاوانی شوێنكەوتەكەی، ئەویش بینا لەسەر كەسایەتیی سزا لە یاسادا كە قورئانی پیرۆز سەدان ساڵ بـەر لـە یاسا لـە چـەندین ئایەتدا بەدەق باسی كردوە، لەوانە ئایەتی ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْـرَى﴾. بەپێچـەوانەی حاڵەتەكە لە پابەندیی مەدەنیدا، كە خاوەن كارگە لێپرسـینەوەی لەگـەڵ دەكرێـت و پابەند دەبیٚ بە قەرەبووكردنەوەی ئەو كرێكارەی لەكاتی كاركردنـدا تووشـی زیانێـك یان نەخۆشیەكی درێژخایەن دەبیٚ، هەروەها شوێنكەوتوو لەبارەی شـوێنكەوتەكەی لێی دەپرسرێتەوە ئەگەر لەكاتی كاركردنیدا بۆ ئەو، زیانێكی بە كەسیتر گەیانـد. بـۆ نموونە وەزارەت بەرپرسە لە قەومانی زیانێك لە دەستی یەكێك لە فەرمانبەرانی سەر بەو وەزارەتە، كە بەهۆی ئەنجامدانی كارەكەیەوە لەدەستی قەوماوە.

**نۆزدەیەم: لەرووی كۆنبوونی بخەرەوە**

لە پابەندیی مەدەنیدا دەعوا پاش تێپـەربوونی ماوەیـەك كـە لـەنێوان سـاڵێك تـا پازدە ساڵدایە بەسەر ئەو مافـەی ئیـدیعا دەكـریٚ (بابـەتی دەعواكـە) بـەبیٚ ئـەوەی قەرزدەرەكە یان نوێنەرەكەی داوای ئەو مافە بكەن، دەكەویٚ.

بەڵام پابەندیی تاوانكاری بەشێوەیەكی سادە نـەبیٚ پـەیڕەوی لـە كاریگـەربوونی كۆنبوون لەسەر كەوتنی دەعوا نەكردوە، وەك لە یاسای سزادانی عێراقی بەركاردا كە لە بابـەتی زینـاكردنی یـەكێك لـە ژن یـان مێـرد (ناپـاكیی هاوسـەری)دا، لـە مـادەی

(٣٧٨)ی دەڵێ "سكاڵاكە قبوڵ ناكرێ ئەگەر پاش تێپەڕبوونی سێ مانگ بەسەر ئەو ڕۆژەی سكاڵاكار بە تاوانەكەی زانیوە پێشكەش كرابێ".

هەندێ یاسای سزایی پەیڕەوییان لە كاریگەریی كۆنبوون كردوە، لەوانە یاسای ڕێوشوێنە سزاییە بەركارەكانی میسر، كە لە مادەی (١٥)دا دەڵێ "دەعوای جینائی لە مادەكانی تاواندا بە تێپەڕبوونی دە ساڵ بەسەر ڕوودانی تاوانەكەدا بەسەر دەچێ، لە مادەكانی كەتندا بەتێپەڕبوونی سێ ساڵ، لە مادەكانی سەرپێچیەكانیشدا بە تێپەڕبوونی ساڵێك، مەگەر یاسا شتێكیتری جیاواز لەوە بڵێ".

هەرچی كەوتنی سزایە مادەی (٥٢٩) دەڵێ "سزای بڕیاردراو پاش تێپەڕبوونی بیست ساڵی زاینی دەكەوێ جگە لە سزای لەسێدارەدان كە بە تێپەڕبوونی سی ساڵ دەكەوێ، سزای بڕیاردراو لە كەتندا بە تێپەڕبوونی پێنج ساڵ دەكەوێ، سزای بڕیاردراو لە سەرپێچیدا بە تێپەڕبوونی دوو ساڵ دەكەوێ".

لەو یاسایانەی پەیڕەوییان لە بنەمای كۆنبوونی بخەر لە دەعوای سزایی و سزاكان نەكردوە، یاسای ئینگلیزییە كە حساب بۆ فەلسەفەی كۆنبوون ناكا، كە بریتییە لەوەی كۆنبوون لەسەر لەبیركردنی تاوانەكە و حوكم تێدادانی دامەزراوە[1].

---

[1] بڕوانە: د. محمود مصطفى، شرح قانون العقوبات المصري، القسم العام، ط١، ١٩٨٣، ص٦٩١ و پاشتر.

## پێشەکی

مەبەست لە تێدا–پابەند (الملتزم فیه) ئەو مافە ماڵینە و شەخسییە ماددی و مەعنەویانەن کە بابەتی پابەندیەکانن بەهۆی رەفتارە یاساییەکان یان رووداوە یاساییەکان یان رووداوە سروشتیەکانەوە لە گرێبەند و ویستی تاکلایەنە بەمانا گشتییەکەی کە سەرتاپاگیرە و هەموو گوفتارە سوودبەخشەکانی وەك بەخشین و وەسێت و وەقف و بەخشینەکانیتر، یان گوفتارە زیانبەخشەکانی وەك تەڵاقدانی ملهوڕانە (تعسفی) لە باری کەسین و شایەتیدانی ساختە و هەواڵی درۆ دژی بەرژەوەندیی کەسانیتر، هەروەها لە پابەندییە جینائێیەکاندا قەزفکردن و شتی لەو شێوەیە، دەگرێتەوە.

یان کردارە سوودبەخشەکانی وەك فوزالە و گفتی خەڵاتکردن لە مامەڵە داراییەکان و دوورخستنەوەی مەترسیی تاوانکارانە لە کەسانیتر ئەگەر خەرجی دەخستە سەر[1].

یان کردارە زیانبەخشەکانی وەك دەسکەوتن بەبێ هۆ (زەنگینبوون بەبێ هۆ)، یان زیانگەیاندن بە ماڵی کەسیتر راستەوخۆ یان بەئەنقەست، بە بوونەهۆ یان بەدەستدرێژی. یان رووداوە سروشتیەکان، وەك پاشتر لەژێر چەمکی گرێبەند و ئەو ناونیشانانەی دەچنە ژێر چەمکی گشتیی ویستی تاکلایەنە (یان رەفتاری تاکەکەسی) نەك بەو مانا تەسکەی یاسا هاوچەرخەکان بۆ ئەو زاراوە گشتیەیان پەسەند کردوە، بەدرێژی لەوە دەکۆڵینەوە.

بەڵگەنەویستە: تێدا–پابەند مافی کەسی بۆ–پابەند و بابەتی پابەندیی کەسی پابەندە. مافەکانیش لەڕووی جۆر (النوع) یان پۆل (الصنف)ەوە زۆرن، هەندێکیان

---

[1] ئەگینا بەرگریکردن لە ژیان و ناموس و ماڵی کەسانیتر ئەرکێکی شەرعی و یاساییە وەك بەرگریکردن لەو مافانەی خۆی، ئەم جۆرە بەرگریکردنە هیچ پابەندیەکی تێدا نیە بۆ قەرەبووکردنەوەی بەرگریکارەکە.

ماڵینــەی ئەســڵی یــان شــوێنکەوتەین، هەیانــە کەســیی مــادی یــان مەعنــەوین، هەندێکیشیان گشتی یان تایبەت یان ئەو جۆرە شتانەن.

بۆ–پابەند کەسێکی سروشتی یان مەعنەوییە. یەکەمیان یان ئەوەتا لەکاتی پەیدابوونی پابەندیەکەدا هەیە (موجود) یان نیە (معدوم)، هەبوویش یان زانراوە یان نەزانراو.

لەبەر تیشکی ئەم دابەشبوونە وێناکراوانەدا توێژینەوەی ئەوەی دەچێتە ژێر ناونیشانی ئەم بەشی چوارەمە لە سێ باسدا قسەی لەسەر دەکرێ. یەکەمیان تەرخان دەکرێ بۆ نەهێشتنی ئەو تێکەڵیەی لەنێوان تێدا–پابەند (بابەتی پابەندی یان شوێنی گرێبەند) و پێ–پابەند (شوێنی پابەندی)، یان ئەنجامدانی ئەرێنیانە ( کردنی کارەکە) و نەرێنیانە (نەکردنی کارەکە)دا.

دووەمیان بۆ تێدا–پابەند (مافەکانی قەرزدەر) و سێیەمیان بۆ بۆ–پابەند (قەرزدەر) تەرخان دەکرێ.

# باسی یەکەم:
# نەهێشتنی تێکەڵی لەنێوان
# تێدا-پابەند و پێ-پابەند

ئەو یاسا عەرەبییە هاوچەرخانەی لەژێر کاریگەریی یاسای مەدەنیی میسریی[1] بەرکاردان، کە ئەویش لەژێر کاریگەریی فیقهی فەرەنسیدایە، تێدا–پابەند (بابەتی پابەندی یان شوێنی گرێبەست) و پێ–پابەند (شوێنی پابەندی)یان تێکەڵ کردوە و یەکەمیان لەباتی دووەم بەکارهێناوە و لەکاتی تاوتوێکردنی پایەکانی گرێبەند (رەزامەندی و شوێن و هۆ)دا، لەباتیی باس لە پایەی گرێبەست بکەن باسیان لە پایەی پابەندی کردوە.

هەندێ لە گەورە یاساناسان لە جیهانی عەرەبیش، بەتایبەت لە میسر کە ئەم یاسایانەیان شەرح کردوە هەمان رێچکەی هەڵەیان گرتۆتەبەر، بەبێ ئەوەی هیچکامیان ئاماژە بەم دوو هەڵە گەورە و زەقە لەنێوان بابەتی پابەندی و شوێنەکەی لەلایەك و رەگەزی گرێبەست و رەگەزی پابەندی لەلایەکیترەوە، بکەن.

ئەوە روونە، وەك پێشتر باسمان کرد، هەموو گرێبەندێکی راست و دروست شەش رەگەزەکەی پابەندی تێدایە، کە بریتین لە: (پابەندکردن، پابەندی، بۆ–پابەند، هۆی پابەندی، تێدا–پابەند (بابەتی پابەندی)، پێ–پابەند (شوێنی پابەندی).

---

[1] ژمارە (١٣١)ی ساڵی ١٩٤٨.

**بۆ نموونە لە گرێبەستی دروستی فرۆشتندا:**

١- پابەندکردن (الالزام)، یان هێزی پابەندکار یاسایە نەك دەسەڵاتی ئیرادە وەك پێشتر وا باو بوو.

٢- پابەند (الملتزم): بەنیسبەت فرۆشراوەکەوە فرۆشیارە و بەنیسبەت نرخەکەیشەوە کڕیارە.

٣- بۆ-پابەند (الملتزم له): بۆ فرۆشراوەکە کڕیارە و بۆ نرخەکە فرۆشیارەکەیە.

٤- تێدا-پابەند (الملتزم فیه) (بابەتی پابەندی): ئەوەیە گرێبەندی لەسەر دەکرێ، یان هەردوو شتە ئاڵوگۆڕ کراوەکەن.

٥- پێ-پابەند (الملتزم به) (شوێنی پابەندی): ئەنجامدانەکەیە، ئەویش بە رادەستکردنی فرۆشراوەکە و دانی نرخەکە.

٦- هۆی پابەندی (سبب الالتزام): بریتییە لە فرۆشتنە دروستەکە و حوکمێکی دانراو (وضعي)یە[1].

پابەندی حوکمێکی شەرعی و یاسایی و تەکلیفییە و پەیامی دەقە شەرعی و یاساییەکان (گوتاری شەرعدانەر و یاسادانەر)ـە، کە پەیوەنی بە رەفتارەکانی مرۆڤەوە هەیە لەرووی پێویستکردن (الاقتچاو) یان سەرپشککردن (التخییر)ەوە. الاقتضاء: بریتییە لە داوای کردن یان داوای وازلێهێنان.

---

[1] هۆ، جۆرێکە لە جۆرەکانی حوکمی وەزعی و مەدلولی دەقە شەرعی یان یاساییەکانی پەیوەست بە رەفتار یان رووداوەکانە، لە رووی کردنیان بە (هۆ) وەك خزمایەتی کە هۆیە بۆ مافی میرات، هەروەها هۆیە بۆ پابەندبوونی دەوڵەمەند بە خەرجیکێشانی خزمی هەژاری. یان کردنیان بە (رێگر) وەك شێتی کە رێگرە لە بەرپرسیارێتیی جینائی. یان بە (مەرج) وەك کردنی عەقڵ بە مەرجێك بۆ دروستیی رەفتارەکان.

**یەکەم: داوای کردن دوو جۆرە:**

یەکێکیان: داوای کردنەکە لە شێوەی حەتمدایە کە ناچارکردن (پێویستکردن)ـە، ئەوەی داوای کردنی دەکرێ واجب و تێدا-پابەندە و وازلێهێنانی بەرپرسیارێتیی مەدەنی و جینائی لێدەکەوێتەوە.

دووەمیان: داوای کردنەکە لە شێوەی لەپێشبوون و باشتربووندایە و کردنی بە پەسەند دادەنرێ، ئەوەی داوای کردنیشی دەکرێ پێخۆش (مستحب)ـە و هیچ بەرپرسیارێتیەکی دنیایی مەدەنی یان جینائی لە نەکردنی ناکەوێتەوە، بەڵام لەوانەیە نەکردنی گلەیی و رەخنەی لێ بکەوێتەوە. لە بابی ئەخلاقیاتە، لەبەرئەوە یاسا لە هەندێ کایەی بەرتەسکدا نەبێ قسەی تێدا نەکردوە.

**دووەم: داوای نەکردن دوو جۆرە:**

یەکێکیان: داواکردنەکە لە شێوەی حەتمدایە کە بە حەرام یان بەتاواندانانە و کردنی ناڕەوایە، هەربۆیە لە کارە مەدەنییە زیانبەخش و ناڕەواکاندا دەستبەری پێویست دەکات، هەروەك لە کارە جورمیە ناڕەواکانیشدا (قەدەغەکراوەکان) سزا پێویست دەکات.

دووەمیان: داوای نەکردنە لە شێوەی لەپێشبوون و باشتربوون و بەخراپدانانە و کردنی پێناخۆش (مکروه)ـە، نە لە شەرع و نە لە یاسادا هیچ سزایەکی مەدەنی یان سزای دنیایی لێ ناکەوێتەوە، بەڵام لەوانەیە گلەیی و رەخنەی لە دنیادا لێ بکەوێتەوە، وەك تەرککردنی سیلەی رەحم و پشتگوێخستنی سەردانی نەخۆش، لەبەر ئەو هۆیەی باس کرا یاسا قسەی لەسەر ئەم جۆرەیشی نەکردوە.

**سێیەم: سەرپشککردن:**

بریتییە لە ئازادکردنی مرۆڤ لەنێوان کردن یان نەکردنی شتێکدا بەبێ ئەوەی هیچ بەرپرسیارێتیەکی جینائی یان مەدەنی یان ئەدەبی، نە لەسەر کردنەکە و نە لەسەر

نەکردنەکە بکەویتەوە، وەك دیاریکردنی کاتێکی دیاریکراو بۆ خوێندنەوە یان خەوتن یان خواردن یان سەردانی کەسانیتر[1].

هەوڵ دەدەین بۆ خوێنەری بەڕێز و هەرکەس بەلایەوە گرنگە راستیەکان بزانێ، نموونەی چەند دەقێکی یاسایی بخەینە روو کە ئەو تێکەڵکردنەیان تێکەوتووە کە باس کرا.

یاسا مەدەنییە عەرەبیەکان، هەندێکیان کەوتونەتە ژێر کاریگەریی یاسای مەدەنیی میسریی کارتێکراو بە فیقهی فەرەنسی و کەوتوونەتە نێو هەڵەی تێکەڵکردن، هەندێکیشیان نەکەوتوونەتە ژێر کاریگەریی ئەو یاسایە و لەو هەڵەیە دوور بوون.

**یەکەم: لەو یاسایانەی لەژێر کاریگەریی یاسای مەدەنیی کارتێکراو بە فیقهی فەرەنسیدان:**

یاسای مەدەنیی عێراقیی بەرکار[2] کە رەحمەتی عەللامە ئەلسەنهوری لە کۆتایی چلەکان و سەرەتای پەنجاکانی سەدەی رابردوودا (سەدەی بیستەم)، سەرۆکایەتیی لیژنەی ئامادەکردنی پرۆژەکەی کرد، کە لە لقی یەکەمی بەشی یەکەمی بابی یەکەمی تایبەت بە سەرچاوەکانی پابەندی و چارەسەری پایەکانی گرێبەند (رەزامەندی و شوێن و هۆ)دا هاتووە:

أ- مادەی (١٢٦): "مەرجە هەموو پابەندیەك لە گرێبەند دەکەوێتەوە شوێن (محل)ێکی هەبێ بدرێتە پاڵی کە حوکمەکەی قبوڵ بکا، دروستە شوێنەکە ماڵێکی عەینی یان قەرز یان سوودێك یان هەر مافێکیتری ماڵی بێ".

ئاشکرایە ئەم مادەیە لەباتیی پایەی گرێبەند (شوێنی گرێبەند) کە رێکەوتنی لەسەر کراوە، باسی پایەی پابەندی (شوێنی پابەندی) کردوە کە ئەنجامدانە (الاداء)

---

[1] بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ئەم بابەتە سەیری ئەم کتێبەمان بکرێ: أصول فقه في نسيجه الجديد، ٢/٢٠٦ و ئاشتر.

[2] رقم (٤٠) لسنة ١٩٥١.

و هەردوو پایەکەی تێکەڵ کردوە: لەلایەك پایەی گرێبەند و پایەی پابەندی و لەلایەکیتر شوێنی گرێبەست و شوێنی پابەندی تێکەڵ کردوە.

وا راستە بەم شێوەیە دابڕێژرێ: "پێویستە هەموو گرێبەندێك شوێنێکی هەبێ بدرێتە پاڵی کە حوکمەکەی قبوڵ بکا،... هتد".

ب- مادەی (١/١٢٧): "ئەگەر شوێنی پابەندی بەرەهایی مەحاڵ بوو، گرێبەندەکە بەتاڵ دەبێ". راستیەکەی ئەوەیە: "ئەگەر شوێنی گرێبەند بەرەهایی مەحاڵ بوو، گرێبەندەکە بەتاڵ دەبێ".

ح- مادەی (١/١٢٨): "پێویستە شوێنی پابەندی بەشێوەیەك دیاری بکرێ هەر نەزانیەکی زەق (فاحش) بداتە دواوە، جا دیاریکردنەکە چ بە ئاماژەکردن بێت بۆی یان بۆ شوێنی تایبەتی خۆی ئەگەر لەکاتی گرێبەندەکەدا مەوجود بوو، یان روونکرنەوەی وەسفە جیاکەرەوەکانی لەگەڵ باسکردنی ئەندازەکەی ئەگەر لە ئەندازەکراوەکان بوو و شتی لەو جۆرە کە نەزانیی زەقی پێ دوور دەخرێتەوە. نابێ تەنها باسی رەگەزەکە بکرێ و باسی ئەندازە و وەسفەکە نەکرێ". راست ئەوەیە دارشتنی ئەم مادەیە بەم شێوەیە بێ:

"پێویستە شوێنی گرێبەند بەشێوەیەك دیاری بکرێ هەر نەزانیەکی زەق بداتە دواوە...هتد". هەروەها پێویستە وشەی (الجنس)ەکە (رەگەز) تێیدا بگۆڕێ بۆ (الصنف) (پۆل) و بەم شێوەیەی لێبێ "نابێ تەنها باسی پۆلەکە بکرێ و باسی ئەندازە و وەسفەکە نەکرێ "، لەبەرئەوەی پۆل خۆی دەچێتە ژێر خانەی جۆر (النوع) و جۆریش دەچێتە ژێر خانەی رەگەز. ئەوە پۆلەکانن دەبنە شوێنی گرێبەند ئەگەر لە حاڵەتی غیابیاندا وەسف و ئەندازەیان روون کرایەوە. هەرچی رەگەز یان جۆرن بەهیچ شێوەیەك نابنە شوێنی گرێبەند لە حاڵەتی غیابیاندا، جا چ بە وەسف و ئەندازە دیاری بکرێن یان نا.

پاشان وەسفەکانی دیاریکردن یان قابیل بۆ دیاریکردن بۆ شوێنی پابەندی کە بریتییە لە ئەنجامدان (الاداء) بەکار نایەت.

د- مادەی (١/١٢٩): "دەكرێ لەكاتی گرێبەندكردندا شوێنی پابەندی نەبێ ئەگەر دەكرا لە ئایندەدا بەدەست بێ و بەشێوەیەك دیاری كرا نەزانی و نادڵنیایی بداتە دواوە".

ڕاست ئەوەیە داڕشتنەكەی بەم شێوەیە بێ: "دەكرێ لەكاتی گرێبەندكردندا شوێنی گرێبەند نەبێ... هتد"، لەبەرئەوەی شوێنی پابەندی ئەنجامدانە و ئەو مەرج و وەسفانەی بەسەردا ناچەسپێن كە لەم مادەیەدا هاتوون.

هـ- مادەی (١/١٣٠): "دەبێ شوێنی پابەندی لەڕووی یاساوە قەدەغە نەبێ و پێچەوانەی سیستمی گشتی یان ئاداب نەبێ ئەگینا گرێبەندەكە بەتاڵ دەبێ".

بەم شێوەیە ئەم دەقە یاساییانەی یاسای مەدەنیی عێراقی لەلایەك پایەكانی گرێبەند و پایەكانی پابەندییان تێكەڵ كردوە و لەلایەكیترەوە شوێنی گرێبەند و شوێنی پابەندییان تێكەڵ كردوە. ئەمە جگە لە هەڵەی بەكارهێنانی ڕەگەز (الجنس) بۆ دەربڕین لەباتیی پۆل (الصنف).

پێشتر باسمان كرد كە ئەم هەڵانە بەرەنجامی كاریگەربوونی یاسای مەدەنیی عێراقی و هیترە بە یاسای مەدەنیی میسریی كارتێكراو بە فیقهی فەرەنسی. بۆ دڵنیابوون لەوە، هەڵوەستە لەسەر ئەو هەڵانە دەكەین كە لە یاسای مەدەنیی میسریی بەركار لە مادەكانی (١٣١-١٣٥)دا هاتوون:

أ- مادەی (١٣١): "دەكرێ شوێنی پابەندی شتێكی ئایندەیی بێ..هتد".

ب- مادەی (١٣٢): "ئەگەر شوێنی پابەندی بەخودی خۆی دیاری نەكرابێ، پێویستە جۆر و ئەندازەكەی دیاری كرابن، ئەگینا گرێبەندەكە بەتاڵە...هتد".

ج- مادەی (١٣٣): "ئەگەر شوێنی پابەندی بەخودی خۆی دیاری نەكرابێ، پێویستە جۆر و ئەندازەكەی دیاری كرابن، ئەگینا گرێبەندەكە بەتاڵە...هتد". ڕاستیەكەی ئەوەیە " ئەگەر شوێنی گرێبەند بەخودی خۆی دیاری نەكرابێ، پێویستە پۆلەكەی دیاری كرابێ، ئەگینا گرێبەندەكە بەتاڵە...هتد". "ئەوەندە بەسە شوێنەكە تەنها پۆلەكەی دیاریكراو بێ...هتد".

د- مادەی (١٣٤): "ئەگەر شوێنی پابەندیە پارەیەك بوو، قەرزارەكە پابەندی ئەو ژمارانەی دەبێ كە لە گرێبەندەكەدا باس كراون بەبێ ئەوەی بەرزبوونەوە یان نزمبوونەوەی بەهای ئەو پارەیە لەكاتی دانەوەیدا هیچ كاریگەریەكی هەبێ".

لەم مادەیەدا جگە لەو تێكەڵكردنەی باس كرا، هەڵەیەكی گەورە هەیە كە هی لێخۆشبوون نیە، ئەویش ئەوەیە دەڵێ، بەرزبوونەوە یان نزمبوونەوەی بەهای پارە هیچ كاریگەریەكی لەسەر پابەندیی قەرزار بە دانەوەی بڕی پارەكە لەكاتی دورستبوونی پابەندیەكەدا نیە. ئەم حوكمە جگە لەوەی نادادپەروەرانەیە مایەی سەرسوڕمانیشە، لەبەرئەوەی پارە لە شتە هاوچەشنەكان (المثليات)ە و هاوچەشنی هەر شتێكیش ئەوەیە بە شێوە و مانا لەگەڵیدا یەكسانە[1]. شێوەی پارەیش لەو ماوەیەی دەكەوێتە نێوان دروستبوونی پابەندی و جێبەجێكردنیدا، بەزۆری هەر وەك خۆی دەمێنێتەوە، بەپێچەوانەی ماناكەی (هێزی كڕین)، جا ئەگەر بە بەرزبوونەوە یان نزمبوونەوە گۆڕا سیفەتی هاوچەشنی لەدەست دەدات و دەگۆڕێكی بۆ ماڵێكی بەهایی. لەم رووەوە بەرزبوونەوە و دابەزینی بەهاكەی كاریگەریەكی روونی لەسەر بڕی دیاریكراو لە گرێبەندەكەدا هەیە و پێویستە لەكاتی دامەزراندنی پابەندیەكەدا حساب بۆ هێزی كڕینی پارەكە بكرێ نەك لەكاتی جێبەجێكردنیدا ئەگەر هاتوو بەهاكەی بە بەرزبوونەوە یان نزمبوونەوە گۆڕانی بەسەردا هات. بۆیە پێویستە قەرزار لەبەر رۆشنایی ئەم گۆڕانە لە دراوەكەدا پابەندیەكەی جێبەجێ بكا، ئەویش بە سەیركردنی هێزی كڕینی لەكاتی دامەزراندنی پابەندیەكەدا، یان خەمڵاندنی نرخەكەی بە زێڕ لەكاتی ئیمزاكردنی گرێبەندەكەدا.

هـ- مادەی (١٣٥): "ئەگەر شوێنی پابەندی پێچەوانەی سیستمی گشتی و ئاداب بوو گرێبەندەكە بەتاڵە" راستەكەی ئەوەیە پابەندی بگوردرێ بە گرێبەند.

---

[1] بۆ پارە، مانا بریتییە لە هێزی كڕین، بەڵام بۆ شتیتربەكەلكهاتنە بۆ بەسوود لێبینین.

هەردوو یاسای ناوبراوی عێراقی و میسری لەنێو ئەو یاسایانەی وڵاتانی عەرەبی كە لەژێر كاریگەریی یاسای میسریدان، لە هەموویان زیاتر لەیەك دەچن لەم چوار هەڵەیەی خوارەوەدا:

١- لە تێكەڵكردن لە نێوان پایەی گرێبەند و پایەی پابەندیدا.

٢- لە تێكەڵكردن لە نێوان شوێنی گرێبەند و شوێنی پابەندیدا.

٣- لە گوتنی كاریگەرنەبوونی گۆڕانی بەهای پارە (هێزی كڕینی) بەبەرزبوونەوە و نزمبوونەوە لەسەر پابەندیی قەرزار، كە ئەو پابەند دەبێ بە ئەندازەی ئەو ژمارەیەی لەكاتی بەستنی لە گرێبەندەكەدا باس كراوە.

٤- بەكارهێنانی رەگەز یان جۆر لەباتیی پۆل.

هەر لەو یاسایانە:

یاسای مەدەنیی سوریی بەركار (مادەكانی ١٣٢-١٣٦)، مەدەنیی كوێتیی بەركار (مادەكانی ١٦٧-١٧٣)، مەدەنیی جەزائیریی بەركار (مادەكانی ٩٢-٩٦)، یاسای پابەندیەكان و گرێبەندی مەغریبیی بەركار (فەسڵەكانی ٥٧-٦١)، یاسای مەدەنیی قەتەریی بەركار (مادەكانی ١٦٤-١٥١)، یاسای بەحرێنیی بەركار (مادەكانی ١٠٣-١١٠) و مەدەنیی لیبیی بەركار (مادەكانی ١٣١-١٣٥).

**دووەم: ئەو یاسا مەدەنییە عەرەبیانەی لەژێر كاریگەریی یاسای مەدەنیی میسریدا نین:**

ئەوانە لە دوو هەڵەی یەكەم بەدوور بوون كە لە برگەی یەكەمدا باس كران ئەوانیش تێكەڵكردن بوون لەنێوان پایەی گرێبەند و پایەی پابەندی و تێكەڵكردن لەنێوان شوێنی گرێبەند و شوێنی پابەندیدا، بەڵام زۆربەیان لە سێیەم تێكەڵكردن قوتار نەبوون كە ئەویش ناكاریگەریی هێزی كڕینی پارەیە لەسەر پابەندیی قەرزار و پابەندبوونی بە دانەوەی بڕی ئەو ژمارانەی لەكاتی بەستنی گرێبەندەكەدا باس كراون.

هەروەها لە كەوتنە هەڵەی چوارەم قوتار نەبوون كە ئەویش بەكارهێنانی (جنس) و (نوع)ـە لەباتی (الصنف).

**لەم یاسایانە:**

* یاسای مەدەنیی ئوردنی بەرکار (مادەکانی ١٥٧–١٦٤). ئەم یاسایە لە مادەی (١٦٢)دا کەوتۆتە هەڵەی ناکاریگەریی گۆڕانی نرخی پارە لەسەر گۆڕانی پابەندی لەکاتی دانەوەی قەرزەکەدا، بەڵام لە مادەی (١٥٧)یدا دەڵێ "پێویستە هەموو گرێبەندێك شوێنێکی هەبێ بدرێتە پاڵی".

* یاسای دەوڵەتی ئیماراتی یەکگرتووی عەرەبی– یاسای مامەڵە داراییەکانی بەرکار (مادەکانی ١٩٩–٢٠٦)، کە مادەی (١٩٩) دەڵێ: "پێویستە هەموو گرێبەندێك شوێنی هەبێ بدرێتە پاڵی". هەروەها یاسای (الموجبات والعقود)ی لوبنانی (مادەکانی ١٨٦–١٩٣) ئەم یاسایە یاسای (بابەتی گرێبەند)ی بەکارهێناوە کە یەکسانە بە (شوێنی گرێبەند).

* یاسای مەدەنیی یەمەنیی بەرکار (مادەکانی ١٨٦–١٩٩) کە لە مادەی (١٨٦)دا لەباتیی (شوێنی پابەندی) دەستەواژەی گرێبەند لەسەرکراو (المعقود علیه) بەکارهێناوە کە (شوێنی گرێبەندە)، بەڵام لە مادەی (١٩٢)دا کەوتۆتە هەڵەی بەکارهێنانی (جنس) و (نوع) لەباتی (الصنف).

هەروەها کەوتۆتە هەڵەی ناکاریگەریی گۆڕانی نرخی پارە بەسەر گۆڕانی پابەندی لەکاتی دانەوەی قەرزەکەدا و لە مادەی (١٩٤)دا دەڵێ "ئەگەر پێ–پابەند پارە بوو، قەرزار بەئەندازەی ئەو ژمارەیەی لە گرێبەندەکەدا باس کراوە پابەند دەبێ بەبێ ئەوەی بەرزبوونەوە یان نزمبوونەوەی بەهاکەی لەکاتی دانەوەیدا هیچ کاریگەریەکی هەبێ".

ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە و هی لێخۆشبوون نیە، ئەویش لەبەرئەوەی پێشتر باسمان کرد کە پارە لەم حاڵەتەدا (حاڵەتی نزمبوونەوە و بەرزبوونەوەی نرخ) سیفەتی هاوچەشنبوون لە دەست دەدات و دەگۆڕێ بۆ بەهایی و پێویستە دانەوەکەی بەرانبەر بەهاکەی بێ لەکاتی پەیدابوونی هۆکەیدا، چونکە کارێکی دادپەروەرانە و بەویژدانانە و ماقووڵ نیە: قەرزارێك ساڵی ١٩٥٠ کە نرخی مسقاڵی

ئاڵتون (٧٥٠) فلس بووە سەد دینار قەرزی لە گەردندا بووە، لە ساڵی (٢٠٠٠)دا کە نرخی مسقاڵی ئاڵتون بە (١٢٠ هەزار) دینارە، هەمان بڕ (واتە سەد دینار) بداتەوە.

جگە لەمەی باس کرا، ئەم یاسایە کەوتە هەڵەیەکیتر، ئەویش بەکارهێنانی (پێ-پابەند)ە لەباتیی (تێدا-پابەند)، لەبەرئەوەی پێ-پابەند وەک وتمان ئەنجامدانەکەیە کە شوێنی پابەندییە، بەڵام تێدا-پابەند مافە (بابەتی پابەندی).

# باسی دووەم:
# تێدا-پابەند (مافەکانی بۆ-پابەند)

**یەکەم: پێناسەی ماف**

وشەی ماف (الحق) لە فەرهەنگە زمانەوانیەکاندا بە چەند مانا و لە چەند شوێنێکدا هاتووە. یەکێك لە هەڵە بڵاوەکان ئەوەیە توێژەر لە دانراو و لێکۆڵینەوە زانستیەکانیدا باسێکی سەربەخۆ یان خواستێك یان لقێك بۆ خستنەرووی مانا زمانەوانیەکان تەرخان بکا.

لە قورئانی پیرۆزدا وشەی (الحق) و داتاشراوەکانی بەزۆر مانا لە نزیکەی (٢١١) ئایەتدا هاتووە. دیارە شوێنی باسکردنیان تەفسیرەکانی قورئانی پیرۆزە.

سەبارەت بە مانای زاراوەیی (الحق)، زانایانی یاسا لە دەربڕین و چەمکەکانیدا بە چەندین جۆر پێناسەیان کردوە[١]، بەڵام لە شەرحەکانی یاسادا پێناسەیەکی رۆشنی تێروتەسەلم نەدی ئەو مەرجە لۆژیکیانەیان تێدا بێ کە پێشتر لەم کتێبەدا روون کرانەوە. ئەمە جگە لەوەی ئەم پێناسانە هەرهەموویان لاساییکارانەن و پاشین (خلف) بە هەموارکردنێکی سادە و ساکار لە دەربڕین یان زیاد و کەمکردنێکەوە، لە

---

[١] لەوانە پێناسەکردنی ماف بەوەی: بەرژەوەندیەکی خاوەن بەهای داراییە و یاسا بۆ تاکی بڕیار دەدات. الأستاذ اسماعيل العمري — الحق ونظرية التعسف في استعمال الحق في الشريعة والقانون، ص٣٤.

یان بەوەی: دەسەڵاتی ئیرادیی کەسەکەیە بەپێی یاسا. د. أحمد شوقي محمد عبدالرحمن، النظرية العامة للحق، ص٦.

ئەم دوو پێناسەیە هەردووکیان ناتەولو و کەموکورتن و هەموو مافەکان ناگرنەوە.

پێشین (سلف)یان دەگوێزێتەوە بەبێ ئەوەی ئەو پێناسانە تاوتوێ بکرێن و پێناسەیەکی نوێیان لێ بەرهەم بهێنرێ.

لەم روانگەوە پێمان وایە خستنەرووی پێناسە زاراوەییەکانی ماف و تاوتوێکردنیان، تەمەن بەفیڕۆدان و کات کوشتنە و جێی هیچ شتێکی لەدەستچوو پڕ ناکەنەوە.

**دووەم: دابەشکردنی ماف:**

زانایانی یاسا وەك چۆن سەرکەوتوو نەبوون لە هێنانی پێناسەیەکی تێروتەسەل بۆ ماف، سەرکەوتوویش نەبوون لە دابەشکردنی ماف بۆ چەند بەشێکی هەمەگیر و تێر و تەواو و ناتێهەڵکێش، وەك لەم نموونانەوە بۆمان دەردەکەوێ:

١- هەندێکیان مافەکانیان بۆ سیاسی و ناسیاسی دابەش کردوە، پاشان ناسیاسیەکانیان بۆ گشتی و تایبەت دابەش کردوە، پاشان دابەشکردنی تایبەتەکان بۆ مافەکانی خێزان و مافە داراییەکان، پاشان دابەشکردنی داراییەکان بۆ ماڵینە و کەسی و ئەدەبی[1].

**لە عەیبەکانی ئەم دابەشکردنە:**

١- مافە سیاسیەکانیش وەك ناسیاسیەکان بۆ گشتی و تایبەت دابەش دەکرێن، وەك لە پەیوەندییە ناوخۆیی و نێدەوڵەتیەکاندا ئەوە روونە.

ب- مافەکانی خێزان هەندێکیان دارایین وەك میرات و نەفەقەی ژن لەسەر مێردەکەی و نەفەقەی خزمی نەدار لەسەر خزمە داراکەی، هەندێکیشیان نادارایین وەك چێژوەرگرتنی ژن و مێرد لە یەکتر، هەروەها وەك رێزگرتنی دووسەرە و سوکنایی و رەحمەت و ئەو شتانە لەگەڵ ئەوەی کراونەتە هاوبەشکە (قسیم)ی مافە داراییەکان، ئەوەیش روونە هاوبەشکەی شت لەو شتە جیاوازە.

---

[1] وەك: الدكتور سليمان مرقس – موجز المدخل للعلوم القانونية، ص٢٥٦ و ئاشتر.

ج- دانانی مافە داراییەکان بە بەشێك لە مافە تایبەتەکان، ئەمەیش هەڵەیە، لەبەرئەوەی مافە داراییەکانیش دابەش دەبن بۆ گشتی و تایبەت، بۆ نموونە کانزاکان لە هەر هەرێمێکدا، چ فلزی بن یان نافلزی، بەشێکن لە ماڵی گشتی.

د- مافەکانی خودا کە بابەتی پابەندیەکانی خەڵکە، ناچنە خانەی هیچکام لەو بەشانەی باس کراون، بەڵام سوود و سەمەرەکەی بۆ کەسی پابەندە نەك بۆ-پابەند، لەبەرئەوەی خوا لە بەندەکانی رەهایە. لەوانەیش وەك ئەو پەرستنانەی لەسەر مرۆڤ فەرز کراون، ئەو مافانەیش هەندێکیان جەستەیی رووتن وەك نوێژ و رۆژوو، هەندێکیان ماڵیی رووتن وەك زەکات و بەخشین لەپێناو بەرژەوەندیی گشتیدا، یان دووسەرەن هەم ماڵی و هەم جەستەیین وەك حەج.

٢- هەندێکیان[1] بۆ دوو بەش دابەشیان کردووە، مافە ماددی و مەعنەویەکان. ماددیەکان ئەوانەن پەیوەستن بە پێویستییە مادیەکان وەك ئازادیی خاوەنداریتی (موڵکایەتی) و کار و نیشتەجێبوون، مەعنەویەکانیش ئەوانەن پەیوەستن بە بیری مرۆڤەوە وەك ئازادیی عەقیدە و بیرورا.

٣- هەندێکیان[2] پەیڕەوییان لە دابەشکردنی سیانینە کردوە، بۆ مافە کەسیەکان وەك ئازادیی هاتوچۆ و ماڵ + مافە فیکریەکان وەك ئازادیی بیرورا و عەقیدە و فێربوون + مافە ئابووریەکان وەك مافی موڵکداری و بازرگانی و پیشەسازی.

٤- هەندێکیشیان[3] پەیڕەوییان لە دابەشکردنی چوارینە کردوە بۆ مافە سیاسی و مەدەنی و ئابووری و کەلتوریەکان.

٥- هەندێکیتریان[4] بەرەو دابەشکردنی پێنجینە چوون و دەڵێن بەشەکانی ماف پێنجن: ئازادیی شەخسی و جەستەیی وەك مافی پاراستن لە کۆیلایەتی و زۆرداری +

---

(1) وەك: الدكتور عثمان خليل عثمان، الاتجاهات الدستورية الحديثة، ص١١١ و ئاشتر.

(2) وەك: الدكتور ثروت بدوي، النظم السياسية، ص٤١١ و ئاشتر.

(3) وەك: الدكتور سعيد محمد أحمد، الإعلان العالمي لحقوق الإنسان، ص٥ و ئاشتر.

(4) وەك: الدكتور أحمد حافظ نجم، حقوق الإنسان بين القرآن والإعلان، ص٣٣ و ئاشتر.

مافی ئاسایش و ئازادیی تاکەکەسی + ئازادیی ژیانی تایبەت + ئازادیی جەستەیی و دەستەبەری پاراستن لە ئەشکەنجەدان و هەتککردن و ئەو جۆرە شتانە + ئازادییە کەلتوری و مەعنەویەکان.

ئەوەی لە رەهەندەکانی ئەم دابەشکردنانە قوول ببێتەوە دەبینێ تێهەڵکێش (متداخل)ن، لەکاتێکدا هاوبەشکە لە هاوبەشکەکەی جیاوازە و دوو لێك جیاوازیش تێهەڵکێش نابن. پاشان ئەم دابەشکردنانە لەسەر پێوەرگەلی بابەتیانەی جێگیر دانەمەزراون. ئەمە جگە لەوەی لەسەر سەرپێوکردن (استقراء)ی ناتەواو دامەزراون کە بەلگەیەکی گومانگر (ظني)ی قەناعەت نەبەخشە، پاشان ئەوانە باسیان لە مافەکانی خودا نەکردوە  کە وەك باسمان کرد سوودی گشتییان بۆ مرۆڤایەتی هەیە.

لە روانگەی ئەو خەوشانەی باس کران، هەولم داوە شێوازێکی نوێی راست بگرمەبەر، چ بۆ پێناسەکردنی ماف یان دابەشکردنی و ئەم رێڕەوەم هەڵبژارد:

**یەکەم: پێناسەی ماف:**

ماف پێگەیەکی شەرعییە لەباریدایە خاوەنەکەی یان کەسانیتر سوودی لێ ببینن.

شیکردنەوەی پێناسەکە بۆ رەگەزەکانی:

١–پێگە (المركز): جیاکەرەوەیەکی تایبەتی ماددی یان مەعنەوییە بەهۆیەوە مافی کەسێك لە مافی کەسێکیتر جیا دەکرێتەوە لەڕووی کەسەکەوە نەك پۆل یان جۆر. بۆ نموونە سپێتیی کاغەزێکی سپیی دیاریکراو لە سپێتیی هاوتاکەی لەڕووی کەسەوە لە کاغەزێکیتری وەك خۆیدا جیاوازە، بەلام لە ڕووی پۆل یان جۆرەوە لە سپێتیدا بەرەها یەکدەگرن، لەبەرئەوەی ئەقلمەند و فەیلەسوفان کۆکن لەسەر ئەوەی یەك کەسایەتی لە دوو شوێنی جیاوازدا لەنگەر ناگرێ.

ب– شەرعی: واتە شەرع (یان یاسا) دانی پێدا دەنێت و دەیپارێزێ.

ج– لەباریدایە هەرکەسێك لەڕووی ماددی یان مەعنەویەوە سوودی لێ ببینن، بەلام نەکراوەتە مەرج ئەم سوودلێبینینە بێتەدی، وەك ئەو کەسەی شتێك دەکڕێ بەلام نە خۆی و نە کەسیتر سوودی لێ نابینن تا ستۆك دەبێت و کەلکی نامێنێ.

د- مافەکانی خودا خاوەنەکەی سوودیان لێنابینێ، وەك ئەو بیروباوەڕ و عیبادەتانەی خودا وەك ئەرك لەسەر مرۆڤی فەرز کردوون، کە سوودەکانیان بۆ مرۆڤ خۆیەتی ئەگەرچی پابەندیەکە بەرانبەر ئەویش نیە.

**دووەم: دابەشکردنی ماف:**

دابەشکردنی عەقڵانیی مافەکان کە لەسەر پێوەرگەلێکی بابەتیی جێگر و سەرپێوکردنی تەواو دامەزرابێ، بریتییە لە دابەشکردنی چوارینە بۆ: مافی تاك لەسەر کۆمەڵگە کە لەم سەردەمەدا لە دەوڵەت و حکومەتدا خۆ دەنوێنێ + پێچەوانەی ئەمە، واتە مافی کۆمەڵگە لەسەر تاك + مافی تاکەکان لەسەر یەکتر + مافی کۆمەڵگە لەسەر کۆمەڵگە کە بە زمانی ئەمڕۆ پێی دەوترێ (مافە نێودەوڵەتیەکان). ئەوە روونە مافی هەر لایەنێك بابەتی پابەندیی لایەنی بەرانبەریەتی.

لە خوارەوە بەکورتی ئەو چوار بەشە روون دەکرێنەوە:

**بەشی یەکەم: مافی تاك لەسەر دەوڵەت یان حکومەت:**

١- هەر دەوڵەت یان حکومەتێکی دنیا بەگوێرەی دەستوور و یاساکانی پابەند دەبێ بە دابینکردنی ژیانێکی سەربەرزانە بۆ ئەو تاکانەی حوکمڕانییان دەکات و دەستەبەرکردنی پێداویستی و خواستەکانی ژیانیان لە هەر کات و شوێنێکدا.

٢- مافی دابینکردنی پێداویستییە کۆمەڵایەتی و ئابووریەکانی وەك ئاو و کارەبا و سوتەمەنی و پێداویستییە تەندروستی و کۆمەڵایەتیەکان بۆ هەمووان، بەبێ جیاوازی لەنێوان شار و لادێکاندا.

٣- مافی فێرکردن و فێربوون و هەرچی دەچێتە خانەی رۆشنبیریی هاوچەرخ بەبێ جیاکاری.

٤- مافی ئازادیی عەقیدە و بیروڕا و دەربڕینی ئیرادە و پەنابەری و مانەوە بەپێی یاسا.

٥- مافی مسۆگەرکردنی شوێنی نیشتەجێبوون و ئازادی و ڕێزگرتنی.

٦- مافی دادخوازی لەبەردەم دادگەیەکی دادپەوەر و دانەشکاو بەلای هیچکام لە دوو لایەنە ناکۆکەکە لەپێناو مسۆگەرکردنی دادپەروەریدا، ئەویش ئەوەیە هەر کەس پاداشت یان سزای شایستەی خۆی وەربگرێ.

٧- مافی رێکخستنی ئاوەڕۆ و شۆستە و قیرکردنی رێگە و شەقامەکان.

٨- مافی مسۆگەرکردنی ئامرازەکانی کات بەسەربردنی پاك لە سەیرانگە و باخچەی گشتی و ئەو شتانە.

٩- چاودێریکردنی بازاڕ و نرخ و مادە خۆراکیەکان و دەرمانی بەکەڵك و رێگرتن لە یاریکردن بەنرخەکان لەلایەن فرۆشیارانەوە، هەروەها رێگەنەدان بە هاوردەکردنی داودەرمانی خراپ و کالای بێکەڵك لەلایەن بازرگانانەوە.

١٠- هەر شتێك تاك پێویستی بێت و بەپێی دەستوور و یاسا و خواستەکانی پەرەسەندنی شارستانی، دەوڵەت لە دابینکردنی بەرپرس بێ.

**بەشی دووەم: مافی کۆمەڵگە لەسەر تاك:**

لە گرنگترین پابەندیەکانی تاك بەرانبەر کۆمەڵگە یان دەوڵەت یان حکومەت ئەمانەن:

١- هەستکردن بە بەرپرسیارێتی لەئاست تێکدانی سیستمی گشتی و ئاداب.

٢- هاوکاریکردن لەگەڵ دەسەلات لە بەڕێوەبردنی دامودەزگا گشتیەکاندا بەو شێوەیەی بەرژەوەندیی گشتی و خێری کۆمەڵگەی تێدا بێ.

٣- پاراستنی ماڵی دەوڵەت و پارێزگاریکردن لە پاکوخاوێنی لەناوەوە و دەرەوەی ئاوەدانی.

٤- شڵپوڕێژ نەکردن لە بەکاربردنی ماڵی گشتیدا وەك ئاو و کارەبا و هەر سەرچاوەیەکیتر کە بۆ سوودی گشتی تەرخان کراوە.

٥- دڵسۆزی لە ئەنجامدانی وەزیفە و کار و هەستان بە خزمەتی گشتی.

٦- خراپ بەکارنەهێنانی وەزیفە و پۆست و هەر لابەندی (ئینتیما)یەکیتری سیاسی بۆ بەرژەوەندیی شەخسی.

٧- بەرگریکردن لە وڵات بەپێی توانا هەرکات دووچاری مەترسیی دەستدرێژیی دەرەکی یان ناوخۆیی ببێ، هەروەها خۆ دوورگرتن لە هاوکاریکردن لەتەك هەر کەسێك دژی بەرژەوەندیی وڵات و نیشتمانەکەی کار بکا.

٨- فەرمانکردن بەچاکە، واتە بە هەر شتێك خێری گشتی تێدابێت و رێگریکردن لە خراپە، واتە لە هەر شتێك زیانی بۆ تاك و کۆمەڵگە و مەترسی بۆ سەر بەرژەوەندیی گشتی هەبێ.

٩- پاڵپشتیکردنی دارایی گشتی بە راستگۆیی و ئەمانەتەوە لەرێی باجدان و هیترەوە، هەرکات بودجەی وڵات تووشی کورتهێنان بوو.

١٠- پابەندبوونی تاکەکان بە هاوکاریکردنی دەوڵەت یان حکومەتەکەیان لە هەر بەرژەوەندیەکی گشتیدا، کە پێویستی بەو هاوکارییە هەبێ.

**بەشی سێیەم: مافی تاکەکان لەسەر یەکتر:**

لە وێنەکانی:

١- مافی دوو گرێبەندوانەکە لە دوو شتە ئاڵوگۆڕکراوەکەدا پاش بەستنی گرێبەندەکە لە ئاڵوگۆڕەکاندا، وەك مافی فرۆشیار لە نرخەکە و مافی کڕیار لە فرۆشراوەکەدا، هەروەها مافی بەکرێگر لە سوودی ماڵە بەکرێگیراوەکە و مافی بەکرێدەر لە کرێکەدا. بەم شێوەیە لە هەر گرێبەندێکی ئاڵوگۆڕی پابەندکار بۆ هەردوولادا، مافی هەریەك لە دوو لایەنەکە بابەتی پابەندییە بۆ ئەویتریان.

٢- مافی یەکێك لە دوو گرێبەندوانەکە و پابەندیی گرێبەندوانەکەیتر لەو رەفتارانەی یەك لایەن پابەند دەکەن، وەك مافی کەسی پێبەخشراو لە شتە بەخشراوەکە و پابەندیی بەخشەر بە رادەستکردنی بەخشراو، هەروەها مافی خوازەر لە سوودبینین لە ماڵە خوازراوەکە پاش وەرگرتنی و پابەندیی شت پێدراو (المعیر) بەوەی خوازراوەکەی رادەست بکا. مافی وەسێت بۆکراو لەو شتەی وەسێتی لەبارەوە کراوە پاش مردنی وەسێتکارەکە و پابەندبوونی میراتگرەکان بە رادەستکردنی. بەم شێوەیە لە هەموو بەخشین (تبرع)ەکاندا پێبەخشراو خاوەن

مافە لەو شتەی پێی بەخشراوە، بەخشەریش پابەندە بە گەیاندنی ئەم مافە پێی پاش ڕاگەیاندنی بەخشینەکە، ئەگینا مافی نیە.

٣- لە ماف و پابەندییە هاوسەرییەکانی نێوان ژن و مێردا هەندێ مافی نادارایی هەن، بۆیە پێویستە لایەنەکەیتر نەرمی بنوێنێ بۆ گەیاندنی ئەو مافە پێی. هەروەها ژن مافی نەفەقەی ڕۆژانەی هەیە و پێویستە مێرد بەپێی توانای ماڵیی خۆی و پێگەی ژنەکە و نرخی بازاڕ، بۆی دابین بکا.

٤- مافی ڕۆڵەکان لەسەر باوك و دایکیان، لە خەرجیکێشان و پەروەردە و دابینکردنی سەرجەم پێداویستییە کەلتوری و تەندروستی و کۆمەڵایەتیەکان و شتی لەو شێوەیە. باوك و دایك یان ئەو کەسەی نوێنەرایەتییان دەکا، پابەند دەبن بە دابینکردنی ئەم مافانە بۆ ڕۆڵە و نەوەکانیان با شۆڕیش بووبنەوە. هۆی پابەندییەکەیان باوکایەتی و دایکایەتی و سەرچاوەکەیشی شەرع و یاسایە.

٥- مافی شیرەخۆر لە شیرپێدانی لەلایەن دایکیەوە، ئەگەر دایکی نەیتوانی دەبێ باوکی شیردەرێکی بۆ دابین بکا. دایەنی و مافی دایەن و شیردەریش بەهەمان شێوە ئەگەر دایکی نەبوو. هەرچی ئەو نەفەقەیەیە کە باوکی شیرەخۆر یان دایەنیکراو دەیکا، لە حاڵەتی نەبوونی باب یان نەداریی ئەودا هەمان شت لەسەر میراتگرەکەی پێویست دەبێ.

٦- بەخێوکردن (الولایة): ئەو بەخێوکەر (وەلی)ەی بەرپرسیارێتیی منداڵە ناکامەکان دەگرێتە ئەستۆ، باوکە پاشان دایك و پاشان نزیکترین خزم پاش ئەوان، لەگەڵ ڕەچاوکردنی بەرژەوەندیی ناکام.

شایانی باسە وەلیبوون زیاتر پابەندییە تا ئەوەی ماف بێ، لەبەرئەوەی شەرع و یاسا بۆ بەرژەوەندیی ناکام بڕیاری لەسەر دەدەن، هەربۆیە بەخێوکەر بۆی نیە بەبێ پاساو دەست لە بەخێوکاری (ویلایەت) هەڵبگرێ.

٧- مافی نەفەقەکێشانی بنەچەکان (الاصول) لەسەر وەچەکانیان (الفروع) لە حاڵەتی دەستکورتییان، هەروەها پابەندیی وەچەکان بەوەی بەپێی توانا و دەسەڵاتی دارایی خەرجییان بکێشن.

٨- مافی نەفەقەکێشانی هەر خزمێکی نەدار لەسەر خزمە داراکەی، لەبەرئەوەی میراتگریەتی، هۆکەیشی خزمایەتییە و سەرچاوەکەی شەرع و یاسایە.

٩- مافی دراوسێ لەسەر دراوسێ لەوەی بەشێوەیەکی وا سەرسەختانە رەفتار لە ماڵەکەیدا نەکا، کە لەڕووی مادی یان مەعنەوییەوە زیان بە دراوسێکەی بگەیەنێ.

١٠- هەر مافێکیتری ماددی یان مەعنەوی کە یاسا لە ژیانی کرداریدا بۆ بەرژەوەندیی تاکێك لەسەر تاکێکیتری فەرز دەکا، لە بەر هەر هۆیەك بێ.

**بەشی چوارەم: مافی کۆمەڵگە لەسەر کۆمەڵگە:**

بەهۆی پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکان و ئەندامبوونی دەوڵەتە لە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لەسەر بنچینەی بەرژەوەندیی دووسەرە، سەرچاوەکەیشی میساقی نەتەوە یەکگرتووەکانە بەشێوەیەکی تایبەت، هەروەها جاڕنامەکانی مافی مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی، ئەمە جگە لە عورفە نێودەوڵەتیەکان. عورف سەرەڕای لاوازیی رۆڵی لە ماف و پابەندییە ناوخۆییەکاندا، بەڵام هێشتا پارێزگاری لە رۆڵی کاریگەری خۆی لە چارەسەری کێشە نێودەوڵەتیەکان و پێدانی مافی هەر دەوڵەتێکدا کردوە. لە وێنەکانی مافە نێودەوڵەتیەکان:-

١- مافی سەروەریی هەر دەوڵەتێك بەسەر هەرێمەکەی خۆیدا بە وشکانی و دەریایی و ئاسمانیەوە و پابەندیی هەموو دەوڵەتان بە رێزگرتنی ئەم سەروەرییە و دەستوەرنەدان لە کاروبارەکانی ناوخۆی، مەگەر لەبەر هۆی مرۆیی.

٢- مافی هەموو دەوڵەتێك لەوەی لە ئاسایش و ئاشتیی هەمیشەییدا بژی دوور لە دەستدرێژی و زیادەڕەویکردنێکی دەرەکی لەلایەن دەوڵەتانیترەوە.

٣- مافی هەموو دەوڵەتێك لە وەبەرهێنانی کانزا و سامانەکانی سەر هەرێمە وشکانی و ئاوییەکەی و ئەوەی لە هەناویاندایە، بەبێ دەستێوەردانی دەرەکی دەوڵەتێکیتر.

٤- مافی هەموو دەوڵەتێك لە سوودوەرگرتن لە دەریای گشتی بۆ کەشتیەوانی و رلو لە دۆخی ئاشتیدا، بەو مەرجەی ئەو سوودوەرگرتنە زیان بە مافەکانی ئەو دەوڵەتانەیتر نەگەیەنێ کە لەو دەریایەدا بەشدارن.

٥- مافی هەموو دەوڵەتێك لە پشکی ئاویی خۆی لە رووبارە نێودەوڵەتییە هاوبەشەکانی وەك فورات و نیل، هەموو ئەو دەوڵەتانەی رووبارەکە بە هەرێمەکەیاندا تێدەپەڕێ پابەند دەبن بەوەی مامەڵەیەك لەتەك رووبارە هاوبەشەکەدا نەکەن زیان بە باقیی دەوڵەتانیتری پەیوەندار بگەیەنێ.

٦- مافی هەموو دەوڵەتێك لە گێڕانەوەی ئەو زەوییانەی بەهۆی جەنگ یان هۆیترەوە لەلایەن دەوڵەتانی داگیرکەرەوە زەوت کراون، ئەنجومەنی ئاسایش و کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان پابەند دەبن بە پێشکەشکردنی هەموو کۆمەکی و پاڵپشتیەك بە دەوڵەتە زەوی زەوتکراوەکە، تا تەواوی مافەکانی لەسەر زەوییە زەوتکراوەکان دەگێڕێتەوە.

٧- مافی هەموو دەوڵەتێك لە نەدانی مافی پەنابەری یان مانەوە یان گوزەرکردن بە سنوورەکانیدا بەبێ پاسپۆرتی رەسمیی بە ئەندامانی دەوڵەتانیتر، ئەگەر سەرچاوەی شلۆقی یان تیرۆر یان هەر کارێکیتری ناڕەوا بوون کە زیان بە بەرژەوەندیەکانی ئەو دەوڵەتە، یان بەرژەوەندیی دەوڵەتانیتر بگەیەنێ.

٨- مافی هەموو دەوڵەتێك لەوەی داوا لە دەوڵەتێکیتر بکا بە بەدەستەوەدانی ئەو تاوانبارانەی لە وڵاتەکەی خۆیاندا تاوانیان کردوە و پاشان هەڵاتوون یان پەنایان بۆ ئەو دەوڵەتە بردوە، یان لەسەر خاکی دەوڵەتانیتر دژ بە بەرژەوەندیی وڵاتەکەیان تاوانیان ئەنجام داوە.

٩- مافی ئاڵوگۆڕی دیبلۆماسی و سیاسی و کەلتوری و ئابووری و ئەمنی لەنێوان دەوڵەتاندا، هەروەها مافی بەستنی پەیماننامە و رێکەوتنامەی نێودەوڵەتی کە ئەو مافانە مسۆگەر بکا.

١٠- هەر مافێکیتری هەر دەوڵەتێك لەسەر دەوڵەتێکیتر لەبەر هۆیەکی رەوا و یاسایی کە یاسای نێودەوڵەتیی گشتی پەسەندی بکا. لەسەر دەوڵەتانی ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکان پێویستە هاوکاری و پاڵپشتی و دەستباری یەکتر بکەن دژی تیرۆری نێودەوڵەتی لەپێناو پاراستنی مافە نێودەوڵەتیەکاندا.

# باسی سێیەم:
# بۆ-پابەند (قەرزدەر)

بۆ–پابەند خاوەن مافە کە دەبێتە بابەتی پابەندیی پابەند و رەگەزی پێنجەمی پابەندی. مافی دارایی و نادارایی، ماددی و مەعنەوی، ماڵینەی ئەسڵی و ماڵینەی شوێنکەوتەیی (تەبەعی)، کەسیی مەدەنی و تاوانکاری و سیاسی و خێزانی و ناوخۆیی و نێودەوڵەتی و تایبەت و گشتی و مافەکانیتری تاک لەسەر کۆمەڵگە، یان کۆمەڵگە لەسەر تاک، یان تاک لەسەر تاک یان کۆمەڵگە لەسەر کۆمەڵگە دەگرێتەوە[1].

مەرج نیە بۆ–پابەند مەرجەکانی پابەندی تێدا بێ کە پێشتر باس کران، لەم رووانەوە:

١- لەرووی کەسایەتیەوە:

دەکرێ بۆ–پابەند کەسێکی سروشتی بێ وەك تاکەکانی مرۆڤ، یان کەسێکی مەعنەوی بێ وەك دەوڵەت و دامەزراوەکانی خاوەن کەڵکی گشتی یان کۆمپانیا ئابوورییەکان کە بەیاسا دانیان پێدا نراوە. هەروەها بوونەوەرە زیندوەکانیتری جگە لە مرۆڤیش دەگرێتەوە کە خەرجیان لەسەر ئەو مرۆڤەیە پاش بوونە خاوەنیان لە بەرێوەبردنیان بەرپرسن، وەك ئەو حەیوانانەی لەژێر دەستی مرۆڤدان. بگرە لەوە دوورتیش دەگرێتەوە، کە هەموو بوونەوەرێکی بەرهەمدارە بۆ مرۆڤ وەك حەیوان و دارو درەخت و کشتوکاڵە بەردارەکان.

---

[1] بۆ وردەکاریی ئەم چوار بەشە بروانە ئەم کتێبەمان: حقوق الإنسان وضماناتها في الإسلام.

هەروەها بۆ-پابەند بەدیهێنەری دروستکراوان، واتە خوای گەورەیش دەگرێتەوە، کە هەندێ بیروباوەڕ و پەرستنی لەسەر مرۆڤ داناوە و کەڵکیان بۆ کەسی پابەندە نەك بۆ (بۆ-پابەند)، لەبەرئەوەی خوا بێنیاز و رەهایە لە جیهانییان.

٢- لەرووی بوونەوە:

دەکرێ بۆ-پابەند لەو کەسانە بێ کە هەن، وەك وەسێتکردن یان بەخشین یان هەر جۆرە بەخشینێکیتر بۆ کەسێکی دیاریکراو کە لەژیاندا بێ، هەروەك دەکرێ ئەو کەسە لەکاتی دامەزراندنی پابەندیدا نەبوو (معدوم) بێ، وەك وەسێتکردن یان وەقفکردن بۆ رۆڵەکانی یەکێك لە کوڕەکانی کە هێشتا هاوسەرگیری نەکردوە. یان لەوانە بێ لە هەمان کاتدا هەن و نیشن وەك وەقفکردن لەسەر کارمەندانی دامەزراوەیەکی خێرخوازی خاوەن سوودی گشتی، کە ئەوانە دەگرێتەوە لەکاتی وەقفکردنەکەدا هەن، هەروەها ئەوانەیش لە ئایندەدا دێن لەو وەقفە سوودمەند دەبن و دەیانگرێتەوە.

٣- لەرووی دیاریکردنەوە:

دەکرێ بۆ-پابەند لەکاتی دامەزراندنی پابەندیەکەدا هەبوویەکی دیاریکراو بێ، وەك ئەو پابەندیانەی لە گرێبەندەکان دەکەونەوە، یان نەبوویەکی دیاریکراو بێ وەك لە گرێبەندی بیمەکردن بۆ سوودمەندێکی دیاریکراو کە هێشتا لەدایك نەبووە وەك رۆڵەی رۆڵەکانی کە بە رەچەڵەك دیاریکراون بەڵام هێشتا نین، یان بۆ کۆرپەلەیەك هێشتا لەدایك نەبووە، هەربۆیە میراتگرەکان یان قازی پابەند دەبێ بە پارێزگاریکردن لە پشکی ئەو کۆرپەلەیە لە میراتەکە و پێویستە لەکاتی دابەشکردنی بەسەر ئەو میراتگرانەی بەکردەوە هەن ئیحتیات بکرێ و بەشە زۆرەکەی بۆ حساب بکرێ، ئەگەر پشکەکەی بەگوێرەی مەزەندەی نێرینەبوونی زیاتر دەبوو پشکی نێرینەی بۆ دادەنرێ، ئەگەر بەپێچەوانەیشەوە بوو پشکی مێینەی بۆ دادەنرێ.

٤- لە رووی شیانەوە (الاهلیة):

دەکرێ کەسی بۆ-پابەند شیان تەواو یان ناتەواو یان نەشیاو بێ، بەتایبەت لەو رەفتارانەی پێویستیان بە قبوڵکردن نیە.

٥- لەرووی توانای وەبەرهێنانی ئەو مافەی تێیدا پابەندە:

لەکاتی دامەزرانی پابەندیدا مەرج نیە بۆ-پابەند بەکردەوە توانای وەبەرهێنانی هەبێ، لەبەر ئەوەی دەکرێ کەسێکیتر لە وەبەرهێنانی ئەو مافەی پابەندی تێدا دەکرێ جێی بگرێتەوە، یان کەسێکی نوێنەری وەك بەخێوکەر یان پێسپێردراو یان هەر کەسێکیتر سوودی لێ ببینێ.

٦- لەرووی زانینەوە:

مەرج نیە کەسی پابەند لەکاتی دامەزرانی ئەو مافەی پابەندی تێدا دەکرێ بە بۆ-پابەند بزانێ، وەك لە جەعالە و فوزالە و بەخشین و هەر شتێکیتردا، کە لەکاتی دامەزرانی پابەندیدا پێویستی بە قبوڵکردنی فەوری نیە.

٧- لەرووی هەڵبژاردنەوە:

مەرج نیە بۆ-پابەند ئازاد بێ لە قبوڵکردنی ئەو مافەی تێدا-پابەندە، وەك ئەو پاداشتەی دەوڵەت پێویستی دەکا بۆ ئەو کەسەی کارێك بۆ بەرژەوەندیی گشتی دەکات و ئەو ویستویەتی کارەکەی بێ بەرانبەر و لەبەر خوا یان لەپێناو بەرژەوەندیی گشتیدا بێ. لەگەڵ ئەوەیشدا لەلایەن دەسەڵاتی گشتیەوە ناچار کراوە بە قبوڵکردنی پاداشتەکە. قبوڵکردنی بەزۆر لەم حاڵەتەدا وەك قبوڵکردنی خۆویستانەیە، لەبەرئەوەی پاداشتەکە سوودی پەتییە.

٨- لەرووی دەست لێهەڵگرتن (التنازل)ەوە:

بۆ-پابەند (خاوەن مافی تایبەت) بۆی هەیە دەست لە تەواوی مافەکەی یان بەشێکی هەڵبگرێ جا بە بەرانبەر بێ یان بەبێ بەرانبەر، وەك مافی قەرزدەر لە

دەستەهەلگرتن لە قەرزەکەی و مافی خاوەن خوێن لە دەستەهەلگرتن لە تۆڵەسەندنەوە.

**٩- لەرووی ناچارکردنی پابەند بۆ جێبەجێکردنی پابەندییەکەی:**

بۆ-پابەند مافی هەیە لەڕێی قەزاوە کەسی پابەند ناچار بە جێبەجێکردنی پابەندییەکەی بکا ئەگەر بەخۆشیی خۆی ئامادە نەبوو ئەوە بکا، جا جێبەجێکردنەکە چ ماڵینە (عینی) بێ یان بە برێتی (بدل). هەروەك بۆ-پابەند بۆی هەیە لەسەر خەرجی کەسی پابەند، تێدا-پابەند جێبەجێ بکا ئەگەر هاتوو لە وادەی دیاریکراو دواکەوت، وەك لە حاڵەتی دامەزراندنی پرۆژەیەکی تایبەت یان گشتیدا.

**١٠- لەرووی قەرەبووکردنەوەوە:**

بۆ-پابەند مافی قەرەبووکرانەوەی ئەو زیانەی هەیە کە بەهۆی دواکەوتنی پابەند لە جێبەجێکردنی پابەندییەکەی، یان جێبەجێکردنی ناتەواو یاخود جێبەجێکردنی بەخەوش، لێی دەکەوێ.

**١١- لەرووی گەرەنتییەوە:**

بۆ-پابەند مافی ئەوەی هەیە داوای گەرەنتی لە پابەند بکا بۆ ئەو مافانەی لە گەرنیدان، وەك گەرەنتیی کەسی لە شێوەی کەفالەت، یان گەرەنتیی ماڵی لە شێوەی بارمتە (رەهن).

١٢- بۆ-پابەند مافی هەیە داوای جێبەجێکردنی فەوری بکا ئەگەر رێکەوتن یان دەقێك نەبێ بۆ دواخستنی، هەروەك بۆی هەیە بابەتی پابەندییەکە بکات بە دوو کەرتەوە کەرتێکی دەستبەجێ بدرێ و کەرتەکەیتری دوا بخرێ، وەك لە مارەیی ژندا، ئەو دواخراوەیش بە نزیکترینی دوو ئەجەلەکە چ تەلاق یان مردن دەگۆڕێ بۆ حازری (واتە ئێستا). لەحاڵەتی مردنی پابەنددا تێدا-پابەند پەیوەست دەبێ بە میراتەکەیەوە و پێویستە وەرەسەکەی (واتە میراتگرانی) بەر لە دابەشکردنی میراتەکە قەرزەکەی لێ بدەنەوە.

**١٣- لەڕووی گواستنەوەوە:**

مافی بۆ-پابەند پاش مردنی بۆ میراتگرانی دەگوێزرێتەوە ئەگەر قابیلیەتی گواستنەوەی بۆ میراتگر ان تێدا بوو. هەندێ ماف هەن ناکرێ لە بۆ-پابەندەوە بۆ وەرەسەکەی بگوێزرێنەوە، کە هەندێکیان داراین وەك سوودێك کە وەسێتی کردبێ بدرێتە کەسێك، کاتێك دەمرێ ئەمە بۆ وەرەسەکەی ناگوێزرێتەوە مەگەر لە وەسێتەکەیدا شتێکیتری گوتبێ.

کاتێك وەسێت بۆ سوودێك کرابێ و گوترابێتیش کە بۆ وەرەسە بگوێزرێتەوە، ئەوا حوکمی وەقفی بەسەردا جێبەجێ دەبێ.

لەو مافانەی قابیل بەوە نین بۆ میراتگرانی بۆ-پابەند بگوێزرێنەوە: وەزیفە و پۆست و نازناو و گواستنەوەی تەختی شاهانە یان پایەی خیلافەت، ئەم مافانە پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامین، لەبەرئەوەی شەرعی ئسلامی گواستنەوەی پۆست یان وەزیفە یان سەرکردایەتی یان سەرۆکایەتی یان هەر دەسەڵات و بەرپرسیارێتیەکیتر لەڕێی میراتەوە قبوڵ ناکا، لەبەرئەوەی تەنها کەسێك شایستەیانە کە بۆ ئەو ئەرکانە شیاو بێ، لەگەڵ هەڵبژاردنی لەلایەن گەل و بەیعەتپێدانی.

هەروەها مافە نادارائیەکانی هاوسەری بۆ وەرەسەی بۆ-پابەند ناگوێزرێنەوە.

**١٤- مافی حەواڵەکردن:**

بۆ-پابەند بۆی هەیە ئەو مافەی خۆی کە لە گەردنی پابەنددایە بۆ کەسێکیتر بگوێزێتەوە، با بەبێ ڕەزامەندیشی بێ.

**١٥- لەڕووی سروشتی جێبەجێکردنەوە:**

ئەگەر بابەتی پابەندبوونی کەسی پابەند بەدیهێنانی ئامانجێك بێ، ئەوا تەنها هەوڵدان یاخود بایەخپێدان بەس نیە، تا ئامانجی بۆ-پابەند نەیەتە دی.

**١٦- لەڕووی کەوتنەوە (السقوط):**

مافی بۆ–پابەند دەکەوێ ئەگەر جێبەجێکردنی پابەندییەکە مەحاڵی رەها بوو، وەك لە حاڵەتی مردنی پابەند لە کێشە قەزاییەکان و لەناوچوونی بابەتی پابەندییەکە لە کێشە مەدەنیەکاندا.

بەڵام لە کەوتن بەهۆی کۆنبوونەوە مافی بۆ–پابەند ناکەوێ، بەڵکو دەعوای دلواکردنەکەی دەکەوێ و کەسی پابەند لەڕووی دینیەوە بەرپرس دەمێنێ، بەڵام لەڕووی قەزاییەوە نا.

# بەشی پێنجەم

# هۆی پابەندی

هۆی پابەندی شەشەم رەگەزی پابەندییە و لەم بەشەدا بەم شێوەیە لێی دەکۆڵینەوە:

هۆ (السبب) یان ئەوەتا بەکردەوە هەیە، یان ئەوەتا بوونێکی نادروست ، یاخود بوونێکی نارەوا هەیە، یان ئەوەتا بوونێکی دروست و رەوا هەیە بەڵام بەهۆیەکی ئیرادی یان یاسایی (پاش بوون و بەر لە جێبەجێکردنی) لەناو دەچێ.

لەم روانگەوە، ئەم چوار حاڵە بەسەر چوار باسدا دابەش دەبن، یەکەمیان تەرخان دەکرێ بۆ حاڵەتی لە بنەرەتدا نەبوونی هۆ، دووەمیان بۆ هۆی نادروست، سێیەم بۆ هۆی نارەوا و چوارەمیان بۆ نەمانی هۆ دروست و رەواکە پاش بوونی.

# باسی یەکەم:
# نەبوونی هۆ بەکردەوە[1]

**هۆی پابەندی:**

هۆ وەسفێکی دیاری رێکخراو (منضبط)ــە شــەرع یـان یاسـا حـوکمێکی لەسـەر دادەمەزرێنێ، کە بە بوونی ئەو هۆیە حوکمەکە بەدیدێت و بە نەبوونیشی نامێنێ.

هۆی حوکمی شەرعی یاخود یاسایی ئەوەیە بـوونی، بـوونی حوکمەکـە پێویسـت دەکا ئەگەر رێگرێك نەیەتە پێشی. بۆ نموونە خزمایەتی هـۆی میراتــە، بـەڵام ئەگـەر رێگرێکی هاتە پـێش وەك کوشـتنی میراتگـر بـۆ میراتدەرەکـەی، کـار بـە رێگرەکـە دەکرێت و بکوژەکـە میراتـی ناکـەوێ، لـەو رووەوە سـزایەکی وابەسـتە (تَبَعي)یـە، ئەگەرچی هۆیەکیش هەیە کە میراتگرتنەکە دەخوازێ.

دزی هۆیەکە بۆ ئەو سزایەی بۆی دانراوە، جا ئەگەر دزەکە کەسێکی نەشیاو (بێ ئەهلیەت) بوو وەك ئەوەی منداڵێکی نەفام یان شـێتێك بـێ، ئـەوە دەبێتـە رێگـر لـە سزادان و لە کارپێکردنیدا ئەم پێش دەخرێ.

یاساکانی دەوڵەتانی دنیا کۆکن لەسەر ئەوەی پابەندی ئەگەر هۆیەکی نەبوو یـان هۆکەی نادروست بوو وەك گرێبەندی بەتاڵ، یان نارەوا بوو وەك پابەندبوون بە دانـی چەردەیەك پارە بە کەسێك بەرانبەر بەوەی تاوانێکی بۆ ئەنجام بدات، ئەو پابەندییـە بەتاڵ دەبێ.

---

[1] با بە هێزەکیش هەبێ وەك لە هەردوو حاڵەتی دووەم و سێیەمدا.

لەو یاسایانە، یاسای مەدەنیی فەرەنسیی بەرکار کە لە مادەی (١١٣١)دا دەڵێ "پابەندی هیچ ئاسەرێك بەرهەم ناهێنێ ئەگەر لەسەر هۆیەك دانەمەزرابوو، یان لەسەر هۆیەکی نادروست یان هۆیەکی ناڕەوا دامەزرابوو".

لە مادەی (١١٣٢)دا دەڵێ: هۆکە ناڕەوا دەبێ ئەگەر یاسا قەدەغەی کردبوو یان پێچەوانەی ئاداب یان سیستمی گشتی بوو.

یاسای مەدەنیی تونسیی بەرکار (فەسڵی ٦٧) ڕێك وەك ئەوە وایە. یاسای مەدەنیی عێراقیی بەرکار (م/١٣٢)، میسری (م/١٣٦)، سوری (م/١٣٧ و ١٣٨)، لیبی (م/١٣٦)، جەزائیری (م/٩٧)، مەغریبی (فەسڵی ٦٢)، مۆریتانی (م/٨٢) و یەمەنی (م/١٩٩)یش لەوەوە نزیکن.

لەم حاڵەتانەی خوارەوەیشدا لەبەرنەبوونی هۆ بەکردەوە، پابەندی دروست نابێ:

**یەکەم: حاڵەتی نەبوونی هۆ لە بنەڕەتدا:**

لە وێنەکانی:

١- یەکێك لە دوو قەرزارە هاوکار (متضامن)ەکە قەرزێك بداتەوە ئەویتریان پێشتر دابێتیەوە.

٢- ئەو کەسەی شتێك دەداتە کەسێکیتر و پێی وابووە لەسەری واجبە پاشتر دەردەکەوێ وا نیە، دەتوانێ شتەکە لەو کەسە بسێنێتەوە کە بەناهەق وەریگرتووە.

٣- میراتگرێك قەرزێك بداتەوە کە پێی وابووە پەیوەندی بە میراتەکەوە هەیە، پاشان دەربکەوێ شتی وا بەهیچ شێوەیەك نەبووە.

٤- جێبەجێکردنی وەسێتی میراتدەرەکە لەلایەن میراتگرەکانەوە پاشان بۆیان دەربکەوێ وەسێتەکە بەتاڵە، یان وەسێتکارەکە لێی پاشگەز بووەتەوە.

٥- کەسێك زیانێك ببژێرێ کە وای زانیوە ئەو لێی بەرپرسە، پاشان دەربکەوێ ئەو لەوە بەرپرس نەبووە.

٦- لایەنی بەرپرس لە کۆکردنەوەی باج، باجێك لە باجدەرێك وەربگرێ کە پێویست نەبووە، یان پتر لە رادەی پێویستی لێ وەرگرتبێ.

٧- قەرزارێك زیاتر لەوەی لەسەریەتی بداتەوە.

لە هەموو ئەو وێنانەدا، پێویستە ئەوەی پابەندیەکی جێبەجێ کردوە کە لە بنەڕەتدا هۆیەکی نەبووە، لەو کەسەی وەریگرێتەوە کە پێی داوە.

مامۆستا ئەلسەنهوری (رەحمەتی خوای لێبێ) لە کتێبی (الوسیط)[1]دا پێی وایە قەرزی سروشتی بە قەرزێکی نەبوو دەژمێردرێ وەك قەرزێك کە لە گرێبەندێکی بەتاڵدا رێکەوتن لەسەر دامەزرانی کرابێ و دەڵێ "قەرز لە کۆتاییدا لە بنەڕەتەوە نامێنێ ئەگەر سەرچاوەکەی گرێبەندێکی بەتاڵ بێ ئیتر هۆی بەتاڵیەکەی هەرچی بێ، یان قەرزەکە قەرزێکی مەدەنی نەبێ، بەڵکو قەرزێکی سروشتی بێ کە جێبەجێکردنی ناچارکردنی تێدا نیە".

بەبۆچوونی لەخۆبوردوانەی ئێمە ئەم گوتەیە لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە ورد نیە:

١- پابەندیی سروشتی ئەو پابەندیەیە رەگەزی داواکردنی ناتەواوە. پەیوەستیەکی یاساییە بەڵام مافی دەعواکردنێکی وا بە قەرزدەر نادا بەهۆیەوە بتوانێ قەرزارەکە ناچاری دانەوە بکا.

٢- بەراشکاوی دەڵێ قەرزی سروشتی هەیە و نەبوو نیە: یاسای مەدەنیی میسری (م/٢٠١) و سوری (م/٢٠٣) و لیبی (م/٢٠٤)، کە مادەکان بەدەق دەڵێن "قەرزار ئەوە ناگێڕێتەوە کە بەویستی خۆی داویەتی و مەبەستی بەجێهێنانی پابەندیەکی سروشتی بووە".

٣- کۆنبوون مافەکە ناخات بەڵکو دەعواکە دەخات، بەگوێرەی ئایەتی ﴿إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا﴾[2] قەرزار بە قەرزێکی سروشتی لەڕووی

---

[1] ١٣٤٣/١. نبذة ٨٢١.

[2] سورة النساء/ ٥٨.

دیانەتەوە بەرپرسە نەك لەڕووی قەزاییەوە. هەر مافێکی کەسانیتر لە ئەستۆی قەرزاردا بێ، ئەمانەتە لە گەردنیدایە و چەندە کات درێژ بێتەوە هەر دەمێنێتەوە جا خاوەن قەرزەکە داوای کردبێتەوە یان نا، هەروەها ئاخۆ قەرزەکە بەڵگەنامەی سەلماندنی هەبێ یان نا.

**دووەم: حاڵەتی ئەوەی قەرزەکە شایستەی دانەوە نەبێ:**

لە وێنەکانی:

١- ئەوەیە قەرزەکە بەسترابێتەوە بە مەرجێکی وەستاو (شرط واقف)، جا ئەگەر قەرزەکە بەر لە بەدیهاتنی ئەو مەرجە درایەوە ئەوا پابەندبوون دەبێ بە دانەوە بەبێ هۆ، لەبەرئەوەی قەرزەکە لەم حاڵەتەدا لەبەر نەبوونی هۆکەی بە هەبووی حازر دانانرێ، ئەگەرچی کاتێ مەرجەکە دێتەدی، مەوجود دەبێ، بەوەیش بەتاڵ دەبێ.

لەو دەقە یاساییە عەرەبیانەی ئاماژەن بۆ ئەم حاڵەتانە لە دانی قەرزی ناشایستە و وەرگرتنی بەناهەق: یاسای مەدەنیی عێراقی (م/١/٢٣٣)، میسری (م/١٨٢)، سوری (م/١٨٣)، لیبی (م/١٨٥)، لوبنانی (م/١٤٥)، تونسی (فەسڵی ٧٥)، مەراکیشی (فەسڵی ٧٦)، کە ئەم مادانە باس لەوە دەکەن دروستە ئەو قەرزەی بەناهەق دراوەتەوە، بگێڕدرێتەوە ئەگەر دانەوەکە جێبەجێکردنی پابەندیەك بوو هۆکەی نەهاتبووە دی.

٢- ئەوەیە قەرزەکە درابێتە پاڵ وادەیەکی وەستاو و دانەوەکەیشی بەر لەو وادەیە بووبێ، حوکمەکەی حوکمی قەرزی هەڵواسراوە بە مەرجە وەستاوەکەدا، هەر بۆیە وەرگرتنەوەی بەر لە وادەکەی وەرگرتنێکی ناشایستەیە و پێویستە وەرگر بیگێڕێتەوە.

**سێیەم: ئەوەیە قەرزەکە هەبێ و هەموو رەگەزەکانی بوونی تەواو بێ و لە ئەستۆی قەرزدەرەوەکەدا بێ، بەڵام جێبەجێکردنی دواخراو بێ:**

لەبەرئەوەیە یاسا دایناوە ئەم دانەوەیە بەر لە هاتنی وادەکەی، دانەوەیەکی ناشایستەیە ئەگەر قەرزدەرەوەکە کاتەکەی نەدەزانی، یان دەیزانی بەڵام پێی وابوو

کاتەکەی هاتووە، بەڵام ئەو دەقە یاساییە عەرەبیانەی چارەسەری ئەم حاڵەتەیان کردوە، دەڵێن دەکرێ قەرزدەر تەنها ئەو قازانجە بگێڕێتەوە کە بەهۆی گێڕانەوەی پێشخراو و لە سنووری ئەو زیانەی بە قەرزدەرەکە گەیشتووە، دەستی کەوتووە. جا ئەگەر ئەو پابەندیەی کاتی نەهاتووە پارە بوو قەرزدەرەکە پابەند دەبێ بە گێڕانەوەی ئەو قازانجە بۆ قەرزارەکە کە لەو ماوەیەی بۆ گێڕانەوەی قەرزەکە ماوە لەو پارەیە کردویەتی، ئەویش بە نرخی یاسایی یان نرخێك لەسەری رێك بکەون[1].

بەڵام ئەگەر دەیزانی قەرزەکە دواخراوە و کاتەکەیشی هێشتا نەهاتووە، ئەوا دادەنرێ کە دەستی لە مافی خۆی لە وادەکەدا و لێرەیشەوە لە هەر ئەسەرێك لێی بکەوێتەوە هەڵگرتووە، مەگەر بەڵگەیەك هەبێ شتێکیتری جیاواز لەمە بگەیەنێ.

لەو دەقە یاساییانەی ئاماژەن بۆ ئەم حاڵەتە: عێراقی (١/٢٣٥)، میسری (م/١٨٣)، سوری (م/١٨٤)، لیبی (م/١٨٦)، لوبنانی (م/١٨٤)، کە ئەم مادانە بەدەق دەڵێن "ئەگەر دانەوەکە جێبەجێکردنی پابەندیەك بوو کە کاتی نەهاتبوو و قەرزدەرەوەکە هاتنی کاتەکەی نەدەزانی....".

---

[1] الوسيط/ للسنهوري ١/١٣٤٤. النظرية العامة للالتزامات للأستاذ الدكتور حسن ننون، ص٣٢٥، والإثراء على حساب الغير للأستاذ الدكتور مرقس، ص٢٦، ومصادر الالتزام للأستاذ الدكتور محمود جلال الدين زكي ١/٢٥٢.

# باسی دووەم:
# نادروستیی هۆ

ئەگەر هۆی پابەندیەکە گرێبەندێکی بەتاڵ بوو، ئەو پابەندیانەی -لە باری بەدروست دانانیدا- لە گرێبەندەکە دەکەونەوە بەتاڵ دەبن.

گرێبەندەکە بەتاڵ دەبێ ئەگەر یەکێك لەم مەرجانەی دامەزرانی تێدا نەبوو:

١- ئەگەر هەردوو ئیرادەکە نەسازان، بەوەی یەکێکیان نەفام (عدیم التمییـن) بـوو، یان دوو ئیرادەکە لە کاتی خۆیدا بەیەك نەگەیشتن، یـان بەیـەك گەیشـتن بـەڵام کۆك نەبوون.

٢- ئەگەر گرێبەندەکە شوێن (محل)ی نەبوو و بەشێوەیەك دیاری نەکرا کە نەزانی و (غرر) بداتە دواوە، یان نارەوا بوو.

٣- یان کەسی پابەند بەبێ هۆ، یان لەبەر هۆیەکی وەهمـی یـاخود نـارەوا بـەڵێنی دابوو.

٤- ئەگەر یاسـا مـەرجێکی تایبـەتی دانـا و سـزاکەی بەتاڵکردنـەوە بـوو، وەك لـە مەرجی دیاریکردنی ماوە لە گرێبەندی گفتدانذا.

٥- ئەگەر ئەو شێوەیەی یاسا بۆ راستبوونی (گرێبەندەکەی) بڕیار دابوو تێدا نەبوو، وەك لـە فرۆشـتنی خانوبـەرە لـە عێـراق بـەبێ تۆمـارکردنی لـە فەرمانگـەی تایبەتمەند[1].

---

[1] یاسای مەدەنیی عێراقیی بەرکار (م/٥٠٨).

گرێبەنـدی بـەتاڵ بـەبێ ئاسـەوار دادەنـرێ، جـا ئەگـەر بەتاڵیەکـەی بـەر لـە جێبـەجێکردنی گرێبەندەکـە ئاشـکرا بـوو، هیچـکام لـە دوو لایـەنی گرێبەندەکـە بـە جێبەجێکردنی پابەندیەکەوە پابەند نابن. ئەگەر جێبەجێیش کـرا پێویسـتە ئـەوەی پێشتر جێبەجێ کراوە بگێڕدرێتەوە، لەبەرئەوەی هۆکەی نادروستە[1].

بەڵام ئەگەر گرێبەندە بەتاڵەکە کە دوو لایەنەکە بەنیاز بوون ئیمزای بکەن، گۆڕا بۆ جۆرە گرێبەندێکیتر کە رەگەزەکانی لە گرێبەنـدە بەتاڵەکـەدا هـەبوون، خۆبـەخۆ دەگۆڕێ بۆ ئەو گرێبەندە و دەبێتە هۆیەکی دروست بۆ پابەندبوون.

بۆ نموونە ئەوەی لەگەڵ کەسێکدا رێك دەکەوێ کە ببێتە میراتگری بەبێ بوونی هۆی میرات لە خزمایەتی یان هاوسەرایەتیی دروست، ئەم گرێبەندە بەتاڵ دەبێتـەوە و دەگۆڕێ بۆ وەسێت.

---

[1] بڕوانە: أصول الالتزامات للدكتور سليمان مرقس، ص٢١٣ و ئاشتر.

# باسی سێیەم:
# ناڕەوابوونی هۆ

لە وێنەکانی ئەم حاڵەتە:

١- بەرتیل وەرگرتن، بەرتیلدەر مافی وەرگرتنەوەی بەرتیلەکەی هەیە و دەبێ بەرتیلوەرگریش ئەوەی لە بەرتیلدەری وەرگرتووە بیداتەوە، لەبەرئەوەی وەرگرتنێکی ناشایستەیە و لەسەر هۆیەکی ناڕەوا (غیر مشروع) دامەزراوە.

٢- ئەوەی پارەیەك دەداتە ئافرەتێك تا پەیوەندیەکی نامەشروعی لەتەکدا دروست بکا، یان لەسەر ئەو پەیوەندییە بەردەوام بێ ئەگەر پەیوەندیەکە هەبوو. بەخشەرەکە مافی وەرگرتنەوەی ئەو ماڵەی هەیە و پێویستە ئافرەتە وەرگرەکەیش بۆی بگێڕێتەوە، لەبەرئەوەی هۆکەی ناڕەوایە.

٣- ئەوەی پارەیەکی داوەتە کەسێك بەرانبەر ئەوەی کەسێکی بێتاوان بکوژێ یان دزیەکی لێ بکا، دەبێ وەرگرەکە پارەکە بگێڕێتەوە، پارەدەرەکەیش مافی گێڕانەوەی هەیە لەبەرئەوەی هۆی پابەندیەکە ناڕەوایە.

٤- ئەوەی لە قوماردا بردویەتیەوە، پێویستە براوەکە ئەوەی لە دۆڕاوەکەی بردۆتەوە بۆی بگێڕێتەوە، لەبەرئەوەی هۆی پابەندیەکە ناڕەوایە، لێرەوە پابەندیەکەیش بەتاڵە.

**بیرۆکەی پیسبوونی رێگر لە گێڕانەوە**

رێسای باو لای رۆمانەکان وابوو کە لە حاڵەتی ناڕەوابوونی هۆی پابەندیدا، لایەنی پیسکەر (الملوث) مافی گێڕانەوەی ئەو ماڵەی نەبوو کە دابووی.

ئەم بیرۆکەیە بۆ نێو یاسای مەدەنیی میسری کۆنی هەڵوەشاوە گوێزراوەتەوە، بەڵام یاسا عەرەبییە نوێکان، بە یاسای مەدەنیی میسریی نوێشەوە، پەسەندکردنی ئەم بیرۆکەیەیان رەت کردۆتەوە، لەبەرئەوەی هاندانی تێدایە بۆ خراپە.

## باسی چوارەم:
## نەمانی هۆ پاش بوونی

نەمانی هۆی دروست و رەوا، یان بە ویستی گرێبەندوان دەبێ یاخود بە بڕیاری یاسا. حاڵەتی یەکەمیان بە زاراوەی شەرعی و یاسایی پێی دەوترێ هەڵوەشاندنەوە (الفسخ)، دووەمیشیان پێی دەوترێ هەڵوەشانەوە (الانفساخ).

لەبەرئەوە توێژینەوە لە ناونیشانی باسەکە بەسەر سێ خواستدا دابەش دەبێ، یەکەمیان بۆ هەڵوەشاندنەوە، دووەم بۆ هەڵوەشانەوە و سێیەمیشیان بۆ بەراوردکردنی نێوان هەڵوەشاندنەوە و هەڵوەشانەوە تەرخان دەکرێ.

## خواستی یەکەم:
## لابردنی هۆ بە ویستی گرێبەندوان
## (هەڵوەشاندنەوە)

هەڵوەشاندنەوەی گرێبەند: بریتییە لە هەڵوەشاندنەوەی پەیوەستیی گرێبەندانە لەبەر یەکێك لەو هۆیانەی پاساوی دەدەن.

**هۆکانی هەڵوەشاندنەوە:**

گرێبەند بە ویستی هەردوو لایەنی گرێبەندەکە یان یەکێکیان لەڕێگەی دادگەوە یان بەبێ دادگە هەڵدەوەشێنرێتەوە، لەبەر زۆر هۆ، گرنگترینیان ئەمانەن:

١- یەکێك لەو دوو لایەنەکە لەو گرێبەندانەبۆ بۆ هەردوولا پابەندکارن پابەندییەکەی خۆی تێکبدات. یاساناسان تەنها باسیان لەم هۆیە کردوە، هەربۆیە گوتویانە هەڵوەشاندنەوە تەنها لەو گرێبەندانەدا دەبێ کە بۆ هەردوولا پابەندکارن و یەکێکیان ئامادە نابێ پابەندیی خۆی جێبەجێ بکا لەکاتێکدا ئەویتریان پابەندیی خۆی جێبەجێ کردوە، یان ئامادەیە بۆ جێبەجێکردنی[1]. ئەمەیش هەڵەیەکە زادەی کارتێکرانە بە فیقهی خۆرئاوایی و یاسای مەدەنیی فەرەنسیی کارپێکراو.

٢- گرێبەندەکە بەسروشت کارپێکراو و نالازم بێ چ بۆ هەردوو لایەنی گرێبەندەکە وەك بریکاری و ئیعارە و سپاردە و ئاڵوێری پارە (مضاربة) و ئەو جۆرە شتانە، یان بۆ یەکێکیان وەك گرێبەندی رەهن و گرێبەندی کەفالەت.

لەم گرێبەندانەدا هەر گرێبەندوانێك مافی هەیە بە ویستی تاکەکەسیی خۆی گرێبەندەکە هەڵبوەشێنێتەوە، لەبەرئەوەی بۆ هەردوو لایەن لازم نیە. بۆ نموونە بریکار (وەکیل) خۆبەخشە و بۆی هەیە هەر کات ویستی دەست لە خۆبەخشیەکە هەڵبگرێ بەو مەرجەی بریکاریەکە مافی کەسانیتری پێوە نەبێ. بریکاردار (الموکل)یش خاوەنی بەرژەوەندیەکەیە و بۆی هەیە، هەر کات ویستی

---

[1] الأستاذ الدكتور السنهوري، الوسيط ٧٨٨/١ تێیدا هاتووە "هەڵوەشاندنەوە تەنها لەو گرێبەندانەدا دەبێ کە بۆ هەردوولا پابەندکارن... بەڵام ئەو گرێبەندانەی دەکرێ تەنها بۆ یەك لایەن پابەندکار بن، وەك سپاردە و کەفالەت، ناکرێ بیر لە روودانی هەڵوەشاندنەوە تێیاندا بکرێتەوە".

د. حشمت أبوب ستيت، نظرية الالتزام في القانون المدني الجديد، ص٣٤١. د. أنور سلطان، مصادر الالتزام، ص٤١٣، د. عبدالمنعم فرج الصدة، مصادر الالتزام، ص٣٩٨.

دەست لەو بەرژەوەندییە هەڵبگرێ و بە ویستی تاکلایەنەی خۆی بریکاریەکە هەڵبوەشێنێتەوە.

بەڵام گرێبەندی رەهن بۆ قەرزاری رەهنکار لازمە و ناتوانێ بە ویستی تاکلایەنەی خۆی هەڵیبوەشێنێتەوە، بەڵام قەرزدەری رەهنگر مافی هەڵوەشاندنەوەی هەیە، لەبەرئەوەی رەهنەکە تۆماراندن (توثیق)ی قەرزەکەیەتی و بۆی هەیە ئەگەر ویستی، بە ویستی تاکەکەسیی خۆی دەستبەرداری ئەو تۆماراندنە ببێ.

لە گرێبەندی کەفالەتدا گرێبەندەکە بۆ کەفیلەکە لازمە و مافی ئەوەی نیە بە ویستی تاکلایەنەی خۆی هەڵیبوەشێنێتەوە، جیاواز لە کەفیلکراو کە هەر کات ویستی دەتوانێ ئەوە بکا.

٣- بژارەکان (الخیارات): ئەمانە زۆرن، لەوانە بژارەی مەرج وەك مەرجی بژارەیەکی کاتی بۆ یەکێك لە دوو گرێبەندوانەکە یان هەردووکیان یان کەسێکی سێیەم. هەروەها لەوانە بژارەی عەیبی شاراوە، عەیبیش هەر کەمیەکە لە ماڵەکە یان نرخەکەیدا کە بەشێوەیەك بێ ئامانجێکی دروستی ئەویتر لەبەین ببا کە لەباری نەبوونی ئەو عەیبەدا لە فرۆشراوەکەدا دەستی دەکەوێ. شاراوەیش عەیبێکە کەس پێی نازانێ ئەوانە نەبێ لە بابەتەکەدا شارەزان. ئەمیش وەك بژارەی مەجلیس، هەردوولا سەرپشکن تا (لە مەجلیسەکە هەڵنەسن و) لێك جیا نەبنەوە.

٤- ناپاکیکردن لە ئەمانەت لە فرۆشتنە دڵنیاکاندا (بیاعات الامانە) کە بریتین لە: قازانجکاری (المرابحة) (فرۆشتن بە نرخی کرین لەگەڵ رێژەیەك قازانج) + زیانکاری (الوضیعة او المواضعة) (فرۆشتن بە نرخی کرین لەگەڵ رێژەیەك لە زیان) + مایەکاری (التولیة) (فرۆشتن بە نرخی کرین) + بەشدارکردن (الاشراك) (کردنی کەسێکیتر بە شەریك لە بەشێك لە فرۆشراوەکەدا بەرانبەر بە نرخی کرینی).

جا ئەگەر فرۆشیارەكە لە ئاشكراكردنی نرخی كڕینەكەدا ناپاكی كرد، كڕیار مافی هەڵوەشاندنەوەی گرێبەندەكەی هەیە.

٥- هەڵشكان (مایەپووچبوون)ی كڕیار یان هەژاركەوتنی بەر لە وەرگرتنی فرۆشراوەكە و دانی پارەكەی.

٦- بارودۆخی لەناكاو، بەوەی پاش ئیمزاكردنی گرێبەندەكە و بەر لە تەواو جێبەجێكردنی ڕووداوێكی چاوەڕواننەكراو ڕوو بدات و بەهۆیەوە نابەرانبەریەكی دژوار لەنێوان پابەندیی هەردوو لایەنەكەدا بێنێتە كایە، بەشێوەیەك پابەندبوونی لایەنێكیان تاقەتپڕوكێن بێ و هەڕەشەی زەرەركردنی لێبكات.

٧- هەموو گرێبەندێك كە قابیل بە بەتاڵكردنەوە بێ لە فیقهی خۆرئاواییدا بەهەمان هۆ قابیل بە هەڵوەشاندنەوە دەبێ[1].

**مەرجەكانی هەڵوەشاندنەوە:**

بۆ دروستیی هەڵوەشاندنەوەكە پێویستە چەند مەرجێك هەبن، گرنگترینیان ئەمانەن:

١- ڕوودانی ڕەفتارێكی شەرعی (پاسایی قابیل بە هەڵوەشاندنەوە).

٢- بوونی پاساوێكی خودی یان لابەلایی كە هەڵوەشاندنەوەی ئەو ڕەفتارە پاساو بدات.

٣- داوایەكی پەیوەندار بە هەڵوەشاندنەوە لەلایەن دادگەوە، ئەگەر دەستوەردانی پێویست بوو.

٤- نەبوونی ڕێگرێك بۆ هەڵوەشاندنەوەكە، وەك كۆنبوون و وەك بوونی عەیبێكی نوێ لای كڕیار.

---

[1] بڕوانە: تحفة المحتاج بشرح المنهاج في الفقه الشافعي - لابن حجر (شهاب الدين أحمد الهيتمي) ٣٣٢/٤. تبيين الحقائق - للزيلعي في الفقه الحنفي ١/٤. مصطفى الزلمي: نظرية الالتزام برد غير المستحق، ص١٤٧ و پاشتر.

**فەلسەفەی هەڵوەشاندنەوە:**

فەلسەفەی پەسەندکردنی پرۆسەی هەڵوەشاندنەوە بەدیهێنانی ئەو ئامانجەیە کە گرێبەندەکەی لەپێناودا کراوە و زیانگەیاندن بە یەکێك لە دوو گرێبەندوانەکە بەهۆی ئەوەوە.

**جۆرەکانی هەڵوەشاندنەوە:**

هەڵوەشاندنەوە لەرووی گونجاندن (تكييف)یەوە بۆ قەزایی و رێکەوتن و هەروەها ئیرادی لە یەك لایەنەوە، دابەش دەبێ:

١- هەڵوەشاندنەوەی قەزایی: لە حاڵەتێکدا دەبێ یەکێك لە دوو گرێبەندوانەکە پابەندیی خۆی جێبەجێ نەکا لەکاتێکدا لایەنەکیتر پابەندیی خۆی جێبەجێ کردوە، یان ئامادەیە بۆ جێبەجێکردنی.

٢- هەڵوەشاندنەوە بە رێکەوتن: وەك رێکەوتنی هەردوولا لەسەر ئەوەی گرێبەندەکە خۆبەخۆ هەڵبوەشێتەوە ئەگەر یەکێکیان پابەندیی خۆی جێبەجێ نەکرد.

٣- هەڵوەشاندنەوە بە ویستی تاکلایەنە: وەك لەو گرێبەندانەی بەسروشت لازم نین وەك بریکاری و بژارەی مەرج و بژارەی مەجلیس.

**ئاسەوارەکانی هەڵوەشاندنەوە:**

ئەگەر گرێبەندەکە هەڵوەشایەوە هۆی پابەندیەکە کە گرێبەندەکەیە نامێنێت و هەردوو گرێبەندوان بە پاشئاسەوار دەگەڕێنەوە سەر ئەو دۆخەی پێش لە گرێبەندکردن تێیدا بوون، وەك لە گرێبەندەکانی جێبەجێکردنی فەوریدا.

نەمانەکە پشت بە کاتی گرێدانی دەبەستێ و وا دادەنرێ وەك ئەوەی گرێبەندەکە لە بنەڕەتدا گرێ نەدرابێ و هەردوو لایەنی گرێبەندوان پابەند دەبن بە گێڕانەوەی ئەوەی لەویتریان وەرگرتووە. بۆ نموونە لە گرێبەندی فرۆشتندا فرۆشیارەکە پارەکە و ئەو قازانجانەی دەستی کەوتوون دەگێڕێتەوە. کڕیاریش فرۆشراوەکە لەگەڵ ئەو

زیادانەی لای ئەو رووبان داوە دەگێڕێتەوە، بەڵام بەرپرس نابێ لە گێڕانەوەی ئەو سوودەی لێی بینیوە، ئەویش بەگوێرەی رێسای (الغنم بالغرم)، لەبەرئەوەی ئەگەر فرۆشراوەكە لای ئەو بفەوتایە دەبووە ماڵ بەسەریەوە، لەبەرئەوە لەبەرانبەر ئەم كۆڵەدا مافی ئەو سوودەیشی دەبێ.

بەڵام ئەگەر لای ئەو فرۆشراوەكە بەهۆی بەكارهێنانیەوە كەمی كردبوو، پێویستە قەرەبووی بكاتەوە.

بەڵام لە گرێبەندی جێبەجێكردنی بەردەوامدا (گرێبەندی ماوە) وەك گرێبەندی بەكرێدان و ئیعارە، ئەسەری هەڵوەشاندنەوەكە تەنها بۆ ئایندە دەبێ بەبێ رابردوو، لەبەرئەوەی بەدیهاتنی پاشئاسەوار لەو حاڵەتەدا مەحاڵە.

هەرچی ئەسەری هەڵوەشاندنەوەكەیە بۆ كەسانیتر (كەسی سێیەم) وەك مافی هاوشانی (الارتفاق)، بەم شێوەیە دەبێ:

أ- ماڵەكە دوور لە هەر مافێك كە لەسەری جێگیر بووبێ، دەگەڕێنرێتەوە.

٢- مافی قەرزدەری رەهنگر كە بەرەسمی رەهنی كردوە، لەم مافە هەڵاوێر دەكرێ، ئەویش نیەتپاكییە و وەك حاڵەتێكی هەڵاوێردراو فرۆشراوەكە بەژێر باری ئەم رەهنەوە دەگەڕێنرێتەوە[1].

بە رەچاوكردنی ئەم مەرجانەی خوارەوە:

١- خاوەنداریێتی شوێن (محل)ی گرێبەندەكە لەكاتی ئیمزاكردنی رەهنەكە گوێزرابێتەوە بۆ رەهنكار.

٢- قەرزدەری رەهنگر لەكاتی دامەزراندنی رەهنەكەدا نیازی پاك بێ.

٣- ئاگای لەو هۆیە نەبێ كە پاساودەری هەڵوەشاندنەوەی گرێبەندەكەیە.

---

[1] لەبارەی ئاسەواری گرێبەند بڕوانە مادەكانی: (١٨٠) لە یاسای مەدەنیی عێراقی، (١٦٠)ی میسری، (١٦٠)ی سوری، (١٦٢)ی لیبی، (٢٤٢)ی لوبنانی، (٣٦)ی قەتەری، (٢٢٢)ی یەمەنی، فەسڵی (٣٣٦)ی تونسی و (١٠٣٦)ی میسری.

٤- گرێبەندی ڕەهنەکە دروست بێ و هەموو پایە و مەرجەکانی گرێدانی تێدا هاتبنەدی.

٥- ڕەهنەکە پشتئەستوور بێ بە سەنەد (قەواڵە).

ئەگەر ئەم مەرجانە بەردەست بوون، شوێنی گرێبەندەکە (فرۆشراو) بەژێر باری ڕەهنەکەوە دەگەڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی.

## خواستی دووەم:
## نەمانی هۆی پابەندی بە بڕیاری یاسا
## (هەڵوەشانەوە)

هەڵوەشانەوە (الانفساخ) لە ڕووی زمانەوانیەوە بە چەند مانایەك هاتووە، لەوانە کەمکردن (الانتقاص)، شیبوونەوە (الانحلال)[1].

لە زاراوەی یاساییشدا: شیبوونەوەی پەیوەستیی گرێبەندانەیە لە ئەنجامی مەحاڵیی جێبەجێکردنی قەرزار بۆ پابەندیەکەی لەبەر هۆیەکی بێگانە، کە ئەو دەستی تێیدا نیە[2].

خەوشی ئەم پێناسە ئەوەیە تێروتەسەل نیە، لەبەرئەوەی هۆیتر هەن باسی نەکردوون.

هەڵوەشانەوە لە فیقهی ئیسلامیدا: شیبوونەوەی گرێبەندە بە خۆبەخۆ یان بە ویستی دوو گرێبەندوانەکە یاخود یەکێکیان. شایانی باسە لەڕووی فەلسەفی و

---

[1] لسان العرب – فصل الفاء – حرف الخاء ١٤/٤.

[2] یاسای مەدەنیی عێراقی (م/١٦٢)، میسری (م/١٥٩) و سوری (م/١٦٠).

بنیاتـەوە (فسـخ) فیعـل و (الانفسـاخ) ئینفیعالـە، لەبەرئـەوە (انفسـاخ) جۆرێکـە لـە جۆرەکانی (فسخ)[1].

**هۆکانی هەڵوەشانەوە:**

لە یاسادا هۆی هەڵوەشانەوە مەحاڵبوونی جێبەجێکردنە وەك گوتمان.

بەڵام لە فیقهی ئیسلامی و ئەو یاسایانەدا لـەژێر کاریگەریـدان، هەڵوەشـانەوە بـۆ هەندێ هۆ دەگەڕێتەوە، گرنگترینیان ئەمانەن:

١- لەناوچـوونی بابـەتی گرێبەندەکـە بـەر لـە رادەسـتکردنی بـە لایەنەکـەیتر لـە گرێبەندی فەوریدا، یان پـاش لـە رادەسـتکردنی لـە گرێبەنـدی مـاوەدا بـەر لـە کۆتاییهاتنی ماوەکە.

٢- بەلایەکی بێئامان بێتە بەربەست لەبەردەم سوودبینینی گرێبەندوان لە بابەتی گرێبەندەکە، وەك ئەو کەسەی هۆتێلێك بەکرێ دەگرێ، بەڵام جـەنگ رێگـە بـە بەکارهێنانی نادات تا کاتی تەواوبوونی ماوەی بەکرێدانەکە.

٣- کەسایەتیی یـەکێك لـە دوو گرێبەندوانەکـە لەبەرچـاوگیراو بـێ، وەك پزیشـکی پسپۆڕ و هونەرمەند و ئەو جۆرانە و بەر لە جێبەجێکردن مرد.

٤- زەوتکردنی بابەتی گرێبەندەکە، زەوتکردنێك رێگە لە گێڕانەوەی بگرێ.

٥- بـەر لـە جێبـەجێکردن کـەڵکی بابـەتی گرێبەندەکـە بـۆ ماڵـە بەکرێگیراوەکـە بەتەواوی نەمێنێ[2].

**مەرجەکانی مەحاڵبوونی جێبەجێکردن (استحالة التنفيذ):**

مەحاڵبوونی جێبەجێکردن هۆیەکی سەرەکییە لە هۆکـانی هەڵوەشـانەوە، بگـرە لای زانایانی یاسا تاکە هۆیە، بۆیـە گرنگـە مەرجـەکانی روون بکرێنـەوە، کـە بـریتین لەمانە:

---

[1] بدائع الصنائع للكاساني في الفقه الحنفي ٣٣٤٧/٧.

[2] البدائع – سەرچاوەی پێشوو – ٣٦٢٣/٦.

١- ئەوەیە جێبەجێکردنی بەهیچ رێگەیەکی بەردەست مومکین نەبێ.

٢- ئەوەیە مەحاڵبوونەکە بابەتی بێ و بۆ بابەتی پابەندیەکە بگەڕێتەوە، بەشێوەیەك جێبەجێکردنی مەحاڵ بێ، بۆیە مەحاڵبوونی شەخسی، کە بۆ بارونۆخی ئابووریی قەرزارەکە دەگەڕێتەوە، بەس نیە.

٣- ئەوەیە مەحاڵبوونەکە رەها بێ نەك رێژەیی، فەوتانی فرۆشراو ئەگەر ماڵێکی هاوچەشن (مثلي) بێ، گرێبەندی پێ هەڵناوەشێتەوە، لەبەرئەوەی دەکرێ بە جێگرەوەیەکی هاوچەشنی جێبەجێ بکرێ.

٤- ئەوەیە مەحاڵبوونەکە زادەی کارێکی بێگانە بێ وەك بەڵایەکی بێئامان، بەڵام ئەگەر کردەی قەرزارەکە بێ گرێبەندەکە هەڵناوەشێتەوە، بەڵکو قەرەبووکردنەوە جێی دەگرێتەوە.

٥- ئەوەیە پاش ئیمزاکردنی گرێبەندەکە بێ، چونکە بەر لەوە گرێبەندەکە بەتاڵ دەبێ لەبەرئەوەی لەسەر شوێنێکە کە رووداني لە ئایندەدا مومکین نیە.

٦- ئەوەیە هەمووی بێ، لەناوچوونی بەشێك نابێتە مایەی هەڵوەشانەوە، بەڵکو کڕیارەکە لە فرۆشتنەکەدا سەرپشك دەکا، بۆ نموونە لەنێوان کەمکردنەوەی نرخەکە و هەڵوەشاندنەوەدا.

٧- قەرزار بیسەلمێنێ مەحاڵیی جێبەجێکردنەکە بۆ هۆیەکی بێگانە دەگەڕێتەوە[1].

---

[1] د.عبدالحي حجازي - النظرية العامة للالتزام وفقاً للقانون الكويتي، ١/٣٥٤ - یاسای مەدەنیی عێراقی (م/١٢٧). ئەم کتێبەمان: نظرية الالتزام برد غير المستحق، ص١٧٥ و پاشتر.

**جۆرەکانی مەحاڵبوون:**

مەحاڵبوون سێ حاڵەتی هەیە:

یەکەم: مەحاڵبوونی ماددی، وەك لەم وێنانەدا:

١- گرێبەندەکە لەسەر نۆژەنکردنەوەی بینایەك بێ کە بەر لە جێبەجێکردنی داڕماوە.

٢- بابەتی گرێبەندەکە دروستکردنی نهۆمێکی سەرەوە بێ لەسەر نهۆمێکی بنەوە، کە بەر لە جێبەجێکردن بڕوخێ.

٣- بوونی عەیبێکی شاراوە لەو زەویەی ویستراوە بینای لەسەر بکرێ، وەك بوونی ئاوی ژێر زەوی.

٤- بوونی کەموکوڕیەك لە دیزاینەکەدا کە زیان بە ئامانجەکە دەگەیەنێ.

دووەم: مەحاڵبوونی کەسی: وەك مردنی بەڵێندەر یان پزیشك یان هونەرمەندێك کە کەسایەتیەکەی جێ ئیعتیبار بێ.

سێیەم: مەحاڵبوونی یاسایی: وەك تاپۆکردنی ئەو خانوبەرەیەی خاوەنەکەی دەیەوێ بینای لەسەر بکا، یان وەك ئەوەی بەڵێندەر ناچار بێ بچێتە خزمەتی سەربازی، یان مۆڵەتەکەی لێ وەربگیرێتەوە.

**ئاسەوارەکانی هەڵوەشانەوە:**

١- نەمانی گرێبەند و ئاسەوارەکانی، لە ماف و پابەندیەکانن.

٢- نەمانی ئەسەر بە پاشئاسەوار (ئەسەری رەجعی) لە گرێبەندی جێبەجێکردنی فەوریدا، هەروەها بۆ ئاینده لە گرێبەندی جێبەجێکردنی بەردەوام.

٣- نەمانی بەرپرسیارێتیی گرێبەندیی قەرزار سەبارەت بە جێبەجێکردن و بەرپرسیارێتیی کەمتەرخەمی سەبارەت بە قەرەبووکردنەوە، لەبەرئەوەی قەرزار هەڵەی نیە. ئەوە روونە هەڵە لە هەردوو بەرپرسیارێتیەکەدا رەگەزە.

٤- هەڵوەشانەوە پێویستی بە دەستێوەردانی قەزا یان ئەوەی پەیوەندی پێوە هەیە لە ئاگەدارکردنەوە یان بەرزکردنەوەی دەعواوە، نیە.

**لێکەوتەی فەوتان بەسەر کێدا دەشکێتەوە؟**

مەبەست لە لێکەوتە (تبعة)ی شت: ئەو زیانەیە لە فەوتانی نرخی شتێکدا خۆ دەنوێنێ بەهۆی لەناوچوونی بە بەڵایەکی بێئامان. ئەو شتە شوێن (محل)ی گرێبەند و بابەتی پابەندییە، وەك لەناوچوونی فرۆشراوەکە بەر لە رادەستکردنی و لەناوچوونی ماڵ (عین)ـە بەکرێ گیراوەکە بەر لە تەواوبوونی ماوەی بەکرێدانەکە، جا لەناوچوونەکە پێش لە رادەستکردن بێ یان پاشی.

مەبەست لە لێکەوتەی گرێبەند لەئەستۆگرتنی ئەو زەرەرەیە لە نەمانی گرێبەندەکە دەکەوێتەوە. بۆنموونە گرێبەندی سپاردە (ماڵی سپاردەکراو) بەکرێ لەبەرانبەر پاراستنی، ئەگەر بە بەڵایەکی بێئامان فەوتا لادانەر (المودع) زەرەرەکە دەگرێتە ئەستۆ نەك لادانراو، لادانراویش دەرهاویشتەی گرێبەندەکە دەگرێتە ئەستۆ و مافی داواکردنی کرێکەی نیە.

لەمەوە دەردەکەوێ ئەوەی لێکەوتەی گرێبەندەکە دەگرێتە ئەستۆ لەوانەیە لێکەوتەی شتەکە نەگرێتە ئەستۆ. بەڵام لە هەندێ گرێبەندا یەك کەس هەردووکیان دەگرێتە ئەستۆ، وەك گرێبەندی بەکرێدان، جا ئەگەر ماڵە بەکرێدراوەکە بەر لە رادەستکردنی یان پاش ئەوە فەوتا، بەکرێدەرەکە زەرەری فەوتانی ماڵەکە دەگرێتە ئەستۆ و لەکیسی ئەو دەچێ لەبەرئەوەی ئەو خاوەنیەتی. هەروەها زیانی نەمانی گرێبەندەکە بە هەڵوەشانەوە دەگرێتە ئەستۆ و پاش فەوتانی ماڵەکە شایستەی کرێ نابێ.

**هەڵوێستی یاسا و یاساناسان لەبارەی ئەو لایەنەی لێکەوتەی فەوتانەکە دەگرێتەئەستۆ:**

١- هیچ ناکۆکیەك لەنێوان زانایانی یاسادا نیە کە گرێبەند ئەگەر بۆ یەك لایەن پابەندکار بوو، قەرزدەرەکە زەرەری فەوتانی شتەکە دەگرێتە ئەستۆ، کە شوێنی گرێبەندەکە و بابەتی پابەندیەکەیە. بۆ نموونە ئەگەر ماڵێکی بەخشراو پێش یان پاش رادەستکردنی فەوتا، پێبەخشراو زەرەری فەوتانەکە دەگرێتە ئەستۆ.

٢- هەروەها هیچ ناکۆکیەك نیە لەوەدا کە لە گرێبەندی فرۆشتندا کڕیار زەرەرەکە دەگرێتە ئەستۆ لەم حاڵەتانەدا:

أ- ئەگەر ئاگەدار کرابوو بۆ وەرگرتنی فرۆشراوەکە، بەڵام لە وەرگرتنیدا کەمتەرخەمی کردبوو.

ب- ئەگەر فەوتانەکە لەکاتی بەندبوونی فرۆشراوەکەدا بوو لەبەر کەمتەرخەمیی کڕیار لە دانی نرخەکەی.

ج- ئەگەر کڕیار راستەوخۆ بێ یان بە بوونەهۆ رۆڵی لە مەحاڵبوونی جێبەجێکردنەکەدا هەبووبێ.

د- ئەگەر رێکەوتن کرابوو لەسەر ئەوەی بەر لە تەسلیمکردن کڕیار بەرپرسیارێتیی فەوتانەکە دەگرێتە ئەستۆ.

هـ- ئەگەر فەوتانەکە پاش تەسلیمکردن بوو.

٣- هیچ ناکۆکیەك لەوەدا نیە فەوتانەکە لەسەر فرۆشیار دەبێ ئەگەر دەستی هەبووبێ لە مەحاڵبوونی جێبەجێکردندا، یان نەیتوانیبێ بیسەلمێنێ دەستی لە مەحاڵبوونی جێبەجێکردندا نەبووە، یان مەحاڵبوونەکە بەر لە ئیمزاکرنی گرێبەندەکە بووبێ، وەك ئەو کەسەی ئۆتۆمبێلێکی فرۆشتووە کە بەر لە گرێبەندەکە سووتابوو لەسەر مەزەندەی بەراستدانانی گرێبەندەکە.

هەروەها هیچ ناکۆکیەك نیە لەوەدا کە ئەگەر فەوتانەکە بەشەکی بوو کڕیار بۆی هەیە داوای قەرەبووی دابەزینی نرخی فرۆشراوەکە، یان ئەو زیانەی بەهۆی فەوتانەکەوە تووشی هاتووە بکا، یان داوای هەڵوەشاندنەوەی فرۆشتنەکە بکا لەگەڵ قەرەبوو، ئەگەر فەوتانە بەشەکیەکە کاریگەر بوو.

**ناکۆکی لە دەرەوەی ئەو حاڵەتانەی سەرەوەدایە، وەك لەم ڕوونکردنەوەیەدا:**

**یەکەم: ئەو ئاراستەیەی پێی وایە لێکەوتەی فەوتان لە گرێبەندی فرۆشتنەکەدا لەسەر کڕیارە:**

لەو یاسایانەی ئەم ئاراستەیان گرتۆتە بەر:

١- یاسای ڕۆمانی کە پابەندیی هەر گرێبەندوانێك لە گرێبەندی فرۆشتندا لە پابەندیی گرێبەندوانەکەیتر جیا و سەربەخۆ بوو. کەوتنی یەکێکیان کەوتنی ئەویتریانی نەدەسەپاند لەبەرئەوەی نە لە بوونی زەینی و نە لە بوونی دەرەکیدا وابەستە نین، لەبەرئەوە کەوتنی پابەندیی فرۆشیار بە فەوتانی فرۆشراوەکە پابەندنەبوونی کڕیاری بە دانی پارەکەی لێ نەدەکەوتەوە.

٢- یاسای مەدەنیی فەرەنسی بەرکار هەمان ئاراستەی ڕۆمانیەکەی گرت و لە هەردوو مادەی (١١٣٨ و ١٦٢٤) ئەوە وەردەگیرێ فرۆشتنەکە هەر بەتەواوبوونی گرێبەندەکە دەبێتە دەستەبەری کڕیار، بەڵام لەڕووی بنچینەوە لە یاسای ڕۆمانی جیایە، لە ڕۆمانیەکەدا بنچینە پێکەوە نەبەسترانی هەردوو پابەندیەکەیە، لەکاتێکدا لە فەرەنسیەکەدا بنچینە یان ڕێسای: (ڕەنج بە گەنج)ـە، مادام گەنجی فرۆشراوەکە بۆ کڕیارە ڕەنجەکەیشی لەسەر ئەوە، یان ڕێسای (فەوتانی ماڵ لەسەر خاوەنەکەی دەبێ). ئاشکرایە خاوەنداریێتی پاش بەستنی گرێبەندەکە بۆ کڕیار دەبێ.

لەو یاسایانەیش لەژێر کاریگەریی ئاراستە فەرەنسیەکەدان کە لەسەر ئەو بنچینەیە موڵك لە کیسی خاوەن موڵکەکە دەچێ:

یاسای مەدەنیی ئەڵمانی (م/٤٤٠) سەبارەت بەو خانوبەرانەی لە تۆماری خانوبەرەدا تۆمار کراون، کە پاش ئەوە خانوبەرەکە دەکەوێتە دەرەوەی دەستەبەری فرۆشیارەکە و دەچێتە دەستەبەری کڕیار. هەروەها یاسای پابەندیەکانی سویسرا (م/١٨٥) کە دەڵێ سوود و مەترسیەکانی فرۆشراو هەر بە گرێدانی گرێبەندەکە دەگوێزرێنەوە بۆ کڕیار مەگەر یاسا یان ڕێکەوتنی هەردوو گرێبەندوانەکە شتێکیتر بڵێ.

یاسای (الموجبات و العقود)ی لوبنانیش لە مادەکانی (٢٤٣ و ٣٩٦ و ٣٩٨)دا هەمان ئاراستەی وەرگرتووە.

لەو یاسایانەیش رادەستکردن بە مەرجی گواستنەوەی خاوەندارێتی بۆ کڕیار دادەنێن، یاسای نەمساوی و یاسای ئینگلیزین، کە گواستنەوەی خاوەندارێتی رادەگرن تا کاتی رادەستکردن، لەبەرئەوە بەر لە رادەستکردن فرۆشراو لە دەستەبەری کڕیاردا دادەنێن[١].

**دووەم: ئەو ئاراستەیەی دەڵێ بەرپرسیارێتیی فەوتان لەسەر قەرزارە:**

لە رووی ئەو رەخنانەی ئاراستەی یاسای فەرەنسی و ئەو یاسایانەی رێچکەی ئەویان گرتووە، کراون: زۆربەی یاسا مەدەنییە عەرەبییە نوێکان بۆ ئەوە چوون کە فرۆشراو بەر لە رادەستکردن لە گەردنی فرۆشیاردایە جگە لەو حاڵەتانەی لەو یاسایانەدا هەڵاوێردراون. لەوانە:

١- حاڵەتی ئاگەدارکردنەوەی (اعذار) کڕیار بۆ وەرگرتنی ماڵە فرۆشراوەکە[٢].

٢- حاڵەتی رێکەوتن لەسەر ئەوەی فەوتان پاش گرێبەند و پێش وەرگرتنی ماڵەکە لەسەر کڕیارە.

٣- ئەگەر کڕیار بەر لە دانی پارەکەی و بەبێ مۆڵەتی فرۆشیار دەستی بەسەر فرۆشراودا گرت[٣].

٤- کڕیار ببێتە هۆی فەوتانی فرۆشراوەکە.

٥- ئەگەر فرۆشتنەکە بازرگانی بوو لێکەوتەی فەوتان لەسەر کڕیارە، لەبەرئەوەی بوون و نەبوونی بەندە بە خاوەندارێتییەوە و لە ساتی رادەستکردنی فرۆشراو بە بریکاری گواستنەوە یان گوێزەرەوە یان کەسی بەرپرس لە گواستنەوەی شتومەك کڕیار بە خاوەنی دادەنرێ، لەبەرئەوەی ئەم رادەستکردنە حوکمییە جێگەی

---

[١] بڕوانە: شرح القانون المدني المغربي القديم - د. أحمد نجيب الهلالي ١/٣٠٤، هامش ٤.

[٢] مەدەنیی عێراقیی بەرکار م/٥٤٧.

[٣] مەدەنیی عێراقیی بەرکار م/٥٧٨.

رادەستکردنی راستەقینە دەگرێتەوە کە ئەوکاتە کڕیار بۆی هەیە رەفتار بە کاڵاکەوە بکا[1].

پشتیوانانی ئەم ئاراستەیە ئەو هەڵوێستەیان بەوە شیکردۆتەوە کە پابەندبوون بە رادەستکردن ئەگەرچی پابەندیەکی شوێنکەوتەی پابەندبوونە بە گواستنەوەی خاوەندارێتی، بەڵام پابەندیەکی دووەمی نیە، چونکە بە رادەستکردن نەبێ خاوەندارێتیەکە بۆ کڕیار ساف نەبووە (واتە لە رووی ئەسەرەوە هێشتا گرێبەندەکە تەواو نابێ)، لەبەرئەوەی رادەستکردن توانای ئەوە بە کڕیار دەبەخشێ سوود لە فرۆشراوەکە وەربگرێ.

پاشان رادەستکردن کڕیار دەپارێزێ لە مەترسی ئەوەی فرۆشیار جارێکیتر فرۆشراوەکە بە یەکێکیتریش بفرۆشێتەوە، لەبەرئەوەی نەریت بەزۆری وایە کەسیتر پەنا بۆ کڕینی فرۆشراوەکە نابا، مەگەر هێشتا لە لەدەستی فرۆشیارەکەدا بێ.

**هەڵوێستی فیقهی ئیسلامی لە دیاریکردنی ئەو کەسەی لێکەوتەی فەوتانەکەی دەکەوێتە سەر:**

شەرعناسانی ئیسلامیش وەك یاساناسان سەبارەت بە دیاریکردنی ئەو لایەنەی بەرپرسیارێتیی فەوتانی فرۆشراوەکە بەر لە تەسلیمکردنی دەگرێتە ئاستۆ، بۆ دوو ئاراستە دابەش بوون:

ئاراستەیەك بەرپرسیارێتیی فەوتانەکەی بە بوون و نەبوونی خاوەندارێتیەوە بەستووە لەسەر ئەو بنچینەیەی (ماڵ لە کیسی خاوەن ماڵ دەچێ)، لەکاتێکدا لایەنەکەیتر کە رای ئاپۆرا (جمهور)ی شەرعناسانە بە تەسلیمکردنیەوە دەبەستنەوە، جگە لە گرێبەندی بەکرێدان کە فەوتانەکە بەمل خاوەن مولکی بەکرێدەردا دێ، لەبەرئەوەی لەم حاڵەتەدا خاوەندارێتیی ماڵەکە (ملكية الرقبة) لەدەست نادا.

---

[1] یاسای بازرگانیی عێراقیی بەرکار.م/١٥٣.

لە لایەنگرانی ئاراستەی یەکەم شەرعناسانی زاهیرین، ئیبن حەزم (رەحمەتی خوای لێبێ) لە کتێبی (المحلى)[1]دا دەڵێ "هەر فرۆشتنێك بەدروستی دامەزرا و ئەنجا فرۆشراوەکە پاش تەواوبوونی فرۆشتنی فەوتا، کوستەکەی بۆ کڕیارە و بۆی نیە پارەکەی لە فرۆشیار وەربگرێتەوە، هەروەها هەر عەیب و ناتەواویەك رووی تێبکا، جا چ فرۆشراوەکە غایب بێ یان حازر".

لە لایەنگرانی ئاراستەی دووەمیش شەرعناسانی حەنەفین، خوالێخۆشبوو محەمەد قەدری پاشا لە دەربڕینی رای مەزهەبە حەنەفیەکەیدا[2] دەڵێ "ئەگەر فرۆشراوەکە لای فرۆشیارەکە بە کردەی خۆی یان کردەی فرۆشراوەکە یان بەڵایەکی ئاسمانی فەوتا، فرۆشتنەکە بەتاڵ دەبێتەوە –واتە خۆبەخۆ هەڵدەوەشێتەوە– و ئەگەر پارەی درابوو کڕیارەکە پارەکەی لە فرۆشیارەکە وەردەگرێتەوە". ئەگەریش پارەی نەدرابوو فرۆشتنەکە دەکەوێ و ئەستۆی کڕیار پاك دەبێت و پابەند نابێ بە دانی، لەبەرئەوەی هۆی دانەکەی نەماوە.

ئاراستەیەکی نەرۆك و بێ پاساویش هەیە هەندێ لە شەرعناسانی مالیکی[3] و شافیعی[4] و ئیبازی[5] پەسەندیان کردوە. ئەم ئاراستەیە دەستیان داوەتە وردکردنەوەیەکی زۆر کە سوودێکی کرداری تێدا نابینین بەتایبەت لەم سەردەمەدا کە لەرووی ئابووری و شارستانیەوە پەرەی سەندوە، ئەویش بە جیاکارییکردن لەنێوان ئەوەی فرۆشیارەکە بەندە بێ یان کەنیزەك و ئەوەی فرۆشراوەکە بەروبووم بێ.

حەنبلەیەکان[6] وردکردنەوەیەکیتری ماقووڵیان هەیە، ئەویش جیاکارییە لەنێوان ئەوەی فرۆشراوەکە هاوچەشن بێ و بەوە لە کیسی فرۆشیارەکە دەچێ لەبەرئەوەی

---

[1] ٣٧٩/٨ بند ١٤٢١

[2] لە کتێبی: مرشد الحيران المادة (٤٦٠).

[3] الشرح الصغير للدردير، ١٩٥/٢ و پاشتر.

[4] المهذب لأبي إسحاق الشيرازي ٢٩٦/١.

[5] شرح كتاب النيل وشفاء العليل للعلامة أطفيش ٥١٤/٨.

[6] المغني لابن قدامة ٥٦٩/٣.

دەكرێ بەهاوچەشنەكەی جێبەجێ بكرێ و ئەم جێبەجێكردنە مەحاڵ نیە. ئەگەر بەهایی (قیمی)ش بوو لە ملی كڕیار دەبێ و ئەوە وەك فەوتانیەتی پاش وەرگرتن.

ئیمامیش[1] لەگەڵ حەنەفی كۆكن لەسەر ئەوەی لێكەوتەی فەوتانەكە لە ملی فرۆشیاردایە بەرەهایی، جا هاوچەشن بێ یاخود بەهایی.

رای زاڵ (الراجح):

بەبۆچوونی لەخۆوبوردوانەی ئێمە ئەگەر فرۆشتنەكە بەهۆی فەوتانی فرۆشراوەكە بە بەلایەكی بێئامان هەڵوەشایەوە، هەردوو گرێبەندوانەكە نیوەبەنیوە بەرپرسیارێتیی فەوتانەكە دەگرنە ئەستۆ.

هۆی لەئەستۆگرتنی نیوەی بەرپرسیارێتیی فەوتانەكە لەلایەن فرۆشیارەكەوە ئەوەیە، ئەگەرچی پابەندییە سەرەكیەكەی لە گواستنەوەی خاوەندارێتیی فرۆشراوەكە بۆ كڕیارەكە جێبەجێكردوە، بەڵام پابەندیی دووەمی جێبەجێ نەكردوە كە لە گرنگیدا بەدوای پابەندیی یەكەمدا دێ، ئەویش تەسلیمكردنە.

هەرچی هۆی بەرپرسبوونی كڕیارە بۆ بەرپرسیارێتیی نیوەكەیتری فەوتانەكە، لەبەرئەوەیە پاش بەدیهاتنی پایە و مەرجەكانی و نەمانی رێگرەكانی بە خاوەنی فرۆشراوەكە دادەنرێ، بەبەڵگەی ئەوەی ئەو زیادانەی پاش گرێبەندەكە و بەر لە تەسلیمكردن هاتوونەتە سەر ماڵە كڕیار خاوەنیانە و بۆی هەیە داوایان بكا جا چ تەسلیمكردن روویدا یان مەحاڵ بێ. ئەمەیش شتێكە دوو كەس تێیدا ناكۆك نین.

پاشان پەیڕەویكردن لەم نیوەبەنیوەیە هەردوو بنچینە باسكراوەكەی لەئەستۆگرتنی لێكەوتە كۆدەكاتەوە: بنچینەی بەستنەوەی لەئەستۆگرتن بە تەسلیمكردنەوە و بنچینەی بەستنەوەی بە خاوەندارێتییەوە. ئەمە جگە لەوەی ئەمە دادپەروەریی زیاتری تێدایە تا تەواوی قورساییەكە لەسەر شانی یەكێك لە دوو گرێبەندوانەكە دانەنرێ، لەبەرئەوەی گوتنی ئەوەی قەرزار (فرۆشیار) لێكەوتەكە

---

[1] الروضة البهية شرح اللمعة الدمشقية للعاملي ١/٣٣٦.

دەگرێتە ئەستۆ، جۆرە ستەمێکی تێدایە، کە ئەو کەسە لە یەك کاتدا پارەکەیش و فرۆشراوەکەیش لەکیس دەدات بەبێ ئەوەی هیچ کەمتەرخەمی یان گوناهێکی هەبووبێ، لەکاتێکیشدا خاوەندارێتیەکە بەکردەوە بۆ کەسێکیتر گوێزراوەتەوە.

هەروەها بارکردنی ١٠٠٪یش لەسەر شانی قەرزدەر (کڕیار) جۆرە ستەم و بێدادیەکە، لەبەرئەوەی پارە دەدا بەرانبەر بە هیچ.

**نەهێشتنی هۆی پابەندی بە بەتالکردنەوە**

بەتالکردنەوە (الابطال) لە فیقهی خۆرئاوایی و ئەو یاسایانەی لەژێر کاریگەریدان، بریتییە لە نەهێشتنی گرێبەندێك کە بەرهەمهێنی ئاسەوارەکانیەتی، لەبەرئەوەی لە بناغەیدا هەلگری ڤایرۆسێکە هەڕەشە لە مانەوەی دەکا و پێی دەوترێ گرێبەندی قابیل بە بەتالکردنەوە، یان بەشێوەیەکی ڕێژەیی بەتاڵ.

گرێبەند قابیل بە بەتالکردنەوە دەبێ ئەگەر وجودی تەواو کردبوو و پایەکانی هەبوون، بەڵام مەرجێك لە مەرجەکانی دروستیی پایەی ڕەزامەندی لەدەست دابوو. گرنگترینی ئەم مەرجانە شیانی تەواوی ئەنجامدان و سەلامەتیی ڕەزامەندییە، واتە خاڵیبوونی لە هەر خەوشێك لە خەوشەکانی ڕەزامەندی. لەم ڕوانگەوە گرێبەند قابیل بە بەتالکردنەوە دەبێ لە یەکێك لەم دوو حاڵەتەدا:

**یەکەمیان** ئەگەر یەکێك لە دوو گرێبەندوانەکە بەنیسبەت گرێبەندەکەیەوە شیان ناتەواو بێ. لەو یاسایانەی لەژێر کاریگەریی فیقهی ئیسلامیدان، لەم حاڵەتەدا گرێبەندەکە وەستێنراو (موقوف) دەبێ.

دووەمیان ڕەزامەندیی لایەکیان هەڵە یان خەڵەتاندن یان زۆرلێکردن یان قۆستنەوەی تێکەڵ بوو.

قابیلیەتی گرێبەندیش بۆ بەتالکردنەوە ڕاستەوخۆ بۆ سروشتی ئەم شتانە و بەرژەوەندیی گشتی ناگەڕێتەوە، بەڵکو بۆ ئارەزووی پاراستنی یەکێك لە دوو گرێبەندوانەکە دەگەڕێتەوە لە مەترسیی ئەو دەردەی پێی دەوترێ خەوشی ئیرادە یان خەوشی ڕەزامەندی، کە بریتییە لە هەڵە یان خەڵەتاندن یان زۆرلێکردن یان

قۆستنەوە سەبارەت بەو کەسەی لە بەرژەوەندیی ئەو بڕیار لە قابیلبوون بە بەتاڵکردنەوە دراوە[1].

یاساناسان بە دەربڕینی جیاواز ئەم بابەتەیان چارەسەر کردوە، لەوانە: سەلامەتیی ڕەزامەندی و نەخۆشیەکانی گرێبەند و خەوشەکانی ئیرادە و خەوشەکانی ڕەزامەندی و دروستیی ڕەزامەندی. بەڵام دەربڕینی ورد بریتییە لە (خەوشەکانی ئیرادە). لەو یاسایانەی لەژێر کاریگەریی فیقهی ئیسلامیدان لەم حاڵەتەدا گرێبەندەکە گرێبەندێکی کارپێکراو و نالازم دەبێ، جگە لە یاسای مەدەنیی عێراقی بەرکار، کە لەم یاسایانە لایداوە و بەپێچەوانەی ئەم یاسایانە و فیقهی ئیسلامی جوڵاوەتەوە و لە مادەکانی (١١٢–١٢٥)دا گرێبەند بۆ خەوشەکانی ئیرادەی بە گرێبەندێکی وەستێنراو داناوە، لەکاتێکدا گرێبەندی وەستێنراو ئەو گرێبەندەیە هۆی وەستانەکەی بۆ ناتەواویی شیان یان پەیوەندبوون بە مافی کەسانیترەوە دەگەڕێتەوە، وەك وەسێتکردن بە زیاتر لە سێ–یەکی میرات، یان بۆ نەبوونی دەسەڵات بەسەر بابەتی گرێبەنددا، وەك لە گرێبەندی خۆهەڵقورتێن (فزول)دا.

پاشان یاسادانەری عێراقی کەوتە هەڵەیەکیتر ئەویش باسکردنە لەوەی گرێبەند قابیل بە بەتاڵبوونەوەیە کە لەنێو ئەو یاسا عێراقی و عەرەبیانەی لەژێر کاریگەریی فیقهی ئیسلامیدان و تەنانەت یاسای مەدەنی خۆیشیدا بەدی ناکرێ، کە لە برگەی سێیەم لە مادەی (١٣٨) دەڵێ: "لەگەڵ ئەوەیشدا شیان ناتەواو، ئەگەر گرێبەندەکە لەبەر ناتەواویی شیانی ئەو بەتاڵ کرایەوە، پابەند ناکرێ بە گێڕانەوەی جگە لەو سوودەی بەهۆی جێبەجێکردنی گرێبەندەکەوە دەستی کەوتووە".

پاش ئەوەی برگەی دووەمی هەمان مادە دەڵێ "ئەگەر گرێبەندەکە بەتاڵ بوویەوە هەردوو گرێبەندوان دەگەڕێنەوە سەر ئەو دۆخەی بەر لە گرێبەندەکە تێیدا

[1] بڕوانە: الأستاذ د. سليمان مرقس – أصول الالتزامات، ص٢٣٢ و پاشتر.

بوون، ئەگەر ئەمەیش مەحاڵ بوو دەکرێ بڕیار بە دانەوەی قەرەبوویەکی هاوتا بدرێ".

ئەم بڕگەیەیش هەڵەیەکی تێدایە، لەوەدا یاسادانەر دەستەواژەی دەکرێ (جاز)ی لەباتی پێویستە (وجب) بەکارهێناوە.

**گرێبەندی قابیل بە بەتاڵکردنەوە و ئەو گرێبەندانەی پێیەوە پەیوەندارن،**

**یەکەم: گرێبەندی قابیل بە بەتاڵکردنەوە و (گرێبەندی) بەتاڵی رەها:**

یەکەمیان بەم خەسڵەتانەی خوارەوە لە دووەم جیا دەکرێتەوە:

١- بوونێکی راستەقینە و یاسایی هەیە بەپێچەوانەی دووەم کە بوونەکەی وێنەییە.

٢- مۆڵەتی لەگەڵدایە، بەپێچەوانەی دووەم.

٣- ئاسەوارگەلێك بەرهەم دێنێ کە بە مۆڵەتدان جێگیر دەبن.

٤- بە کۆنبوون (التقادم) دەگۆڕێ بۆ دروست، بەپێچەوانەی دووەم.

٥- ماوەی کۆنبوون تێیدا سێ ساڵە، بەپێچەوانەی دووەم کە بۆ کەوتنی دەعوا (١٥) ساڵ پێویستە.

٦- تەنها ئەو کەسە دەستی پێوە دەگرێ کە قابیلیەتی بەتاڵکردنەوە لە بەرژەوەندیی ئەو بڕیاری لێدراوە، بەپێچەوانەی دووەم کە هەموو خاوەن بەرژەوەندیەك مافی دەستپێوەگرتنی هەیە.

٧- هۆکانی بریتین لە ناتەواویی شیان و خەوش (عەیب)ەکانی ئیرادە، بەپێچەوانەی دووەم کە هۆکانی بریتین لە سەرپێچیکردنی یاسا، یان سیستمی گشتی، یان ئادابی گشتی، یان نەبوونی پایە، یان مەرجی گرێدان.

٨- دەکرێ لەلایەن ئەو کەسەی قابیلیەتی بەتاڵکرنەوە لە بەرژەوەندیی ئەو بڕیاری لێدراوە دەستی لێ هەڵبگیرێ، بەپێچەوانەی دووەم کە دەستلێهەڵگرتنی پێچەوانەی سیستمی گشتییە، لەبەرئەوەی بناغەکەی پاراستنی بەرژەوەندیی گشتی یان سیستمی گشتی یان ئادابی گشتییە.

٩- دادگە بۆی نیە خۆبەخۆ بڕیاری بەتاڵکردنەوە بدات، بەپێچەوانەی دووەم.

١٠- بناغەی یەکەمیان چاودێریکردنی بەرژەوەندیی تایبەتە و بناغەی دووەمیشیان چاودێریکردنی بەرژەوەندیی گشتییە.

١١- لە یەکەمیاندا رەزامەندی هەیە بەڵام خەوشدارە، لە دووەمیاندا هەر نیە[1].

**دووەمیان: گرێبەندی قابیل بە بەتاڵکردنەوە و گرێبەندی وەستێنراو:**

هەندێ لە شەرعناسان[2] گومانیان وابوو ئەم دوو گرێبەندە هاومانان، ئەم گومانەیش هەڵەیە، لەبەرئەوەی یەکەمیان زاراوەی فیقهی خۆرئاوایی و ئەو یاسایانەیە لەژێر کاریگەریدان، بەڵام دووەمیان زاراوەی فیقهی ئیسلامی و ئەو یاسایانەیە لەژێر کاریگەریدان.

هەردوو زاراوەکە لەم رووانەوە جیاوازن:

١- **لەرووی ئەسەرەوە: گرێبەندی** قابیل بە بەتاڵکردنەوە ئەگەرچی فیقهی خۆرئاوایی بە گرێبەندێکی خراپ (فاسد)ی دادەنێ، بەڵام هەموو ئەسەرەکانی گرێبەندی دروستی لێدەکەوێتەوە، بەڵام ئەم ئەسەرانە بە مۆڵەتی ئەو کەسە نەبێ کە لە بەرژەوەندیی ئەو قابیلیەتی بەتاڵکردنەوە بڕیاری لێدراوە جێگیر نابن، لەکاتێکدا گرێبەندی وەستێنراو لەرووی ئەسەرەوە هاوشێوەی گرێبەندی بەتاڵی رەها بەر لە مۆڵەتدان، تا پاش مۆڵەتدانی ئەو کەسەی لە بەرژەوەندیی ئەو قابیلیەتی بەتاڵکردنەوە بڕیاری لێدراوە، یان کۆنبوون، ئەو ئەسەرانەی لێناکەونەوە.

٢- **لەرووی هۆوە:** وەك پێشتر باس کرا، هۆکانی قابیلبوون بۆ بەتاڵکردنەوە، بریتین لە ناتەواویی شیان یاخود ئەهلیەتی یەکێك لە دوو گرێبەندوانەکە یان تووشبوونی ئیرادەی بە نەخۆشی (خەوش)ی ئیرادە، کە بریتییە لە هەڵە یان

---

[1] الأستاذ د. أبو ستيت، مصادر الالتزام ٢٦٠/١ و ئاشتر.
الأستاذ مرقس، أصول الالتزامات ٢٣٢ و ئاشتر.
الأستاذ توفيق حسن فرج، مصادر الالتزام ٢٠١/١.

[2] د. سليمان مرقس، أصول الالتزامات، ص٢١١.

زۆرلێكردن یان فریودان یان قۆستنەوە. لەكاتێكدا هۆكانی وەستانی گرێبەند بریتین لە نەبوونی ویلایەت بەسەر شوێنی گرێبەندەكەدا، یان ناتەواویی شیان، یان پێوەبەسترانی مافی كەسانیتر.

٣- گرێبەندی قابیل بە بەتالكردنەوە لە دروستیەوە نزیكترە تا لە بەتاڵیی رەها، لەبەرئەوەی ئەسەرەكانی بەرهەم دێنێ با جێگیریش نەبن، لەكاتێكدا گرێبەندی وەستێنراو لە بەتاڵییەوە نزیكترە تا دروستی، لەبەرئەوەی تا پاش مۆڵەتدان ئەسەرەكانی بەرهەم ناهێنێ.

٤- گرێبەندی قابیل بە بەتالكردنەوە لەلایەن فیقهی خۆرئاواییەوە بە بەشێك لە گرێبەندی نادروست دەژمێرێ، لەكاتێكدا فیقهی ئیسلامی گرێبەندی وەستێنراو دەخاتە نێو بەشی گرێبەندی دروست.

**سێیەم: گرێبەندی قابیل بە بەتالكردنەوە و گرێبەندی خراپ:**

یاساناسان گرێبەندی قابیل بە بەتالكردنەوە بە گرێبەندێكی خراپ (فاسید) بە چەمكی فیقهی ئیسلامی، دادەنێن، ئەمەیش لە چەند روویەكەوە هەڵەیە:

١- هۆكانی گرێبەندی خراپ لای ئەوانەی ئەوە دەڵێن[1] پێنجن، هۆكانی قابیلیەت بە بەتالكردنەوەیش ئەگەرچی ئەوانیش پێنجن بەڵام جیاوازن. یەكەمیان بریتین لە زۆرلێكردن، الغرر، زیان، سوو و مەرجی خراپ، لەكاتێكدا هۆكانی قابیلیەت بە بەتالكردنەوە وەك پێشتر باسمان كرد بریتین لە ناتەواویی شیان، زۆرلێكردن، فریودان، هەڵە و قۆستنەوە.

٢- خراپ (الفاسد) لە فیقهی ئیسلامیدا پاش وەرگرتن خاوەندارێتی دەگەیەنێ و پێی دەوترێ خاوەندارێتیی پیس (الملكیة الخبیثة)، لەبەرئەوەی گرێبەندی خراپ پێویستە قەزا حوكم بە هەڵوەشاندنەوەی بدات، لەكاتێكدا قابیل بە بەتالكردنەوە پێش وەرگرتن خاوەندارێتی دەگەیەنێ.

---

[1] بروانە: الأستاذ د. سلیمان مرقس — أصول الالتزامات، ص٢٣٢ و ئاشتر.

٣- خراپ لە فیقهی ئیسلامی و ئەو یاسایانەی لەژێر کاریگەریدان بە نەمانی هۆی خراپییەکە دەگۆڕێ بۆ دروست، لەکاتێکدا قابیل بە بەتاڵکردنەوە بە مۆڵەت نەبێ دروست و جێگیر نابێ.

**چوارەم: گرێبەندی قابیل بە بەتاڵکردنەوە و گرێبەندی کارپێکراوی نالازم:**

پەیوەندیی نێوان ئەم دوو گرێبەندە پەیوەندییەکی پتەوە، ئەویش لەبەر کۆکبوونیان لەم ڕووانەی خوارەوە:

١- هەردووکیان ئاسەواریان بەرهەم دێنن، بەڵام لە فیقهی ئیسلامی و ئەو یاسایانەی لەژێر کاریگەریدان و لە فیقهی خۆرئاوایی و ئەو یاسایانەی لەژێر کاریگەریدان لەبەردەم ئەگەری لابردن و نەهێشتنی ئاسەوارەکانیدان.

شایانی باسە بەتاڵکردنەوە و هەڵوەشاندنەوە لە فیقهی ئیسلامیدا هاومانان.

٢- ئەو کەسەی پێی وایە هەردووکیان پێویستبوون (لزوم)یان تێدا نییە، مافی هەڵبژاردنی هەیە لەنێوان هەڵوەشاندنەوە (یاخود بەتاڵکردنەوە) یان مۆڵەتپێدانی، کە لە فیقهی ئیسلامیدا پێی دەوترێ (الامضاء).

٣- لەوەدا کۆکن کە هەردووکیان هاوبەشکەی بەتاڵی ڕەهان، هاوبەشکەی هەر شتێکیش لێی جیاوازە.

بەڵام لە هەندێ ڕوویترەوە لێك جیاوازن، لەوانە:

١- کارپێکراوی نالازم ڕاست و دروستە لەبەرئەوەی بەشێکە لە گرێبەندی دروست، لەکاتێکدا قابیل بە بەتاڵکردنەوە بەشێکە لە گرێبەندی نادروست، لەبەرئەوەی فیقهی خۆرئاوایی -وەك پاشتر باس دەکرێ- گرێبەند لە ڕووی سیفەتە یاساییەکەیەوە بۆ بەتاڵ و دروست دابەش دەکا، بەتاڵیش بۆ بەتاڵی ڕەها و بەتاڵی ڕێژەیی (یان قابیل بە بەتاڵکردنەوە) دابەش دەکا، ئەوە لە فیقهی خۆرئاواییدا هاوبەشکەی دروستەکەیە.

شایانی باسە ئەم ئاراستە خۆرئاواییە هاودژیەکی ڕوونی تێدایە لەوەی گرێبەندەکە بە نادروست و لە هەمان کاتدا بەرهەمهێنی ئەسەریش دادەنێ.

٢- **لەڕووی هۆوە:** وەك پێشتر باسمان کرد و پاشتریش باسی دەکەین، هۆکانی ناسەپێن (نالازمی)ی گرێبەند لە فیقهی ئیسلامیدا جیاوازن لە هۆکانی قابیلبوونی گرێبەند بۆ بەتاڵکردنەوە، کە بریتین لە ناتەواویی شیان و عەیبەکانی ئیرادە.

**ئاسەوارەکانی بەتاڵکردنەوەی گرێبەندی قابیل بە بەتاڵکردنەوە:**

هەرکاتێك بڕیاری بەتاڵکردنەوەی گرێبەندی قابیل بە بەتاڵکردنەوە درا، هۆی پابەندی نامێنێ و پێویستە هەردوو گرێبەندوان بگێڕدرێنەوە بۆ دۆخی بەر لە بەستنی گرێبەندەکە، بەڵام یەك شت لەم ڕێسایە هەڵاوێردراوە ئەویش ئەوەیە ئەگەر گرێبەندی قابیل بە بەتاڵکردنەوە لەبەر ناتەواویی شیان بەتاڵ کرایەوە، کەسی شیان ناتەواو تەنها ئەو شتە دەگێڕێتەوە کە ماڵە لەبەردەستیدا و ماوە، یان بەئەندازەی ئەوەی سوودی لێ بینیوە لەوەی کە نەماوە. ئەو بڕە پارانەی شیان ناتەواو قەرزەکانی کەسانیتری پێ داونەتەوە و شتی بەکەڵکی پێ کڕیون، وا دادەنرێ بڕە پارەیەکن سوودی لێ بینیون. بەڵام ئەوەی لە تێرکردنی ئارەزووەکانیدا خەرجی کردوون وا دانانرێ سوودی لێ بینیون و نایانگێڕێتەوە[1].

---

[1] بڕوانە یاسای مەدەنیی عێراقیی بەرکار- مادەی (١٣٨) و مەدەنیی میسریی بەرکار مادەی (١٤٢).

# بەشی شەشەم

# گرێبەند. دابەشکردن و جۆرەکانی

وەك پێشتر باسمان کرد، هۆ وەسفێکی دیاری رێکخراوە بەجیاوازیی کەسەکان و کات و شوێن ناگۆڕێ، بوونی هۆ بوونی حوکمدانی لێدەکەوێتەوە ئەگەر رێگرێك نەبێ، نەبوونیشی حوکمنەدانی لێدەکەوێتەوە ئەگەر هۆیەکیتری نەبێ[1].

هۆکانی پابەندیش بەگشتی دوو جۆرن: رەفتاری یاسایی و رووداو (واقعە)ی یاسایی.

بەڵام لە وردەکاریدا چوارن: گرێبەند و ئیرادە و کردەوەی سوودبەخش و کردەوەی زیانبەخش.

زانایانی یاسا ئەو هۆیانەیان ناوناوە سەرچاوەی پابەندی. لە فەسڵی یەکەمی ئەم بابەتەدا بە بەڵگەی مەنتیقی بەتاڵیی ئەم ناونانەمان سەلماند، بەڵام ئەم ناونانە لەرووی مەجازەوە دروستە، بەڵام تا راستەقینە مەحاڵ نەبێ پەنا بۆ مەجاز نابرێ.

لەم رووەوە توێژینەوە لە ناونیشانی ئەم فەسڵە بۆ دوو باس دابەش دەکرێ: یەکەمیان بۆ دابەشکردنەکانی گرێبەند و دووەمیان بۆ جۆرەکانی تەرخان دەکرێ.

---

[1] وەك لە رەوینەوەی پابەندیدا کە چەند هۆیەکی هەیە، ئەگەر یەکێکیان نەبوو لەوانەیە هۆیەکیتر جێی بگرێتەوەوەك دانەوەی قەرز، ئەگەر قەرزارەکە نەیدایەوە و قەرزدەرەکە مرد و میراتگرەکەیش هەر تەنها کەسە قەرزارەکە خۆی بوو. پابەندیەکە نامێنێ، ئەویش لەبەر یەکگرتنی ئەستۆ.

# باسی یەکەم:
# دابەشکردنەکانی گرێبەند
# لەڕووی گونجاندنی یاساییەوە

گرێبەند پەیوەستیەکی یاساییە لەنێوان ئیجاب و قبوڵدا بەشێوەیەك ئاسەوارەکەی لە گرێبەند لەسەرکراو گرێبەندواندا جێگیر دەبێ. لەفزی (گرێبەندوان) من زیادم کردوە لەبەرئەوەی ئاسەواری گرێبەند لە مافەکانە و پەیوەندی بە گرێبەند لەسەرکراو و ئەو پابەندیانەوە هەیە کە پەیوەندیان بە ئەستۆی هەردوو گرێبەندوانەوە هەیە پاش ئەوەی گرێبەندەکە بەشێوەیەکی راست و دروست دادەمەزرێ. یاسادانەری عێراقی لە پێناسەی گرێبەند لە مادە (٧٣)دا کە لە (مرشد الحیران) مادەی (...) وەرگیراوە ئەم زیادەیەی پشتگوێ خستووە، ئەوەیش کەمیەکی عەیبهێنە، لەبەرئەوەی ئاسەوارەکانی گرێبەند تەنها پەیوەندییان بە گرێبەند لەسەرکراوەوە نیە، بەڵکو مافەکان پەیوەندییان بەوەوە هەیە و پابەندیەکان پەیوەندییان بە ئەستۆی دوو گرێبەندوانەکەوە هەیە.

**بەشەکانی گرێبەند:**

گرێبەند لەڕووی گونجاندنی یاسایی (سیفەتی یاسایی)ەوە بەشێوەیەکی سیانینە و چوارینە و پێنجینە دابەش دەبێ، لەڕوویتریشەوە جۆریتری هەیە.

**یەکەم: بەشەکانی گرێبەند لەڕووی گونجاندنی یاساییەوە سیانن: سیانینە و چوارینە و پێنجینە**، وەك لەم روونکردنەوەیەدا:

**أ- دابەشکردنی سیانینە:**

فیقهی خۆرئاوایی و ئەو یاسایانەی لەژێر کاریگەریدان، لەڕووی گونجاندن (التكييف)ی یاساییەوە گرێبەندیان بۆ دروست و بەتاڵ (الصحيح و الباطل) دابەش کردوە. بەتاڵیشیان بۆ بەتاڵیی رەها و بەتاڵیی رێژەیی کە پێی دەوترێ قابیل بە بەتاڵکردنەوە، دابەش کردوە.

**بەشی یەکەم:** گرێبەندی بەتاڵی رەها: لە باسی دووەمی فەسڵی سێیەمدا ئەم گرێبەندەمان روون کردەوە، بۆیە پێویست بە دووبارەکردنەوەی ناکاتەوە، بەڵام ئەم تایبەتمەندیانەی دەخەینە سەر:

- هەر خاوەن بەرژەوەندیەك بۆی هەیە دەست بە بەتاڵیی رەهاوە بگرێ، هەروەك دادگە بۆی هەیە لەخۆیەوە بڕیاری لەسەر بدات.
- ناکرێ واز لە دەستگرتن بە بەتاڵبوون (بطلان)ەوە بهێنرێ.
- مۆڵەتی پێوە نابەسترێ لەبەرئەوەی وەك نەبوو وایە.
- دەعوای بەتاڵبوونیش تا تێپەڕبوونی پازدە ساڵ ناکەوێ، ئەمە مانای ئەوە نیە گرێبەندەکە بە کۆنبوون دەبێتە دروست، بەڵکو مەبەست ئەوەیە بۆ نموونە ئەگەر فرۆشتنی بەتاڵ جێبەجێ کرا، پاشان فرۆشیارەکە ویستی پێداگری لەسەر بەتاڵیی فرۆشتنەکە بکا تا فرۆشراوەکە بگێڕێتەوە، یان کڕیارەکە پێداگری لەسەر بکا تا پارەکە بگێڕێتەوە، گوێ لە داواکەی ناگیرێ. بەڵام داوای بەبەتاڵدانان بە کۆنبوون ناکەوێ، واتە ئەگەر یەکێك لەو دوو لایەنە دلوای جێبەجێکردنی هەندێ لەو پابەندیانەی لە لایەنەکەیتر کرد کە لێی دەکەونەوە، بۆ نموونە وەك پابەندبوون بە گەرەنتیکردنی فرۆشراوەکە پاش تێپەڕبوونی پازدە ساڵ لە مێژووی گرێبەندەکە، داوا لەسەرکراو (مدعى عليه) بۆی هەیە داوای بەبەتاڵدانانی گرێبەندەکە بکا کە داواکار پشتی پێدەبەستێ سەرباری ئەوەی ماوەی کۆنبوون بەسەر دەعواکەدا تێپەڕیوە.

نهێنی ئەوەیش دلوای بەبەتاڵدانان (الدفع بالبطلان) بە کۆنبوون ناکەوێ، ئەوەیە ماوەی کۆنبوون تێیدا لەکاتی دروستبوونی مافەکە و ئیمکانی بەکارهێنانیەوە دەست پێدەکا. بەدەربڕینێکیتر، ماوەی کۆنبوونی دەعوا لەکاتی دامەزرانی گرێبەندەکەوە دەست پێدەکا، لەکاتێکدا ماوەی دلوای بەبەتاڵدانان لەکاتی بەرزکردنەوەی دەعواکەوە دەستپێدەکا[1].

**بەشی دووەم:** گرێبەندی قابیل بە بەتاڵکردنەوە: پێشتر بەدرێژی باسی ئەم بەشە کرا لەڕووی هۆکان و بەراوردکردن بە گرێبەندە پەیوەندارەکانەوە و پێویست بە دووبارەکردنەوەی ناکا.

**بەشی سێیەم:** گرێبەندی دروست: ئەو گرێبەندەیە هەموو پایە و مەرجەکانی گرێدرانی تێدایە و هیچ هۆیەك لە هۆکانی قابیلیەتی بەتاڵبوونەوەی تێدا نیە.

هەرکاتێك ئەم رەگەزانە بەدیهاتن ئاسەوارەکانی لە ماف و پابەندییەکان بەرهەم دێنێ، ئەگەر رێگرێك لەئارادا نەبێ.

**ب- دابەشکردنی چوارینە:**

ئاپۆرای شەرعناسان ئاراستەی چوارینەیان پەسەند کردوە و هەندێ یاسا کەوتونەتە ژێر کاریگەریەوە، لەوانە یاسای مەدەنیی عێراقیی بەرکار، وەك خوارەوە:

بەشی یەکەم: گرێبەندی بەتاڵ: هەر گرێبەندێکە پایەیێك لە پایەکانی گرێدانی، یان مەرجێك لە مەرجەکانی گرێدانی تێدا نەبێ.

بەشی دووەم: گرێبەندی دروستی وەستێنراو: گرێبەندێکە بە دروستی گرێ دەدرێ، بەڵام ئاسەوارەکانی لەسەر مۆڵەتپێدانی ئەو کەسەی مافی مۆڵەتدانی هەیە دەوەستێ لەبەر بوونی هۆیەك لە هۆکانی وەستان، ئەویش ناتەواویی شیانی یەکێك لە دوو گرێبەندوانەکەیە، یانی شوێنی گرێبەندەکە مافی کەسانیتری پێوە بێ، یان دەسەڵات بەسەریدا نەبێ وەك پێشتر روون کرایەوە.

---

[1] الأستاذ مرقس – المرجع السابق، ص٢١٦ و پاشتر.

بەشی سێیەم: گرێبەندی کارپێکراوی نالازم: گرێبەندێکی دروستە و پایە و مەرجەکانی تێدا هاتوونەتە دی، بەڵام ئەگەری هەڵوەشاندنەوەی لەپێشە، لەبەر خودی خۆی وەك بریکاری و ئیعارە، یان لەبەر بەربەستێك، وەك گرێبەندێك بژاردەی عەیب یان بژاردەی مەرج یان بژاردەی بینین و ئەو شتانەی تێدا بێ.

بەشی چوارەم: گرێبەندی کارپێکراوی لازم: گرێبەندێکی دروستە و پایە و مەرجەکانی تێدا هاتوونەتەدی و هیچ هۆیەك لە هۆکانی کارپێنەکران، یان نالازمی تێدا نیە.

**ج- دابەشکردنی پێنجینە:**

بریتییە لە دابەشکردنە چوارینەکە و بەشێکی پێنجەمی خراوەتە سەر، ئەویش گرێبەندی خراپ (واتە فاسیدە).

لایەنگرانی ئەم دابەشکردنە دەڵێن: گرێبەند یان ئەوەتا دروست (صحیح)ە یان نادروست (غیر صحیح)ە، هی دروست یان کارپێکراوی لازمە، یان کارپێنەکراو (وەستێنراو)ە، یان ئەوەتا کارپێکراوی نالازمە.

گرێبەندی نادروستیش یان بەتاڵە یان فاسیدە.

هەندێ لە شەرعناسان سەرکردایەتی ئەم دابەشکردنە پێنجینەیان کردوە[1].

شایانی باسە یاسادانەری عێراقی لە یاسای باری کەسینی کارپێکراودا، لە هەردوو مادەی شەشەم و بیست و دووەمیدا، پەیڕەوی لەم دابەشکردنە کردوە. هەروەها یاسای مەدەنیی ئوردنیی بەرکار مادەی (١٧٠) و یاسای مەدەنیی یەمەنیی بەرکار مادەی (١٤٣).

**بنچینەکانی خراپیی گرێبەند:**

لایەنگرانی ئەم بەشە خراپەکەیان لەسەر سێ بنچینە دامەزراندوە:

---

[1] وەك حەنەفیەت، البدائع ٣٠٨٠/٧ و ئاشتر. تبیین الحقائق شرح کنز الدقائق للزیلعي ٤٣/٤ و ئاشتر. فتح القدیر لابن الهمام ٤٠٠/٦.

**بنچینەی یەکەم:** جیاکاری لەنێوان هەڵبژاردن و رەزامەندی، گوتیان هەڵبژاردن دەستکردنە بە هۆ بە ئیرادەیەکی ئازاد و بزانەوە. رەزامەندیش ئارەزووکردنە لەوەی ئاسەوار لەو هۆیە بکەوێتەوە کە دەستی پێ کراوە[1]. هەروەها روونیان کردۆتەوە کە هەڵبژاردن و رەزامەندی دوو پایەی مەعنەویی گرێبەندن، ئەگەر پێکەوە هاتنە دی گرێبەندەکە دروست دەبێ، ئەگەریش پێکەوە نەبوون گرێبەندەکە بەتاڵ دەبێ. ئەگەریش هەڵبژاردن هەبوو و رەزامەندی نەبوو گرێبەندەکە خراپ (فاسد) دەبێ، وەك گرێبەندی زۆرلێکراو.

لەکاتێکدا ئاپۆرای شەرعناسان ئەو جیاکاریەیان لەنێوان هەڵبژاردن و رەزامەندیدا نەکردوە و گوتویانە هەردووك هاومانان. بەڵام فیقهی خۆرئاوایی لەگەڵ جیاکاریەکەدایە و پێی وایە هەڵبژاردن دەربڕینی گرێبەندە و رەزامەندی ویستنی ئاسەوارەکەیەتی[2].

**بنچینەی دووەم:** جیاکاری لەنێوان نەهیکردنی گرێبەندەکە لەبەر خودی خۆی (پایەیێك لە پایەکانی) وەك ئەوەی شوێنی گرێبەندەکە هی ئەوە نەبێ مامەڵەی لەتەکدا بکرێ، وەك نەهیکردن لە مامەڵەکردن بە مادەی هۆشبەر. هەروەها لەنێوان نەهیکردنی لەبەر وەسفە وابەستەکەی (لێی جیا نابێتەوە) وەك قەرزی بەسوو، کە لە فیقهی ئیسلامیدا وەسفە وابەستەکەی بەرەهایی سوودەکەیە، لە یاساشدا هەر زیادەیەکە بەدەر لەوەی یاسا دیاری کردوە.

ئەم زیادەیە وابەستە (لازم)یەتی مادام هەڵگری سیفەتی سووکاری (ربوي)یە، بەلای ئاپۆرای شەرعناسانەوە گرێبەندەکە لە هەردوو حاڵەتەکەدا بەتاڵە، لەکاتێکدا بەلای ئەوانەی باس لە گرێبەندی فاسید دەکەن لە حاڵەتی یەکەمدا بەتاڵ و لە حاڵەتی دووەمدا فاسیدە.

---

[1] شرح التوضيح على التنقيح لصدر الشريعة عبيدالله بن مسعود ٢/١٩٦.

[2] وحيد الدين سوار، التعبير عن الإرادة في الفقه الإسلامي، دراسة مقارنة بالفقه الغربي، ط ١٩٦٠، ص٤٤٤ و ئاشتر.

**بنچینەی سێیەم:** جیاكاری لەنێوان ئەسڵی گرێبەند و وەسفەكەی، وەك لەم روونكردنەوەیەدا دیارە:

لایەنگرانی گرێبەندی فاسید دەڵێن رەگەزەكانی گرێبەند -وەك لە پێناسەكەیەوە وەردەگیرێ- بەئیجمال سیانن: دارشتە (الصیغە) + گرێبەندوان + گرێبەندلەسەركراو. بەتەفسیلیش شەشن (ئیجاب و قبوڵ + هەردوو لایەنی گرێبەند + ئەو دووشتەی ئاڵوگۆڕ دەكرێن). ئەم شەش رەگەزەیش مەرجیان هەیە كە بریتین لە:

١- جووتبوون (تطابق)ی ئیجاب و قبوڵ لە شتە جەوهەریەكاندا.

٢- یەكبوونی مەجلیسی ئیجاب و قبوڵ لە بەستنی گرێبەندەكە لەنێوان ئامادەبوواندا.

٣- چەندانەبوونی گرێبەندوان چ بە راستەقینە بێ یان بەحوكم، وەك ئەوەی بریكار بە مۆڵەتی بریكاردارەكەی ئەوماڵەی كراوەتە بریكاری بۆ خۆی بكڕێ.

٤- فامكردنی گرێبەندوان لە ئاڵوگۆڕەكان و باڵقبوون (تەواوكردنی هەژدە ساڵ) لە بەخشیندا.

٥- شوێنی پابەندیەكە دیاریكراو، یان قابیل بە دیاریكردن بێ.

٦- شوێنی پابەندیەكە بۆ مامەڵەكردن دەست بدات (بەكەڵك و بەردەست بێ).

٧- شوێنی پابەندیەكە قابیل بە تەسلیمكردن بێ.

ئەم پێنج مەرجە ئەسڵی گرێبەند (رەگەزەكان) و مەرجی دامەزرانین، جا ئەگەر یەكێكیانی تێدا نەبوو گرێبەندەكە بەتاڵ دەبێ، بەڵام بەدیهاتنی بەس نیە بۆ دروستیی گرێبەندەكە، بەڵكو -جگە لە سێی یەكەمیان- پێویستیان بە هەندێ وەسفیتری تەواوكار هەیە، بەم شێوەیە:

أ- فامكردن یاخود ژیری كە رەگەزی رەزامەندی لەسەر دەوەستێ و پێویستی بە وەسفێكی تەواوكەر هەیە، ئەویش خاڵیبوونیەتی لە زۆرلێكردن، چونكە گرێبەندی زۆرلێكراو خراپ (فاسید)ـە.

ب- ئەوەی شوێنی پابەندیەکە دیاریکراو یان قابیل بە دیاریکردن بێ پێویستی بە وەسفێکی تەواوکار هەیە ئەویش دووربوونیەتی لە نادڵنیایی، ئەگەر لە دیاریکردنیدا نادڵنیایی هەبوو گرێبەندەکە خراپ دەبێ.

ج- ئەوەی شوێنی پابەندیەکە بۆ مامەڵەکردن دەست بدات پێویستی بە دوو وەسفی تەواوکەر هەیە، ئەوانیش بریتین لە دووربوونی لە سوو لەبەرئەوەی گرێبەندێك سووی تێدا بێ خراپە، هەروەها دوور بێ لە مەرجی خراپ، لەبەرئەوەی گرێبەندێك مەرجی خراپی تێدا بێ خراپە.

د- ئەوەی قابیل بە رادەستکردن بێ پێویستی بە وەسفێکی تەواوکەر هەیە، ئەویش خاڵیبوونیەتی لە زەرەر، چونکە هەر رادەستکردنێك زەرەری لێبکەوێتەوە خراپە، وەك ماڵێکی هاوبەش کە قابیل بە بەشکردن نەبێ.

لە روانگەی ئەوەی باس کرا، هۆ سەرەکیەکانی خراپی یاخود خراپیی گرێبەند بەلای لایەنگرانیەوە (وەك رێبازی حەنەفی) پێنجن: زۆرلێکردن، نادڵنیایی (الغرر)، زیان، سوو، مەرجی فاسید.

بەڵام بەبڕوای لەخۆبوردوانەی ئێمە، سوو دەچێتە ژێر چەمکی مەرجی فاسید، لەبەرئەوەی قەرزدان بەمەرجی سوود، مەرجێکی خراپ و خراپکارە، بۆیە هیچ پاساوێك نیە بە هۆیەکی سەربەخۆ بۆ خراپیی گرێبەند بێتە ژماردن.

شەرعناسانی حەنەفی لە روانگەی ئەوەی باس کرا رێسایەکیان داناوە کە دەڵێ "گرێبەندی بەتاڵ ئەوەیە بە ئەسڵ و وەسفی ناڕەوایە، گرێبەندی فاسید ئەوەیە بەئەسڵ رەوایە بەڵام بەوەسف نا".

ئەبوحەنیفە (رح) کە سەرکردایەتی ئەم جیاکاریەی لەنێوان بەتاڵ و فاسید کردوە، ئەم جیاکارییە بەوە شیدەکاتەوە کە ئەگەر ئەوەی لە ئەسڵیدا رەوا و لە وەسفیدا ناڕەوایە بە بەتاڵ دابنرایە، ئەوا ناڕەوا لە ئەسڵ و وەسفدا لەتەك رەوا لە ئەسڵ و ناڕەوا لە وەسفیدا یەکسان دەبوون، ئەمەیش پێچەوانەی مەنتیق و عەقڵی ساغە.

ئەگەر بە دروستیش دابنرایە، دەبوو رەوا لە ئەسڵ و وەسف لەگەڵ نارەوا لە ئەسڵ بەبێ وەسفەکەی، یەکسان دەبوون، ئەمەیش دیسان پێچەوانەی عەقڵ و مەنتیقە.

گرنگیی ئەم لێکجیاکردنەوەیەی نێوان بەتاڵ و خراپ لەوەدا دەردەکەوێ ئەگەر فەسادی گرێبەند پاش ئیمزاکردنی لابرا خۆبەخۆ دەگۆڕێ بۆ دروست، بەپێچەوانەی بەتاڵ کە لابردنی هۆی بەتاڵیەکە نایگۆڕێ بۆ دروست. لەبەرئەوە عەللامە ئەلسەنهوری[1] دەڵێ "یاساناسان ستایشی کارەکەی ئەبوحەنیفەیان کردوە لەو جیاکاریەدا و بەوە زۆر مامەڵەی دارایی لە هەرەسهێنان رزگار کردوە، لەسەر ئەو بنچینەیەی فاسید هەر بە لابردنی هۆی خراپیەکەی دەگۆڕێ بۆ دروست".

**بەروبومی لێکجیاکردنەوەی بەتاڵ و فاسید:**

ئەم بەروبومە بەڕوونی لە مامەڵە داراییەکان و باری کەسایەتی و پەرستنەکاندا دەردەکەوێ، بەم شێوەیە:

١- **خراپ لە مامەڵە داراییەکاندا** هەر بە لاچوونی هۆی خراپیەکە خۆبەخۆ دەگۆڕێ بۆ دروست، بەپێچەوانەی بەتاڵ کە ئەگەر هۆی بەتاڵبوونەکە نەما ناگۆڕێ بۆ دروست، بەڵکو پێویستە سەرلەنوێ دەستی پێ بکرێتەوە.

٢- **لە باری کەسیندا:** ئەگەر لە هاوسەرگیریی خراپدا چوونەلای ژن روویدا، لەبەر بوونی گومانی حەڵاڵبوونی شکڵی، گرێبەندەکە سەرباری خراپیەکەی، ئەم ئاسەوارە شەرعیانەی لێ دەکەوێتەوە:

أ- ئەگەر لەم چوونەلایە منداڵێك بوو نەسەبەکەی شەرعی و مافی منداڵی شەرعی لە هاوسەرگیریی دروستی دەبێ، هەروەك پابەندیەکانیشی لەسەر دەبێ.

[1] لە کتێبەکەی: مصادر الحق في الفقه الإسلامي، دراسة مقارنة بالفقه الغربي.

ب- پاش لێكجیاكردنەوەی ژن و مێردەكە بەهۆی خراپیی هاوسەرگیریەكەوە، پێویستە ژنەكە عیددە تەواو بكا.

ج- ئەو ژنەی پیاوەكە چووەتە لای، مارەیی هاوشێوە (مهر المثل)ی بۆ واجبە، لەسەر بنچینەی ئەو زیانە مەعنەویەی بەهۆی شووكردن و چوونەلاكەوە تووشی بووە.

د- بە چوونەلا خزمایەتی روودەدات و ژنەكە لەسەر ئەسڵ و فەرعەكانی پیاوەكە حەرام دەبێ، هەروەها بنەچە و وەچە (اصل و فرع)ەكانی پیاوەكەیش لەو حەرام دەبن.

هـ- چوونەلا (الدخول) سزای لەسەر لادەكەوێ و بە تاوانی زینا دانانرێ لەبەر بوونی گومان. پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ (ادرؤا الحدود بالشبهات). (بەگومان، جێبەجێكردنی حەددەكان رابگرن).

**٣- لە پەرستن (عیبادەت)ەكاندا:** ئەگەر كەسێك بۆ نموونە نەزری لەسەر خۆی كرد رۆژێك بەڕۆژوو بێ و لە رۆژی جەژنی رەمەزان یان جەژنی قورباندا بەڕۆژوو بوو، رۆژووەكەی فاسید دەبێ، سەرباری ئەوەیش، بەلای ئەوەی بەتاڵ و فاسید لێكجیا دەكاتەوە و ئەو رۆژووە بە فاسید دەزانێ، بەرپرسیارێتیەكەی لەكۆڵ دەبێتەوە و نەزركار پێویستی بەوە نیە رۆژێكیتر بەڕۆژوو بێتەوە.

# باسی دووەم:
# جۆرەکانی گرێبەندی دروست

گرێبەندی دروستی کارپێکراوی لازم لەچەند روویەکەوە بۆ چەند جۆرێك دابەش دەبێ:

**یەکەم: لەرووی لێکەوتنەوەی ئەسەرەوە:**

دابەش دەبێ بۆ رەزامەندی و شکڵی و عەینی:

١- **گرێبەندی رەزامەندی:** بۆ دامەزران و لێکەوتنەوەی ئاسەوارەکانی هەر ئەوەندە بەسە هەردوولایەنی گرێبەندوان رازی بن، بەو مەرجەی شیانی گرێبەندکردنیان تێدا بێ، وەك فرۆشتنی گوازراوەکان.

٢- **گرێبەندی شکڵی:** ئەوەیە کە لەو یاسایانەی شکڵبوون بە پایەیێك دادەنێن، بەبێ بەدیهاتنی ئەم شکڵیەتە دانامەزرێ، وەك فرۆشتنی خانوبەرە لە یاسای عێراقی[1] و یاسای تۆمارکردنی خانوبەرەدا[2]. تا ئەم شکڵیەتە نەیەتەدی، راست نیە و دانامەزرێ.

٣- **گرێبەندی عەینی (ماڵینە):** ئەو گرێبەندەیە تەنها بە رەزامەندیی دووسەرە کە لە ئیجاب و قبوڵدا خۆ دەنوێنێ، بە دروستی دادەمەزرێ و پابەندی بەرهەم نێنێ، بەلام مافی لێناکەوێتەوە تا پاش وەرگرتن وەك بەخشینی گوازراوە[3]، بۆیە

---

[1] یاسای مەدەنیی عێراقیی بەرکار (م/ ٥٠٨).

[2] (م/٣).

[3] (م/٦٠٣).

گرێبەندەکە لەڕووی ئەسەرەوە دانامەزرێ، نیوەی (واتە پابەندییەکان)ی لێدەکەوێتەوە، نیوەکەیتری (واتە مافەکان) تا پاش وەرگرتن دانامەزرێ.

زانایانی یاسا تەواوی ئەسەرەکان و تەواوی رەگەزەکانیان تێکەڵ کردوە و وەرگرتنیان بە رەگەزی دامەزراندنی گرێبەندەماڵینەکان داناوە، وەك قەرز و ئیعارە و سپاردە و بەخشینی گوازراوە و رەهنی لەلابوون (الرهن الحیازی)، ئەویش لەو رووەوە (لایتم)یان بە (لاینعقد) واتە دانامەزرێ، راڤە کردوە.

**بەرهەمی دابەشکردنەکە:**

١- لە گرێبەندی رەزامەندیدا تەنها رەزامەندیی دووسەرە بەسە، بەپێچەوانەی هەردوو گرێبەندی شکڵی و عەینی.

٢- گرێبەندی شکڵی بەبەتاڵ دادەنرێ ئەگەر شکڵە یاساییەکەی تێدا نەیەتەدی.

٣- گرێبەندی عەینی گونجاندن (تکییف)ی بۆ دەکرێ بەوەی لە ناوەڕاستی گرێبەندی رەزامەندی و گرێبەندی شکڵیدایە، لەڕووی لێکەوتنەوەی پابەندیەوە تەنها بە ئیجاب و قبوڵ لە گرێبەندی رەزامەندی دەچێ، لەڕووی لێنەکەوتنەوەی مافیش تا پاش وەرگرتن، لە گرێبەندی شکڵی دەچێ.

**دووەم: لەرووی ئاڵوگۆڕەوە:**

گرێبەند بۆ ئاڵوگۆڕەکان (المعاوضات) و بەخشینەکان (التبرعات) دابەش دەبێ:

١- گرێبەندی ئاڵوگۆڕکردن: ئەو گرێبەندەیە هەریەك لە دوو گرێبەندوانەکە لەبەرانبەر ئەو شتەی دەیدات بەویتر یان تێیدا پابەندە بۆی، بەرانبەرێك دەبات، وەك فرۆشتن کە تێیدا کڕیارەکە لەبەرانبەر ئەو پارەیەی بە فرۆشیارەکەی دەدا، شتە فرۆشراوەکە دەبات. فرۆشیارەکەیش لەباتیی فرۆشراوەکە نرخەکەی دەبات.

٢- گرێبەندی بەخشین: ئەو گرێبەندەیە بەو پێیە لایەك لە دوو لایەنە گرێبەندوانەکە هیچ بەرانبەرێك بۆ ئەو شتە نابات کە دەیدا یان پێی پابەندە، هەروەها ئەویتریش بەرانبەرێك نادات بۆ ئەوشتەی بردویەتی وەك پێدان (ئیعارە) و سپاردە و بریکاری بەبێ دەڵاڵانە (عمولە) و بەخشین (الهبة).

**بەرهەمی دابەشکردنەکە :**

بەرهەمی دابەشکردنەکە لەم خاڵانەدا دەردەکەوێ:

۱- **لەڕووی شیانەوە:** لە ئاڵوگۆڕدا شیانی ناتەواوی ئەنجامدان بەسە بۆ دامەزراندنی گرێبەند، ئەگەرچی تا پاش مۆڵەتدان ئەسەرەکانی لێناکەوێتەوە، لەکاتێکدا لە تەبەڕوعاتدا -جگە لە وەسێت[1]- بوونی شیانی تەواوی ئەنجامدان بەمەرج دادەنرێ.

۲- **لەڕووی پلەی پابەندیەوە:** پلەی پابەندی لە ئاڵوگۆڕەکاندا لە پابەندی لە بەخشینەکاندا توندترە ئەگەر کەسی پابەند تێکیدا، بۆ نموونە: ئەگەر دانانی سپاردە بەکرێ بوو ئەوە ئاڵوگۆڕە و پێویستە ئەوەی سپاردەی لەلا دادەنرێ بەئەندازەی بایەخدانی پیاوێکی ئاسایی بایەخ بە پاراستنی راسپاردەکە بدات.

بەڵام ئەگەر بەبێ کرێ بوو ئەوە بەخشەرە و بایەخدانی پیاوی ئاسایی پێویست نیە، بەڵکو بەئەندازەی ئەو کۆششە پێویستە کە بۆ پاراستنی ماڵی خۆی بەخەرجی دەدا، بەبێ ئەوەی لە بایەخدانی پیاوی ئاسایی زیاتری لێ داوا بکرێ.

۳- **لەڕووی پابەندی بە دەستەبەری شایستەیی:** لە بەخشینەکاندا لە سنوورێکی بەرتەسکدا نەبێ کاری پێناکرێ، بۆ نموونە بەخشەر گەرەنتیی شایستەبوونی بەخشراو ناکا مەگەر بەئەنقەست هۆی شایستەبوونەکەی بشارێتەوە یان بەخشینەکە لەجێی باتییەك بێ (بەخشینی پاداشت)، بۆیە قازی مەزەندەی باتییەك (عوض) بۆ پێبەخشراو دەکا لەو زیانەی لە حاڵەتی یەکەمدا پێی کەوتووە، بەڵام لە حاڵەتی دووەمدا بەخشەر تەنها ئەوەندەی لە گەردندا دەبێ

---

[1] هۆی هەڵاوێرانی وەسێت دوو شتە: یەکەمیان نەگواستنەوەی خاوەندارێتی ئەو شتەیە وەسێت لەبارەیەوە دەکرێ بۆ کەسی وەسێت بۆکراو تا پاش مەرگی وەسێتکارەکە و ئەو کەسە بەو وەسێتە لەڕووی مادیەوە زیانی پێناگا. دووەمیان ئەوەیە شیان ناتەواو وەك شیان تەواو عیبادەتکردنی راست و دروستە و پاداشتی لەسەر دەدرێتەوە، وەسێتیش عیبادەتێکی دارایییە و وەسێتکار پێویستی پێی هەیە.

كــە پێبەخشــراوی داوە، بەپێچــەوانەی ئــاڵوگۆڕكردن وەك فرۆشــتن، كــە دەستەبەری تەولو بۆ شایستەبوون هەیە.

٤- **لەڕووی عەیبە شارلوەكانەوە:** لـە ئاڵوگۆڕەكانـدا گـەرەنتی هەیـە، بـەڵام لـە بەخشیندا گەرەنتی نیە مەگەر بەئەنقەست عەیبەكەی شارابێتەوە یان بەخشەر گەرەنتیی بێعەیبیی بەخشراوەكەی كردبێ، یان فرۆشراوەكە ئاژەڵێكی نەخۆش بـوویێ بـە نەخۆشـیەك بووبێتـە هـۆی نەخۆشـكەوتنی بـاقیی ئاژەڵـەكانیتری پێبەخشراو، ئەوكاتە دەبێ بەخشەر قەرەبووی ئەو زیانەی بۆ بكاتەوە.

٥- **لەڕووی هەڵەكردن لە كەسی گرێبەندواندا:** ئەوە لە بەخشـیندا بەشـێوەیەكی گشـتی گرێبەنـد بــەتاڵ دەكاتــەوە ئەگــەر كەسـایەتیی پێبەخشـرلو بــەلای بەخشەرەوە لەبەرچاو دەگیرا، بەپێچەوانەی ئاڵوگۆڕەكان كە بەتاڵكەرەوە نابێ تا نەسەلمێ كەسایەتیی گرێبەندوانەكە لەكاتی رێكەوتنەكەدا لەبەرچاو گیراوە.

٦- لەڕووی دەعـوای كارپێنـەكرانی ئـەو رەفتـارەی لـە قـەرزارەوە دەرچـووە بـۆ زیانگەیاندن بە قەرزدەرەكەی (دەعـوای بۆلصـی)، ئـەوە لـە بەخشـیندا قبـوڵ دەكـرێ بـەبێ ئـەوەی پێویسـت بـە نیـەتخراپیی پێبەخشـراو بكـا، بـەڵام لـە ئاڵوگۆڕەكانـدا قبــوڵ نــاكرێ مەگــەر قــەرزدەر نیــەتخراپیی رەفتارچـیەكە و ئاگەداریی رەفتار بۆكراو لەوە بسەلمێنێ[1].

**سێیەم: لەڕووی دەستبەجێبوون و بەردەوامبوونەوە:**

بۆ دوو جۆر دابەش دەبێ:

١- گرێبەنـدی دەسـتبەجێ (فـوری): ئـەو گرێبەندەیـە كـات هـیچ رۆڵێكـی لـە دیاریكردنی شوێن (محل)ەكەیدا نیە یا رۆڵیشی لە دیاریكردنی وادەی جێبەجێكردنیدا هەبێ. بۆ نموونە فرۆشتن بەسروشـتی خـۆی گرێبەنـدێكی فەورییـە بۆیـە كـات هـیچ رۆڵێكی لە دیـاریكردنی هـەردوو گۆڕدراوەكـە (فرۆشـراو و نرخەكـەی)دا نیـە، بـەڵكو

---

[1] الأستاذ الدكتور سليمان مرقس – أصول الالتزامات، ص٤٦–٤٧.

فرۆشراوەکە بە وەسفە زاتیەکان یان بە بینین و نرخەکەیشی بە بڕێك پارە یان بە نرخی بازاڕ دیاری دەکرێ. بەڵام فەوریبوونی جێبەجێکردنی گرێبەندەکە ڕێگە لەوە ناگرێ کاتێك بۆ جێبەجێکردنی پابەندیی هەردوو تەرەفەکەی، یان یەکێکیان دیاری بکرێ.

٢- گرێبەندی بەردەوام یان (گرێبەندی ماوە) یان (گرێبەندی زەمەنی): ئەو عەقدەیە کات ڕۆڵی لە دیاریکردنی شوێنەکەیدا هەیە و توخمێکی جەوهەرییە تێیدا نەك لابەلایی، کە تەنها کاتی جێبەجێکردنی دیاری بکا، وەك عەقدی بەکرێدان.

**بەرهەمی دابەشکردنەکە :**

ئەم بەرهەمە لەم خاڵانەدا خۆ دەنوێنێ:

١- لەڕووی هەڵوەشاندنەوەوە هەڵوەشاندنەوەیەکی دەستبەجێ جێبەجێکراو دەبێ بە پاشئاسەوارێك و هەردوو گرێبەندوان دەگەڕێنەوە بۆ ئەو دۆخەی پێش گرێبەندکردنەکە تێیدا بوون، بەپێچەوانەی جێبەجێکردنی بەردەوام کە ئەوەی لێی فەوتاوە ناگەڕێنرێتەوە، بەڵکو کاریگەریی هەڵوەشاندنەوەکە تەنها بۆ ئایندە دەبێ.

٢- لەڕوی کاریگەریی بەڵای بێئامانەوە: لە گرێبەندی دەستبەجێدا کاریگەریی بەڵای بێئامان کە دەبێتە ڕێگر لەبەردەم جێبەجێکردندا، تەنها لەوەدا دەبێ کە دانەوەکە دوا دەخرێ تا ئەوکاتەی بەڵاکە نامێنێ بەبێ ئەوەی هیچ لە ئەندازەی ئەوەی پێویستە بدرێتەوە کەم بکات. لەوانەیە کاریگەریەکە ببێتە مایەی هەڵوەشانەوەی گرێبەندەکە ئەگەر هاتوو کات درێژ بوویەوە، بەپێچەوانەی بەردەوام کە ماوەی ڕاگرتنی جێبەجێکردن بەهۆی بەڵای بێئامانەوە لە ماوەی گرێبەندەکە دەردەکرێ، ئەگەر درێژ بوویەوە تا هەموو ماوەی گرێبەندەکەی گرتەوە گرێبەندەکە کۆتایی دێ و ئیتر لەکاتی نەمانی بەڵای بێئامانەکەدا بوونی هیچ نرخێکی نامێنێ. بۆ نموونە ئەو کەسەی هۆتێلێکی لە بەسرە بەکرێ گرتووە بەڵام جەنگی عێراق-ئێران هەڵگیرسا و نەیتوانی سوودی لێ ببینێ، جا ئەگەر شەڕەکە بەر لە تەواوبوونی ماوەکە نەما ئەوا گرێبەندەکە لەو ماوەیەی ماوە جێبەجێ دەکرێ و ئەو ماوەیەی

لێدەردەکرێ کە سوودی لێ نەبینراوە و بەکرێدەر مافی کرێی ئەو ماوە رابردووەی نابێ.

**چوارەم: لەرووی ناونان و رێکخستنی یاساییەوە:**

گرێبەند بۆ ناونراو و ناونەنراو دابەش دەبێ:

١- گرێبەندی ناونراو: گرێبەندێکە یاسا ناوێکی دیاریکراو و تایبەتی پێداوە و حوکمەکانی بەتایبەت و بەشێوەیەکی راستەوخۆ بە دەقی یاسا رێکخستووە.

٢- گرێبەندی ناونەنراو: پێچەوانەی ناونراوە، یاسا بەشێوەیەکی راستەوخۆ حوکمەکانی رێك نەخستووە و ناوێکی تایبەتی پێنەداوە.

هۆی ئەم جیاکارییە ئەوەیە جۆری یەکەم زۆر بەکار دێ، ئەوەیش لەکاتی یاسادانانیدا لەلایەنی پراکتیکیەوە گرنگیەکی گەورەی پێبەخشیوە. دەشێ گرێبەندێك لە سایەی یاسای رابردوودا لە جۆری دووەم بووبێ و لەئەنجامی پەرەسەندنی ژیانی ئابووری لە سایەی یاسا نوێکەدا بووبێتە گرێبەندێکی گرنگ و بەهەندێ ناو کە لەگەڵ سروشتیدا بگونجێ رێکی خستووە و تایبەتی کردوە.

لە نموونەی گرێبەندە ناونەنراوەکان لە سایەی یاسای مەدەنیی بەرکاردا[1]: گرێبەندی هێنان و گرێبەندی هۆتێلوانی و گرێبەندی بڵاوکردنەوەن، پرۆژەی مەدەنیی نوێ ساڵی ١٩٨٥ کە تائێستا روناکی نەبینیوە رێکی خستووە، ئەویش پاش ئەوەی ئەو گرێبەندانە لە ژیانی کرداریدا گرنگیەکی گەورەیان پەیدا کرد.

١- گرێبەندی هێنان[2]، ئەو گرێبەندەیە تێیدا بهێن پابەند دەبێ بەوەی لە ماوەیەکی دیاریکراودا و بەچەند کاروانێکی لەدوای یەك و لەکاتی خۆیدا کاڵایەکی دیاریکراو بۆ بۆهێنراو بێنێ، لەبەرانبەر ئەوەی ئەویش پارەکەی بدات.

---

[1] الأستاذ الدكتور مرقس – المرجع السابق، ص٥٤.

[2] ئەو پێناسانەی سێ گرێبەندەکە ئەنجامگیریی خۆمن بە پشتبەستن بە مادەکانی پرۆژەی (٦٨٤، ٧٨١، ٨٤٤) و لە کەسم وەرنەگرتوون، لەبەرئەوەی ئەو پێناسانەی لەو مادانەدا هاتوون ناتەواو و خەوشدار بوون، یان حەشو و زیادەیان تێدا بوو.

٢- گرێبەنـدی هۆتێلـوانی: گرێبەندێکـە تێیـدا خـاوەن هۆتێـل پابەنـد دەبـێ بـە ئامادەکردنی شـوێنی نیشـتەجێبوون و پێشکەشـکردنی خزمەتگوزاریـەکان بـۆ میوانان لە ماوەیەکی دیاریکراو یان دیارینەکراودا، بەرانبەر کرێیەك.

٣- گرێبەندی بڵاوکردنەوە: ئەوەیـە دانـەر بەوپێیـە مـافی خـۆی لـە سـوودبینینی دارایی لە بەرهەمەکەی بـۆ بڵاوکارەکـە دەگوێزێتـەوە، لەبەرانبـەر پابەنـدبوونی ئەویش بە بڵاوکردنەوەی و دانی پارەکەی.

**بەرهەمی دابەشکردن بۆ ناونراو و ناونەنراو:**

١- ئەگەر کێشەیەك لەبارەی گرێبەندی ناونراو خرایە بەردەم دادگە، پێویستە قازی بگەڕێ بەدوای ئەو حوکمەی بەگوێرەی ئەو یاسایەی حوکمەکانی ڕێکخستووە، پێویستە لەو کێشەیەدا جێبەجێی بکا، لەبەرئەوەی عەقـدە ناونراوەکـان پـێش هەموو شـت دەقـە تایبەتـەکانی خۆیـان حوکمیـان دەکـەن، جـا ئەگـەر لـەوێ نەیبینیەوە پێویستە بچێتە سەر دەقە گشتیەکان.

ئەگەر کێشـەکە لـە گرێبەنـدێکی ناونـەنراودا بـوو پێویسـتە قـازی لـەنێو ڕێسـا گشتیەکانی پابەندیەکاندا، واتـە ئـەو دەقـە گشـتیانەی ئـەو ڕێسـا گشـتیانەیان تێدایە، بۆ حوکمەکەی بگەڕێ.

٢- ئەگەر قازی نەیتوانی چارەسەری خوازراو لەڕێی دەقە گشتیەکانەوە دەربێنێ، پێویستە پەنا بـۆ ئـەو دەقـە تایبەتانـە ببـات کـە چارەسـەری گرێبەنـدێکیتری نـاونراوی پەیوەنـدار بـە گرێبەنـدە ناونەنراوەکـەیان کـردوە، یـان پـەنا بـۆ بەکارهێنانی ماناکەی (المفهوم) یان قیاسکردن ببات[1].

**پێنجەم: لەرووی دیاریکردنی نرخەوە:**

دابەش دەبێ بۆ گرێبەندی نرخ دیار و گرێبەندی شیمانەیی:

---

[1] (م/٦٠٣).

١- گرێبەندی نرخ دیار: ئەو گرێبەندەیە هەردوو لایەنەکەی دەتوانن لەکاتی ئیمزاکردنی گرێبەندەکەدا ئەو ئەندازەیەی وەریدەگرن و ئەو ئەندازەیەی دەیدەن، دیاری بکەن. بۆ نموونە لە گرێبەندی فرۆشتندا هەریەك لە فرۆشیار و کڕیار دەتوانن بزانن چی لەویتر وەردەگرن و چی پێ دەدەن.

٢- گرێبەندی شیمانەیی (احتمالي): ئەوەیە ئەندازەی پابەندیی لایەکیان لەسەر ڕووداوێکی نادڵنیا دەوەستێ، کە دەکرێ ئەندازەی پابەندیەکان زیاد یان کەم بکات. لە نموونە کرداریەکانیشی گرێبەندی بیمەکردنی ژیانە (تأمين الحياة)، کە دوو لایەنەکە لەکاتی گرێبەندەکەدا ناتوانن نە ژمارەی ئەو قیستە شایستانەی دەکەونە ئەستۆی بیمەکراو و نە رادەی پابەندیی بیمەکار بزانن، چونکە بەگوێرەی درێژبوونەوەی تەمەنی کەسی بیمەکراو ژمارەی قیستەکان زیاد دەکەن، لەوانەیشە زوو بمرێت و تەنها یەك قیست یان چەند قیستێکی کەم بدات. بەڵگەنەویستە لە حاڵەتی یەکەمدا بیمەکار قازانجیەتی، بەڵام لە دووەمیاندا زیانی گەورەی بەردەکەوێ.

لەو ڕووەوە قازانج و زیانەکەی ئەگەر و نەگەرە گرێبەندەکە ناونراوە شیمانەیی.

لەوانەیە گرێبەندی نرخ دیار بە هاتنەناوەوەی توخمێکی نادڵنیا، بە سروشتی خۆی بگۆڕێ بۆ گرێبەندی شیمانەیی، وەك فرۆشتنی خانوویەك بەرانبەر موچەیەك بەدرێژایی تەمەنی فرۆشیارەکە.

**بەرهەمی دابەشکردنەکە:**

ئەم دابەشکردنە یەك بەرهەمی لێدەکەوێتەوە، ئەویش ئەوەیە لەڕووی یاساوە ئەو کەسەی تووشی زەرەر دەبێ بۆی نیە نارەزایی دەرببڕێ بەوەی مافی خوراوە و بەیاسا داوای نەهێشتنی بکا، لەبەرئەوەی ئەوە لە گرێبەندە نادڵنیاکانە، واتە ئەوەی پێشوەخت چاوەڕوانی زیان و خەڵەتانی لێدەکرێ، جا قبولکردنی گرێبەندەکە بە قبولکردنی بەرگەگرتنی زیانە چاوەڕوانکراوەکە دەژمێرێ.

**شەشەم: لەرووی شوێنەوە (المحل):**

دابەش دەبێ بۆ گرێبەندی ماڵ (عین) و گرێبەندی سوود و گرێبەندی کار:

**١– لەو گرێبەندانەی لە ماڵدا هاتوون:**

أ– گرێبەندی فرۆشتن: عەقدێکە بەو پێیە خاوەندارێتی فرۆشراو لەبەرانبەر چەردەیەك پارە بۆ کڕیار دەگوێزرێتەوە. ئەگەر بەرانبەرکردنەکە لەنێوان دوو ماڵدا بوو، کە هیچ یەکێکیان لە پارە نەبێ پێی دەوترێ شمەك بەشمەك (المقایضة).

ب– گرێبەندی هێنان: پێشتر پێناسە کرا.

ج– گرێبەندی ئاشتەوایی (سوڵح): گرێبەندێکە بەو پێیە کێشەیەکی ئارا یەکلا دەکرێتەوە یان خۆ لە کێشەیەکی چاوەڕوانکراو لادەدرێ، ئەویش بە دەستهەڵگرتنی هەریەکەیان لە بەشێك لەوەی دلوای دەکا.

د– گرێبەندی قەرز: گرێبەندێکە بەو پێیە کەسێك پابەند دەبێ بەوەی ماڵێکی هاوچەشن بداتە کەسێکیتر کە بۆ بەکاربردن بشێ، بەو مەرجەی لە ماوەیەکدا کە لەسەری رێك دەکەون هاوچەشنی ئەوەی بداتەوە.

هـ– گرێبەندی بەخشین (الهبة): گرێبەندێکە بەخشەر پابەند دەبێ بە گواستنەوەی خاوەندارێتی ماڵێك لە ژیانیدا بۆ کەسێکیتر بەبێ بەرانبەر، یان بە باتییەك کە لەرووی نرخەوە بە بەرانبەر دانانرێ.

**٢– لەو گرێبەندانەی لە سوودەکان (المنافع)دا هاتوون:**

أ– گرێبەندی بەکرێدان: ئەوەیە بەکرێگر سوودی ماڵێك بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بەکرێ دەگرێ، لەبەرانبەر کرێیەکی دیاریکراو.

ب– گرێبەندی ئیعارە: رێگەدانە بە سوودگەیاندنی ماڵێك کە قابیل بە بەکاربردن (استهلاك) نەبێ بۆ کەسێکیتر بەبێ بەرانبەر بۆ ماوەیەکی دیاریکراو یان بۆ ئامانجێکی دیاریکرلو.

ج– گرێبەندی هۆتێلوانی: پێشتر پێناسە کرا.

**٣- لەو گرێبەندانەی لەسەر کار هاتوون:**

أ- گرێبەندی بەڵێندەرایەتی (المقاولة): گرێبەندێکە بەو پێیە کەسێك کە نە جێگر نە شوێنکەوتەی خاوەن کارە، پابەند دەبێ بەوەی لەبەرانبەر کرێیەکدا بینایەك، یان شتێکی بۆ دروست بکا، یان کارێك بکا.

ب- گرێبەندی بریکاری (الوكالة): ئەوەیە کەسێك کەسێکیتر دابنێ بۆ ئەنجامدانی رەفتارێکی یاسایی، کە مافی خۆیەتی پێی هەستێ.

ج- گرێبەندی سپاردە (الوديعة): گرێبەندێکە بەو پێیە سپاردە لەلا دانراو پابەند دەبێ بە پاراستنی ماڵێکی لەلادانەر.

**بەرهەمی دابەشکردنەکە:**

ئەو گرێبەندەی لەسەر سوود و کار دەکرێ لەو گرێبەندانەن جێبەجێکردنیان بەردەوامە و حوکمەکانی بەسەریاندا جێبەجێ دەبێ.

ئەو گرێبەندەیش لەسەر ماڵ (أعيان) هاتووە لە گرێبەندەکانی جێبەجێکردنی فەورییە و حوکمەکانی بەسەریدا جێبەجێ دەبێ.

**رۆڵی گرێبەند لە پەیدابوونی پابەندیدا:**

یاساکان و یاساناسان کۆکن لەسەر ئەوەی پابەندی لە ئەسەرەکانی گرێبەندە، ئەگەر گرێبەند بەدروستی دامەزرا ماف و پابەندیەکانی لێدەکەوێتەوە ئەگەر بەربەستێك نەبێ رێ لەوە بگرێ.

لەم روانگەوە دەبوو لەسەر ئەوە کۆك بن کە گرێبەند هۆیەکە لە هۆکانی پابەندی، کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا کەوتنە ئەم هەڵانەی خوارەوە:

١- گوتیان: گرێبەند هۆیەکی پەیداکەری پابەندییە، بەڵام پێویستە وا لێی بکۆڵرێتەوە و چارەسەر بکرێ وەك ئەوەی سەرچاوەی پابەندی بێ نەك هۆی پابەندی، ئەمەیش لۆژیکی یاسایی رەتیدەکاتەوە، لەبەرئەوەی چییەتی هەریەك لە هۆ و سەرچاوە جیاوازە:

هۆ وەسفێکی رواڵەتیی رێکخراوە هەرکات بەشێوەیەکی درست بەدیهات و رێگری نەبوو بەرهۆکەی لێ دەکەوێتەوە، جا چ حوکم بێ یان هەر ئەسەرێکیتر، ئەم وەسفە کردەی شەرعدانەر (الشارع) یان یاسادانەر (المشرع)ە، لەبەرئەوەی هۆ حوکمێکی دانراو واتە وەزعییە وەك چۆن پابەندی حوکمێکی تەکلیفییە، لەکاتێکدا سەرچاوە ئەو بەڵگە شەرعیەیە کە بەرهۆ لە هۆکەی دەخاتەوە و هێزی پابەندکارانەی پێدەبەخشێ و کەسی پابەند، ناچار دەکا کار بەو پێیە بکا.

لەم رووەوە، گرێبەند هۆیەکە بۆ پایەدابوونی پابەندی و بەڵگەیش لەسەر کردنی بە هۆ بۆ پابەندییە شەرعیەکان دەقی شەرعییە وەك خوای گەورە دەفەرموێ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَوْفُواْ بِالْعُقُودِ﴾[1]، واتە پابەند بن بەو ئەرکانەی لە گرێبەندە دروستەکان دەکەونەوە. یان بەڵگە دەقی یاسایە وەك لە مادەی (٨٢٦)ی مەدەنیی عێراقی بەرکار لەبارەی ئەو پابەندیەی لە گرێبەندی چاندنکاری (المغارسة) دەکەوێتەوە و بەدەق دەڵێ (يلتزم رب الأرض بتسليمها إلى المغارس خالية من الشواغل). (واتە: خاوەن زەوی پابەند دەبێ بە رادەستکردنی بە بچێن دوور لە هەر سەرقاڵکاریەك).

---

[1] سورة المائدة/ ١.

چاندنکاری گرێبەندێکە بەوپێیە کەسێك زەویەکەی خۆی دەداتە کەسێکیتر تا هەندێ درەختی ناسراوی تێدا بچێنێت و بەڵێن دەدات بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بەخێوکردنیان بگرێتە ئەستۆ، بەو مەرجەی پاش تەواوبوونی ماوەکە بە رێژەیەکی دیاریکراو لە درەختەکان و زەویەکە، یان تەنها لە درەختەکاندا شەریك بن.

ئەوە روونە کە راست نیە بە سەرچاوە بگوترێ هۆ، لەبەرئەوەی پێویستە گوتراو و پێگوتراو لەڕووی خود و (ماصدق)ەوە[1]، هاومانا بن وەك ناسێنەر و ناسێنراو ئەگەرچی وەك باسمان کرد لەڕووی چییەتیەوە لێك جیاوازن.

٢- هۆی پابەندی و فەلسەفەی پابەندییان تێکەڵ کردوە و وایان داناوە فەلسەفەی پابەندی و ئامانجەهۆ (العلة الغائية)کەی و مەرامە نزیك یان دوورەکەی، هۆی پابەندین، ئەمەیش مەنتیقی یاسایی رەتی دەکاتەوە، لەبەرئەوەی فەلسەفەی هەر شتێك بریتییە لە مەرامە نزیك یان دوورەکەی و ئامانجەهۆکەی و بەرژەوەندییە ویستراوەکەی و ئەنجامە داواکراوەکەی و ئامانج لەو شتەیە. فەلسەفە بەم مانایانە لەڕووی بەدیهاتنەوە پاشخراوە (مؤخرة) لەکاتێکدا هۆ لەڕووی بوونەوە پێشخراوە (مقدّم)، هەردووکیشیان واتە مەرامی فەلسەفی و هۆ لەڕووی تەرتیبی وجودی و سروشتی و زنجیرەبەندیی زەمەنیەوە لێك جیاوازن، هەروەها لەڕووی چییەتیەوە لێك جیان، چونك چییەتیی مەرام (وەك یەکێك لە دوو ئاڵوگۆڕکراوەکە لە گرێبەندەکانی ئاڵوگۆڕکردندا) بریتییە لە فەلسەفەکە، چییەتی هۆیش لە برگەی یەکەمدا باس کرا.

٣- وەك باسمان کرد زیاتر لە هۆیەکیان بۆ پابەندی بریار داوە و گوتویانە:

أ- گرێبەند هۆیەکە پابەندی پەیدا دەکا[2].

---

[1] (وما صدق)ی هەر زاراوەیەك ئەوەیە بەسەریدا دەچەسپێ، لە تاکەکان یان بەشەکان (الافراد و الجزئيات).

[2] الأستاذ السنهوري – الوسيط ٤٧٨/١.

الأستاذ المرقس – أصول الالتزامات ص١٤٦.

الأستاذ عبدالمجيد الحكيم – شرح القانون المدني العراقي ٢١٦/١.

ب-گوتیان هەردوو باتییەکە هۆی پابەندین، مەبەستە هۆ یان مەرامی راستەوخۆ یان وەك هەندێ[1] ناوی دەنێن هۆی تەکنیکی یان مەرامی راستەوخۆ، کە کەسی پابەند مەبەستیەتی بەهۆی پابەندیەکەیەوە پێی بگات.
گوتیان لە گرێبەندی ئاڵوگۆڕدا هەر باتییەك کە یەکێك لە دوو گرێبەندوانەکە دەییات، هۆیە بۆ پابەندبوونی بەو بەرانبەرەی دەیداتە گرێبەندوانەکەیتر. بەلگەنەویستە ئەم مەرامە راستەوخۆیە فەلسەفەی پابەندیی گرێبەندوانە نەك هۆی پابەندیەکە بێ.

ج- هۆی پاڵنەر (مەرامی دوور) یان ناڕاستەوخۆ یان هۆی بەرژەوەندییانەی[2] پابەندی. لەگەڵ ئەوەی ئەم بزوێنەرە پاڵنەرە کە پێی دەوترێ هۆی پاڵنەر فەلسەفەی چوونەپێشە بۆ ئیمزاکردنی گرێبەندەکە، بەلام بەگوێرەی کەسەکان تەنانەت لە یەك گرێبەندیشدا دەگۆڕێ. بۆ نموونە بزوێنەری پاڵنەر (فەلسەفەی پاڵنەری دوور) بۆ ئەو کەسەی ئۆتۆمبێلەکەی دەفرۆشێ لەوانەیە ئەوە بێ بە پارەکەی خانووەکەی تەولو بکا، یان ژنی پێ بێنێ، یان چارەسەری نەخۆشی پێبکا، یان دوکانێکی بازرگانی پێ دابنێ، یان ئۆتۆمبێلێکی نوێی پێ بکڕێ و ئەو جۆرە شتانە. بەپێچەوانەی فەلسەفەی نزیك (مەرامی راستەوخۆ) کە بەشێکە لە گرێبەندەکە و لەناو گرێبەندەکەیدا بۆی دەگەڕێت، لەکاتێکدا فەلسەفەی پاڵنەر (مەرامە دوورە پاڵنەرەکە) لەناو دەروونی گرێبەندوانەکەدا بۆی دەگەڕێت، لەبەرئەوەی بەشێکە لە ناواخنەکان (مکنونات) و ئیرادەی نادیار و کاتێك ئیرادەی نادیار بە ئیرادەی دیار گوزارشتی لێدەکرێ، ناچێتە ژێر خانەی چەمکی ئیجاب و قبوڵ.

د- گوتیان پابەندیی هەریەك لە دوو گرێبەندوانەکە لە گرێبەندەکانی ئاڵوگۆڕدا هۆی پابەندیی ئەویتریانە، واتە پابەندیی فرۆشیار بۆ نموونە بە رادەستکردنی

[1] لەوانە: د. وحيد الدين سواء – التعبير عن الإرادة في الفقه الإسلامي، ص٤٧٤.
[2] سەرچاوەی پێشوو، ص٥١٣.

فرۆشراو هۆیەکە بۆ پابەندبوونی کڕیار بە رادەستکردنی نرخەکە. بلانیـول لـە میانی رەخنەگرتنی لە تیۆری هۆیی (السببية)[1] لەسەر ئەم خاڵە دەڵـێ: "لـە تیۆری کلاسیکیدا کە هۆی بۆ سێ جۆر دابەش کـردوە (پەیداکـەر + مـەرامی راستەوخۆ + بزوێنەری پاڵنەر یان مەرامی دوور)، هۆی پابەندی لە گرێبەنـدی پابەنـدکار بـۆ هـەردوولادا، بـۆ پابەنـدبوونی بەرانبـەرە..، ئەمـەیش لـەڕووی لۆژیکیەوە مەحاڵە، لەبەرئەوەی هەردوو پابەندیەکە لە یەك کاتدا پەیدا دەبن و ناکرێ یەکێکیان هۆی ئـەویتریان بـێ، چـونکە کاریگـەری و کاریگـەر (الاثـر و المؤثر) و هۆ و بەرهۆ ناکرێ هاوسەردەم بن[2].

**روونکردنەوەی قسەکەی بلانیول:**

بلانیول لە رەخنەکەیدا لە روویەکەوە راستە و لە روویەکەوە هەڵەیە:

راستبوونی رەخنەکەی لەوەدایە، ئەگەر گریمان یـەکێك لـە دوو پابەندەکـە (أ) و ئەویتریان (ب)یە، جا ئەگەر (أ) لەسەر (ب) وەسـتا و (ب) لەسـەر (أ) وەسـتا، ئـەوا پێویستە (أ) لەسەر (أ) بوەستێ پاش سڕینەوەی دووبارەکە لە ناوەڕاستدا، بەوەیش دەبێ شت لەسەر خۆی بوەستێ، ئەوەیش دەخوازێ شت پێش خۆی بکـەوێ، لازم مەحاڵە هەروەها مەلزومیش.

هـەروەها لـەوەدا راسـت دەکـا کـە دەڵـێ هـەردوو پابەندیەکـە لـە گرێبەنـدە پابەندکارەکاندا هاوکاتن، بەڵام لەو بەڵگەچنییە لۆژیکیەدا هەڵەیە، لەبەرئـەوەی ئـەو لەسەروەستانە لە شتە عەقڵی و ئیعتیباراتە وێنایی (تصوری)ەکانە، لە شتە وێنایی و ئیعتیباریەکانیشدا مەحاڵیی لۆژیکی نیە، بۆ نموونە دەشێ مرۆڤ وێنـای کۆبوونـەوەی دوو هاودژ یان نەمانیان بکا، لەکاتێکدا کە ئەوانە لە دەرەوەی زەینـی مـرۆڤ و واقیـع

---

[1] لە گەورە یاساناسانی فەرەنسییە.

[2] الأستاذ عبدالمجيد الحكيم – الموجز في شرح القانون المدني العراقي ٢٤٤/١.

مەحاڵن، لەبەرئەوەی مەحاڵیی مەنتیقی لەو شتانەدا دەبێ کە لە دەرەوەی زەینی مرۆڤ هەن.

ئێمە رەخنەیەکیتر بۆ رەخنەکەی بلانیول زیاد دەکەین ئەویش ئەوەیە، پابەندیی هەردوو گرێبەندوانەکە لە ئەسەرەکانی گرێبەندن و لەڕووی حەیسیەتەوە یەکسانن، جا چۆن لە یەك کاتدا یەکێك لە دوو ئەسەرەکە دەبێتە هۆ بۆ ئەسەرەکەیتر؟.

**ئەنجامگیری:**

لەم خستنەڕووەوە بەم ئەنجامگیریەی خوارەوە دەگەین:

**یەکەم**– یاساناسان بەگوێرەی ئەوەی باسمان کرد، چوار هۆ (سبب)یان بۆ یەك بەرهۆ (مسبب) کە پابەندیی گرێبەندانەیە بڕیار داوە، ئەمەیش عەقڵی ساغ و لۆژیکی یاسایی رەتی دەکەنەوە، لەبەرئەوەی هەر هۆیەك ئەگەر تەواو بێ بەسە بۆ بەدیهاتنی بەرهۆکەی. وەك چۆن بەڵگەنەویستە ناکرێ یەك مەعلول زیاتر لە یەك عیللەی تەواوی هەبێ، بەهەمان شێوە ناکرێ بەرهۆ زیاتر لە یەك هۆ سەری تێبکەن، لەبەرئەوەی لە بابی بەدەستهێنانی بەدەستهاتوو (تحصيل الحاصل) دەبێ، بەدەستهێنانی بەدەستهاتوویش بەکۆدەنگیی ئەقڵمەند و فەیلەسوفان مەحاڵە.

**دووەم**– هەڵەی تیۆرە یاساییەکان و یاساکان لە تێکەڵکردنی نێوان هۆی پابەندی و فەلسەفەی پابەندیدا[1].

---

[1] بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی ئەو بیرۆز و یاسایانە بڕوانە ئەم کتێبەمان: (نظرية الالتزام برد غير المستحق – دراسة مقارنة)، ص٤٤ و پاشتر.

# بەشی حەوتەم

## ویستی تاکلایەنە
## (رەفتاری تاکەکەسی)

رەفتاری تاکەکەسی (ویستی تاکلایەنە) هەر گوفتار و کردارێکە بە ویست یاخود ویستی تاکلایەنە لە مرۆڤەوە دەربچێ بەشێوەیەك شەرع یان یاسا ئەسەرێکی لەسەر بنیات دەنێ کە حسابی بۆ دەکرێ. بەپێچەوانەی گرێبەند کە لە جووتبوون (تطابق)ی دوو ئیرادە پێکدێ بەشێوەیەك ئەسەری خۆی لەرووی ماف و پابەندییەوە لە گرێبەند لەسەرکراو و هەروەها گرێبەندواندا جێگیر دەکا .

بەر لەوەی بچینە کرۆکی لێکۆڵینەوە لەم بابەتە ، گرنگە هەندێ لەو هەڵانە بخرێنە روو کە زانایانی یاسا و یاساکان تێیان کەوتوون و بەبێ ئاگەداربوون لێیان لە پێشینانەوە بۆ پاشینان گوێزراونەتەوە. لەو هەڵانە:

**یەكەم: لە یاساكان و شەرحەكانیاندا دەستەواژەی ویستی تاكلایەنـە (الارادة المنفردة) لەباتیی رەفتاری تاكەكەسی (التصـرف الانفـرادي) بـلاو بـووە،** ئەمەیش لەم روانەوە هەڵەیە:

١- ئیرادە هەر كات خرایە كار بە ئـیرادەی نادیـار وەردەگـیرێ، ئـەویش بـەپێی رێسای (إذا أطلق الشيء يحمل على فرده الكامل). (واتە: ئەگەر شتێك دەستی پێكرا لەسـەر تاكـە تەواوەكـەی وەردەگـیرێ). تـاكی تـەواو بریتییـە لـە ئـیرادەی نادیـار، لەبەرئـەوەی ئـیرادەی دیـار وەك قاڵـب و توێكڵێـەتی، لەبەرئـەوەی دەربڕینیـەتی، هەروەها لەبەرئەوەی یاسا حوكمی رواڵەتەكان دەكا.

٢- تێكەڵكردنی نێوان رووداو و رەفتارەكان، بەوەی رەفتـاری یاسـایی تـەنها لـە گوفتارەكـان (الاقـوال)دا قـەتیس دەكـرێ و بـە كردارەكـان دەگـوترێ رووداوەكـان (الوقائع)، پێشتر هەڵەبوونی ئەم گوتنەمان سەلماند، بەڵام لێـرەدا بـۆ زیـادە سـوود دوویـارەی دەكەینـەوە و دەڵـێین ئـەم قەتیسـكردنە پێچـەوانەی عـورف و شـەرع و ترازووی مەنتیقە:

أ- لە عورفی عەرەبدا واباوە رەفتار (التصرف) بە گوفتار و كردار دەگوترێ، بـۆ نموونـە ئەگـەر كەسـێك لەبـەردەم خەڵكدا قسـەیەكی نامـاقوڵ یـان كـارێكی نەشیاوی كرد، پێی دەوترێ ئایا ئەمە رەفتاری مرۆڤی ژیرە؟!

ب- قورئانی پیرۆز لە زۆر ئایەتدا وشەی كـار (عمـل)ی بـۆ گوفتـار و كردارەكـان بەكارهێناوە، لەوانە ئایەتی ﴿وَالْعَصْرِ إِنَّ الْإِنسَـانَ لَفِـي خُسْـرٍ إِلَّـا الَّـذِينَ آمَنُـوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾[1]. ئاشكرایە زۆربەی كارە چاكەكانی مرۆڤ كردەوەن، جا چ بۆ پەروەردگاری بن یان بۆ خەڵك.

---

[1] سورة العصر/ ١-٣.

ج- مەنتیقی یاسایی لە لێکەوتنەوەی ئاسەوارێکدا کە یاسا حسابی بۆ دەکات، جیاوازی لەنێوان گوفتار و کرداردا ناکات.

د- لەم سەردەمە پێشکەوتووەدا دەربڕینی ویستی تاکلایەنە بەزۆری لەڕێی کردارەوە دەکرێ، لە بەکارهێنانی ئامرازە تەکنەلۆژییە نوێکان بۆ بەستنی گرێبەند لەنێوان دەوڵەتان لەڕێگەی ئیمەیل (پۆستی ئەلیکترۆنی) یان نووسین یان ئاماژە و هیتر. هەموو ئەمانە کردارن نەك گوفتار.

شایانی باسە من پاش پێداچوونەوەی زۆر لە یاساکان و شەرحەکانیان، نەمدی دەستەواژەی (رەفتاری تاکەکەسی) لەباتیی (ویستی تاکلایەنە) بەکار هاتبێ جگە لە یاسای مەدەنیی ئوردنی[1] کە فەسڵی دووەمی بەناونیشانی (التصرف الانفرادی) بۆ چارەسەری ئەم بابەتە تەرخان کردوە و مادەی (٢٥٠)ی دەڵێ ((یجوز أن یتم التصرف بالآرادە دون التوقف علی القبول ما لم یکن فیه إلزام الغیر بشیء و کبقاً لما یقچی به القانون)). (واتە: دروستە بە ئیرادە رەفتار بکرێ بەبێ وەستان لەسەر قبولکردن، ئەگەر پابەندکردنی کەسیتری تێدا نەبێ بە شتێك بە گوێرەی ئەوەی یاسا فەرمان دەکا).

**دووەم: زانایانی یاسا لە دەقە یاساییەکان و شەرحەکانیاندا سەرچاوەکانی پابەندییان بۆ پێنج بەش دابەش کردوە**، کە بریتین لە: گرێبەند، ویستی تاکلایەنە، کاری ناڕەوا (نامەشروع)، بەدەستهێنان بەبێ هۆ (زەنگینبوون بەبێ هۆ) و یاسا. بەوەیش کاری ناڕەوا و بەدەستهێنان بەبێ هۆیان بە هاوبەشکەی ویستی تاکلایەنە (رەفتاری تاکەکەسی) داناوە.

لە ترازووی مەنتیقدا هاوبەشکەی هەر شتێك لەو شتە جیاوازە و ئەوەی بۆ یەکێکیان راستە بۆ ئەویتریان راست نیە و یەکێکیان ناچێتە ژێر چەمکی ئەویتریان. ئاشکرایشە ئەم کردەوەیە هەڵەیە و پێچەوانەی مەنتیقی یاساییە، لەبەرئەوەی

[1] ژمارە (٤٢)ی ساڵی ١٩٧٦.

هەریەك لە كاری ناڕەوا و بەدەستهێنان بەبێ هۆ (زەنگینبوون بەبێ هۆ) دەچێتە ژێر چەمكی رەفتاری تاكەكەسی و هەردووكیان لە بەشەكانی ویستی تاكلایەنەن، بەشی هەر شتێكیش لە دابەشكراو (مُقسَم)ەكەی تایبەتترە و لە هەركوێ بەدیهات دابەشكراوەكەیش لەگەڵی بەدیدێ، بەڵام پێچەوانەكەی نا.

**سێیەم: بەدەستهێنان بەبێ هۆ (زەنگینبوون بەبێ هۆ) دەچێتە ژێر چەمكی كاری ناڕەوا یان كاری زیانبەخش بە كەسانیتر،** هەربۆیە دانانی بە فەسڵێكی سەربەخۆ هاوشێوەی فەسڵی كاری ناڕەوا پێچەوانەی مەنتیقی یاساییە، هەروەها پێچەوانەی مەنتیقی رەوانبێژییە، كە دەخوازێ حەشو و دووبارە لە قسەدا لابدرێ، بەتایبەت لە داڕشتنی هونەریانەی یاساییدا.

**چوارەم: فیقناسانی یاسا گرێبەند و رەفتاری تاكەكەسی (ویستی تاكلایەنە)یان تێكەڵ كردوە لەژێر ناونیشانی (العقد الملزم لجانب واحد) كاتێ لە چەند** روویەكی جیاوازەوە گرێبەندەكانیان بۆ چەند بەشێك دابەش كردوە: لە رووی رادەی پابەندیەوە گرێبەندەكەیان دابەش كردوە بۆ گرێبەندی پابەندكار بۆ هەردوولا (یان دووسەرە)، كە پابەندی (یان ماف)ی دووسەرە دەخاتە گەردنی هەردوو گرێبەندوانەكە، وەك گرێبەندی فرۆشتن كە فرۆشیار پابەند دەكا بە گواستنەوەی تەواوی خاوەندارێتیی فرۆشراو بۆ كڕیار و كڕیاریش پابەند دەكا بە دانی پارەكە بە فرۆشیار + گرێبەندی یەكلایەنە كە پابەندی دەخاتە گەردنی یەكێك لە دوو گرێبەندوانەكە بەبێ ئەویتریان، بەشێوەیەك یەكێك لە دوو لایەنەكەی تەنها قەرزدەرە و قەرزار نیە، ئەویتریان قەرزارە و قەرزدەر نیە، وەك لە بەخشیندا[1].

ئەم دابەشكردنە مەنتیقی یاسایی رەتی دەكاتەوە، لەبەرئەوەی لە بابی

---

[1] بڕوانە: أصول الالتزامات للأستاذ الدكتور سليمان مرقس، ص٤١–٤٢، كە لە گەورە یاساناسانی لە میسر و ئەم دابەشكردنە نامەنتیقیەی پەسەند كردوە. هەروەها مامۆستا سەنهوری، الوسیط ١/١٧٠، كە لە گەورە فقیهانی یاسایە لە جیهانی عەرەبیدا.

دابەشکردنی شتە (کە گرێبەندە) بۆ خۆی و غەیری خۆی (ئەویش ڕەفتاری تاکەکەسییە) کە گرێبەند نیە، لەبەرئەوەی چییەتی (ماهیەت)ی گرێبەند بریتییە لە جووتبوونی دوو ئیرادەی ڕوویەڕوو کە لە ئیجاب و قبوڵدا خۆ دەنوێنێ و مەرجەکانی گرێدانیان تێدایە، بەشێوەیەك ماف و پابەندیی دووسەرە لەسەر ئەو چییەتییە دروست دەبێ.

ئەقڵمەندان و زانایانی مەنتیق و فەیلەسوفەکانیش کۆدەنگن لەسەر بەتاڵیی دابەشکردنی شت بۆ خۆی و بۆ غەیری خۆی.

**پێنجەم: پشتگوێخستنی ڕۆڵی ڕەفتاری تاکەکەسی لە هۆبوونی پابەندیەکاندا**

لەلایەن زانایانی یاسا و یاساکانەوە و قەتیسکردنی ئەو هۆبوونە بەنیسبەت مەسەلە مەدەنیەکانەوە لە بازنەیەکی بەرتەسکی بە دەقی یاسایی دیاریکراودا، بەشێوەیەك ڕەفتاری تاکەکەسی لەو حاڵەتانەدا نەبێ کە بەدەق دیاری کراون، هیچ ئەسەرێکی یاسایی لێناکەوێتەوە.

بۆ نموونە برگەی یەکەمی مادەی (١٨٤)ی یاسای مەدەنیی عێراقی بەرکار دەڵێ (لا تلزم الإرادة المنفردة صاحبها إلا في الأحوال التي ينص فيها القانون على ذلك). (واتە: ویستی تاکلایەنە خاوەنەکەی پابەند ناکا، لەو بارانەدا نەبێ کە یاسا باسیان بکا).. لەم ڕوانگەیەشەوە یاسا ویستی تاکلایەنە ملکەچی ڕێسایەکی هاوشێوەی ڕێسای (نە تاوان و نە سزا، بەبێ دەق نیە) دەکا، لەبەرئەوەی بەگوێرەی ئەم ئاراستە بەرتەسکە پێویستە بگوترێ (لا جمره ولا مسؤولیه فی الأراده المنفرده إلا بنص). (واتە: هیچ بەرهەم یان بەرپرسیارێتیەك لە ویستی تاکلایەنەدا نیە، مەگەر بە دەقێك).

ئەمەیش لەگەڵ کۆدەنگیی زانایانی یاسادا ناکۆکە کە جیاکارییان لەنێوان کێشە تاوانکاری (جنائی) و مەدەنیەکاندا کردوە، بەوەی پابەندییە تاوانکاریەکان سنووردار و قەتیسکراون بەپێچەوانەی پابەندییە مەدەنیەکان کە ملکەچی قەتیس و سنووردارکردن نابن.

**شەشەم: هەندێ تیۆری یاسایی بۆ دوورتر لەوەی باسمان کرد چوون لە**

**چارەسەرکردنی ئیرادەی تاکەکەسی بەنیسبەت پابەندیەکان**، لەوانە ئەو تیۆرە فەرەنسیەی دەڵێ ویستی تاکلایەنە ناتوانێ پابەندی پەیدا بکا. هەروەها بۆ ئەوە چوون کە ئەو پابەندیەی لە کارێکی یاسایی (ویستی تاکلایەنە) پەیدا دەبێ سەرچاوەکەی هەر دەبێ سازانی هەردوو ئیرادەکە بێ ( گرێبەندێك بێ). یاسای مەدەنیی فەرەنسی ئەم رێسایەی لە یاسای فەرەنسیی کۆن بۆ ماوەتەوە، ئەویش ریشە (تیۆریەکانی) لە یاسای رۆمانی بۆ ماوەتەوە.

ئەم ئاراستە یاساییە، واقیعی پراکتیکی پیادەکردنەکانی ئەو پابەندیانەی لە ئیرادەی تاك دەکەونەوە پوچەڵی دەکاتەوە، هەروەها لۆژیکی یاساییش رەتیدەکاتەوە.

بۆ دوورخستنەوەی ئەو هەڵانەی زۆربەی زانایانی یاسا و یاساکان تێیان کەوتوون، لەسەر ئەم رێبازەی خوارەوە لە بابەتی (رەفتاری تاکەکەسی) دەکۆڵینەوە:

أ- بەکارهێنانی رەفتاری تاکەکەسی بەمانا گشتگیرەکەی لەباتیی ویستی تاکلایەنە.

ب- دابەشکردنی رەفتاری یاسایی بۆ گوفتار و کردار.

ج- دابەشکردنی کردارەکان بۆ کردارە سوودبەخشەکان وەك فوزالە و کردارە زیانبەخشەکان وەك زەوتکردن (الغصب).

د- پاشان لێکۆڵینەوە لە رەفتاری تاکەکەسانە لەرووی شکڵیەوە بۆ سێ باس دابەش دەکرێ، یەکەمیان بۆ رەفتارە گوفتارییە تاکەکەسییە سوودبەخشەکان، دووەم بۆ کردەوە تاکەکەسییە سوودبەخشەکان و سێیەمیشیان بۆ کردەوە تاکەکەسییە زیانبەخشەکان تەرخان دەکرێ.

# باسی یەکەم:
# رەفتارە گوفتارییە تاکەکەسییە سوودبەخشەکان

رەفتاری تاکەکەسی هەموو گوفتار و کردارێکە لە مرۆڤێکی باڵقی ژێر هەڵبژێرەوە دەربچێ، بەشێوەیەك یاسا (یان شەرع) پابەندیەکی بخاتە سەر بەبێ ئەوەی لەسەر ئیرادەی کەسێکیتر بوەستێ، بەپێچەوانەی ئەو مافەی لێی دەکەوێتەوە، کە لەوانەیە پێویستی بە قبولکردنی لەلایەن بۆ-پابەندەوە هەبێ، یان لانیکەم لەسەر رەفزنەکردنی ئەو دەوەستێ، وەك بەخشین و وەسێت و جۆرەکانیتری بەخشینی بەمولککردن بەبێ باتی، بەڵام لە هەندێ رەفتاری تاکەکەسیدا لە نموونەی خستنەکان وەك گەردن ئازادکردن (الابراء)[1] و دەستهەڵگرتن لە هەقێکی ئارا[2] و تەڵاق بەبێ باتی و شایەتی و دانپێدانان و ئەو جۆرە شتانە، ئەسەرەکە چ ماف بێ یاخود پابەندی لەسەر قبولکردن یان نەکردنی ئەویتر ناوەستێ.

لەو رووەوە رەفتاری تاکەکەسی کارێکی ئیرادییە، دەبێتە ئەسەرێك بۆ توانا (قودرەت)ی مرۆڤ کە سەر بە ئیرادەیەتی، ئەویش سەر بە زانین (ادراك)یەتی. ئەوەی لە یاساکان و شەرحەکانیاندا باوە گوایە ئەسەری ئیرادەیە پێچەوانەی مەنتیقی یاساییە، لەبەرئەوەی هەموو کارێکی ئیرادی، جا گوفتار یان کردارێکی رەوا بێ یان نارەوا، یەکەم شت زانینی بکەرەکەی پەیوەندی پێیەوە هەیە، پاشان ویستە نادیارەکەی بۆ نەخشە و بەرنامەدانان و چۆنێتی روودانی بەر لە هاتنی بۆ دنیای

---

[1] ئەگەر بە خستن گونجاندنی بۆ کرا نەك بە بەمولککردن.

[2] وەك دەستهەڵگرتن لە خوێنبایی کوشتنی بەهەڵە.

بوونی دەرەکی پەیوەندیان پێیەوە هەیە، پاشان تواناکەی پەیوەندی پێیەوە هەیە کە لە گوزارشتکردن لە ئیرادە نادیارەکەیدا بەوەی ئاماژە بێ بۆی، خۆ دەنوێنێ، یان پرۆسەی جێبەجێکردنەکە بۆ هێنانەدەرەوەی ئەوەی لە زەیندا شاراوەیە بۆ دنیای بوونی ڕواڵەتی.

شایانی باسە یاسا بڕیار تەنها لەسەر ڕواڵەت دەدا، بەپێچەوانەی شەرعی خودا کە وەك چۆن بڕیار لە ڕواڵەت دەکا بڕیار لە ناو ناخیش دەدا ئەوەی ملکەچی ئیرادەی مرۆڤە وەك خوا دەفەرموێ ﴿وَإِن تُبْدُواْ مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللّهُ﴾[1]..

ئەوەی گومانی بردوە کە ئەم ئایەتەبە ئایەتی ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا﴾[2] نەسخ کراوەتەوە هەڵەی کردوە، لەبەرئەوەی ئەم ئایەتە نەسخکەرەوە نیە بەڵکو تایبەتکراوە بۆ گشتیبوونی لەفزی (ما)ی مەوسولە کە بەخودی خۆی گشتی دەگەیەنێ و غەریزە نائیرادیەکانی ناوەوە نێنێتە دەرەوە، هەرچی ئیرادیەکانی وەك حەسودی و شاردنەوەی شایەتی و ئەو شتانەیە مرۆڤ لەسەریان لێی دەپرسرێتەوە. خۆ ئەگەر دادگەیش لێی نەپرسێتەوە لەسەریان لەڕووی دیانەتەوە لێی دەپرسرێتەوە.

ئاشکرایە زۆربەی ڕەفتارە تاکەکەسییە بەسوودەکان بەخشین (تبرع)ن، بۆیە بوونی شیانی تەواوی ئەنجامدان مەرجە تێیاندا جگە لە وەسێت، کە وەسێتکار لەژیانیدا تووشی زیان نابێ، لەبەرئەوەی ئەو شتەی وەسێتی لەبارەوە کردوە تا پاش مەرگی خۆی نابێتە موڵکی وەسێت بۆکراو، هەروەها لەبەرئەوەی وەسێتکردن عیبادەتێکی ماڵییە و سوودێکی ساف بە وەسێتکار دەگەیەنێ لە ژیانی ئەودنیادا.

جگە لە مەرجی شیانی تەواو، مەرجە ڕەزامەندیی ڕەفتارکار خەوشێك لە خەوشەکانی تێکەڵ نەبووبێ.

---

[1] سورة البقرة/ ٢٨٤.

[2] سورة البقرة/ ٢٨٦.

پێشتر بەدرێژی پلەکانی شیان و بەربەست و ڕێگرەکانی روون کرانەوە و ماوەتەوە باس لە خەوشەکانی رەزامەندی بکرێ، کە واباوە زاناکانی یاسا لەکاتی گەڕان بەدوای رەگەزەکانی گرێبەندا لێی دەکۆڵنەوە، کە رەفتارێکە لە دوو رەفتاری تاکەکەسی پێکدێ. بینیمان لێکۆڵینەوەی لە باسی رەفتاری تاکەکەسی (ویستی تاکلایەنە)دا وردترە، لەبەرئەوەی گرێبەند لە بەیەکگەیشتنی دوو ویستی تاکلایەنە پێکدێ و باسکردنی لێرەدا لەپێشترە، تا گرێبەند و رەفتاری تاکەکەسی پێکەوە بگرێتەوە.

لەم رووەوە لێکۆڵینەوە لە رەفتاری تاکەکەسی بەسەر دوو خواستدا دابەش دەبێ، یەکەمیان تەرخان دەکرێ بۆ خەوش یاخود عەیبەکانی ئیرادە و دووەمیشیان بۆ پیادەکردنەکان (تطبیقات)ی رەفتاری تاکەکەسی:

# خواستی یەکەم:
# عەیبەکانی ئیرادە (رەزامەندی)

زانایانی یاسا لەم بوارەدا هەندێ جار دەستەواژەی رەزامەندی (الرضا) و هەندێ جاریتر عەیبەکانی ئیرادە بەکاردێنن ئەگەرچی مەبەست لە هەردووکیان یەك مانایە، بەڵام دەستەواژەی دووەم راستتر و وردترە[1]، لەبەرئەوەی ئیرادەی نادیار نیەتە، ئیرادەی دیاریش دەربڕینێکە ئاماژە بۆ رەزامەندی دەکا، ئەم عەیبانە نادرێنە پاڵ نیەت، بەڵام ئەو دەربڕینەی ئاماژەیە بۆ رەزامەندی لەوانەیە ساغ و لەوانەیە عەیبدار بێ بەیەکێك لەو چوار عەیبە (هەڵە (الغلط)، خەڵەتاندن (التدلیس)، زۆرلێکردن و قۆستنەوە). بۆ زیادە روونکردنەوە و سوود هەریەك لەوانە لە لقێکی سەربەخۆدا شی دەکەینەوە.

## لقی یەکەم:
## هەڵەی خۆبەخۆ

زانایانی یاسا پێناسەی هەڵەیان کردوە بەوەی: وەهمێکە لە مێشکی کەسێکدا دروست دەبێ و شتەکەی جیاواز لە حەقیقەتی خۆی لەبەرچاو دەنەخشێنێ، واتە وای لێدەکا باوەڕی بە بوونی رووداو یان سیفەتێك هەبێ کە نیە، یان بەپێچەوانەوە. واتە باوەڕی بە هەبوونی رووداو یان سیفەتێك نەبێ[2].

---

[1] مامۆستا سەنهوری لە (الوسیط ٣٠٩/١)دا دەستەواژەی عەیبەکانی ئیرادەی بەکارهێناوە، مامۆستا سلیمان مرقس لە (أصول الالتزامات، بند ١٧١، ص١٧٤)دا دەستەواژەی عەیبەکانی رەزامەندی بەکارهێناوە.

[2] الأستاذ مرقس — سەرچاوەی پێشوو ص٧٥.

هەندێ[1] پێناسەیان کردوە بەوەی دۆخێکە لە دەرووندا دروست دەبێ وای لێدەکا شتێکی بەخەیاڵدا بێ کە لە واقیعدا نیە. هەندێ گوتویانە[2]: وەهمێکە لە دەرووندا پەیدا دەبێ و وای لێدەکا گرێبەندەکە ئیمزا بکا. یەکێکیتر[3] بە شێوەیەکی نزیك لە راستی پێناسەی کردوە پاشان لە تەفسیرکردنی پێناسەکەیدا گەڕاوەتەوە بۆ ئەو هەڵەیەی کەسانیتر تێی کەوتوون و دەڵێ: (هەڵە وێناکردنی ناحەقیقەتە)، ئەمە لە پێناسە راستەکەیەوە نزیکە بەڵام قسەکەی بەو شێوەیە لێکداوەتەوە کە کەسانیتر بۆی چوون و دەڵێ: وەهمێکە لە زەینی کەسێکدا پەیدا دەبێ و شتێکی جیاواز لە راستەقینەکەی بۆ وێنە دەکێشێ.

مامۆستا ئەلبەدراوی[4] پێناسەی کردوە بەوەی وەهمێکە، واتە باوەڕێکی هەڵەیە لە زەینی گرێبەندواندا دروست دەبێت و پاڵی پێوە دەنێ بۆ گرێبەندکردن. تەفسیرکردنی بۆ وەهم بە باوەڕ (اعتقاد) لە ترازووی مەنتیق و فەلسەفەدا هەڵەیە. یاساناسی فەرەنسی سالی[5] پێناسەی کردوە بەوەی نەسازانی ئیرادەی راستەقینە (نادیار)ـە لەتەك ئەو ئیرادەیەی دەربڕیەتی (دیار)، ئەم پێناسەیەیش لە ترازووی مەنتیقدا هەڵەیە، لەبەرئەوەی رێگر نیە و عەیبەکانیتری رەزامەندیش لەخۆ دەگرێ.

پوختەی قسان ئەوەیە پێناسەیەکی راستی زانایانی یاسام نەدیوە کە بەگوێرەی زانیاریی من لەگەڵ مەنتیقی یاساییدا تەبا بێ، لەبەرئەوەی هەڵە هەمیشە وەهم نیە بەڵکو زانینی شتە بە غەیری راستەقینەکەی. ئەو زانین (ادراك)ەیش ئەم چوار ئاستانەی خوارەوەی هەیە:

---

[1] الأستاذ السنهوري – سەرچاوەی پێشوو ٣١١/١.

[2] الدكتور حسن الذنون – النظرية العامة للالتزامات، ص٩٠.

[3] الدكتور إسماعيل غانم – النظرية العامة للالتزامات، ص١٧٥.

[4] النظرية العامة للالتزام في القانون المدني المصري، الجزء الأول، مصادر الالتزام، ص٢٤٤.

[5] لە زاری د.عبدالمجيد الحكيم، مصادر الالتزام، ١٣٦/١.

١- نەزانیی ئاڵۆز (الجهل المركب): باوەڕی پێداگر و نەگۆڕ و ناجووت لەگەڵ واقیعە، وەك باوەڕی كەسی مولحید بەوەی گەردوون بەرێكەوت پەیدا بووە. لەوەدا دەكەوێتە هەڵەیەكەوە كە نایزانێ و ناشزانێ كە نازانێ.

ئەو واقیع ناناسێ و نایشزانێ كە نایناسێ، لەبەرئەوە ناونراوە نەزانیی ئاڵۆز.

٢- لاساییكردنەوەی موجتەهیدێك كە لە ئیجتیهادەكەیدا نەیپێكاوە. لاساییكەرەوەیش وەك لاساییكراوەكەی، لەو حوكمەی پێی گەیشتووە باوەڕێكی پێداگر و ناجێگیر و ناجووت لەگەڵ واقیعی هەیە، بەڵام دەكرێ ئەم هەڵەیە بە زانینی راستەقینەكە یاخود لاساییكردنەوەی موجتەهیدێكی پێكاو نەمێنێ.

٣- گومان: زانینی لایەنی زاڵ (راجح)ە كە پێچەوانەی واقیعە، وەك قازی كە گومانی وایە تۆمەتبار تاوانبارە، پاشان بۆی روون دەبێتەوە بێتاوانە.

٤- وەهم: زانینی لایەنی بنزاڵ (مرجوح)ە لای كەسەكە، بەڵام پێچەوانەی واقیعە، وەك ئەو كەسەی زانینی بنزاڵی هەیە كە ئەو قەرزەی لەسەری بووە داویەتەوە، پاشان بۆی دەردەكەوێ وانیە.

لەم روانگەوە پێناسەكردنی هەڵە لەلایەن زانایانی یاساوە بە وەهم، پێچەوانەی مەنتیقی یاساییە لەم رووانەوە:

أ- وەهم نابێتە مایەی باوەڕ، لەبەرئەوەی دووەم لەیەكەم بەهێزترە و زانینی لاواز ناتوانێ لە خۆی بەهێزتر بەرهەم بێنێ. بە دەربڕینێكیتر وەهم لە وێناكردنەكان (تصورات) و باوەڕ لە بڕواپێكردن (تصدیقات)ە، پێشەكییە وێناییەكانیش بڕواپێكردن بەرهەم ناهێنن، لەكاتێكدا زانایانی یاسا لە پێناسەی هەڵەدا ئەم هەڵەیەیان ئیقرار كردوە.

ب- هەڵە هەمیشە وەهم نیە بەڵكو لەوانەیە گومان یان لاساییكردنەوە یان نەزانیی ئاڵۆز بێ وەك باسمان كرد.

ج- وەهم هەمیشە وێناکردنێکی لایەنی بنزاڵ دەبێ، وێناکردنی کزیش هەمیشە و تەسەورکردنی زاڵەکەی لە هەمان کاتدا پێویست دەکا. لێرەوە، ئەوەی دەکەوێتە هەڵەوە بیر لە دوو لایەن دەکاتەوە زاڵ و بنزاڵ، واتە وەهم و گومان کۆدەکاتەوە، جا واز لە گومان دێنێت و کار بە وەهم دەکا، ئەمەیش لەگەڵ مەنتیقی یاساییدا تێکدەگیرێ.

**هۆکانی هەڵە (الغلط):**

هەڵە لەڕووی جیاوازی هەڵەتێداکراو و گرنگیەکەیەوە بۆ سێ جۆری سەرەکی دابەش دەبێ:

**جۆری یەکەم: هەڵەی ڕێگر (الغلط المانع):**

ئەو هەڵەیە کاریگەری لەسەر دامەزرانی گرێبەندەکە هەیە بەهۆی جووتنەبوونی ئیجاب و قبوڵ لە واقیع و نەبوونی تۆخمی ڕەزامەندی لە حەقیقەتدا، وەك لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا:

أ- هەڵە لە سروشتی گرێبەندەکەدا، وەك ئەوەی (أ) بەشێك لە ماڵەکەی بە سپاردە لای (ب) دابنێ و (ب)یش باوەڕی وابێ ئەوە بەخشینە نەك سپاردە.

ب- هەڵە لە شوێنی گرێبەنددا: وەك ئەوەی کەسێك خشڵێك بەناوی ئاڵتون دەکڕێ کەچی دواتر وا دەرناچێ.

ج- هەڵە لە هۆدا: وەك گرێبەندی سوڵح کە واریسێك لەتەك کەسێکیتر دەیبەستێ کە باوەڕی وایە ئەو کەسە بە وەسیەتێکی دروست و کارپێکراو وەسیەت بۆکراوە تا واریسەکە لەباتیی ئەو شتەی وەسیەت کراوە بیدرێتی، ڕێك دەکەون ماڵێکیتری دیاریکراوی بداتێ، جا چ بەشێك بێ لە میراتەکە یان نا، پاشان دەربکەوێ وەسیەتەکە بەتاڵە، یان وەسیەتکەر بەر لە مردنی رای گۆڕیوە و لێی پەشیمان بۆتەوە. ئاشکرایە هۆکە لەم سوڵحەدا وەسیەتێکی وەهمییە کە وجودی نیە.

د- هەڵە لە بوونی شوێنی گرێبەنددا: وەك ئەوەی کەسێك ئۆتۆمبێلێك بکڕێ کە بەر لە ئیمزاکردنی گرێبەندەکە سووتاوە و هەردوو لایەنیش ئەوە نازانن.

لەم چوار حاڵەتە و هاوشێوەکانیاندا لەبەر جووتنەبوونی ئیجاب و قبوڵ و نەبوونی ڕەزامەندی لە واقیعدا، گرێبەندەکە بەتاڵە.

**جۆری دووەم: ئەو هەڵەیەی دەکەوێتە ناو ڕەزامەندی:**

ئەمەیە پێی دەوترێ هەڵەی جەوهەری. هەڵە جەوهەری دەبێ ئەگەر بەڕادەیەك گەورە بوو گرێبەندوان بەهۆیەوە ئامادە نەبوو گرێبەندەکە بکا یا نەیشکەوتبێتە ناو ئەو هەڵەیە، وەك لە یەکێك لەم حاڵەتانەدا:

أ- هەڵە لە کەسی گرێبەندواندا ئەگەر کەسایەتیی ئەو کەسە بەلای ئەو گرێبەندوانەی کەوتۆتە هەڵەکە لەبەرچاوگیراو بوو ، وەك ئەوەی گرێبەند لەگەڵ پزیشکێك دەکا بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەریەك و گومانی وایە ئەوە ئەو پزیشکەی وڵاتە کە بە زیرەکی و پسپۆڕی و ئەزموونی زۆر ناسراوە، پاشان دەریکەوێ پزیشکێکی ئاساییە.

ب- هەڵە لە سیفەتێکی جەوهەری شوێنی گرێبەنددا، وەك ئەو کەسەی شتێك بەدزی بکڕێ و گومانی وابێ ئاسەواری کۆنە، بەڵام پاشان دەریکەوێ وانیە.

ج- هەڵەی جەوهەری لە هەر شتێکیتردا کە عورفی باو لە وڵاتدا بە هەڵەی جەوهەری دابنێ.

ئاسەواری هەڵە لەم حاڵەتانە و هاوشێوەکانیاندا ئەوەیە گرێبەندەکە قابیل بە بەتاڵکردنەوە دەبێ، وەك لە فیقهی خۆرئاوایی و ئەو یاسایانەی لەژێر کاریگەریدان، لەوانە یاسای مەدەنیی میسری بەرکار (م/۱۲۲). (لەم یاسایانەدا) ئەو کەسەی لە بەرژەوەندیی ئەو بڕیار لە قابیلیەت بۆ بەتاڵکردنەوە دراوە بۆی هەیە گرێبەندەکە هەڵبوەشێنێتەوە، ئەگەر هەڵیوەشایەوە هەردوو گرێبەندوان دەگەڕێنەوە سەر حاڵەتی پێشتریان، هاوکات بەهۆی نەمانی هۆکەوە پێویستە هەریەکەیان چی بەویتر داوە یان لێی وەرگرتووە بیگێڕێتەوە.

لە هەندێ یاسادا، لەوانە یاسای مەدەنیی عێراقی بەرکار (م/١١٨)، لەسەر مۆڵەتی ئەو کەسەی کەوتۆتە هەڵەکە پاش ئاشکرابوونی، وەستاوە. هەروەها لە فیقهی ئیسلامی و ئەو یاسایانەی لەژێر کاریگەریدان، وەك یاسای مەدەنیی ئوردنی بەرکار (م/ ١٥٣ و ١٥٤) ئەو گرێبەندە کارپێکراوی نالازمە.

بەڵام لەو حاڵەتانەدا کە دەچنە ژێر خانەی جۆری دووەمی هەڵە، پێویستە ئەو لایەنەی مافی هەڵوەشاندنەوەی هەیە رەچاوی نیازپاکیی لایەنەکەیتر بکا، بەتایبەت ئەگەر ئامادەیی پیشاندا بۆ جێبەجێکردنی گرێبەندەکە بەو شێوەیەی ئەو کەسەی کەوتۆتە هەڵەکەوە دەیەوێ[1].

**جۆری سێیەم: هەڵەی ناکاریگەر:**

ئەوەیە کار نە لە دامەزرانی گرێبەندەکە، نە لە بەسەرچوونی و نە لەسەر لزومی ناکا، وەك هەڵە لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا:

أ- هەڵە لە وەسفێکی ناجەوهەریدا وەك هەڵەکردن لە رەنگی قوماش یان کاغەزدا.

ب- هەڵە لە کەسی گرێبەندواندا ئەگەر کەسایەتیەکەی لە گرێبەندکردنەکەدا لەبەرچاوگیراو نەبوو، وەك ئەوەی شتێك بەنرخێکی کەمتر بفرۆشێ وابزانێ کڕیارەکە دراوسێ یان خزمیەتی، پاشان دەربکەوێ وانیە.

ج- هەڵە لە بزوێنەری پاڵنەر وەك ئەو کەسەی ئۆتۆمبێلێك دەکڕێ و گومانی وایە ئۆتۆمبێلەکەی خۆی دزراوە یان سووتاوە، پاشان دەربکەوێ وانیە.

د- هەڵەی ماددی: وەك هەڵەکردن لە نووسین یان حسابکردندا، لەبەرئەوەی لەم حاڵەتەدا دەکرێ هەڵەکە راست بکرێتەوە.

بەگوێرەی بیردۆزی یاسایی کلاسیکی، هەڵە لەم حاڵەتانە و هەڵە هاوشێوەکانیاندا ناجەوهەرین و هەڵوەشاندنەوە واجب ناکەن، بەڵام ئەگەر کار بە بیردۆزی نوێ بکەین

---

[1] مەدەنیی عێراقی (م/١١٩)، میسری (م/١٢٤)، ئوردنی (م/١٥٦).

کە قەزا دایهێناوە، بۆچوونی جیاواز لەوەی هەیە و بزوێنەری پاڵنەری مەعنەوی وەرگرتووە نەك ماددی و وایداناوە هەر هەڵەیەك پاڵنەر بێ بۆ گرێبەندکردن لە نموونەی ئەو حاڵەتانەی باس کران، هۆیەکە رەزامەندی تێکدەدات و قابیلیەتی گرێبەندەکە بۆ بەتاڵکردنەوە و هەڵوەشاندنەوە واجب دەکا، هەروەك ئەو حاڵەتانەی دەچنە ژێر خانەی جۆری دووەمی هەڵە.

ئێمە کارکردن بەم ئاراستە نوێیە بەپەسەند دەزانین، لەبەرئەوەی لەگەڵ لۆژیکی یاسایی و لەگەڵ دادپەوەری لە مامەڵەی دارایدا تەبایە[1].

لە هەموو حاڵەتەکاندا بۆ کاریگەریی هەڵە و کارتێکرانی رەزامەندی و لێکەوتنەوەی ئەسەر بوونی ئەمانە پێویستە[2]:

١- هەڵەکە لە هەڵەکردنی هەڵەکارەکە نەکەوتبێتەوە، واتە لە نەزانیەکی زەق یان کەمتەرخەمی یان هەڵەشەیی، وەك کەمتەرخەمیکردنی لە بینینی ئەوماڵەی گرێبەندی لەسەر دەکرێ.

٢- هەڵەکە هۆی پاڵنەر بووبێ بۆ گرێبەندبەندەکە.

٣- کەوتبێتە ناو بازنەی گرێبەندکردنەوە، واتە گرێبەندوانەکەیتر زانیبێتی، یان ئاسان بووبێ بیزانێ.

٤- سەلماندنی هەڵەکە. پێویستە لەسەر ئەو کەسەی بانگەشەی ئەوە دەکا

---

[1] لە بابەتی هەڵەدا بڕوانە ئەم سەرچاوانە: الأستاذ مرقس – المرجع السابق، ص١٧٥ و پاشتر. الأستاذ السنهوري – سەرچاوەی پێشوو، ١،٣١ و پاشتر. الأستاذ إسماعيل غانم – سەرچاوەی پێشوو، ص١٧٥ و پاشتر. الأستاذ د.عبدالمنعم البدراوي، النظرية العامة للالتزام، ٢٤٤/١ و پاشتر. الأستاذ عبدالمجيد الحكيم – سەرچاوەی پێشوو، ص١٣٦ و ئاشتر. کتێبەکەی ئێمە: نظرية الالتزام برد غير المستحق، ص٢٠٠ و پاشتر.

[2] بڕوانە ئەم یاسا مەدەنییە عەرەبییانە: عێراقی (م/١١٧-١٢٠)، میسری (م/١٢٠-١٢٤)، سوری (م/١٢١-١٢٥)، ئوردنی (م/١٥١-١٥٦)، کوێتی (م/١٤٧-١٥٠)، لوبنانی (م/٢٠٣-٢٠٧)، جەزائیری (م/٨١-٨٥)، تونسی (فەسڵی ٤٥-٤٩)، مەغریبی (فەسڵی ٣٩-٤٥)، مۆریتانی (م/٦١-٦٦) و فەرەنسی (م/١١١٠).

ئیرادەی بەهەڵە عەیبدار کراوە، ئەو هەڵەیە بسەلمێنێ کە تێی کەوتووە.

## لقی دووەم:
## هەڵەی خەڵەتاندن

وشـەی فریـودان (التغریـر) زاراوەی فیقهـی ئیسـلامی و ئـەو یاسـایانەیە لـەژێر کاریگەریـدان وەك یاسـای مـەدەنیی عێراقیـی بـەرکار (م/١٢١). خەڵەتانـدن (التدلیس)یش زاراوەی فیقهی خۆرئاوایی و ئـەو یاسـایانەیە لـەژێر کاریگەریـدان وەك یاسای مەدەنیی میسری (م/١٢٥). هەردووکیشیان هاوماتان و یەك حەقیقەتیان هەیە کە بریتییە لە: بەکارهێنانی رێگەی فێڵبازانە و چەواشەکارانە لەلایـەن یـەکێك لـە دوو گرێبەندوانەکە یان کەسێکیترەوە تا گرێبەندوانەکەیتر بخاتە هەڵەوە، یـان وای لێبکـا لەسەر ئەو هەڵەیەی تێی کەوتووە بەردەوام بێ، تا وای لێبکرێ گرێبەندەکە بکا.

ئەسڵ لە فریوداندا ئەوەیە بکەرەکە یەکێك لە دوو گرێبەندوانەکە بێ، کەوتنە نـاو هەڵـەیش لـەوەوە پەیـدا دەبـێ، بـەڵام لەوانەیشـە لـە کەسـی سـێیەم و بێگانـە بـە گرێبەندەکـەوە بـێ. بـەڵام کاریگەریکـەی وەك کاریگـەریی ئـەو فریودانەیـە کـە لـە گرێبەندوانەکە خۆیەوە بووە ئەگەر کەسی سوودمەند بەوەی دەزانی یـان دەیتـوانی پێی بزانێ.

هەڵە بەزۆری بـەهۆی فریودانـەوە روودەدا، بـەڵام لەوانەیشـە خۆبـەخۆ بـووبێ و گرێبەندوان تێی کەوتبێ، بەڵام فریودانەکە بۆ ئەوە بووە لەو تێکەوتنە بەردەوام بێ.

**تێکەڵکردن لەنێوان خەڵەتاندن و هەڵە لەو رووەوە خەوشێکە لە خەوشەکانی رەزامەندی:**

ئەوەی لە یاساکان و شەرحەکانیان ورد بێتـەوە دەبـینێ خەڵەتانـدن (فریـودان) خەوشی رەزامەندییـە لەگـەڵ ئـەوەی کـردەوەی کەسـی فریـودەر (خەڵەتێنـەر)ە و

بەوەوە وەستاوە، بەڵام هەڵە سیفەتی فێڵ لێکراو و رەزامەندیەتی، جا چۆن دەکرێ سیفەتی کەسێك بە خەوش (عەیب) دابنرێ بۆ رەزامەندی یان ئیرادەی کەسێکیتر.

لەم روانگەوە دەربڕینی دروست لە ناونیشانی ئەم بابەتەدا لەباتیی (خەڵەتاند) یان (فریـودان) بریتییـە لـە (هەڵـەی خەڵەتانـدن)، ئـەم بەکارهێنانـەیش تـەنها لـەڕووی مەجازەوە دروستە، لەبەرئەوەی مانا راستەقینەکەی ئەو هەڵەیە لە خەڵەتاندنەکەوە پەیدا بووە، مانا مەجازیەکە خەڵەتاندنـە، پەیوەنـدیی نێـوان دوو ماناکـەیش هۆییـە، هەربۆیە هۆ بەکار هاتووە و مەبەست پێی بەرهۆ (المسبب) بووە.

**توخمەکانی خەڵەتاندن:**

بەلای یاساناسانەوە[1] رەگەزەکانی خەڵەتاندن دووانن، ماددی و مەعنەوی:

١- رەگەزی ماددی: رێگەکانی فێڵکردنن کە لە خەڵەتاندن (فریودان)ەکەدا بەکار هاتوون.

٢- رەگەزی مەعنەوی: بریتییە لە نیـەتی چەواشـەکردن بەمەبەسـتی پاڵنـان بـە فریودراوەوە بۆ گرێبەندکردن.

وەك زۆرجار باسمان کردوە لە ترازووی مەنتیقدا رەگەزەکانی هەر شتێك ئەوەیـە ئەو شتە لەسەری دەوەستێ و لە بووندا پێش ئەو کەوتووە، جـا ئەگـەر رەگەزەکـە بەشێك بوو لێی پێی دەوترێ پایە ، ئەگینا پێی دەوترێ مەرج.

لە روانگەی ئەم راستیەوە رەگەزەکانی خەڵەتاندن پێنجن و ئەمانەن:

١- خەڵەتێنەر: ئەو چەواشەکارەیە کە رێگـەکانی فێڵکردنـی بـەکار دێنـێ جا چ یەکێك بێ لە دوو گرێبەندوانەکە یان کەسێکی سێیەم و بێگانە بێ بە گرێبەندەکـە لـە

[1] لەوانە مامۆستا السنهوري، سەرچاوەی پێشوو، ١/٣٤٣، هەروەها مامۆستا البدراوي، سەرچاوەی پێشوو، ص٢١٩، مامۆستا المرقس، سەرچاوەی پێشوو، ص٨٧، مامۆستا إسماعيل غانم، سەرچاوەی پێشوو، ص٢١٠.

حاڵەتێکدا کەسی سوودمەند لەو کارە ئاگەداری ئەم دەستێوەردانە دەرەکییە بێ، یان دەیتوانی پێی بزانێ.

٢- خەڵەتێنراو: ئەو گرێبەندوانەیە چەواشە کراوە و کەوتۆتە هەڵەوە.

٣- پێ خەڵەتێن: بەکارهێنانی ڕێگەکانی خەڵەتاندن و دەگەلێدانە.

٤- هۆی پاڵنەر (السبب الباعث): بەدیهێنانی ئامانجێکی ناڕەوایە. ئەم هۆ پاڵنەرە لەو رووەوە لە وێناکردندا پێش خراوە پێی دەوترێ مەرام (الغرض)، لەو رووەیشەوە لە بووندا دواخراوە پێی دەوترێ ئامانج و ئەنجام و بەرژەوەندی، ئەم سێ زاراوەیەیش یەکسانن بە فەلسەفەی گرێبەندکردن.

٥- نیازی فریودانی خەڵەتێنەرەکە: ئەگەر کەسێك بە کاری کەسێکیتر خەڵەتا بەبێ ئەوەی ئەو کەسە مەبەستی خەڵەتاندنی بووبێ، ئەوا خەڵەتێنراو مافی داواکردنی هەڵوەشاندنەوەی نیە لەسەر بناغەی ئەو هەڵەیەی تێی کەوتووە.

بۆنموونە فریوخواردنی گرێبەندوانێك بە دیمەنی کەشخە و دەوڵەمەندانەی گرێبەندوانەکەیتر، بەبێ ئەوەی ئەو کەسە مەبەستی بووبێ بەوە فریوی بدات، بە خەڵەتاندن دانانرێ، هەروەها دانی زانیاریی ناڕاست بە نیەتی چاکیش بەهەمان شێوە، لەبەرئەوە نیەتی خراپی فریودان پێویستە لە رەفتارێکی دەرەکیدا بەرجەستە ببێ، وەك بەکارهێنانی ڕێگەکانی فێڵکردن.

**مەرج و ئاسەوارەکانی خەڵەتاندن:**

هەموو مەرج و ئاسەوارەکانی هەڵەی خۆبەخۆ بەسەر خەڵەتاندندا دەچەسپێن، جگە لەم ئاسەوارانەی خوارەوە:

یەکەم: خەڵەتاندن کارێکی ناڕەوایە و لەسەر بنچینەی بەرپرسیارێتیی کەمتەرخەمیکردن قەرەبوو بۆ خەڵەتێنراو لەو زیانەی بەو هۆیەوە لێی کەوتووە پێویست دەکا، جا چ گرێبەندەکە هەڵبوەشێتەوە نا.

دووەم: یاسادانانە سزاییەکان زۆر لە مێژە بەو ئاراستەیەدا دەڕۆن خەڵەتاندن بە تاوانێك دابنرێ کە سزادانی لەسەرە.

زانایانی یاسای جینائی پێناسەی جیاوازیان بۆ کردوە، لەوانە پێناسەکردنی بەوەی: بریتییە لە شێواندنی راستی لەبارەی رووداوێکەوە، کە کەوتنە نێو هەڵەی لێدەکەوێتەوە[1].

ئەم پێناسەیە ئەوە دەگەیەنێ کاڵای خەڵەتاندن درۆیە، بابەتی ئەم درۆیەیش رەفتارێکە دروستکردنی پشێوی لە بیرکردنەوەی کەسێکدا لێدەکەوێتەوە کە راستیەکە نازانێ.

بەپێی زانیاریی من یەکەمین یاسا لە وڵاتانی عەرەبی چارەسەری خەڵەتاندنی لەسەر بنچینەی تاوان کردبێ، یاسای سزادانی ئەسڵیی میسرییە کە ساڵی ١٨٨٣ دەرچووە و لە مادەی (٢٤٥)دا بەدەق بەتاوانی داناوە و سزاکەی دیاری کردوە.

پاش ئەوە یاسای سزادانی میسری ساڵی ١٩٠٤ی بەدوادا هات، پاشان یاسای سزادانی میسری ساڵی ١٩٣٧، پاشان یاسای ژمارە (٤٨)ی ساڵی ١٩٤١، پاشان یاسای ژمارە (١٠٦)ی ساڵی ١٩٨٠، پاشان یاسای ژمارە (٢٨١)ی ساڵی ١٩٩٤ کە مادەی یەکەمی دەڵێ "بە ماوەیەك کەمتر نەبێ لە ساڵێك بەندکردن و غەرامەکردنێك لە پێنج هەزار جونەیه کەمتر نەبێت و لە بیست هەزار جونەیهیش زیاتر نەبێ، یان بە هاوتای نرخی شمەکەکە (کە فێڵی تێدا کراوە) یان کامیان گەورەتر بێ یان بە یەکێك لەو دوو سزایە، سزا دەدرێ هەر کەسێك بە هەر رێگەیەك لە رێگەکان گرێبەندوان بخەڵەتێنێ، یان لە یەکێك لەم شتانەی خوارەوەدا هەوڵی خەڵەتاندنی دابێ:

١- خودی کاڵاکە، ئەگەر ئەوەی لێی وەرگیرابوو جیا بوو لەوەی لەسەری رێك کەوتوون.

٢- حەقیقەت یان سروشتی کاڵاکە، یان سیفەتە جەوهەریەکانی.

٣- جۆری کاڵاکە یان چاوگ یان ئەسڵ یان سەرچاوەکەی.

[1] د. محمود نجيب حسني، شرح قانون العقوبات المصري، القسم الخاص، ط١٩٨٧، ص

٤- ژمارەی کاڵاکە یان ئەندازەکەی یان پێوانەکەی یان پێوانەکەی یان بارستاییەکەی یان وزەکەی یان عەیارەکەی و هتد[1].

**خەڵەتاندن و مافخوران (الغبن):**

یاسای مەدەنیی فەرەنسی (م/١١٦) و پاشتر و ئەو یاسایانەی لەژێر کاریگەریدان وەك یاسای مەدەنیی میسری (م/١٢٥)، پێیان وایە هەریەك لە خەڵەتاندن و مافخوران خەوشێکی سەربەخۆن لە خەوشەکانی رەزامەندی، لەکاتێکدا فیقهی ئیسلامی و ئەو یاسایانەی لەژێر کاریگەریدان لەوانە یاسای مەدەنیی عێراقی (م/ ١٢١-١٢٥) بۆ ئەوە چوون بە یەك خەوشیان دابنێن، لێرەیشەوە نە فریودان (یان خەڵەتاندن) بەتەنها بەبێ مافخوران و نە مافخوران بەتەنها بەبێ فریودان بە خەوشێك دانانرێن کە رەزامەندی خراپ بکا، ئەمە جگە لە مەرجی ئەوەی مافخورانەکە زەق بێ.

مادەی (١/١٢١) دەڵێ: "ئەگەر یەکێك لە دوو گرێبەندوانەکە ئەویتریانی فریودا و ساغ بوویەوە گرێبەندەکە مافخواردنێکی زەق (فاحش)ی تێدایە، گرێبەندەکە لەسەر مۆڵەتی گرێبەندوانە مافوراوەکە دەوەستێ، جا ئەگەر ئەو کەسەی بە مافواردنێکی زەق فێڵی لێکرابوو، دەعوای فریودان بۆ واریسەکەی دەگوێزێتەوە".

مادەی (١٢٤)یش دەڵێ: "مافخواردن بەتەنها رێگر نیە لە کارپێکرانی گرێبەندەکە تا مافخورانەکە فریودانی لەگەڵ نەبێ".

پێمان وایە ئەم ئاراستەیە لە راستی و دادپەروەرییەوە نزیکە، بەو مەرجەی ئەوە مسۆگەر بکرێ کە فریودەر لەسەر بنچینەی بەرپرسیارێتیی کەمتەرخەمیکردن قەرەبووی ئەو زیانە بکاتەوە لە کارەکەی کەوتۆتەوە. لەبەرئەوەی ساختەکردن خۆی لە خۆیدا، جا مافخواردن هەبێ یان نەبێ، بە کارێکی ناڕەوا دادەنرێ و ساختەکار

[1] بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: الأستاذ إبراهيم المنجي، جرائم التدليس والغش، ط ١٩٩٧، ص٣٢. هەروەها کتێبەکەمان: نظرية الالتزام برد غير المستحق، ص٢٢١-٢٢٤.

رووبــەرووەی لێپرســینەوەی مــەدەنی دەكــرێ، هــەروەك لەوانەیــە دووچــاری لێپرسینەوەی جینائیشی بكا.

پێشـنیار دەكـەین دەسـتەواژەی (فـاحش) بگـۆڕێ بـۆ (جسـیم) یـان (فـادح)، لەبەرئەوەی یەكەم لە بابی ئەخلاقیات و تاوانە ئەخلاقیەكاندا بەكار دێ.

**پێناسەی مافخوران:**

مـافخوران نابەرانبەرییـە لـەنێوان دوو باتییەكـەدا، واتـە ئـەوەی هەریـەك لـە دوو گرێبەندوانەكە بەویتری دەدەن.

ئەم پێناسەیەش ئەمانەی لەسەر بنیات دەنرێ:

١- مافخوران تەنها لە گرێبەندی ئاڵوگۆڕ و ناشیمانەییدا دەبێ.

٢- پێوەری مـافخوران و نـەبوونی هاوتابوونـە لـەكاتی بەسـتنی گرێبەندەكـەدا، لەبەرئەوە حساب بۆ ئەو جیاوازییە ناكرێ كە پاش گرێبەندەكە روودەدا.

٣- ئاستەمە هاوتابوونی ١٠٠٪ بەدیبێ، لەبەرئەوە جیـاوازیی كـەم یـاخود سـادە (یسیر) لە مامەڵەی داراییدا ئاساییە و حسابی بۆ ناكرێ.

جیاوازیی گەورەیش حوكمی سووی بەسـەردا دەچەسـپێ وەك خـوا دەفـەرموێ ﴿وَأَحَلَّ اللّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا﴾[1].

مەبەست لە فرۆشتن (البیـع) هـەموو ئاڵوگۆڕێكـە هاوتـایی و هاوسـەنگی لـەنێوان هەردوو ئاڵوگۆڕكراوەدا بێتەدی، مەبەست لە سوو (الربا)یش هەر ئاڵوگۆڕێكە جیاوازیی گەورە لـەنێوان هـەردوو ئاڵوگۆڕكراوەكـەدا هـەبێ و لەسـەر حسـابی یـەكێك لـە دوو گرێبەندوانەكە سوود بەویتریان بگەیەنێ.

---

[1] سورة البقرة/ ٢٧٥.

**پێوەری لێك جیاکردنەوەی گەورە و کەم:**

شەرعناسان دوو پێوەریان بۆ لێك جیاکردنەوەی گەورە و بچوك پەسەند کردووە:

یەکەمیان مادییە: بریتییە لە جیاوازیی نێوان بەها مادییەکەی بابەتی گرێبەندەکە و نرخەکەی، جا ئەگەر نرخەکەی لەسەر زیاد کرد بەشێوەیەك لەنێوان سێ-یەکی بەهاکەی و ٢,٥٪ ئەوە بە مافخورانی گەورە دادەنرێ، ئەگەر لە ٢,٥٪ کەمتر بوو بە کەم دادەنرێ.

دووەمیان پێوەرێکی مەعنەوییە، گەورە ئەوەیە ناچێتە ژێر راستکردنەوەی راستکەرەوان بەپێچەوانەی کەم، بۆ نموونە ئەگەر کابرایەك ماڵێکی فرۆشت بە هەزار دۆلار، پاشان یەکێك لە دوو گرێبەندوانەکە بانگەشەی ئەوەی کرد تووشی مافخورانێکی گەورە بووە و کێشەکە خرایە بەردەم شارەزایان، ئەگەر لەسەر مەزەندەکردنی فرۆشراوەکە بە زیاتر لە هەزار دۆلار رێك کەوتن، ئەوا فرۆشیارەکە مافخواردنی دژواری بەرانبەر کراوە، ئەگەر رێکیش کەوتن لەسەر مەزەندەکردنی نرخەکەی بە کەمتر لە هەزار دۆلار ئەوا کڕیارەکە مافخورانی زەقی بەرانبەر کراوە. ئەگەریش رایان جیاواز بوو، هەندێکیان بە زیاتر و هەندێکیان بەکەمتر لەو نرخە مەزەندەیان کرد، مافخورانەکە کەم دەبێت و لەو شتانەیە لەسەودا و مامەڵەدا رێپێدراوە[1].

بەم ئەندازەیە لە روونکردنەوەی رەگەز و حوکمەکانی خەڵەتاندن و ئەو هەڵەیەی لێی دەکەوێتەوە واز دێنین، هەرکەس چاوی لە زیاترە با سەردانی سەرچاوەکانیتر بکا[2].

---

[1] الأستاذ عبدالمجید الحکیم، المرجع السابق، ١/١٧٠.

[2] یاسای مەدەنیی عێراقی (م/١٢١–١٢٥) + میسری (م/١٢٥–١٢٦) + سوری (م/١٢٦–١٢٧) + ئوردنی (م/١٤٣–١٥٠)، یاسای (الموجبات والعقود)ی لوبنانی لە بابەتی فێڵلێکردن (ساختەکردن) (م/٢٠٨–٢٠٩). لە بابەتی مافخوران (م/٢١٣–٢١٤)، لەبەرئەوەی یاسای لوبنانی لەژێر کاریگەریی فیقهی خۆرئاوایی و یاسای فەرەنسیدایە (م/١١١٦)، کە خەڵەتاندن و مافخورانی بە عەیبی سەربەخۆ داناوە + یاسای یەمەنی لە فریودانادا (م/١٨١–١٨٢) لە غبندا (م/١٨٣). ئەم ←

## لقی سێیەم:
## بیمی زۆرلێکردن

خەوشی سێیەم لـە خەوشـەکانی رەزامەنـدی لەلایـەن زانایـانی یاسـاوە نـاونراوە هەڵەی زۆرلێکردن، وەك ئەو هەڵەیەی لە بابەتی خەڵەتاندندا تێی کەوتن. هەڵەبوونەکە وەك لە خەڵەتاندندا باسمان کرد ئەوەیە زۆرلێکردن کردەوەی زۆرلێکەرە و سیفەتێکە بوونی بەوەوە بەندە، بەڵام خەوش (عەیب) سیفەتی زۆرلێکراوە و بە رەزامەندیی ئەو وەستاوە و لە ترازووی مەنتیق و عەقڵدا عەقڵ نایبڕێ سیفەتی کەسێك خەوش بێ بۆ کەسێکیتر یان بۆ ئیرادەی یان بۆ رەزامەندیی (ئەو کەسە). بۆیە راستەکەی ئەوەیـە تـرس (الخـوف) یـان بـیم (الرهبـة) لـەباتیی زۆرلێکـردن (الاکـراه) بـەکار بهێنـرێ. یاسادانەری لوبنانی کارێکی چاکی کردوە کاتێ لـەمادەی (٢١٠)دا لـەباتیی (الاکـراه) دەستەواژەی (الخوف)ی بەکار هێناوە.

ئەگەرچی مامۆستا سەنهوری (رح) دەرکـی بـەم راسـتییە کـردوە و دەڵـێ[1] بـیم رەزامەندی خـراپ دەکـا، کەچـی دەسـتەواژەی (زۆرلێکـردن)ی کردۆتـە ناونیشـانی سێیەم خەوش لە خەوشەکانی ئیرادە.

---

یاسایەیش لەژێر کاریگەریی فیقهی خۆرئاواییدا لە سەربەخۆیی هەریەك لە مافخوران و فریودان لە یەکتر + یاسای کوێتی (م/١٥١–١٥٥) ئەم یاسایە بابەتی مافخورانی پشتگوێ خستوە + یاسای مەغریبی لەبارەی خەڵەتاندن (فەسڵی ٥٢–٥٣) و لەبارەی مافخوران (فەسڵی ٥٥–٥٦). ئەم یاسایەیش لەژێر کاریگەریی فیقهی خۆرئاواییدا لە سەربەخۆیی هەردووکیاندا + یاسای جەزائیری (م/٨٦–٨٧)، ئەم یاسایەیش بابەتی مافخورانی پشتگوێ خستووە + یاسای تونسی لەبارەی فریودان (فەسڵی ٥٦–٦٠) لە مافخوران (فەسڵی ٦١)، ئەمیش هەریەکەیانی بە عەیبێکی سەربەخۆ داناوە.

[1] الوسیط، ١/٣٦٠، البند ١٨٧.

**پێناسەی زۆرلێکردن:**

پاڵەپەستۆیەکەی ناڕەولیە کەسێك دەیخاتە سەر کەسێکیتر و بیم دەخاتە دڵیەوە و وای لێدەکا کارێك بکا کە پێی خۆش نیە.

هیچ جیاوازی نیە لەنێوان ئەوەی زۆرلێکردنەکە لە یەکێك لە دوو گرێبەندوانەکە یان لەلایەن کەسێکی بێگانە لە گرێبەندەکەوە بێ مادام گرێبەندوانی زۆرلێکەر پێی بزانێ، یان دەیتوانی پێی بزانێ.

پاڵەپەستۆ ئەگەر لە شتێکیتری جگە لە مرۆڤەوە بوو، وەك لە ئاژەڵ یان سروشت یان ڕووداوی لەناکاو پێی دەوترێ زەرورەت یان بەلای بێئامان و لە دەرەوەی بابەتەکەمانە، ئەگەرچی لەڕووی ئاسەوارەوە لێك نزیکبوونەوەیەکی زۆر لەنێوان هەردوو بابەتەکەدا هەیە.

پاڵەپەستۆی رەوا (مشروع) وەك زۆرکردن لە قەرزدای قەرزکوێر کە نایەوێ پابەندیەکەی جێبەجێ بکا یان دەستی دەستی بەخاوەن قەرز دەکتا و قەرزەکەیش حازری بوو، ناچێتە خانەی ئەم بابەوە.

**رەگەزەکانی زۆرلێکردن:**

لە یاساکان و شەرحەکانیاندا بڵاوە کە رەگەزەکانی زۆرلێکردن دوانن: ماددی و مەعنەوی.

١- رەگەزی ماددی: لە پرۆسەی هەڕەشەلێکردن یان پاڵەپەستۆکە پێکدێ.

٢- رەگەزی مەعنەوی: ترس یاخود بیمە لەئەنجامی پایە ماددیەکەوە.

ئەم دابەشکردنە لە دوو رووەوە هەڵەیە:

وەك پێشتر باسمان کرد، رەگەزەکانی هەر شتێك لە بووندا پێش ئەو شتە کەوتوون، لەکاتێکدا سیفەتی (ترس) یان (بیم) بەر لە بوونی زۆرلێکردن وجودیان نیە، جا ئەگەر دەست بەم دابەشکردنە دوانینەوە بگرین ئەوا پێچلێدان بەدەوری داواکراو (یان سووڕ، لە زاراوەی مەنتیقیدا) پێویست دەبێ، لەبەرئەوەی بیم لەسەر بوونی زۆرلێکردن دەوەستێ و ئەگەر ئەو نەبووایە ئەمیش نەدەبوو، ئەگەر زۆرلێکردن لەسەر

ئەم رەگەزە مەعنەوییە بوەستایە دەیخواست شت لەسەر ئەو شتە بوەستیّ کە لەسەری دەوەستیّ، ئەوەیش دەیخواست شت لەسەر خۆی بوەستیّ، وەستانی شتیش لەسەر خۆی دەخوازیّ شت پێش خۆی بکەویّ، هەم لازم مەحالّ و بەتالّە و هەمیش مەلزوم، کە وەستانی شتە لەسەر ئەوەی لەسەری دەوەستیّ.

رووی دووەمی هەلّەکە ئەوەیە رەگەزەکانی هەموو شتێك ئەوەیە ئەو شتەی لەسەر دەوەستن، لە روانگەی ئەم راستیەوە رەگەزەکانی زۆرلێکردن چوار دەبن و بریتین لە:

١- **زۆرلێکەر** (المُکرِه): جا چ زۆرلێکردنەکە لەلایەن یەکێك لە گرێبەندوانەکانەوە بیّ یان لە کەسێکی سێیەمەوە کە گرێبەندوانە سوودمەندەکە لێی ئاگەدارە یان دەیتوانی لێی ئاگەدار بیّ. مادەی (١٢٥)ی یاسای مەدەنی میسری باسی ئەم گشتاندنەی کردوە و دەلّیّ: "ئەگەر زۆرلێکردن لەلایەن کەسێکەوە بوو جیا لە دوو گرێبەندوانەکە، ئەوا گرێبەندوانی زۆرلێکراو بۆی نیە داوای بەتالّکردنەوەی گرێبەندەکە بکا تا نەیسەلمێنیّ گرێبەندوانەکەیتر بەو زۆرلێکردنەی زانیوە، یان دەبوو پێی بزانیّ".

**لە مەرجەکانی زۆرلێکەر:**

أ- توانای جێبەجێکردنی ئەو هەڕەشەیەی هەبیّ کە دەیکا، چ خۆی چ بەهاوکاریی کەسانیتر.

ب- لە هەڕەشەکردنەکەیدا جدی بێت و گالّتە نەکات.

ج- رێگرێك لەبەردەم جێبەجێکردنی ئەو هەڕەشەیەدا نەبیّ کە کردوویەتی، وەك بوونی رووبارێك یان بەربەستێك کە رێگە لە جێبەجێکردنی بگریّ، یان بوونی کەسێك کە زۆرلێکراو دژی جێبەجێکردنی ئەو هەڕەشەی لێی کراوە پەنای بۆ ببات.

٢- **زۆرلێکراو** (المُكرَه): لە مەرجەکانی:

أ- هەڕەشەیەکی دەستەویەخەی لەسەر بێ کە زیان بە بەرژەوەندیی خۆی کە یاسا دەیپارێزێ، یان بەرژەوەندیی کەسێکی ئازیزی وەك هاوسەر، دایك یان باوك، یان ڕۆڵەکانی بگەیەنێ.

ب- نەتوانێ خۆی یان بە پشتبەستن بە کەسانیتر ئەو مەترسییە دوور بخاتەوە.

ج- گومانی زاڵی ئەوە بێ کە ئەگەر ئەوەی لەپێناویدا زۆری لێدەکرێ جێبەجێ نەکا، هەڕەشەکە دەستودەم جێبەجێ دەکرێ.

د- ئەو شتەی لەپێناویدا زۆری لێکراوە لەسنووری ئەوەی داوای لێکراوە جێبەجێ بکا، بەوەی شتێکی وا نەکا بەڵگەی ئەوە بێ توانای هەڵبژاردنی هەیە.

هـ- کەسایەتیی ئەو لەڕووی نێرینە و مێینە، بچوکی و گەورەیی، باری تەندروستی و کۆمەڵایەتی و بەهێزی و بێهێزیی ئیرادە و هێزی خزمایەتی و ئەو شتانەوە لەبەر چاو بگیرێ.

٣- **لەپێناودا زۆرلێکراو** (المُكرَه علیه)، لە مەرجەکانی:

أ- ئەوەیە کردەوەیەکی دیاریکراو بێ.

ب- کارێکی ناڕەوا بێ، چونکە زۆرکردن لە قەرزار بۆ جێبەجێکردنی پابەندیەکەی کارێکی ناڕەوا نیە و ناچێتە ژێر ئەو بابەوە.

ج- ئەوەیە مەترسیەکەی لە مەترسیی هەڕەشەپێکراو (المُهدّد بە) کەمتر بێ، ئەگەر گوتی ئەمە بکوژە ئەگینا ئۆتۆمبێلەکەت دەسوتێنم، ئەوا بۆی نیە بەپاساوی زۆرلێکردن بیکوژێ جیاواز لە پێچەوانەکەی، وەك ئەوەی بڵێ ئەگەر ئۆتۆمبێلەکەتم پێ نەفرۆشیت دەتکوژم.

**٤- هەڕەشەپێکراو (المُهدّد بە)، لە مەرجەکانی:**

ئەوەیە هەڕەشەپێکراو ئامرازێکی ناڕەوا بێ لەبەر خودی خۆی یان هیتر. ئەو بەشانەی لەم حاڵەتەدا بەبیردا بێ چوارن:

یەکەم- ئامراز و ئامانج هەردووک رەوان، وەك ئەوەی خاوەن قەرز هەڕەشە لە قەرزارەکەی بکا جێبەجێکردن لەسەر ماڵەکەی ئەگەر زەمانێکی نەداتێ وەك رەهن یان کەفیل، لێرەدا زۆرلێکردن دروستە و هیچ ئەسەرێکی لێ ناکەوێتەوە، لەبەرئەوەی ئامانجەکە رەوایە.

دووەم- ئامراز ناڕەوا و ئامانج رەوایە وەك ئەوەی بەکرێدەر هەڕەشە لە کرێچی بکا ئەگەر قیستی شایستەی سەری نەدات دەستدرێژی دەکاتە سەر ژیانی یان سەلامەتی. زۆرلێکردنەکە رەوایە لەبەرئەوەی ئامانجەکە رەوایە.

سێیەم: هەردووکیان ناڕەوان: وەك ئەوەی هەڕەشەی کوشتن لە کەسێك بکرێ ئەگەر ئیمزای پابەندیەکی بەبێ هۆ نەکا، ئامانجەکەیش ناڕەوایە.

چوارەم: ئامرازەکە رەوا و ئامانجەکە ناڕەوایە، وەك ئەوەی لەپڕ دەچێ بەسەر کەسێکدا کە خەریکی تاوانێکە و هەڕەشەی لێدەکا دەسەڵاتی گشتی لە تاوانەکەی خەبەردار دەکا ئەگەر قەواڵەیەکی بۆ بەپێدانی بڕێکی زۆر پارە بەبێ هۆ بۆ نەنووسێ. ئامانجەکەیش ناڕەوایە.

لەم چوار وێنەیەدا زۆرلێکردن لە وێنەی سێیەم و چوارەمدا لەئارادایە، بەڵام لە یەکەم و دووەمدا نا.

وەلحاسڵ، ئەگەر ئامانج لە پاڵەپەستۆکە گەیشتن بێ بەوەی شایستەیە (مستحق)، پاڵەپەستۆکە نابێتە زۆرلێکردن، با ئامرازەکەیش ناڕەوا بێ.

**جۆرەکانی زۆرلێکردن:**

زۆرلێکردن لەڕووی سروشتی ئەو ئامرازەی تێیدا بەکار دێ بۆ سێ جۆری سەرەکی دابەش دەبێ: زۆرلێکردنی مەعنەوی و ماددی و ئەدەبی. بەم شێوەیە:

**یەکەم- زۆرلێکردنی مەعنەوی:**

بریتییە لە هەڕەشەکردن لە زۆرلێکراو بە مەترسیەك بۆ سەر مافێك لە مافەکانی کە یاسا دەیپارێزێ، یان مافی کەسێکی ئازیزی وەك هاوسەر یان باوك و دایك یان رۆڵەی.

ئەم جۆرەیش دەبێ بە دوو بەشەوە:

بەشی یەکەم: زۆرلێکردنی سەخت (الاکراه الملجيء) (تەولو): ئەوەیە بە هەڕەشەکردن بێ بە لەناوبردنی نەفسێك یان ئەندامێك یان لێدانێکی بەزەبر (گۆشت یان ئێسك ببڕێ) و ئەو شتانە کە ترسی لەناوچوونی نەفسێك یان ئەندامێکیان لێدەکرێ، یان بەلەناوبردنی ماڵێکی گرانبەها یان بەندکردنێکی توند و لەو شێوەیە.

ئەم جۆرە رەزامەندی خراپ دەکا نەك هەڵبژاردن، لەبەرئەوەی سەرباری ئەوەی ئەو هەڵبژاردنە بەرتەسکە بەڵام هێشتا بواری هەڵبژاردنی ساناترینی دوو شەڕەکە (أهون الشرين)ی هەیە.

بەشی دووەم: زۆرلێکردنی سووك (الاکراه غير الملجيء) (ناتەولو): وەك هەڕەشەکردن بە بەندکردنێکی سادە یان سووکە لێدانێك و ئەو شتانە. ئەم جۆرە لەڕووی کارتێکردن و کارتێکرانەوە بەپێی جیاوازیی کەسایەتی زۆرلێکارەکە دەگۆڕێ، وەك ئەوەی ئاخۆ نێرینەیە یان مێینەیە، منداڵە یان هەراشە، ئازایە یان ترسنۆکە و ئەو جۆرە شتانە، واتە سەبارەت بە خراپیی رەزامەندی، بەڵام بەهیچ شێوەیەك هەڵبژاردن خراپ ناکا.

یاسادانەری عێراقی پەیڕەوی لەم دابەشکردنە دووانینەیەی زۆرلێکردنی مەعنەوی کردوە کە رای شەرعناسانی حەنەفیەتە، ئەویش لە مادەی (١١٢) دا کە بەدەق دەڵێ ((يكون الإكراه ملجئاً إذا كان تهديداً بخطر جسيم محدق (حال) كإتلاف نفس أو عضو أو ضرب مبرح أو إيذاء شديد أو إتلاف خطير في المال، ويكون غير ملجيء إذا كان

تهديداً بما هو دون ذلك كالحبس (أي البسيط) والضرب على أحوال الناس)[1]. (واتـە: زۆرلێكردن سەخت دەبێ ئەگەر هەڕەشەكردن بوو بە مەترسیەكی سەخت و یەخەگیر (حازر) وەك لەناوبردنی نەفسێك یان ئەندامێك یان لێدانێكی بەزەبر یـان ئـازاردانێكی توند یان لەناوبردنێكی ترسناكی ماڵ، هەروەها سووك دەبێ ئەگەر هەڕەشەكردن بوو بە كەمتر لەوانە وەك بەندكردن (واتە سادە) و لێدان لە دۆخی خەڵك).

**دووەم- زۆرلێكردنی مادی:**

ئەوەیـە پاڵەپەسـتۆكە مـاددی بـێ بەشـێوەیەك بگاتـە ئاسـتێك لـە بـەهێزی كـە زۆرلێكراو نەتوانێ بەرەنگاری بكا، لەم حاڵەتەدا زۆرلێكردن رەزامەنـدی و هەڵبـژاردن هەردووكیان خراپ دەكات و ئەو رەفتارەی بەزۆر پێی كراوە بەتاڵە، وەك ئەو كەسەی بەزۆر دەستی كەسێك بگرێت و ئیمزای قەواڵەیەكی ساختەی پـێ بكـا، كـە هۆیـەكی رەوای نیە.

شایانی باسە ئەم جۆرە زۆرلێكردنە لە بابی خەوشەكانی رەزامەندیدا باسـی نیـە، لەبەرئەوەی لە چوارچێوەی خەوش دەردەچێت و لەبەلای بێئامان نزیك دەبێتـەوە. بـەڵكو مەبەسـت ئـەو زۆرلێكردنەیـە رەزامەنـدی خـراپ دەكـات و لـە هـەمان كاتـدا ئەندازەیەك ئازادیی هەڵبژاردن بە زۆرلێكراو دەدا تا لـەنێوان ئـەو كردەوەیـەی زۆری لێدەكرێ بیكا یان ئـەو هەڕەشـەیەی لێـی دەكـرێ، ئـەوەیان هەڵبـژێرێ كـە شـەڕی كەمترە[2].

هـەر رەفتـارێكی ئـاڵۆز (مركـب) (گرێبەنـد) یـان تاكەكەسـی كـە لـەژێر فشـاری زۆرلێكردنی مادیدا بكرێ، حسابی بۆ ناكرێت و ئەسەرەكانی لە ماف و پابەندیەكان لێ ناكەوێتەوە، لەبەرئەوەی بەتاڵی رەهایە.

---

[1] واتە زۆرلێكردنی سووك وەك باسمان كرد بەگوێرەی جیاوازیی دۆخی خەڵك جیاوازە. بڕوانە مادەی (١١٤)ی ئەم یاسایە.

[2] الأستاذ مرقس، سەرچاوەی پێشوو، ص١٩٢.

**سێیەم: زۆرلێکردنی ئەدەبی:**

بنچینەکەی دەگەڕێتەوە بۆ گوێڕایەڵیکردنی زۆرلێکەر بۆ فەرمانی کەسێك کە باوەڕی ئەو جۆرە پیرۆزی و ڕێزێکی هەیە، وەك گوێڕایەڵیکردنی کوڕ بۆ فەرمانی باوکی لە تەڵاقدانی ژنەکەیدا، هەروەها وەك مۆڵەتدانی وەرەسە بۆ وەسێتکردن لەسەر زیاتر لە سێ-یەکی میرات و مۆڵەتدانەکەیش لە ژیانی وەسێتکاردا بووبێ، هەروەها جێبەجێکردنی کەسێك بۆ فەرمانی کەسێکیتر کە باوەڕی وایە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی پێویستە و لەژێر کاریگەریی ئەو بیروباوەڕەدا تاوانێك ئەنجام بدات.

بەبڕوای لەخۆبوردوانەی ئێمە ئەم جۆرەی سێیەمی زۆرلێکردن هیچ ئەسەرێکی مەدەنی یان جینائی بۆ زۆرلێکرلو لێناکەوێتەوە و تەڵاق لەژێر پاڵەپەستۆی ئەدەبیدا ناکەوێ، هەروەها حساب بۆ مۆڵەتدانی وەرەسە بە وەسێتکردن لەسەر زیاتر لە سێ-یەکی میرات ناکرێ، تا پاش مردنی وەسێتکار. هەروەها لەڕووی جینائی و مەدەنیەوە لێپرسینەوە لە کەسێکی سۆفی ناکرێ کە بە فەرمانی شێخەکەی تاوانێك ئەنجام دەدات و باوەڕی وایە جێبەجێکردنی ئەم فەرمانە لەڕووی دینیەوە لەسەری واجبە.

بەکورتی و بەپوختی، زۆرلێکردنی ئەدەبی هیچ ئەسەرێکی لێناکەوێتەوە تا ترس یان بیمی لەگەڵ نەبێ.

هەندێ یاسا ئەمەیان گوتووە، لەوانە یاسای مەدەنیی مەغریبی (فەسڵی ٥١) کە دەڵێ "ترس بەهۆی شەرمکردنەوە هەڵوەشاندنەوە ناخوازێ مەگەر هەڕەشەیەکی بەهێز یان لێدانی لەگەڵ نەبێ". هەروەها یاسای مەدەنیی تونسی (فەسڵی ٥٥) کە دەڵێ "ترس لە بەر ڕێزگرتن، سەرپشك ناکا بۆ بەتاڵکردنەوە، مەگەر هەڕەشەی گەورە یان کردەوەی مادیشی لەگەڵ بێ".

**ئاسەواری زۆرلێکردن:**

یاساکان و رای یاساناسان لە گونجاندن (پێدانی سیفەتی یاسایی)ی ئەو ئاسەوارانەدا جیاوازیان هەیە، لە فیقهی خۆرئاوایی و ئەو یاسایانەی لەژێر کاریگەریدان ئەسەری زۆرلێکردن ئەوەیە ئەو رەفتارەی بە زۆر کراوە قابیلیەتی بەتاڵکردنەوە پەیدا دەکا، لەوانە یاسای مەدەنیی میسری (مادەی ١٢٧).

لە فیقهی ئیسلامی و ئەو یاسایانەی لەژێر کاریگەریدان، بەبۆچوونی ئیمامی ئەبوحەنیفە (رح) ئەسەرەکەی ئەوەیە رەفتارەکە فاسیدە، وەك یاسای باری کەسینی عێراقی بەرکار (مادەی ٦ و مادەی ٢٢). هەروەها لەو یاسایانەی لەژێر کاریگەریی رای شیعەی ئیمامی و کۆمەڵێ لە شەرعناسانی حەنەفیدا ئەسەرەکە وەستان (کارپێنەکرانی)یەتی، وەك یاسای مەدەنیی عێراقی بەرکار (مادەی ١٣٤).

هەروەها لەو یاسایانەی لەژێر کاریگەریی مەزەبی ئیمام مالیکدان (رح) رەفتارەکە لزومی نیە، وەك یاسای مەدەنیی تونسی (فەسڵی ٥١). لەو یاسایانەیش لەژێر کاریگەریی مەزەبی ئیمام شافیعیدان (رح) گرێبەندەکە بەتاڵە، وەك یاسای یەمەنی (م/١٧٩) کە دەڵێ: " گرێبەندێك بەزۆر بەکەسێك کرابێ دروست نیە، پێویستە ئەو کەسەی زۆرەکەی کردوە ئەو شتە بگێڕێتەوە کە زۆری لەسەر کردوە".

یاسادانەری عێراقی لە یاسای باری کەسینی بەرکاردا سەبارەت بە هاوسەرگیریی زۆرلێکراو سەرکەوتوو نەبووە، کە لە مادەی نۆیەمیدا دەڵێ "هاوسەرگیریی زۆرلێکراو بەتاڵە ئەگەر چوونەلای ژن (الدخول) رووی نەدابێ". ئەم مادەیە لە دوو رووەوە نادروستە:

یەکەمیان: لە هیچ یاسایەك لە یاساکانی دەوڵەتانی دنیادا نیە کە دان بەگۆڕانی گرێبەندی بەتاڵی رەها بۆ گرێبەندی دروست بنرێ بە مۆڵەتدان، لەبەرئەوەی بەتاڵ و نەبوو وەك یەکن. ئەوەیش روونە نەبوو مۆڵەتی لەگەڵ نیە.

دووەم: لەوانەیە ئەو چوونەلایەیش کە بە مۆڵەت دانراوە بەزۆرلێکردن بووبێ.

بەڕای لەخۆبوردوانەی ئێمە هاوسەرگیریی زۆرلێکراو لەسەر مۆڵەتی زۆرلێکراوەکە خۆی دەوەستێ پاش نەمانی ئەسەری زۆرلێکردنەکە[1]، یان فاسیدە، فاسیدیش بۆ زۆرلێکردن حوکمی وەستێنراوی هەیە.

[1] لە بابەتی زۆرلێکردندا بڕوانە ئەم یاسا مەدەنییە عەرەبییانە: عێراقی (م/١١٢-١١٦)، میسری (م/١٢٧-١٢٨)، سوری (م/١٢٨-١٢٩)، ئوردنی (م/١٣٥-١٤٢)، لوبنانی (م/٢١٠-٢١٢)، کوێتی (م/١٥٦-١٥٨)، جەزائیری (م/٨٨-٨٩)، مەغریبی (فەسڵی ٤٦-٥١)، تونسی (فەسڵی ٥٠-٥٤)، یەمەنی (م/١٧٧-١٨٠)، مۆریتانی (م/٦٩-٧١)، یاسای مەدەنیی فەرەنسی (م/١١١١-١١١٥).

لە شەرحەکانی یاسایشدا:

الأستاذ السنهوري، الوسيط، ١/٣٦٠ و ئاشتر، الأستاذ المرقس، المرجع السابق، ص١٩١ و ئاشتر، الأستاذ إسماعيل غانم، المرجع السابق، ص٢١٩، بند ١١٠ و ئاشتر، الأستاذ الننون، المرجع السابق، ص٨٤ و ئاشتر، الأستاذ البدراوي، المرجع السابق، ص٢٧٧ و ئاشتر، الأستاذ عبدالمجيد الحكيم، المرجع السابق، ص٢٣ و ئاشتر.

## لقی چوارەم:
## لاوازیی قۆزراوە

زانایانی یاسا و یاساکان لەژێر ناونیشانی قۆستنەوە (الاستغلال)دا مامەڵەیان لەتەك ئەم خەوشە کردوە و لەکاتی لێکۆڵینەوە لە خەوشی چوارەم لە خەوشەکانی رەزامەندی (یان ئیرادە)دا قۆستنەوە و مافخورانیان پێکەوە بەستووە.

هەموو کۆك بوون لەسەر ئەوەی قۆستنەوە بەتەنها بەبێ ئەوەی مافخورانی لەگەڵ بێ، بەهیچ شێوەیەك لە خەوشەکانی رەزامەندی یان ئیرادە ناژمێرێ.

پێناسەی مافخورانیان کردوە بەوەی ناهاوتاییە لەنێوان ئەوەی گرێبەندوانەکە بەگوێرەی گرێبەندەکە دەیدات و ئەوەی وەریدەگرێ. خۆی شتێکی مادییە بەپێچەوانەی قۆستنەوە کە شتێکی دەروونییە، دەگونجێ مافخوران ئەنجامە مادیەکەی بێ، بەوەی کەسێك لاوازیی ئیرادەی کەسێکیتر بەهۆی پێویستیی زۆری[1] یان هەڵەشەییەکی زەق[2] یان ئارەزوویەکی هەڵچوو[3] یان دەسەڵاتێکی ئەدەبی یان بێئەزموونیەوە بقۆزێتەوە و بەوە وای لێبکات گرێبەندێك لە بەرژەوەندیی ئەو یان بەرژەوەندیی کەسێکیتر ئیمزا بکا، کە گرێبەندەکە لەکاتی ئیمزاکردنیدا ناهاوسەنگیەکی زەقی تێدایە لەنێوان ئەوەی بەو پێیە پێوەی پابەند دەبێ و ئەو سوودە ماددی یان ئەدەبییەی بەدەستی دێنێ، بەشێوەیەك ئیمزاکردنی خۆنەبانکردنێکی ئاشکرایە لە شەرەفی مامەڵەکردن و نیەتپاکی.

هەروەها لەسەر ئەوە رێك کەوتن کە بەتەنها مافخوران لەرووی بوونی بە خەوشێکی سەربەخۆ وەك پاساوێك بۆ داواکردنی هەڵوەشاندنەوەی گرێبەندەکە

---

[1] وەك زەرورەت ولیە.

[2] لەدەستدانی بیرکردنەوە لە ئاکامی شتەکان.

[3] مەیلی دەروون وەك پەیوەندیی نێوان نێر و مێ.

حسابی بۆ ناکرێ، لەسەر ئەو بناغەیەی کە قابیل بە بەتاڵکردنەوە، یان وەستێنراو یان نالازم یان بەتاڵ بێ بەگوێرەی ئەو جیاوازیانەی لە گونجاندنی ئەسەرەکەیدا هەن ئەگەر زۆرلێکردن یان خەڵەتاندن یان قۆستنەوەی پێش نەکەوتبوو، جگە لەو حاڵەتانەی یاسا هەڵاوێری کردوون، وەك ئەوەی مافخوراو نەشیاو یان شیان ناتەواو بێ، یان شوێن (محل)ی گرێبەندەکە لە ماڵی دەوڵەت یان کەسە مەعنەوییە گشتیەکانیتر بێ، یان هی وەقف بێ، لەم حاڵەتانە و هاوشێوەکانیدا حساب بۆ مافخورانی زەق لە ڕووی کاریگەرییەوە دەکرێ، ئەگەرچی زۆرلێکردن یان خەڵەتاندن یان قۆستنەوەیشی لەپێشەوە نەهاتووە.

لەم ڕوانگەوە لە پێکهێنانی خەوشی ڕەزامەندیدا هەریەك لە قۆستنەوە و مافخوران ئەویتریان تەواو دەکا، بەڵام جیاوازیان ئەوەیە لە هەموو حاڵەتەکاندا قۆستنەوە بەتەنها بەهیچ شێوەیەك کاریگەری لەسەر ڕەزامەندی (ئیرادە) و لەوێیشەوە لەسەر گرێبەندەکە نابێ، بەڵکو تەنها مافخوران بەس دەبێ ئەگەر مافخورانەکە گەورە بوو، ئەویش لە هەندێ حاڵەتی تایبەتدا کە یاسا دیاری کردوون، وەك باسمان کرد.

بەڵام بەهۆی تێکەڵکردن لە نێوان (فعل و انفعال)دا هەڵە لە دیاریکردنی سروشتی ئەم خەوشەدا ڕوویداوە هاوشێوەی دوو خەوشەکەیتری ڕابردوو (زۆرلێکردن و خەڵەتاندن)، چونکە قۆستنەوە کردەوەی بقۆز (المستغَل) و سیفەتێکە بەوەوە بەندە، مافخورانیش سیفەتی شوێنی گرێبەندەکەیە، لەبەرئەوەی بریتییە لە ناهاوسەنگی و ناهاوتایی لەنێوان دوو باتییەکەدا، لەکاتێکدا خەوش سیفەتێکە بە ڕەزامەندی (یان ئیرادە)ی کەسی قۆزراوە (المستغِل)، واتە لایەنی مافخوراوەوە، بەندە.

لە ترازووی مەنتیق و عەقڵدا ناشێ سیفەتی یەکێك لە دوو لایەنەکە لە گرێبەندکردندا عەیب بێ بۆ لایەنەکەیتر (ڕەزامەندی یان ئیرادەی)، لەبەرئەوەی هەر سیفەتێك عەرەزێکە بە شتێکیتر (جەوهەر)ەوە بەندە، مەحاڵیشە یەك عەرەز لە دەرەوەی زەینی مرۆڤ لە دوو شوێندا بێ.

راستی ئەوەیە وەك باسمان کرد ناونیشانەکە بریتی بێ لاوازیی قۆزراوە (لاوازیی ئیرادەی مافخوراوی قۆزراوە)، سەرچاوەی ئەم لاوازییەش هەمەجۆرە، لەوانە بێئەزموونی یان پێویستی زۆر یان دەسەلاتی ئەدەبی یان هەڵەشەییەکی زەق یان ئارەزوویەکی هەڵچوو و ئەو شتانە.

**پەیوەندیی قۆستنەوە بە عەیبەکانی رابردووەوە:**

قۆستنەوە لە هەڵە یان خەڵەتاندن یان زۆرلێکردن سەربەخۆ نیە، بەڵکو سەرباری ئەوەی بە سەربەخۆ لەو دانراوە بەلام زۆر لێی نزیك دەبێتەوە، لە حاڵەتی ئارەزووی هەڵچوودا لە زۆرلێکردن نزیك دەبێتەوە، لە حاڵەتی هەڵەشەیی زەقدا لە هەڵە و خەڵەتاندن نزیك دەبێتەوە. لەبەر ئەم لێکنزیکبوونەوەیە دەبینین هەندێ یاسا لەکاتی لێکۆڵینەوە لە مافخوران باسیان لە قۆستنەوە نەکردوە، لەو یاسایانە یاسای مەدەنیی ئوردنی بەرکار (م/١٤٩) و تونسی (فەسڵی ٦١) و مۆریتانی (م/٧٦).

سەرباری ئەم لێکنزیکییە قۆستنەوە بە دوو جیاکەرەوە لە باقیی عەیبەکان جیاوازە:

یەکەمیان: ماوەی خستنی دەعوا لە باقیی عەیبەکانیتردا سێ ساڵە[1] لە مێژووی ئاشکرابوونی هەڵە و خەڵەتاندن و نەمانی زۆلێکردنەکەوە، لەکاتێکدا ماوەی خستنی دەعوای قۆستنەوە یەك ساڵە لە ئیمزاکردنی گرێبەندەوە وەك لە یاسای مەدەنیی عێراقی (م/١٢٥)، هەروەها لە مێژووی نەمانی کاریگەریی هەوەس یان دەسەلاتە، وەك لە یاسای کوێتیدا (م/١٦١)[2].

---

[1] ئەم یاسا مەدەنیانە ئەو ئاراستەیان وەرگرتووە: مەدەنیی میسری (م/١٤٠)، یەمەنی (م/١٨١)، کوێتی (م/١٨٣)، قەتەری (م/١٦١)، لیبی (م/١٤٠)، ساڵێکە لە یاسای مەدەنیی سوریدا (م/١٤١)، وادیارە ئەم هەمان ئاراستەی یاسای مەدەنیی عێراقیشە (م/١٢٥)، هەروەها دە ساڵیش وەك یاسای مەدەنی لوبنانی (م/٢٣٥).

[2] یاسادانەری کوێتی چاکی کردوە کاتێ لە (م/١٦١) ئەم وردەکاریەی باس کردوە: "دەعوای قۆستنەوە پاش ساڵێك لە ئیمزاکردنی رێکەوتن دەکەوێ، بەلام ئەگەر ئیمزاکردنی رێکەوتنەکە ←

فەلسەفەی ئەم جیاوازییە لە ماوەی کەوتنی دەعـوادا ئـارەزووی یاسـادانەرە بـۆ یەکلاکردنەوەی ئەو کێشەیەی بەهۆی قۆستنەوەوە سەری هەڵداوە لەنزیکترین کاتدا، تا چارەنووسی گرێبەندەکە بە هەڵواسراوی بـە دەعوایەکدا نەمێنێتـەوە کـە بـواری ئیدیعاکردن تێیدا فراوان دەبێ[1].

دووەمیـان: مـافی مـافخوراو لـە بەتاڵکردنـەوە یـان کەمکردنـەوەی پابەنـدی لـە قۆستنەوەدا، لەکاتێکدا لە یاساکاندا بڕیـاردەر لـە بـاقیی عەیبـەکانیتردا تـەنها مـافی بەتاڵکردنەوەیە.

**رەگەزەکانی قۆستنەوە**

یاساناسـان[2] هـەمان ڕێچـکەی پێشـوویان لـە دوانینـەبوونی ڕەگـەزەکان لـە ساختەکاری و زۆرلێکردندا گرتۆتەبەر و گوتویانە ڕەگەزەکانی قۆستنەوەیش دووانن:

١- ڕەگەزی ماددی (بابەتی): تێکچوونی بەرانبەرییە لەنێوان پابەندیەکانی هەردوو گرێبەندواندا زۆر بەخراپی. مەزەندەکردنی ڕادەی ئەو خراپییەیش بۆ مەزەندەی قازیی بابەتەکە بەجێهێڵراوە.

٢- ڕەگەزی مەعنەوی (دەروونی): قۆستنەوەی گرێبەندوانە بـۆ ئـەو لاوازی یـان ناتەواویەی لە مافخوراودا هەیـە وەك ئـارەزووی هەڵچوو و هەڵەشـەیی زەق و بـاقیی حاڵەتە دەروونیەکان.

ئەم دابەشکردنە دووانینەیە بۆ ڕەگەزەکانی قۆستنەوە لەم ڕووانەوە عەیبدارە:

---

بەرەنجامی قۆستنەوەی ئارەوویەکی سەرچڵ یان سەتوەیەکی ئەدەبی بوو ئەوا تێپەڕبوونی ماوەی سالکە لە مێژووی نەمانی کاریگەریی ئارەزووەکە یان سەتوەکەوە دەستپێدەکا، بەڵام بەهەرحاڵ دەعواکە پاش تێپەڕبوونی (١٥) ساڵ بەسەر ئیمزاکردنی گرێبەندەکەدا دەکەوێ".

[1] بڕوانە: الأستاذ إسماعيل غانم، المرجع السابق، ١٨٦/١.

[2] لەوانە مامۆستا السنهوري، الوسيط ٣٩٣/١، والأستاذ حسن ننون، سەرچاوەی پێشوو، ص٤١٣، والأستاذ عبدالمنعم البدراوي، سەرچاوەی پێشوو، ٨٧/١، والأستاذ أبو ستيت، ٦٢/١، والأستاذ إسماعيل غانم، ٢٢٣/١، والأستاذ فرج صدة، سەرچاوەی پێشوو، ص٢٢٤، والأستاذ حجازي، ٣١٢/١، والأستاذ عبدالمجيد الحكيم، سەرچاوەی پێشوو، ١٧٣/١.

أ- تێکچوونی هاوسەنگی دوای ئیمزاکردنی رێکەوتن روودەدات، ئیتر چۆن دەکرێتە رەگەزی گرێبەندەکە، لەکاتێکدا رەگەزی هەر شتێك ئەوەیە شتەکە لەسەری دەوەستێ و بەر لە بوونی شتەکە هەیە، جا چ رەگەزێکی مەعنەوی بێ وەك قەسدی جینائی لە تاواندا، یان ماددی بێ وەك بەشەکان (رەگەزەکان)ی ئۆتۆمبێل کە لێیان دروست کراوە.

ب- رەگەزی مەعنەوی (دەروونی) مەبەستیان پێی خودی قۆستنەوە بووە، ئیتر چۆن قۆستنەوە رەگەزی قۆستنەوەدەبێ لەگەڵ ئەوەی رەگەزی شت ئەوەیە بوونی شتەکە لەسەری دەوەستێ و بەر لەو هەیە، جا چۆن شتێك دەبێتە رەگەز بۆ خۆی؟

ج- لە ترازووی مەنتیقی یاساییدا راست ئەوەیە رەگەزەکانی قۆستنەوە ئەم چوارەی خوارەوەن:

یەکەم: بقۆز (المستغِل): ئەو گرێبەندوانەیە لاوازیی لایەنەکەیتر دەقۆزێتەوە، لە مەرجەکانی:

١- یەکێك لە دوو گرێبەندوانەکە بێ جا چ ئەسڵی بێ یان نوێنەر.

٢- نیازی بەدەستهێنانی ئامانجێکی ناڕەوا بووبێ بۆ بەرژەوەندیی خۆی یان بەرژەوەندیی کەسێکیتر.

٣- قۆستنەوە پاڵنەر بێ بۆ ئیمزاکردنی گرێبەندە ناهاوسەنگەکە.

دووەم- قۆزراوە (المستغَل): یان مافخوراو (المغبون)، ئەو گرێبەندوانەیە کە بۆشی وەرگیراوە و لاوازیەکەی قۆزراوەتەوە، لە مەرجەکانی:

١- یەکێك بێ لە دوو گرێبەندوانەکە، جا ئەسڵی بێ یان نوێنەر.

٢- لاوازیەکی دەروونی تێدا بێ کە بکرێ لەلایەن کەسانیترەوە بقۆزرێتەوە، ئیتر هۆی ئەو لاوازییە هەرچی بووبێ.

٣- لەکاتی بەستنی گرێبەندەکەدا تووشی مافخورانێکی گەورە ببێ.

**سێیەم- تێدا قۆزراوە (المستغَل فیه) (شوێنی گرێبەند): لە مەرجەکانی:**

١- بەرانبەرێکی هەبێ بەوەی گرێبەندەکە لە گرێبەندی ئاڵوگۆڕ بێ، بەپێچەوانەی هەندێ یاسای وەك یاسای مەدەنی عێراقیی بەرکار (م/١٢٥)، کە گشتاندویەتی بەشێوەیەك بەخشین (تەبەرووع)یش بگرێتەوە و دەڵێ (أن للمغبون خلال سنة طلب رفع الغبن عنه إلى الحد المعقول في المعاوضات فإذا كان التصرف تبرعاً له في هذه المدة أن ينقضه). (واتە: مافخوراو بۆی هەیە لە ماوەی ساڵێکدا داوای نەهێشتنی مافخوران بەرز بکاتەوە بۆ ئاستی ماقوڵ لە ئاڵوگۆڕەکاندا، ئەگەر رەفتارەکە بەخشین بوو بۆی هەیە لەو ماوەیەدا هەڵیبوەشێنێتەوە).

٢- شوێن لە گرێبەندەکاندا نرخ دیاریکراو بێ و لە گرێبەندە شیمانەییەکان نەبێ.

گرێبەندی شیمانەیی (یان گرێبەندی نادڵنیا) ئەوەیە ئەندازەی پابەندیەکانی لایەنێکیان لەسەر رووداوێکی نادڵنیا بوەستێ کە دەشێ رادەی ئەو پابەندیانە زیاد یان کەم بکا، وەك گرێبەندی بیمەکردن یان فرۆشتن بەرانبەر مووچەیەکی دیاریکراو بەدرێژایی ژیان.

لەبەرئەوەی سروشتی گرێبەندی شیمانەیی ئەگەری مافخورانی یەکێك لە دوولایەنەکەی لێ چاوەڕوان دەکرێ، بۆیە نابێ بکرێتە بەڵگە لەسەر مافی هەڵوەشاندنەوە یان هەموارکردنی پابەندی، لەبەرئەوەی هەر لەکاتی بەستنیدا ئەگەری قازانج و زەرەری بۆ هەریەك لە دوو لایەنەکەی تێدا بووە، پێشوەخت نازانرێ کامیان براوە و کامیان دۆڕاوە[1].

**چوارەم: ئەو لاوازییەی بەهۆیەوە قۆستنەوە روودەدا:** هەموو حاڵەتێکە بکرێ کەسێك بۆ بەرژەوەندیی خۆی یان بەرژەوەندیی کەسێکیتر بیقۆزێتەوە، لە وێنەکانی:

---

[1] بڕوانە: الأستاذ مرقس، سەرچاوەی پێشوو، ص٤٨.

أ- پێویستی (حاڵەتی زەرورەت)، وەك ئەوەی پزیشکێك پێویستیی نەخۆش بۆ نەشتەرگەریەك بقۆزێتەوە و داوای پارەیەکی زۆری لێبکا. ئاشکرایە پزیشکەکە لایەنێکی بەهێزە و نەخۆشەکە لایەنێکی لاوازە، لەبەرئەوەی پێویستی بە نەشتەرگەریەکە هەیە.

ب- ئارەزووی هەڵچوو (ئارەزوویەکی زۆر) بۆ دەستکەوتنی کەسێك یان شتێك بەهەر نرخێك بووبێ.

ج- بێئەزموونی و نەشارەزایی لە مامەڵە داراییەکاندا.

د- کەمفامی لەبەر گێلی، یان بێئاگایی یان شتێکی لەو شێوەیە.

**مافخورانی سادە و مافخورانی دژوار:**

خۆپاراستن لە مافخوران بە وێنە جیاوازەکانیەوە کارێکی زەحمەتە، لەبەرئەوە شەرعناسان و یاساناسان لەسەر زەرورەتی چاوپۆشیکردن لە مافخورانی سادە و وەستان تەنها لەسەر مافخورانی دژوار کۆدەنگییان هەیە، بەڵام لەبارەی پێوەری لێك جیاکردنەوەیان جیاوازن، دەکرێ ئەو پێوەرەیش بۆ دوو ئاراستە بگێڕدرێتەوە کە بریتین لە: ماددی و کەسی.

**یەکەم- ئاراستەی ماددی:** بەو شێوەیە کە لە مەزەندەکردنی مافخوراندا تەماشای بەهای ئابووریی شوێنی رەفتارەکە دەکرێ لە خودی خۆیدا بەپێی یاسا ئابوورییە بازرگانیەکان، لەوانە یاسای خستنەروو و خواست. مافخوران لەبەر تیشکی ئەم ئاراستەیەدا خەوشێکە لە گرێبەندەکەدا نەك لە ئیرادەدا و پلەی تێکچوونی هاوسەنگیەکەیش بە ژمارە بەپێی رێژەی نێوان بەهای شتەکە و نرخەکەی دیاری دەکرێ، کە دەشێ بەم هۆیەوە لەسەر نابەرانبەریەکە لە خودی خۆیدا بوەستین بەبێ گەڕان بەدوای هۆی نابەرانبەریەکە و وردبوونەوە لە ئیرادەی لایەنە مافخوراوەکە و لە

مەبەستی لایەنە مافخۆرەکە، لەم روانگەوە مافخوران لەخۆیدا بەهۆیەك دادەنرێ بۆ تانەدان لە گرێبەندەکە لەسەر بنچینەی ناهاوسەنگی لەنێوان دوو باتیەکەدا[1].

**دووەم- ئاراستەی کەسی**[2]: لە ترازووی ئەم ئاراستەیەدا مەحەك لە مەزەندەکردنی مافخورانەکەدا بەها شەخسیەکەیە، کە بەهای شتەکەیە لە دیدی گرێبەندوانەکەدا، چونکە لەوانەیە شتەکە خۆی لەخۆیدا بێنرخ بێ بەڵام لە چاوی ئەو کەسەی لەبەر هەندێ ئیعتیباراتی پەیوەندار بە هەلومەرجی کەسیی خۆی دەیەوێ بەدەستی بێنێ گەورە بێ، وەك ئەوەی ئەو شتە بەلای ئەوەوە یاداوەریی مێژوویی یان خێزانی پیشان بدات، یان ئارەزوویەکی خۆی پێ تێر بکات و ئەو جۆرە شتانە.

لەم جۆرە حاڵەت و هەلومەرجانەدا مافخورانێك لەئارادا نابێ کە پاساو بێ بۆ داوای بەتاڵکردنەوەی گرێبەندەکە یان کەمکردنەوەی پابەندیەکە مەگەر پارەیەکی زیاتر لە نرخە کەسینەکەی دابێ. دیارە کابرا شتی واناکا مەگەر لە وەهمدا بژی یان لە نرخەکەیدا خەڵەتێنرابێ یان ناچار بووبێ ئەو گرێبەندە بکا، ئەمەیش روونادا مەگەر لە ئەنجامی هەڵەشەیی یان ئارەزوو یان سەرەڕۆیی یان بێئەزموونی یان پێویستیەکی گەورەوە. لەم روانگەوە مافخوران نابێتە عەیبێکی سەربەخۆ، بەڵکو پێویستە قۆستنەوە یان خەڵەتاندنێکی لەپێشەوە بێ، مەزەندەکردنی رادەی سەختی تێکچوونی هاوسەنگیەکەیش بۆ دەسەڵاتی مەزەندەکردنی قازی بەجێهێڵراوە کە لەوەدا پشت بە کەسانی شارەزا دەبەستێ.

یاسادانانە نوێکان پەیڕەوییان لەم وێنەگرتنە دەروونییە (شەخسی)یەی مافخوران کردوە و لەوەدا کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی فیقهی رێبازە ئیشتراکیەکان، کە بانگەشەیان بۆ پاراستنی لایەنی لاواز لە گرێبەندەکەدا کردوە، هەروەها وەك کارکردن بە بنەماکانی ئەخلاق پاش پێشکەوتنی هزرە کۆمەڵایەتیەکان[3].

---

[1] البدرلوي، سەرچاوەی پێشوو، ٢٨٨/١.

[2] السنهوري، الوسيط، ٣٨٧/١.

[3] إسماعيل غانم، النظرية العامة للالتزام، مصادر الالتزام، ٢٦٦/١.

لە باشیەکانی ئەم ئاراستەیە ئەوەیە پێوەرەکە کەسی و بەکێش (مرن)ـە نەك ژمارەیی و حەدی کە لەوانەیە لەگەڵ دادپەروەری نەگونجێ وەك لە تیۆری مادیدا، ئەمە جگە لە گۆڕانی مافخورانی دژوار (فادح) بۆ تیۆرێکی گشتی کە بەسەر هەموو گرێبەندەکاندا پراکتیزە ببێ، بە بەخشین و گرێبەندە بەها دیاریکراوەکان (شیمانەییەکان)یشەوە، پاشان ئەم ئاراستە کەسییە کارکردن بە تاککردنەوە و لەبەرچاوگرتنی بارودۆخی تایبەت لە هەموو بابەتێکی تێدایە.

**سەلماندنی قۆستنەوە:**

لە روانگەی رێسای (الأصل في الصفات العارضة العدم)[1] (واتە: ئەسڵ لە سیفەتە لابەلاییەکاندا نەبوونە) پێویستە ئەو کەسەی بانگەشەی ئەوە دەکا (ئیستیغلال) کراوە بەڵگە لەسەر دوو شت بێنێتەوە:

یەکەمیان هێنانەوەی بەڵگە لەسەر ناهاوتایی و لاسەنگیی زەق لەنێوان پابەندیی هەردوو لایەندا.

دووەمیشیان لەسەر قۆستنەوە، واتە ئیستیغلالکردنی ئەو لاوازییەی تێیدایە.

شایانی باسە هەردوو سەلماندنەکە دەکرێ بە هەموو رێگەیەك بکرێن بە ئاماژە یاریدەدەرەکانیشەوە (القرائن)، لەبەرئەوەی بابەتەکە پەیوەندی بە سەلماندنی رووداوگەلێکی مادییەوە هەیە[2].

**سزای قۆستنەوە:**

ئەگەر پایە و مەرجەکانی لاوازیی قۆزراوە هەبوون و بەربەستەکانی نەبوون ئەم ئەسەرانەی لێدەکەوێتەوە:

**یەکەم: مافخوراو مافی بەرزکردنەوەی یەکێك لەم دوو داوایەی هەیە (داوای بەتاڵکردنەوە یان داوای کەمکردنەوە):**

---

(١) گۆڤاری: الأحكام العدلية، مادەی (٩).

(٢) البدراوي، سەرچاوەی پێشوو، ١/٢٩٥.

أ- ئەگەر داوای کەمکردنەوەی پابەندی بەرز کردەوە، قازی مافی نیە گوێ لە داوای بەتاڵکردنەوە بگرێت و حوکمی پێ بدات، لەبەرئەوەی ئەوکاتە حوکم بۆ داواکار دەدا بە زیاتر لەوەی لە داواکەیدا داوای کردوە، ئەمەیش دروست نیە.

شایانی باسە هیچ مەرج نیە کەمکردنەوە بگاتە رادەی نەهێشتنی مافخورانەکە، بەڵکو نەهێشتنی دژواریی مافخورانەکە بەسە[1].

لە یاسای مەدەنیی عێراقیدا[2] رێگە بەقازی دراوە لە ماوەی ساڵێکدا هەڵیبوەشێنێتەوە ئەگەر رەفتارەکە بەخشین بوو. هەروەها ئەگەر فرۆشتنەکە بە زیادکردنی ئاشکرا و بەگوێرەی یاسا بوویێ، نابێ بەناوی مافخورانەوە تانە بدرێ با مافخورانەکە دژواریش بێ[3].

ب- ئەگەر مافخورلو داوای بەتاڵکردنەوەی بەرز کردەوە قازی بۆی هەیە حوکمی کەمکردنەوە (ی پابەندی) بدا ئەگەر پێی وابوو ئەوە بەسە بۆ نەهێشتنی ئەسەری قۆستنەوەکە تا لایەنەکەیتر خۆی لابدا لە دەعوای بەتاڵکردنەوە، ئەگەر دەرخستەیەکی وا خرایە بەردەمی کە قازی پێی وابوو بەسە بۆ نەهێشتنی مافخورانەکە[4]. ئەویش بۆ ئەوەی بەپێی توانا کار بۆ سەقامگیریی مامەڵەکان بکرێ.

لە هەردوو دەعواکەدا پێویستە لە ماوەی ساڵێك لە مێژووی ئیمزاکردنی گرێبەندەکە، هەروەها لە نەمانی کاریگەریی ئارەزوو یان دەسەڵاتە ئەدەبیەکەوە لە حاڵەتێکدا لاوازیی قۆزراوەکە بەهۆی ئەو دووانەوە بوویێ، داواکە بەرز بکرێتەوە. سەبارەت بە نەشیاو و شیان ناتەواویش، داواکە لە مێژووی تەواوکردنی شیانەوە بەرز دەکرێتەوە.

---

(1) إسماعیل غانم، سەرچاوەی پێشوو، ١/٢٣٢.

(2) مادەی (١٤٥).

(3) مادەی (٤٢٧) یاسای مەدەنیی میسریی بەرکار.

(4) یاسای مەدەنیی میسری (م/١٢٩).

لە هەموو بارەکاندا داواکە بە تێپەڕبوونی پازدە ساڵ بەسەر ئیمزاکردنی گرێبەندەکەدا دەکەوێ[1].

**دووەم– لە هەندێ یاسادانانانادا قۆستنەوە لە هۆیەکانی بەتاڵیی ڕەهای گرێبەند دادەنرێ وەك لە یاسای مەدەنیی ئەڵمانیدا[2]**، ئەویش لەبەر نەگونجانی لەگەڵ ئادابی گشتیدا[3].

ئەم ئاراستەیە لەگەڵ هەندێ مەزەبی ئیسلامیدا کۆکە وەك مەزەبی زاهیری، ئێمەیش پشتگیریی ئەم ئاراستەیە دەکەین لەبەرئەوەی دەگەڕێتەوە بۆ بیرۆکەی پیسبوون (التلوث)، بۆیە دروست نیە ئەوەی هۆکار (مسبب)ی بووە سوودی لێ ببینێ، هەروەها لەبەرئەوەی لە بابی گزی (غش)ە و لە شەریعەت و یاسادا تاوانە.

سێیەم– لە هەندێ یاسادا وەك یاسای سزاکانی عێراقی بەرکار (مادەی ٤٥٨) قۆستنەوە تاوانێکە سزای لەسەر دەدرێ ئەگەر قۆزراوەکە ناکام بوو. بەدیدی ئێمە ئەم ئاراستەیە پێکاویەتی، لەبەرئەوەی یارمەتیی قەڵاچۆکردنی تاوانە ئابوورییەکان دەدا، هەروەها حوکمێکە دادپەروەری و عەقڵ و مەنتیقی یاسایی پشتگیری دەکەن. یاسادانەری عێراقی چاکی کردوە کە ئەم ئاراستەیەی پەسەند کردوە و بانگی باقیی یاساکانیتری دنیا دەکەین چاوی لێ بکەن، تا ڕێگە لە هەر کەسێك بگرن بەخەیاڵیدا بێ ئەم جۆرە تاوانە ئابوورییانە ئەنجام بدات، کە هەم بۆ بەکاریەر زیانبەخش و هەم پێچەوانەی ئەخلاقیشن.

ئەمەیش دەقی مادەکەیە:

"١– بە بەندکردن سزا دەدرێ هەرکەس پێویستیی ناکامێك کە هەژدە ساڵی تەواو نەکردبێ بەدەرفەت دەزانێت، ئارەزوو یان بێئەزموونیی ئەو دەقۆزێتەوە و وای لێدەکا زیان بە بەرژەوەندیی خۆی یان کەسێکیتر بگەیەنێ لەسەر ماڵ یان

---

[1] یاسای مەدەنیی کوێتیی بەرکار (م/١٦٦).

[2] مادەی (١٣٨).

[3] السنهوري، الوسيط، ٤٠١/١.

قەواڵەیەکی چەسپاو لە قەرز یان ئەستۆپاکینامە (مخالصة)یەکدا، یان لە هەڵوەشاندنەوەی ئەو قەواڵەیە یاخود هەموارکردنی. هەریەك لە: شێت و دەبەنگ و حیجرلەسەر و ئەو کەسەی پاش گەیشتنی بە هەژدە ساڵیش حوکمی بەردەوامبوونی چاودێریکردنی بۆ دەرچووە، حوکمی ناکامی هەیە.

٢- سزاکە بەندکردن دەبێ بۆ ماوەیەك لە حەوت ساڵ زیاتر نەبێ، یان حەپسکردن ئەگەر ئەنجامدەری تاوانەکە بەخێوکەر یان چاودێر یان سەرپەرشتی تاوان بەرانبەرکراو بێ، یان بەهەر سیفەتێك لە چاودێریکردنی بەرژەوەندیەکانی بەرپرس کرابێ، جا ئەوە چ بەگوێرەی یاسا بووبێ یان بەگوێرەی حوکمێك یان بە رێکەوتنێکی تایبەت".

بەم ئەندازەیە کۆتایی بە باسکردنی قۆستنەوە دێنین[1].

لە کۆتاییدا بەپێویستی دەزانم ئاماژە بە خاڵێکی گرنگ بکەم، ئەویش ئەوەیە هەریەك لە خەڵەتاندن و زۆرلێکردن و قۆستنەوە دەچنە خانەی کاری نارەواوە کە دەچێتە ژێر خانەی ویستی تاکلایەنە، وەك پاشتر باس دەکرێ.

بۆیە دەبوو ئەم سێ شتە لە بابەتی کاری نارەوادا باس بکرێن، بەڵام لەبەرئەوەی ئەم کارانە لەخۆیاندا هۆ نین بۆ پابەندیەکان بەڵکو وەك بەدرێژی باسمان کرد، هۆ راستەقینەکان بەرهۆکانیانە کە بریتین لە هەڵە لە خەڵەتاندندا، بیم (یان ترس) لە زۆرلێکردندا و لاوازی لە قۆستنەوەدا، لەبەرئەوە بینیمان لۆژیکی یاسایی دەخوازێ لە بابەتی خەوشەکانی رەزامەندی (ئیرادە)دا لێی بکۆڵرێتەوە.

---

[1] لەم بابەتەدا بڕوانە ئەم سەرچاوانە: یاسای مەدەنیی عێراقی (م/١٢٥)، میسری (م/١٢٩)، ئوردنی (م/١٢٩)، یەمەنی (م/١٨٣)، لوبنانی (م/٢١٤)، تونسی (فەسڵی ٦١)، جەزائیری (م/٩٠)، مۆریتانی (م/٧٦)، فەرەنسی (م/١٦٧٤).

## خواستی دووەم:
## رەفتاری گوفتاریانەی تاکەکەسی

رەفتاری گوفتاریانەی تاکەکەسی ئەوەیە تێیدا گوزارشتکردن لە ئیرادەی نادیار بە وشە دەبێ، بەزۆری ئەمە یان جێگرەوەی ئەمەیە وەك نووسین و ئاماژەی تێگەیەنەر، لەرووی ئاسەواریشەوە سێ جۆرە: تەنیا پەیداکەری پابەندییە، یان بخەری پابەندیی بەرکارە، یان پەیداکەر و بخەری پابەندیەکانە لە یەك کاتدا و بەیەك دەربڕین.

لەم رووەوە، لێکۆڵینەوە لە بابەتەکە دەخوازێ بەسەر سێ لقدا دابەش بکرێ، یەکەمیان بۆ یەکەم، دووەمیان بۆ دووەم و سێیەمیان بۆ سێیەم تەرخان دەکرێ.

### لقی یەکەم:
### رەفتاری گوفتاریانەی تاکەکەسی
### کە دەبێتە هۆی پابەندی

ئەوە روونە هەموو بەخشینەکان لەو هۆیانەن کە پابەندی لە ئەستۆی بەخشەردا دروست دەکەن، لەبەرئەوەی بە ویستی تاکلایەنەی خۆی و لەبارێکدا ئەو کەسێکی بالغ و ژیر و هەڵبژێرە، بەبێ بەرامبەر خۆی پابەند دەکا، مەگەر پێشتر پابەند بووبێ. لە دیارترین وێنەکانی بەخشین بە ماڵیش بریتین لە: بەخشین، وەسێت، مۆڵەتدان بە رەفتاری وەستێنراو، بەڵێندان بە خەڵات و ئەو شتانە وەك لەم کورتەیەی خوارەوە:

**یەکەم: بەخشین (الهبة):**

بەخشین رەفتارێکی گوفتاریی تاکەکەسییە لە حاڵەتی ژیاندا، بریتییە لە کردنی ماڵێك بە مولکی کەسێکیتر بەبێ بەرانبەر.

**پایەکانی بەخشین:**

لەو پێناسەوە تێدەگەین پایەکانی چوارن:

١- دارشتە (الصیغە): تەنها بریتییە لە ئیجاب واتە راگەیاندنی پێدان، وەك ئەوەی بەخشەر بڵێ: ئەمەم بەخشی بە فلان کەس یان فلان لایەن.

٢- بەخشەر: کەسێکی سروشتییە و مەرجە شیانی بەخشین (تبرع)ی هەبێ (کە بریتین لە: باڵقبوون، ژیری و هەڵبژاردن).

٣- بەخشراو: هەمووماڵێکی بەکەڵك و بەردەست (متقوم)ە قابیل بە مامەڵەپێوەکردن و کردنە موڵك بێ و موڵکی بەخشەرەکە بێ.

٤- پێبەخشراو: ئەو کەسەیە ماڵەکەی پێ دەبەخشرێ، دەشکرێ لەکاتی بەخشینەکەدا وجودی نەبێ، بوونی تەنها لەکاتی جێبەجێکردنەکەدا مەرجە.

هەروەها دەکرێ کەسێکی مەعنەوی بێ وەك دامەزراوەیەك کە سوودی گشتی هەبێ، وەك مزگەوت و قوتابخانە و نەخۆشخانە و ئەو جۆرە شتانە.

**گونجاندنی (التکییف):**

بەخشین گونجاندنی بۆ دەکرێ بەوەی رەفتارێکی شەرعیی یاسایی تاکەکەسیی نالازمە بەر لە وەرگرتن، بەخشەر بۆی هەیە لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا لە بەخشینەکەی پاشگەز ببێتەوە:

١- بە رەزامەندیی پێبەخشراو.

٢- ئەگەر پێبەخشراو ئەوە تێکبدات کە بەرانبەر بەخشەر پێویست بوو لەسەری.

٣- لە حاڵەتی دەستکورتی و پێویستیی بەخشەر بە ماڵە بەخشراوەکە.

٤- ئەگەر خوا منداڵێکی پێ بەخشی کە لەکاتی بەخشینەکەدا نەیبوو و ئەو نەبوونەیش پاڵنەر بوو بۆ بەخشینەکە.

٥- ئەگەر پێبەخشراو بەخشەرەکەی کوشت، ئەویش بەپێوانەکردنی لەسەر کوشتنی میراتگر بۆ میراتدەرەکەی، کە (ئەو تاوانە) لە میراتەکە بێبەری دەکا.

٦- ئەگەر بەخشینەکە لەبەر ئامانجێك بوو نەهاتبووە دی، وەك ژنێك مارەییە داواخراوەکەی دەبەخشێتە مێردەکەی بەمەبەستی ئەوەی ژیانی هاوسەرییان بە خۆشەویستی و رێزی دووسەرەوە بەردەوام بێ، بەڵام پاشان مێردەکەی تەڵاقی بدات.

**رێگرەکانی پاشگەزبوونەوە:**

لەم حاڵەتانەدا رێگە بە پەشیمانبوونەوە لە بەخشین نادرێ:

١- روودانی زیادەکاری کە زیادبوونی بەهای ماڵە بەخشراوەکە واجب دەکا، وەك نۆژەنکردنەوەی خانوویەکی بەخشراو.

٢- مردنی یەکێکیان (بەخشەر یان پێبەخشراو).

٣- فرۆشتنی ماڵە بەخشراوەکە لەلایەن پێبەخشراوەوە.

٤- ئەگەر بەخشینەکە لە یەکێك لە ژن و مێردەوە بوو بە ئەویتریان.

٥- ئەگەر بەخشراوەکە فەوتا یان بەکار برا.

٦- بەخشینی قەرزی قەرزارەکەی لەلایەن قەرزدەرەوە[1].

**ئاسەوارەکانی بەخشین:**

هەر بە راگەیاندنی بەخشین لەلایەن بەخشەرەوە، واتە ئیجاب، دارشتەی بەخشین پابەندی لە گەردنی بەخشەردا دروست دەکا بەوەی بەخشراوەکە رادەستی پێبەخشراو بکا، بەڵام تا پاش وەرگرتنی شتەکە خاوەندارێتییەکەی ناگوێزرێتەوە، مەبەست لە مادەی (٦٠٣)ی یاسای مەدەنیی عێراقیی بەرکار ئەم مانایەیە کە دەڵێ: (لا تتم الهبة في المنقول إلا بالقبض). (واتە: بەخشین لە گوێزراوەدا بە وەرگرتن نەبێ تەواو نابێ). واتە ئاسەوارەکانی تەواو نابن، بەڵکو هەندێکیان دێنەدی کە بریتییە لە پابەندی و هەندێکیتریان نایەنەدی کە بریتییە لە ماف (مافی خاوەندارێتی).

---

[1] یاسای مەدەنی عێراقی (م/٦٢٠-٦٢٣) کە لە فیقهی ئیسلامی وەرگیراوە.

ڕاڤەکردنی (لاتتم) بە (لاتنعقد) واتە دانامەزرێ لەلایەن شەرحکەرانی یاساکەوە هەڵەیە، لەبەرئەوەی دەربڕینەکە ڕوو لە ئاسەوارەکان دەکا نەك ڕەگەزەکان، بەم شێوەیە سەرجەم گرێبەندە ماڵینەکانیش (بەخشین، قەرز، ڕەهن، ئیعارە و سپاردە) تەنها بە ئیجاب (واتە ئیرادەی تاکەکەسی) دادەمەزرێن و پابەندی لەسەر پێدەر (الموجب) دروست دەکا، بەڵام تا شتەکە وەرنەگیرێ، مولکایەتیەکە ناگوێزرێتەوە [1].

هۆی پابەندی لە بەخشین و باقیی تەبەرعاتەکانیتردا ویستی تاکلایەنەیە، سەرچاوەکەیشی شەرع و یاسایە، فەلسەفەی پابەندیەکان لە هەموو جۆرەکانی بەخشیندا بریتییە لە پاڵنەرە دەرەکیەکە لە گێڕانەوەی چاکە، یان سیلەی ڕەحم، یان بەدەستهێنانی پاداشت لای خوا یان مەبەست و پڕوپاگەندەی ناوبانگ لە دنیادا، یان شتی لەو شێوەیە.

ئەوەی زانایانی یاسا دەڵێن کە لە تەبەڕوعکردندا هۆ نیەتی بەخشینە، مەنتیقی یاسایی و فەلسەفەی کارە ئیرادیەکان ڕەتیدەکاتەوە، لەبەرئەوەی هۆ بەواتای پاڵنەر شتێکی دەرەکییە و ئیرادە دەبزوێنێ و وای لێدەکا مافێکی کەسانیتر بێنێتە کایە و خۆی بە شتێك پابەند دەکا، کە پێشتر پێی پابەند نەبووە.

**دووەم: وەسێتە**

بریتییە لە ڕەفتارکردنێك بە میراتەوە کە دوای مردن جێبەجێ دەبێ و ماناکەی بەخاوەنکردنە بەبێ بەرانبەر [2].

---

[1] لەبابەتی بەخشیندا بڕوانە: یاسای مەدەنیی عێراقی (م/٦٠١-٦٢٥)، ئوردنی (م/٥٥٧-٥٨١)، کوێتی (م/٥٢٤-٥٤٢)، میسری (م/٤٨٦-٥٠٤)، سوری (م/٤٥٤-٤٧٢)، لیبی (م/٤٧٥-٤٩٣)، لوبنانی (م/٥٠٤-٥٢٥).

[2] یاسای باری کەسایەتیی عێراقیی بەرکار، مادەی (٦٤).

**پایەکانی وەسیەت:**

لەو پێناسەیەوە ئەوە وەردەگیرێ کە پایەکانی وەسیەت چوارن و بریتین لە: دارشتە (سیغە)، وەسیەتکار، وەسیەت پێکراو، وەسیەت بۆکراو.

١- سیغە: تەنها پێدان (واتە ئیجابە).

٢- وەسیەتکار (الموصي): هەموو کەسێکی سروشتییە کە خاوەن شیانی فامکردن بێ و هۆشیار و هەڵبژێر (مختار) بێ. لە وەسیەتدا، ئەگەرچی لە بەخشینەکانیشە، شیانی بەخشین (گەیشتن بەتەمەنی پێگەیشتن)[1] نەکراوەتە مەرج، بەڵکو تەنها فامکردن (التمییز) بەسە لەبەر دوو هۆ:

یەکەمیان ئەوەیە وەسیەتکار لەڕووی مادییەوە زیانی پێناگا، لەبەرئەوەی خاوەندارێتیی ئەو شتەی وەسیەتی پێکراوە، تا دوای مردنی وەسیەتکار بۆ وەسیەت بۆکراو ناگوێزرێتەوە.

دووەمیان: شیان ناتەواویش وەك شیان تەواو پێویستی بە پاداشتی رۆژی دوایی هەیە، وەسیەتیش پەرستنێکی ماڵییە خێر و پاداشتی لە ئاخیرەتدا لەسەرە.

٣- وەسیەت پێکراو (الموصى بە): مەرجە ماڵێکی بەکەڵك و بەردەست بێ و قابیل بە مامەڵەپێوەکردن و لەکاتی وەسیەتکردنەکەدا موڵکی وەسیەتکار بێ، هەروەها لە سێ-یەکی میرات زیاتر نەبێ.

٤- وەسیەت بۆکراو (الموصى لە): هەموو کەسێکی سروشتی یان مەعنەوییە، چونکە دەکرێ وەسیەت بۆ کەسی سروشتی بکرێ چ لەکاتی وەسیەتکردنەکەدا هەبێ یان نەبێ و لەکاتی دامەزرانیدا بوونی مەرج نیە، بەڵکو بوونی لەکاتی جێبەجێکردنیدا مەرجە. هەروەها دەکرێ وەسیەت بۆ کەسی مەعنەویش بکرێ وەك مزگەوت و نەخۆشخانە و قوتابخانە و هەموو دامەزراوەیەکی خێرخوازیی خاوەن سوودی گشتی.

---

[1] مادەی (١٠٦) لە یاسای مەدەنیی عێراقی کە دەڵێ "تەمەنی پێگەیشتن تەواوکردنی هەژدە ساڵە".

بەلام مەرجە وەسێت بۆکراو لایەنێکی سەرپێچیکار نەبێ، وەك وەسێتکردن بۆ سەماگە و ئەو جۆرە شتانە.

### گونجاندن (تکییف)ی:

وەسێت وا گونجاندنی بۆ دەکرێ کە رەفتارێکی تاکەکەسیی ئیرادیی ناسەپێنە و وەسێتکار بۆی هەیە بەر لە مردنی لێی پاشگەز بێتەوە، لەم حاڵەتانەدا بەتاڵ دەبێتەوە:

١- پاشگەزبوونەوە لێی بەر لە مردن.

٢- وەسێتکار شیان لەدەست بدات بەهۆی شێتبوونی نوتەك و پەیوەست بە مردنەوە.

٣- کوژرانی وەسێتکار لەسەر دەستی وەسێت بۆکراو.

٤- ئەگەر وەسێت پێکراو لەناوچوو یان بەکاربرا.

٥- ئەگەر وەسێتکار رەفتارێکی پێوەکرد کە خاوەندارێتی دەگواستەوە.

٦- ئەگەر دەرکەوت وەسێت پێکراو موڵکی کەسیترە.

٧- زیادبوون لە سێ-یەك ئەگەر واریسەکان رێگەیان پێ نەدابێ[1].

### حوکمەکانی وەسێت:

١- شکڵیبوون بۆ دامەزرانی وەسێت پێویست نیە، بەڵکو بۆ سەلماندنیەتی کاتێ لەلایەن وەرەسەوە نکوڵی لێبکرێ.

٢- هەر بە مردنی وەسێتکار، وەسێت بۆکراو دەبێتە خاوەنی وەسێت پێکراو و بە میراتەکەیەوە پەیوەست دەبێ، بۆیە نابێ دابەش بکرێ تا لێی دەرنەکرێ یان وەسێت بۆکراو لە بارێکدا بالّغ و ژیر و هەڵبژێر بێ، مۆڵەت بەو کارە نەدات.

---

[1] مەدەنیی عێراقی: مادەکانی (١١٠٨-١١١٢).

٣- دروستە وەسێت بۆ میراتگر و نامیراتگر بکرێ لە سنووری سێ-یەکی میراتەکەدا پاش دەرکردنی خەرجی گواستنەوەی وەسێتکار بۆ دوامەنزڵی و پاش دەرکردنی قەرزەکانی خودا، وەك زەکات، هەروەها قەرزەکانی خەڵك.

٤- حوکمی وەسێت بەسەر ئەم رەفتارانەدا جێبەجێ دەبێ:

أ- بەخشینەکانی نەخۆشێك نەخۆشی مەرگی هەبێ و ئاڵوگۆڕەکانی کە خاترانە (محاباة)یان تێدایە لە سنووری خاترانەدا[١].

ب- گەردنئازادکردنی نەخۆشێك نەخۆشی مەرگی هەبێ بۆ ئەو کەسەی قەرزاریەتی، جا چ میراتگر بێ یان کەسیتر[٢].

ج- کەفالەتی نەخۆشێك نەخۆشی مەرگی هەبێ. (نەخۆشیی مەرگ ئەو نەخۆشیەیە واباوە ئومێدی چاکبوونەوەی لێناکرێ وەك نەخۆشی شێرپەنجە و ئایدز، پێویستە کاریگەریەکەی تەنها لەسەر رەفتارەکانی نەخۆش لە کۆتا ساڵ (کە تێیدا دەمرێ) پەیوەست بەمردنەکەی بگرێتەوە، ئەویش بۆ رەچاوکردنی سەقامگیریی مامەڵەکان.

د- بڕیاردانی قەرزێك بۆ واریسێك یان کەسیتر ئەگەر بڕیارەکە وەك بەمولککردن بوو، بەپێچەوانەی ئەوەی بڕیاردانەکە وەك پێڕاگەیاندن بێ، یان دانپێدانانی وەرگرتنی ئەمانەتێکی، یان بەکاربردنی ئەمانەتێکی بێ کە لەلای بووە و بەبێ دانپێدانانی ئەو سەلماوە، ئەوا ئەو شتەی بڕیاری لەبارەوە داوە لە هەموو ماڵەکەیدا جێبەجێ دەکرێ با میراتگرەکانیش رازی نەبن، حوکمی وەسێتی بەسەردا جێبەجێ ناکرێ، هەروەها لەسەر نرخی ئەو ماڵەیش کڕیویەتی یان ئەو قەرزەی لە حاڵێکدا بە نەخۆشیی مردن نەخۆش بووە کردوویەتی جێبەجێ نابێ[٣]. باوەڕکردنی وەرەسەیش بەوەی نەخۆشە میراتدەرەکەیان

---

[١] مەدەنیی عێراقی (م/١١٠٨).

[٢] مەدەنیی عێراقی (م/١١٠٩).

[٣] سەرچاوەی پێشوو (م/١١١٠).

لە ژیانیدا بڕیاری لەبارەوە دەدا، پابەندیان دەكات و ئەگەر بەو نەخۆشییە مرد، پێویستە لەسەریان ئەوەی بڕیار دراوە لە هەموو میراتەكەدا جێبەجێ بكەن نەك لە سێیەكیدا، لەبەرئەوەی ملكەچی حوكمەكانی وەسێت نابێ[1].

ئەو كەسەی نەخۆشەكە بەپێی ئەو حوكمانەی باس كران بڕیاری لە بەرژەوەندیدا داوە، تا قەرزەكانی قۆناغی لەشساغی لێ نەدرێتەوە شایستەی نابێ، لەبەرئەوەی هەركات قەرزی حاڵەتی لەشساغی و قەرزی حاڵەتی نەخۆشی زۆر بوون، ئەوەی یەكەم پێش ئەو قەرزانە دەخرێ كە ساغ بووەتەوە هی قۆناغی نەخۆشیی مەرگن.

ئەگەر نەخۆشی سەر جێگەی مەرگ دانی بەوەدا نا كە ئەو قەرزەی لەسەر (أ) بووە وەریگرتوتەوە، ئەگەر دەركەوت قەرزەكە لە حاڵەتی تەندروستیی قەرزدەرەكەدا لە ئەستۆی (أ)دا بووە، ئەوا ئیقرارەكە لەسەر قەرزارەكانی سەردەمی لەشساغی جێبەجێ دەكرێ، بەڵام ئەگەر دەركەوت لە حاڵەتی نەخۆشیەكەیدا بووە، ئیقرارەكە دەرهەق بەو قەرزارانە جێبەجێ ناكرێ. هەروەها ئەگەر دانی بەوەدا نا كە لە كاتی لەشساغیدا كەفالەتی قەرزی فلانی كردوە، دانپێدانانەكە پاش دەركردنی قەرزەكانی سەردەمی لەشساغی لە حاڵەتی ڕوودانی فرەقەرزیدا، لە هەموو ماڵەكەیدا جێبەجێ دەكرێ[2].

### حوكمی وەسێتكردن بۆ میراتگر:

شەرعناسان لەو بارەوە سێ ڕای جیاوازیان هەیە:

أ- هەندێكیان گوتویانە وەسێتكردن بۆ میراتگر بەهیچ شێوەیەك دروست نیە، لەبەرئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (إن الله أعطى كل ذي حق حقه فلا وصيه لوارث)، (واتە: خوا مافی هەموو خاوەن مافێكی داوە، هەربۆیە وەسێتكردن بۆ میراتگر نیە). لەو ڕووەوە گوایە ئایەتەكانی میرات ئایەتەكانی

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، (م/١١١١).
[2] مەدەنیی عێراقی (م/١١١٢).

وەسێتیان نەسخ کردۆتەوە (هەڵوەشاندۆتەوە)، کە بەو پێیە میرات دابەش دەکرا.

ب- هەندێکیتریان گوتویانە بەهەموو شێوەیەك دروستە، لەبەرئەوەی ئایەتەکانی میرات واجببوونیان لە ئایەتەکانی وەسێتدا هەلگرت، بەڵام جائیزبوون لە سنووری سێ-یەکدا مایەوە.

ج- هەندێکیتریان گوتویانە: جائیز و ناجائیزی بە مافی میراتگران لە میراتەکەوە بەستراوە، ئەگەر پاش مردنی میراتدەرەکە مۆڵەتیان پێدا جێبەجێ دەکرێ، ئەگینا وا دادەنرێ وەك ئەوەی لە ئەسڵدا نەبووبێ.

پێمان وایە وەسێتکردن بۆ میراتگر لەم حاڵەتانەدا زەروریە:

أ- ئەگەر میراتدەر لە ژیانی خۆیدا لە ماڵەکەی خەرجی ژنهێنانی هەندێ لە کوڕەکانی کێشا و هەندێکیان مانەوە و ژنیان نەهێنابوو، پێویستە بەر لە مردنی وەسێت بکا هەندێ لە ماڵەکەی تەرخان بکرێ بۆ ئەوانەی ژنیان نەهێناوە.

ب- ئەگەر هەندێکیان خوێندنیان تەواو کردبوو و هەندێکیان هێشتا تەواویان نەکردبوو، پێویستە وەسێت بۆ ئەوانە بکا کە خوێندنیان تەواو نەکردوە.

ج- ئەگەر هەندێکیان بەشدارییان لە پێکەوەنانی میراتەکەیدا کردبوو و هەندێکیان نەیانکردبوو، پێویستە وەسێت بۆ ئەوانەیان بکا کە لە پەیداکردنی میراتەکەدا بەشدارییان لەگەڵ کردوە، بەوەی بازرگان بووە و هەندێکیان یارمەتییان داوە، یان جوتیار بووە یان ئاژەڵداری کردوە و ئەو شتانە. هەندێکیان هاوکارییان کردوە و هەندێکیان نەیانکردوە.

د- ئەگەر کچی هەبوون و هێشتا شوویان نەکردبوو یان بێوەژن و ئەو جۆرە شتانە بوون، پێویستە بەگوێرەی پێویست وەسێت بۆ یەکێك یان زیاتریان بکا.

**وەسێتی واجب:**

وەسێتی واجب ئەوەیە پێویستە وەسێتکار لە ژیانیدا بیکا، ئەگەر وەسێتی نەکرد لەڕووی شەرعەوە دادگە گریمانەی بوونی دەکا، ئەم وەسێتە لە حاڵەتی کۆبوونەوەی

کوڕ و کچەکان و نەوەکان، یان کۆبوونەوەی نەوەکان لەگەڵ ڕۆڵەکانیان، با شۆڕیش بووبنەوە، دەبێ، بەم مەرجانەی خوارەوە:

١- یەکێك لە منداڵەکانی میراتدەرەکە لە ژیانی خۆیدا بمرێت و منداڵێك یان زیاتری لەپاش بەجێ بمێنێ.

٢- ئەوەیە نەوە (کوڕەزا و کچەزا) بەهۆی کوڕەوە لە میرات بێبەش ببێ، لە حاڵەتی بوونی کوڕەزا لەگەڵ کچ وەسێتی ناوێ، لەبەرئەوەی کچەکە نیوەی دەبات و باقیەکەی بۆ ئەو دەبێ.

٣- میراتدەر لە ژیانیدا پشکێك هاوتای پشکی باوك یان دایکە مردووەکەیان نەداتە نەوەکان، ئەگەر کەمتری دانێ، لە وەسێتە واجبەکە تەواو دەکرێ.

٤- بەشی نەوەکان لە سێ-یەکی میراتەکە زیاتر نەبێ، لەبەرئەوەی ئەوان بەناوی وەسێتەوە پشك دەبەن نەك میرات.

٥- وەسێتە واجبەکە بەپێی ڕێسای نێرینەیەك پشکی دوو مێیەنەی هەیە (للذکر مثل حظ الانثیین)، بەسەر شایستەکاندا دابەش بکرێ.

**چۆنێتیی دابەشکردنی میرات لە حاڵەتی وەسێتی واجبدا:**

وادادەنرێ منداڵ جا نێر بێ یان مێ هێشتا زیندووە و پشکەکەی بەپێی ئەم گریمانەیە دیاری دەکرێ و پاشان بۆ ڕۆڵەکانی دەگوێزرێتەوە. بۆ نموونە ئەو کەسەی دەمرێ و کوڕێك و کچەزایەکی کوڕی لە شوێن بەجێ دەمێنێ، ئەگەر وا دابنرێ کچەکە لە ژیاندایە میراتەکە بەپێی ڕێسای (للذکر مثل حظ الانثیین) دابەش دەکرێ، کوڕەکە دوو لەسەر سێ و کچەکەیش سێ-یەکی بەردەکەوێ، پاشان خۆبەخۆ پشکی کچە مردووەکە بۆ کوڕەکەی دەگوێزرێتەوە.

یاسادانەری عێراقی لە یاسای باری کەسێتی بەرکار لە مادەی (٧٤)دا مامەڵەیەکی ناتەواوی وەسێتی واجبی کردوە و هەندێ لەو مەرجانەی تێدا نیە.

شایانی باسە لە حاڵەتی جیاوازیی ژن و مێرد لە ئایندا وەسێتکردن واجبە، لەبەرئەوەی بەبێ وەسێت ئەم جیاوازییە ڕێگرە لە میرات، بۆیە پێویستە هەریەکەیان

بەلەبەرچاوگرتنی ئەگەری مردنیان بەر لەویتر، وەسیّت بکەن بەشیّك لە ماڵە تایبەتەکەیان بدریّتە ئەویتریان [1].

**سێیەم: مۆڵەتدان بە گرێبەندی وەستێنراو:**

یەکێك لە رەفتارە تاکەکەسییە گوفتاریەکان مۆڵەتدانە بە گرێبەندێك کە لەسەر ئەو مۆڵەتە وەستێنراوە:

رەفتاری یاسایی یان شەرعی لە یەکێك لەم سێ حاڵەتەدا وەستێنراو دەبێ:

١- یەکێك لە دوو گرێبەندوانەکە شیان ناتەواو بێ: لەم حاڵەتەدا دامەزرانی گرێبەندەکە لەسەر مۆڵەتی ئەو کەسەی مافی مۆڵەتدانی هەیە دەوەستێ (ئەسەرەکانی لە ماف و پابەندیەکان لێ ناکەوێتەوە). جا ئەگەر مۆڵەتیدا لە مێژووی ئیمزاکردنیەوە، واتە بە پاشئاسەوار، ئەسەر بەرهەم دێنێ، ئەگینا وا حساب دەکرێ وەك ئەوەی هەر نەبووبێ.

٢- گرێبەندوان دەسەڵاتی بەسەر شوێنی گرێبەندەکەدا نەبێ: وەك ئەو کەسەی بەفزولی و بەبێ نوێنەرایەتیکردنێکی پێشوەخت ماڵی کەسانیتر دەفرۆشێ، دامەزرانی گرێبەندەکە لەسەر مۆڵەتی خاوەن شوێنەکە (خاوەن مولکەکە) دەوەستێ، ئەگەر لە ماوەی سێ مانگدا مۆڵەتی پێدا، لە رۆژی ئیمزاکردنیەوە کارپێکراو و لازم دەبێ، ئەگەر مۆڵەتیشی نەدا وا حساب دەکرێ وەك ئەوەی هەر نەبووبێ. هەروەها ئەگەر کەسی خۆهەڵقورتێن (فزول) شتێکی بۆ کەسێك کڕی کە مۆڵەتی پێنەدابوو کڕینەکە راست دەبێت و بەلای شەرعناسانی ئیسلامی (وەك حەنەفی و مالیکی) و ئەو یاسایانەی لەژێر کاریگەریدان [2]، لەسەر ئەو کەسە دەوەستێ کە مافی مۆڵەتدانی هەیە.

---

[1] بۆ زانیاریی زیاتر بڕوان ئەم کتێبەمان: أحكام الميراث والوصية وحق الانتقال في الفقه المقارن والقانون، ص٥٩ و پاشتر.

[2] وەك مەدەنیی عێراقی مادەی (١٣٥).

٣- بەسترانی مافی کەسانیتر بە شوێنی رەفتاری تاکەکەسیەوە: وەك ئەوەی وەسێت لەبارەی زیاتر لە سێ-یەکی میراتەکەی بکا، ئەو زیادەیە لەسەر مۆڵەتی وەرەسە پاش مردنی میراتدەرەکە دەوەستێ ئەگەر هاتوو باڵق و ژیر و هەڵبژێر بوون.

شایانی باسە بۆ دووربوون لە زۆرلێکردنی ئەدەبی، لە ژیانی وەسێتکاردا حساب بۆ ئەو مۆڵەتپێدانەی وەرەسە ناکرێ، لەبەرئەوەی مۆڵەتدان لە ژیانی وەسێتکاردا لەوانەیە جۆرە بێزێری و بێئەدەبیەکی بەرانبەر وەسێتکار تێدا بێت و گومانی زۆرلێکردنی ئەدەبی لێبکرێ.

ئاشکرایە مۆڵەتدان بە گرێبەندی وەستێنراو رەفتارێکی گوفتاریانەی تاکەکەسییە و پابەندی و مافی لێدەکەوێتەوە.

چوارەم: بەڵێنی خەڵاتدان:

رەفتارێکی گوفتاریانەی تاکەکەسییە و روو لە جەماوەرە و ماناکەی پابەندبوونە بە دانی خەڵاتێك بە هەر کەسێك کارێکی دیاریکراوی داواکراو ئەنجام بدات. ئەمە لە دیارترین پیادەکردنەکانی ئەو رەفتارە گوفتارییە تاکەکەسانەیە کە دەبێتە هۆیەك بۆ پابەندبوونی بەڵێندەر بە دانی ئەوەی لە بەڵێنەکەیدا دیاری دەکا بە چاوپۆشین لە کەسایەتیی بەڵێن پێدراوەکە، جا چ ناسراو بێ یان نەناس، چ بەر لە بەڵێنەکە دەست بە کار بکرێ یان نا و چ بەڵێنەکە رەها بێ یان کاتێکی بۆ دیاریکرابێ، هەروەها چ بە مەرجێکەوە بەسترابێتەوە یان نا.

پایەکانی بەڵێنی خەڵاتدان:

لەو پێناسەوە دەردەکەوێ پایەکانی پێنجن: شێوە یاخود دارشتەی بەڵێنەکە، بەڵێندەر (الواعد)، بەڵێن پێدراو (الموعود لە)، بەڵێندراو (الموعود بە) و کارە داواکراوەکە.

١- دارشتەی بەڵێنەکە: تەنها ئیجابە، لە مەرجەکانی:

أ- دەربڕینێکی رۆشن بێ و ئاماژە بۆ مانا ویستراوەکە بکا.

ب- دەربڕینەكە ئاراستەكراو بێ بۆ جەماوەر، ئەگەر ئاراستەی كەسێك یان چەند كەسێكی دیاریكراو كرا دەربڕینەكە بە ئیجاب دادەنرێ وەك ئیجاب لە گرێبەندا و هیچ ئەسەرێكی لێ ناكەوێتەوە تا قبولْ نەكرابێ، ئەگەر قبولْ كرا دەگۆڕێ بۆ گرێبەند و ئەوكاتە گرێبەندەكە دەبێتە هۆی پابەندی، نەك رەفتاری تاكەكەسی و ئەحكامی بەڵێندان بە خەڵاتكردنی بەسەردا ناچەسپێ.

ج- رەهایی یان وادە: ئەگەر بەڵێندەر لە سیغەكەدا وادەیەكی بۆ ئەنجامدانی كارەكە دیاری نەكرد، بۆی هەیە هەركات ویستی لە بەڵێنەكەی پاشگەز بێتەوە، بەو مەرجەی ئەوە كار لە مافی ئەو كەسە نەكا كە بەر لە پاشگەزبوونەوەكە كاری كردوە.

بەڵام ئەگەر ماوەیەكی كرداری دیاری كرد، پێویستە پێوەی پابەند بێ و بۆی نیە بەر لە بەسەرچوونی ماوەكە لێی پاشگەز بێتەوە، هەروەها ئەگەر كاتێكی بۆ كاركردن دیاری كرد بەو كاتەوە پابەند دەبێ.

**٢- بەڵێندەر:** مەرجە **شیانی** گرێبەندكردنی تێدا بێ، پێشتر **شیان** و بەربەرست و رێگرەكانی روون كرانەوە.

**٣- بەڵێندراو (بابەتی پابەندی):** چی لە شوێنی گرێبەنددا مەرجە لەمیشدا مەرجە، لەوەی بكرێ و رەوا و دیاریكراو یان قابیل بەدیاریكردن بێ، بەكەڵك و بەردەست (واتە: متقوم) بێ و بەهایەكی دارایی هەبێ، دەشێ بەهایەكی دارایی پوخت بێ وەك برێك پارە، یان ئۆتۆمبێلێك، یان خانوویەك، یان پارچە زەویەك و ماڵە گوازراوەكانیتر، هاوچەشن و بەهایی.

لەوانەیشە بەها بنەڕەتیەكەی بەهایەكی ئەدەبی یان مەعنەوی بێ وەك ئەو نیشانە (وسام)ەی ئەسەری دارایی لێ ناكەوێتەوە[1].

**٤- ئەو كارەی پێویستە جێبەجێ بكرێ، لە وێنەكانی:**

[1] الأستاذ إسماعيل غانم، النظرية العامة للالتزام، ص٣٩٦.

أ– دۆزینەوەی شتێکی بزربوو یان بێ سەروشوێن.

ب– راگەیانـدنی زانیـاریی ئـەوتۆ کـە یارمـەتیی ئاشـکراکردنی تاوانبـارێکی هەڵاتوو، یان سیاسیەکی خۆحەشارداو، یان رێکەوتنێکی تاوانکارانە بەر لە جێبەجێکردنی بدات.

ج– یان دۆزینەوەی شتێك کە سوودێکی گشتی هەبێ.

د– یان گێڕانەوەی ماڵێکی زەوتکراو یان دزراو.

هـ– یان دانانی کتێبێك لەسەر بابەتێکی گرنگ و خاوەن سوودی گشتی.

و– یان دانانی پەیکەرێکی ئەندازەیی بۆ کەسایەتیەکی مێژوویی.

ز– یان هەر ئامانجێکیتری داواکراو لە دیدی بەڵێندەردا.

**٥– بەڵێن پێدرلو بە خەڵات، کە پێویستە ئەم مەجانەی تێدا بێ:**

أ– کارەکە بەو شێوەیەی داواکراوە ئەنجام بدات.

ب– پابەند بێ بە وادەی خۆی ئەگەر کاتەکەی دیاری کرابوو و بە مەرجەکەی ئەگەر مەرجدار بوو.

لە حاڵەتی پاشـگەبوونەوەی بەڵێنـدەر لـە بـەڵێنی خەڵاتکردنەکـە، سـێ شـیمانە هەیە:

شیمانەی یەکەم: ئەگەر دەست بە جێبـەجێکردنی کـارە داواکراوەکـە نـەکرابوو، بەڵێندەر بەیەکجاری لە ئەنجامی بەڵێنەکەی رەها دەبێ.

شیمانەی دووەم: ئەوەی (بەڵێن پێدراو) خەرجی کردوە بۆی بگەڕێنرێتەوە بـەو مەرجەی لە نرخی ئەو خەڵاتەی بەڵێنی لەبارەوە دراوە تێنەپەڕێ.

ئەو بەڵێنەی پاشەکشەی لێکراوە بە بنچینەی ئەم پابەندییـە دانـانرێ، بـەڵکو بـۆ حوکمـەکانی بەرپرسـیارێتیی کەمتەرخـەمی دەگەڕێتـەوە کـە لـە دەقـەکانی یاسـادا بڕیاری لێدراوە.

ئەم بەرپرسیارێتییە لە یەکێك لەم دوو حاڵەتەدا دەکەوێ:

یەکەمیان: لە حاڵەتی کەوتنی دەعواکە بە گێڕانەوەی ئەوەی خەرجی کردوە بە تێپەڕیوونی شەش مانگ بەسەر ڕاگەیاندنی پاشگەزبوونەوە لە بەڵێنەکە.

دووەمیان: بەڵێنـدەر بەڵگـە بـدات بەدەسـتەوە کـە سـەرکەوتنە ویسـتراوەکە بەدیدەهات ئەگەر ئەوەی دەستی بە جێبەجێکردنی کرد تەواو بکرایە، لەبەرئەوەی لەم حاڵەتەدا پەیوەندیی هۆیی لەنێوان ئـەو زیانـەی لـە گرتنەئەسـتۆی خەرجیـەکان تووش هاتووە و پاشگەزبوونەوەی بەڵێندەر لە بەڵێنەکەی، نامێنێ.

بەهەمان شێوەیش دەبێ کاتێ بەر لە ڕاگەیاندنی پاشـگەزبوونەوەکە دەست بـە جێبەجێکردنی کارە داواکراوەکە کرابێ و پاش ئەو پاشگەزبوونەوەیە تەواوکرابێ.

شـێمانەی سـێیەم: ئەوەیـە ئەگـەر کـارە داواکراوەکـە بـەر لـە ڕاگەیانـدنی پاشگەزبوونەوە بەتەواوی ئەنجام درابێ، لەم حاڵەتەدا پێویستە خەڵاتەکە بدرێ[1].

شایانی باسە ئەگەر ئەو کارەی خەڵاتەکە لەپێناویدا بڕیاری لێدرا لەلایەن زیاتر لە کەسێکەوە جێبەجێ کرا، خەڵاتەکە بۆ لەپێشترینیانە ئەگەر بەدوای یەکدا جێبـەجێ کرابوو، ئەگەریش هەموو لە یەك کاتدا جێبـەجێیان کردبـوو بەیەکسـانی بەسـەریاندا دابەش دەکرێ، بەڵام ئەم ڕێسـایە بـەگوێرەی سروشـتی ئـەو داڕشـتە گشـتیەی لـە بەڵێندان بە خەڵاتەکەدا بەکار هاتووە جیاوازە، بۆ نموونە:

أ- ئەگەر فەرماندەی شەڕێك بە دە سەرباز لە سەربازەکانی گوت: هەرکێتان (کل من..) لەپێشەوە فلان شوێنی دوژمن بگرن بۆ نموونە دە هەزار دۆلار خەڵاتیەتی. جا ئەگەر بەدوای یەکدا شوێنەکەیان داگیر کرد خەڵاتەکە بۆ یەکەم دەبێ، بەڵام ئەگەر بە هاوجەمی گرتیان نەك بەدوای یەکدا هەریەکـەیان شایسـتەی دە هـەزار دۆلار دەبـێ، لەبەرئەوەی لەفزی (کل) مانای گشتی بەشێوەی تاك تاك دەگەیەنێ، بۆیە پێویسـتە هەریەکە بەجیا وەربگیرێن وەك ئەوەی کەسیتری لەگەڵ نەبێ.

---

[1] بڕوانە: مجموعة الأعمال التحضيرية للقانون المدني المصري رقم (١٣١) لسنة ١٩٤٨، ٢/٢٤٠.

ب- ئەگەر پێی گوتن: سەرجەم (جمیع من..) ئەوانەتان ئەو شوێنە لەپێشەوە بگرن دە هەزار دۆلاری دەدرێتێ، جا ئەگەر بەدوای یەکدا گرتیان پارەکە بۆ یەکەمیانە. ئەگەریش پێکەوە گرتیان پارەکەیان بەیەکسانی لەنێواندا بەش دەکرێ هەریەکەیان هەزار دۆلار، لەبەرئەوەی لەفزی (جمیع) مانای گشتی دەگەیەنێ لە شێوەی کۆبوونەوەدا نەك تاك تاك و بەو پێیە هەموو ئەوانەی دەچنە ناوی لە یەکەمبووندا وەك یەك کەس حسێبن، بۆیە بڕە پارەکە بەهاوبەشی و یەکسانی دەبەن.

ج- ئەگەر پێی گوتن: کێ (من..) لە ئێوە یەکەم کەس ئەو شوێنەی دوژمن بگرێ دە هەزار دۆلاری دەدەمێ، جا ئەگەر بەدوای یەکدا گرتیان پارەکە بۆ یەکەمیانە، ئەگەریش پێکەوە گرتیان هیچیان ناکەوێ، لەبەرئەوەی وشەی (من) بەبێ (کل) یان (جمیع) بەهیچ شێوەیەك چوارچێوەدان ناگەیەنێ، نە بە تاك تاك و نە بە کۆ[1].

نموونەیتری کردرایی زۆری ڕەفتاری گوفتاریانەی تاکەکەسی هەن کە پابەندی پەیدا دەکەن، لەوانە وەقف، نەزرکردن، مەرجدانان بۆ بەرژەوەندیی کەسانیتر، مەرجەکانی ملکەچبوون کە لە گرێبەندی ملکەچکردندا لایەنی بەهێز بەسەر لایەنی لاوازیاندا دەسەپێنێ، پەیماننامەی ناهاوشان کە واباوە دەوڵەتی بەهێز و سەرکەوتوو پاش تەواببوونی جەنگ بەسەر دەوڵەتە لاوازە بەزیوەکەیدا دەسەپێنێ، وەك ئەو مەرجانەی دەوڵەتانی هاوپەیمان پاش جەنگی جیهانیی دووەم بەسەر هەریەك لە ئەڵمانیا و ژاپۆن و ئێرانیاندا سەپاند.

---

[1] بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: کشف الأسرار مع أصول البزدوي، ٢/٣٢٨ و پاشتر. أصول السرخسي، ١/١٥٨. ئەم کتێبەمان: أصول الفقه في نسیجه الجدید، ٢/٣٣٩ و پاشتر.

## لقی دووەم:
## رەفتاری گوفتاریانەی تاكەكەسی
## كە پابەندیەكی بەركار دەخا

رەفتاری گوفتاریانەی تاكەكەسی وەك چۆن بەدیهێنەری پابەندییەكە پێش ئەو نەبووە، هەروەها لەوانەیە بخەری پابەندیەكی بەركاریش بێ.

لە گرنگترین نموونەكانی: **گەردن ئازاكردن** (الابراء)، كۆتاهێنان بە بریكاری لە بریكاردار یان بریكار، كۆتاهێنان بە كەفالەت لە كەفیلدار ، كۆتاهێنان بە رەهن لە قەرزدەری رەهنگر، هەروەها دەستهەلگرتن لە تۆڵەی شەرعی (قصاص) یان خوێنبایی.

**یەكەم: گەردن ئازادكردن (واتە بەخشینی قەرزار):**

بریتییە لە وازهێنانی قەرزدەر لە مافەكانی كە بابەتی پابەندیی قەرزارە، بەبێ بەرانبەر.

رەفتارێكی یاساییانەی یەكلایەنەیە و ماناكەی ئەوەیە ئاراستەی ئیرادەی قەرزدەر بەرەو بەخشینی قەرزەكە دەڕوا.

**گونجاندن (تكییف)ی گەردن ئازادكردن:**

لێرەدا پرسیارێك دێتە سەر مێزی لێكۆڵینەوە ئەویش دیاریكردنی سروشتی گەردن ئازادكردن و سیفەتە یاساییەكەیەتی ئاخۆ بەمولككردنە یان خستنە، شەرعناسانی ئیسلامی و یاساناسان لەو بارەوە رای جیاوازیان هەیە:

أ- هەندێكیان وایان گونجاندوە كە بەرەهایی خستنە (اسقاط).

ب- هەندێكیشیان وایان گونجاندوە كە بەرەهایی بەمولككردنە.

ج- هەندێکیان وایان گونجاندوە کە بۆ قەرزدەرەکە بەموڵککردن و بۆ قەرزارەکە خستنە[1].

بەبۆچوونی لەخۆبووردوانەوەی ئێمە رای زاڵ ئەوەیە گەردن ئازادکردن خستنی مافی قەرزدەرە لە ئەستۆی قەرزاردا، لێرەیشەوە نەهێشتنی پابەندییە بە دانەوە، لەبەرئەوە ئەو مافەی بابەتی پابەندییە بە گەردن ئازادکردن دەکەوێ، خستنیشی خستنی پابەندی دەسەپێنێ. لە یاسا گشتیەکانیش ئەوەیە: (الساقگ لا یعود کما أن المعدوم لا یعود)[2]. (واتە: کەوتوو ناکەوێ هەروەها نەبوویش ناگەڕێتەوە).

**بەرهەمی جیاوازییەکە:**

ئەو بەرهەمە چییە کە لە گونجاندنی گەردن ئازادکردن بە خستن یان بەموڵککردن دەکەوێتەوە؟

ئەم گونجاندنە چەند ئەنجامێکی گرنگی لێدەکەوێتەوە، لەوانە:

أ- ئەگەر بە خستن گونجاندنی بۆ بکرێ ئاگەداریی خاوەن قەرز لە بڕی قەرزەکە ناکرێتە مەرج، بەپێچەوانەی بەموڵککردن.

ب- ئەگەر بە خستن گونجاندنی بۆ بکرێ پێویستی بە قبوڵکردنی قەرزار نیە، بەپێچەوانەی بەموڵککردن.

ج- کەوتوو ناگەڕێتەوە و بە رەتکردنەوەی لەلایەن قەرزارەوە رەت نابێتەوە، بەپێچەوانەی بەموڵککردن.

د- لە خستندا ئاگەداریی قەرزار بەمەرج ناگیرێ بەپێچەوانەی بەموڵککردن کە زانین تێیدا مەرجە، مادەی (٣٧١)ی یاسای مەدەنیی میسریی بەرکار دەڵێ: ((ینقضي الالتزام إذا أبرأ الدائن مدینه مختاراً، ویتم الإبراء متی وصل إلی علم المدین ویرتد برده)). (واتە: پابەندی بەسەردەچێ ئەگەر قەرزدەر بەئارەزووی

---

[1] بڕوانە: المنثور في القواعد للزرکشي، ٨١/١، والأشباه والنظائر لابن نجیم، ص٢٦٣، الاستقصاء في مسائل الإبراء للأستاذ علي حیدر، ص١٨ وما یلیها.

[2] گۆڤاری: الأحکام العدلیة، مادەی (٥١).

خۆی بەخشی، بەخشرانەکە بە بیستنی لەلایەن قەرزارەکەوە دادەمەزرێ، بە ڕەتکردنەوەیشی دەگەڕێتەوە).

لەم دەقەوە تێدەگەین کە یاسادانەری میسری گەردن ئازادکردنی بە بەمولککردن گونجاندوە ئەگەرچی مانای (ینقضي) لە مانای کەوتن نزیکترە تا لە مانای بەمولککردن.

لە یاسای مەدەنیی عێراقیدا دژیەکی دەبینین لەنێوان گونجاندنی بە خستن و مەرجی قبولکردن و مافی ڕەتکردنەوە لەلایەن قەرزارەوە، مادەی (٤٢٠) دەڵێ: (إذا أبرأ الدائن المدين سقط الدين). (واتە: ئەگەر قەرزدەر گەردنی قەرزاری ئازاد کرد قەرزەکە دەکەوێ).

لێرەدا یاسادانەری عێراقی لەم مادەیەدا بەخشینی بە خستن گونجاندوە، ئەمەیش لەگەڵ ئەوەی لە مادەی (٤٢٢)دا دژ دەوەستێ کە دەڵێ (لا يتوقف الإبراء على قبول المدين لكن إذا رده قبل القبول إرتد).(واتە: بەخشین لەسەر قبولکردنی قەرزار ناوەستێ، بەڵام ئەگەر بەر لە قبولکردن ڕەتیکردەوە، دەگەڕێتەوە ). لەنێوان ئەم دوو مادەیەدا دژیەکیەکی ڕۆشن هەیە، چونکە بەخشین ڕەفتارێکی تاکەکەسییە و بە ویستی تاکەکەسی پابەندیەکە دەخات و ئیرادەی قەرزار هیچ ڕۆڵێکی لەم خستنەدا نیە. هەروەها دژیەکیەك لەنێوان بەمەرجنەکردنی قبولکردن و مافی ڕەتکردنەوەدا هەیە، لەبەرئەوەی ڕەتنەکردنەوە مانای قبولکردنی ناڕاستەوخۆ دەگەیەنێ.

سەیر لەوەدایە یاسای (الموجبات و العقد)ی لوبنانیی بەرکار، گەردن ئازادکردنی قەرزدەر بۆ قەرزار لە قەرزەکەی بە ڕێکەوتن و گرێبەند داناوە[1].

[1] مادەی (٣٣٨)ی دەڵێ: "گەردن ئازادکردن لە قەرز دەستهەلگرتنی قەرزارە لە مافەکانی بۆ بەرژەوەندیی قەرزارەکە، دەبێ بەپێی ڕێکەوتنێك بێ، چونکە لە گەردن ئازادکردندا ئەسڵ وایە ڕێکەوتنێك لەنێوان کەسە پەیوەندارەکان بەبابەتەکەوە هەبێ". مادەی (٣٤٠)یشی دەڵێ " گرێبەندی گەردن ئازادکردن ڕاشکاو یان ناڕستەوخۆ (ضمني) دەبێ".

**لە مەرجەکانی گەردن ئازادکردن:**

١- بەخشەر **شیانی بەخشینی** هەبێ و بۆ **شیان** ناتەواو دروست نیە، یاساکان و یاساناسەکان هاوڕان لەسەر ئەوەی حوکمە بابەتیەکانی تەبەرۆعکردن بەسەر گەردن ئازادکردنی قەرزاردا جێبەجێ دەبن[1].

٢- رەزامەندیی بەخشەر لە خەوشەکانی ئیرادە خاڵی بێ.

٣- ئەوەیە قەرزەکە بەکردەوە و بەدڵنیاییەوە لە ئەستۆی قەرزاردا بێ. واتە گەردن ئازادکردن بۆ قەرزێك دروست نیە کە هێشتا واجب نەبووە، با هۆی واجببوونەکەیشی پەیدا بووبێ، وەك نەفەقەیەکی ئایندەیی بۆ ژن.

٤- بەخشینەکە لە نەخۆشیی مەرگدا نەبێ، ئەگینا حوکمی وەسێتی بەسەردا دەچەسپێ، زیادکردنیش لە سێ-یەکی میرات پێویستی بە مۆڵەتی وەرەسە هەیە پاش مردنی بەخشەر، وەك لە بابەتی وەسێتدا ئەوە بەدرێژی باس کرا.

٥- ئەو مافەی بابەتی پابەندیەکەیە، لەو مافانە بێ کە خستن قبوڵ دەکەن، تاوان لەسەرکراو یان خاوەن خوێن بۆیان نیە مافی کەفارەتی کوشتنی بەهەڵە بخەن، بەڵام دەکرێ لە خوێنباییەکە گەردنی ئازاد بکەن.

٦- بابەتی پابەندیەکە ماڵ (عین)ێك لە ماڵەکان نەبێ، لەبەرئەوەی پەیوەندی بە ئەستۆوە نیە، خستنیش بۆ ئەو شتەیە پەیوەندی بە ئەستۆوە هەبێ، بەڵام دەستلێهەڵگرتن قبوڵ دەکا، وەك دەستهەڵگرتنی ماڵ زەوتکراو لە ماڵە زەوتکراوەکەی، هەروەها دەستهەڵگرتنی دزلێکراو لە ماڵە دزراوەکەی.

**رەهایی و بەستنەوە لە بەخشیندا:**

أ- بەخشینی رەها: ئەوەیە بە مەرجێکەوە نابەسترێ و وادەیەکی بۆ دانانرێ.

ب- بەخشینی بە مەرجێکەوە بەستراوە کە بەبێ ئەوە بەدینایەت. ئەگەر قەرزدەر بەخشینی قەرزارەکەی لە هەندێ لە قەرزەکەی بەستەوە بە مەرجی

---

[1] هەروەها لەوانە یاسای مەدەنیی عێراقی (م/٤٢١)

دانەوەی باقیەکەی، ئەوا ئەگەر قەرزارەکە ئەوەی دایەوە ئازاد دەبێت و ئەگەر نەیدایەوە ئازاد نابێ و هەموو قەرزەکەی لەسەر دەمێنێتەوە. ئەگەر بەسترا بە وادەیەکەوە، تا هاتنی وادەکە بەدینایەت.

**ئەسەرەکانی بەخشین:**

١- بەسەرچوونی پابەندی.

٢- ئەستۆپاکبوونی قەرزار.

٣- ئەستۆپاکبوونی کەفیل ئەستۆپاکبوونی قەرزارە ئەسڵیەکە (واتە کەفیلدارەکە) ناسەپێنێ، بەپێچەوانەی پێچەوانەکەی. ئەگەر قەرزدەرەکە گەردنی قەرزارەکەی لە هەموو قەرزەکە ئازاد کرد، گەردنی کەفیلەکەیش ئازاد دەبێ، لەبەرئەوەی بەکەوتنی شوێنکەوتوو شوێنکەوتەیش دەکەوێ. لق بە کەوتنی ئەسڵەکەی دەکەوێ[1].

٤- ئەگەر قەرزدەر گەردنی یەکێك لە دوو قەرزاری هاوکار (متضامن)ی ئازاد کرد، گەردنی هاوکارەکەیتر ناگرێتەوە، بەڵکو ئەسەرەکە هەر پشکەکەی خۆی دەگرێتەوە و قەرزەکەیش بەئەندازەی ئەوە کەم دەکا[2].

**دووەم: کۆتاهێنان بە بریکاری بە ویستی تاکلایەنە:**

ئەوە روونە بریکاری (کە گرێبەندێکە بەوپێیە بریکار کارێکی یاسایی لەباتیی بریکاردار ئەنجام دەدات) بەسروشتی خۆی لە گرێبەندە کارپێکراوە ناسەپێن (نالازم)ەکانە بۆ هەریەك لە بریکاردار و بریکار، هەریەکەیان بۆی هەیە بە ویستی تاکلایەنەی خۆی و بەبێ گەڕانەوە بۆ لایەنەکەیتر بۆ وەرگرتنی مۆڵەت و رەزامەندی، کۆتایی بە بریکاریەکە بێنێ. (بریکاری) بەسروشتی خۆی نەك بەهۆیەکیتری ناوخۆیی یان دەرەکی، ناسەپێنە بەو مەرجەی کۆتاهێنانەکە لە کاتێکدا نەبێ زیان بە

---

[1] گۆڤاری: الأحكام العدلية، مادەی (٥٠).

[2] یاسای مەدەنیی عێراقی مادە (٣١٨) و میسری مادە (٢٨٢).

لایەنەکـەیتر بگەیـەنێ، هـەروەها مـافی کەسـیتری پێـوە نـەبێ و بـە بەرانبـەر (دەلالانە/عمولە)یەك نەبێ، لەبەرئەوەی لە حاڵەتی یەکەم و دووەمدا کۆتاهێنـانی بـە ویسـتی تاکلایەنــە بەرپرسـیارێتیی کەمتەرخـەمی لێدەکەوێتــەوە لەبــەر بــوونی زیانگەیاندن بە کەسیتر.

لە حاڵەتی سێیەمیشدا حوکمەکانی بەکرێدانی لەسەر جێبـەجێ دەبـێ، هەربۆیـە ڕاست نیە بە ویستی تاکلایەنە کۆتای پێ بهێنرێ.

**پایەکانی بریکاری:**

بریتین لە داڕشتە (الصیغە)، بریکاردار (الموکل)، بریکـار (الوکیـل)، تێـدا وەکیـل (الموکل فیە).

شایانی باسە کۆتاهێنان بە بریکاریـەك کـە پایـە و مەرجـەکانی تێدا هاتبنـە دی، پابەندبوونی بریکارەکە بە جێبەجێکردنی بریکاریەکەی لێدەکەوێتـەوە بـەبێ ئـەوەی سنوورە کێشراوەکانی تێبپـەڕێنێ، مەگـەر بـۆی نـەلوابێ پێشـوەخت بریکاردارەکـە ئاگـەدار بکاتــەوە، هـەروەها هەلومەرجەکـە زیـاتر ئـەوەی لـێ دەخوێنرایـەوە کـە بریکاردارەکـە بـەو تێپەڕاندنـە ڕازی دەبـێ بـەو مەرجـەی هـەرکات بـۆی لـوا لـە تێپەڕاندنەکە ئاگەداری بکاتەوە.

ئەوەی لێرەدا بەلامانەوە گرنگە کۆتاهێنانە بە بریکاریەکە و لەوێیشەوە کۆتاهاتنی ئـەو پابەندیـەی لێـی دەکەوێتــەوە بـە ویسـتی تاکلایەنـە (ڕەفتـاری گوفتاریانــەی تاکەکەسی).

جگە لە پابەندبوون بە جێبەجێکردنی بریکاریەکە وەك خـۆی، بریکارەکـە پابەنـد دەبێ بەوەی بە ئەندازەی بایەخدانی بە کارە تایبەتەکانی خـۆی بایـەخی پـێ بـدات ئەگەر بەبێ کرێ بوو، هەروەها بایەخدانی پیاوێکی ئاسـایی ئەگـەر بـەکرێ بـوو. لـە هەموو بارەکاندا ئەو پابەندە بە بایەخدان نەك بە بەدیهێنانی ئامانجێك.

هـەروەها بریکارەکـە پابەنـد دەبـێ بـەوەی زانیـاریی پێویسـت لـەبارەی دوایـن هـەنگاوی جێبـەجێکردنی بریکاریەکـە بداتـە بریکاردارەکـە و حسـاباتی لـەبارەوە

پێشکەش بکات و ماڵی بریکاردارەکە بۆ بەرژەوەندیی خۆی بەکار نەهێنێ، هەروەها خۆی بەو کارە هەستێ کە تێیدا کراوەتە بریکار ئەگەر کەسایەتیەکەی جێ ئیعتیبار بوو، هەروەها بریکاردار پابەند دەبێ بەوەی بریکارەکە چ خەرجێکی لە جێبەجێکردنێکی ئاساییانەی بریکاریەکەدا کردوە بۆی بگێڕێتەوە لەگەڵ سوودە یاساییەکانی لە کاتی خەرجکردنەکەوە.

**کۆتاهێنان بە بریکاری و پابەندیەکانی بە ویستی تاکلایەنە :**

بریکاردار بۆی هەیە هەرکات ویستی بریکاریەکە کۆتا پێ بێنێ، بەوەیش بە ویستی تاکلایەنەی خۆی ئەو پابەندیانەی دەخات و بریکارەکە لەم کۆتاپێهێنانە ئاگەدار بکاتەوە، لەبەرئەوەی بریکاردار خاوەن بەرژەوەندییەکەیە و هەرکات ویستی بۆی هەیە دەستبەرداری ببێ.

هەروەها بریکاریش بۆی هەیە بە ویستی تاکلایەنەی خۆی هەرکات ویستی واز لە بریکاریەکە بێنێ، لەبەرئەوەی ئەو خۆبەخش و بەخشەرە و مافی ئەو وازهێنانە و دەستهەلگرتن لە خۆبەخشی و بەخشینەکەی هەیە، بەڵام ئەم ئازادییە بۆ هەریەك لە بریکاردار و بریکار رەها نیە، بەڵکو بە چەند کۆتێك سنووردار کراوە، لەوانە:

أ- بریکاریەکە لە بەرژەوەندیی بریکارەکە (خۆی) یان کەسێکی سێیەم نەبێ، ئەگینا بەبێ رەزامەندیی ئەو کەسەی بریکاریەکە لە بەرژەوەندیدا کراوە دروست نیە، بۆ نموونە ئەگەر مێرد لەکاتی هاوسەرگیریکردن یان دوای ئەوەدا، لەسەر داوای ژنەکە خۆی، ژنەکەی کردە وەکیل کە خۆی تەڵاق بدات هەرکات پاساوێکی بۆ ئەوە بینی بەوەی لەو ژیانی هاوسەرییە زیانی پێ دەگات، ئەوا بریکاردار بۆی نیە بە ویستی تاکلایەنەی خۆی کۆتایی بەو وەکالەتە بێنێ، لەبەرئەوەی مافی ژنەکەی پێوەیە، بەڵام مێرد بۆی هەیە بەر لەوەی ژنەکە خۆی تەڵاق بدات، تەڵاقی بدات.

هەروەها ئەگەر قەرزاری رەهنکار کەسێکی کردە وەکیل بۆ ئەنجامدانی رێوشوێنەکانی فرۆشتنی ماڵە رەهنکراوەکە ئەگەر هاتوو وادەی قەرزدانەوەکە هات و و نەدرایەوە و قەرزدەرە رەهنگرەکە داوای فرۆشتنی کرد تا قەرزەکە لە نرخەکەی

وەریگرێتەوە، قەرزارە رەهنكارەكە لە حاڵەتی غیابیدا بریكارەكە لابدات، لەبەرئەوەی وەكالەتەكە مافی قەرزدەرە رەهنگرەكەی پێوە بەستراوە[1].

ب- هەڵوەشاندنەوەی بریكاریەكە زیانی بۆ لایەنەكەیتر نەبێ.

## سێیەم: كۆتاهێنان و خستنی كەفالەت بە ویستی تاكلایەنە لەلایەن كەفیلدارەوە:

كەفالەت گرێبەندێكە بەوپێیە كەفیل دەبێتە گەرەنتی بۆ دانەوەی ئەو قەرزەی لە گەردنی قەرزاردایە بۆ خاوەن قەرزەكە، ئەگەر نەیدایە ئەو بۆی دەداتەوە. بۆ دانانیشی بە هۆی پابەندی، پێویستە ئەم مەرجانەی تێدا بن:

١- دیاریكراو بێ.

٢- كەفیلەكە راشكاوانە پێی رازی بووبێ.

٣- پابەندیی كەفیلدارەكە دروست (صحیح) بێ.

٤- قەرزەكە ئایندەیی نەبێ.

**پابەندیەكانی كەفیل:**

١- ئەگەر كەفالەتەكە یاسایی یان قەزایی یان بازرگانی بوو كەفیلەكە هاوكار دەبێ لەگەڵ قەرزارەكە بۆ دانەوەی قەرزەكە، ئەگەر كەفیلەكانیش فرە بوون، لەنێوان خۆیاندا و هەروەها لەگەڵ قەرزارەكەدا هاوكار دەبن.

٢- ئەگەر كەفیلدار ئامادە نەبوو، یان نەیتوانی ئەو شتە بداتەوە كە بوونەتە كەفیلی تێیدا، كەفیلەكە پابەند دەبێ بەو ئەركەی گرتوویەتیە ئەستۆ و لە قەرزەكەدا لە هەموو ئەو ماڵەی قەرزدەر كە لەلای قەرزارەكەیە جێگەی قەرزدەر دەگرێتەوە. پاشتر بۆ ئەوەی داویەتی دەگەرێتەوە سەر قەرزارەكە.

---

[1] لە بابەتی كەفالەتدا بڕوانە ئەم سەرچاوانە: یاسای مەدەنیی عێراقی مادەكانی (٩٢٧-٩٤٩)، میسری (٦٩٩-٧١٧)، یەمەنی (٩١٢-٩٤٤)، تونسی فەسڵەكانی (١٤٠٤-١١٩٤)، مەغریبی فەسڵەكانی (٨٧٩-٩٤٢)، سوری (م/٦٦٥-٦٨٣)، لوبنانی (٧٦٩-٨٢٢)، ئوردنی (٨٣٣-٨٦٧)، جەزائیری (٥٧١-٥٨٩)، كوێتی (٦٩٨-٧٠٣).

کەفیلدار بۆی هەیە بە ویستی تاکلایەنەی خۆی کەفیلەکە لە هەموو پابەندیەك کە لە گرێبەندی کەفالەتەکە کەوتۆتەوە ببەخشێ، لەبەرئەوەی بەنیسبەت ئەوەوە ناسەپێنە، بەڵکو بەپێی یاسا لە بەرژەوەندیی ئەو بڕیاری لێدراوە و بۆی هەیە دەستبەرداری ئەو بەرژەوەندییەی ببێ کە گەرەنتیکردنی قەرزەکەیەتی، بەڵام بۆ کەفیلەکە گرێبەندێکی سەپێن (لازم)ە و بۆی نیە بە ویستی تاکلایەنەی خۆی وازی لێبێنێ[1].

**چوارەم: کۆتاهێنان بە رەهن بە ویستی تاکلایەنە:**

بارمتە (رەهن) گرێبەندێکە بەو پێیە رەهنکار ماڵێکی دیاریکراو وەك گەرەنتی تەرخان دەکا بۆ دانەوەی مافی قەرزەدەرێکی رەهنگر.

ئەسڵ ئەوەیە رەهنکار قەرزارەکە خۆی بێ، دەشکرێ کەسێکیتر بێ کە رەهنێك لە بەرژەوەندیی قەرزارەکە وەك گەرەنتیی دانەوەی قەرزەکە پێشکەش دەکا.

بابەتی رەهنیش خانوبەرە یان ماڵێکی گوازراوە یان قەرزێك دەبێ کە بکرێ مامەڵەی تێدا بکرێ و هەموو پاشکۆکانی رەهنکراوەکە لەکاتی بەستنی گرێبەندەکەدا دەگرێتەوە. رەهنکراوەکە یان هەر بەشێکی، دەستەبەری تەواوی قەرزەکە یان بەشێکی دەکا، مەگەر دەقێك یان رێکەوتنێك لەسەر شتێکی جیاواز لەوە هەبێ.

ئەوەی لێرەدا بەلامانەوە گرنگە ئەوەیە گرێبەندی رەهن وا گونجاندنی بۆ دەکرێ کە گرێبەندێکی کارپێکراوی سەپێن (لازم)ە بەنیسبەت رەهنکارەوە و بۆی نیە بە ویستی تاکلایەنەی خۆی هەڵیبوەشێنێتەوە. بەڵام بۆ قەرزدەرە رەهنگرەکە ناسەپێنە، لەبەرئەوەی یاسا رەهنی بۆ بەرژەوەندیی ئەو و گەرەنتیکردنی قەرزەکەی داناوە و بۆی هەیە هەرکات ویستی دەستبەرداری ئەو بەرژەوەندییە ببێت و رەهنەکە

---

[1] یاسای مەدەنیی عێراقی مادەکانی (٩٣٣-٩٤٩)، میسری (٦٩٩-٧١٧)، یەمەنی (٩١٢-٩٤٤)، تونسی فەسڵەکانی (١٤٠٤-١١٧٨)، مەغریبی فەسڵەکانی (٨٧٩-٩٤٢)، سوری (م/٦٦٥-٦٨٣)، ئوردنی (٨٣٣-٨٦٧)، کوێتی (٦٩٨-٧١٩).

کۆتایی پێ بێنێ، بەوەیش بە ویستی تاکلایەنەی خۆی ئەو پابەندیانە نەهێڵێ کە لێی کەوتونەتەوە.

**پێنجەم: دەستهەڵگرتن لە تۆڵەی شەرعی یان خوێنبایی یان هەردووکیان پێکەوە لەلایەن خاوەن خوێن یان وەرەسەوە بە ویستی تاکلایەنە:**

ئاشکرایە پابەندی لەم شێوەیەدا پابەندیەکی تاوانکارانەیە و تۆڵەی شەرعی (قیساس) سزایەکی رووتە و تاوانکار پابەند دەبێ بەوەی ملکەچ بێ بۆ جێبەجێکردنی لەسەری.

خوێنبایی (الدیة) جا چ بەدیلی تۆڵەکردنەوە بێ یان لە کوشتنی بەهەڵەوە کەوتبێتەوە، وەك پێشتر باسمان کرد، خاوەن سروشتێکی دووسەرەیە و سیفەتەکانی قەرەبووکردنەوە و سزا کۆدەکاتەوە.

ئەوەیش روونە کە تاوانی قیساس و خوێنبایی لە تاوانەکانی کەسەکان و دەستدرێژیکردنە بۆ سەر گیان یان خوار گیان، دەستدرێژیکردنە بۆ سەر مافێکی هاوبەش لەنێوان تاوان لەسەرکراو ئەگەر زیندوو بێ یان وەرەسەکەی و لەنێوان کۆمەڵگەدا، بەڵام لایەنی مافی تایبەت تێیدا زاڵە، لەبەرئەوەی ئەو مەرگەساتەی لەئەنجامی تاوانەکەدا تووشی خێزانی تاوان لەسەرکراو دەبێ بەهێزتر و توندتر و تاڵتره لەو کۆستەی تووشی کۆمەڵگە دەبێ، هەروەها زیانی ماددی و مەعنەویی خێزانەکە لە زیانی کۆمەڵگە زیاترە، بۆیە وەرەسە لە کۆمەڵگە -کە لە دەوڵەتدا خۆ دەنوێنێ- زیاتر مافی هەیە بڕیار لە چارەنووسی تاوانکارەکە بدات، ئەگەرچی جێبەجێکردنی سزاکان لە رواڵەتەکانی سەروەریی دەوڵەتە کە لەوەتی دروست بووە مافی سزادانی بۆ خۆی پاوان کردوە و رێگەی لە تاوان لەسەرکراو یان وەرەسەکەی گرتووە، پەنا بۆ تۆڵەسەندنەوەی تاکەکەسی ببەن.

بەڵام دەستووری خوای گەورە (قورئانی پیرۆز) سێ بژارەی داوەتە تاوان لەسەرکراو ئەگەر لەژیاندا بوو و خاوەن خوێن یان وەرەسەکەی پاش مردنی: یەکەمیان جێبەجێکردنی تۆڵەی شەرعی (قصاص) یان سەندنی خوێنبایی،

دووەمیان وازهێنان لە تۆڵەی شەرعی و هەڵبژاردنی خوێنبایی، سێیەم دەستهەڵگرتن لە هەردووکیان. خودا دەفەرموێ ﴿وَمَن قُتِلَ مَظْلُوماً فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِ سُلْطَاناً﴾[1].

مەبەست لە (السلطان) ئەو سێ بژاردەیەیە. تاوان لەسەرکراو یان خاوەن خوێن یان وەرەسەکەی بۆی هەیە دەست لە مافی خۆی لە داواکردنی مافی قیساس هەڵبگرێ بۆ خوێنبایی، یان دەست لە هەردووکیان هەڵبگرێ بەو مەرجەی کەسێکی باڵق و ژیر و هەڵبژێر بێ و هۆشی بە ویستی تاکلایەنەی هەبێ.

پاش دەستهەڵگرتنەکە پابەندیی تاوانکاریی تاوانکار و کەسوکارەکەی دەڕەوێتەوە، لەبەرئەوەی لە حاڵەتی دەستهەڵنەگرتندا خۆی بەشەخسی پابەند دەبێ بە ملکەچکردن بۆ ئەو حوکمەی دادگە بۆی دەردەکات، هەروەها لە حاڵەتی واجببوونی خوێنباییدا کەسوکار (عاقلە)ەکەی پابەند دەبن بە دانی ئەو خوێنباییە بە کەسوکاری تاوان لەسەرکراو.

## لقی سێیەم:
## رەفتاری گوفتاریانەی تاکەکەسی
## کە پابەندی دەخات و پەیداشی دەکات

رەفتاری گوفتاریانەی تاکەکەسی وەك چۆن دەکرێ تەنها پەیداکەر یان بخەر بێ، لەوانەیە لە هەمان حاڵەت و کاتدا پەیداکەر و بخەریش بێ پێکەوە، لە دیارترین پیادەکردنەکانی ئەم حاڵەتەیش جیابوونەوە (تەڵاق) و هەقداربوون (الشفعة)یە:

**یەکەم - تەڵاق:**

بریتییە لە کۆتاهێنان بە پەیوەندیەکی هاوسەری بە رەفتارێکی گوفتاریانەی تاکەکەس لەلایەن مێردەوە، یان لەلایەن ژنی سەرپشککراو یان لەلایەن قازیەوە.

---

[1] سورة الإسراء/ ٣٣.

لەوانەیشە بە ڕێکەوتنی ژن و مێرد بێ کە پێی دەوترێ داماڵین (الخلع)، ئەمەی دوواییان لە دەرەوەی بابەتی ئێمەیە.

تەڵاقیش ناکۆتا (رجعي) یان کۆتا (بائن)ـە، بائینیش یان بەینونەی بچوك یان گەورەیە.

أ- تەڵاقی ناکۆتا: هەموو جیابوونەوەیەکە پاش چوونەلای ژن بەو مەرجەی بە باتی (عوض)، یان بۆ جاری سێیەم نەبێ.

حوکمی: مێرد بۆی هەیە بەر لە تەواوبوونی عیددەی، ژنەکەی بەبێ عەقد و مارەییەکی نوێ بگێڕێتەوە.

ب- بەینونەی بچوك: هەموو جیابوونەوەیەکە پێش چوونەلا یان بە باتی یان بۆ جاری یەکەم یان بۆ جاری دووەم.

حوکمی: ژن و مێرد بۆیان هەیە بە عەقد و مارەییەکی نوێ دەست بەژیانی هاوسەری بکەنەوە.

ج- بەینونەی گەورە: تەڵاقدانە بۆ جاری سێیەم.

حوکمی: گێڕانەوەی ژیانی هاوسەری نە بە رەجعە و نە بە گرێبەندێکی نوێ دروست نیە تا ژنەکە بەشێوەیەکی ئاسایی شوو نەکاتەوە و مێردەکەی سەرجێیی لەگەڵ بکا، پاش ئەوە ئەگەر مێردی دووەمی بەشێوەیەکی ئاسایی تەڵاقیدا، یان مرد و عیددەی تەواو بوو، بۆی هەیە بە گرێبەند و مارەییەکی نوێ شوو بە مێردی یەکەمی بکاتەوە.

هەریەك لە هاوسەری (زواج) و تەڵاق پابەندیی دارایی و نادارایی خۆیان هەیە:

أ- پابەندییە داراییەکانی هاوسەری: پابەندبوونی مێردە بە نەفەقەکێشانی ژن لە رۆژی مارەکردن و مارەیی پێشخراو (یاخود حازر) و مارەی دواخراوی تەواو پاش چوونەلا (الدخول). مێرد لە رۆژی مارەکردنیەوە پابەند دەبێ بە نەفەقەکێشانی ژنەکەی جا چ ژنەکە هەژار بێ یان دەوڵەمەند، هەروەها پابەند دەبێ بە دانی مارەیی ناونراو (المسمی) یان مارەیی هاوشێوە (مهر المثل)، جا

چ حازر بێ یان دواخراو[1]. هەموو دواخراوێکیش بە مردن یان جیابوونەوە دەبێتە حازر.

ب- پابەندییە نادارایییەکانی هاوسەری: مێرد پابەند دەبێ بە هاوژیانیکردنی ژنەکەی لەڕووی چێژوەرگرتنی ناوبەناو و لەڕووی تێکەڵبوون و خۆشەویستی و ڕێزگرتنی دووسەرە و ئەو شتانە.

هەروەها جیابوونەوەیش کۆمەڵێ پابەندی لێدەکەوێتەوە، کە هەندێکیان دارایی و هەندێکیان نادارایین:

أ- ئەو پابەندییە داراییانەی لە جیابوونەوە، واتە تەڵاق دەکەونەوە ئەمانەن:

یەکەم- نەفەقەی عیددە: مێرد پابەند دەبێ بە خەرجیکێشانی ژنە تەڵاقدراوەکەی وەك ئەوکاتەی ژنی بووە، تا ماوەی عیددەکەی تەواو دەبێ.

دووەم- مارەییە دواخراوەکەی بداتێ، کە بە جیابوونەوە بووەتە حازری.

سێیەم- چێژ (المتعة): بریتییە لە بڕێك ماڵ لە پارە یان شمەك یان جلوبەرگ یان هەر پێویستیەکیتری ماڵی، کە ژن پاش تەڵاق سوودیان لێوەردەگرێ.

چوارەم- کرێی شیردان: مێرد لەکاتی هاوسەریدا پابەند نیە بە دانی ئەم کرێیە، بەڵام پاش جیابوونەوە پێویستە بیداتە شیردەر جا دایکی بێ یان کەسێکیتر تا ماوەی شیرەخۆری تەواو دەبێ، مەگەر دایکەکە خۆی بە ویستی خۆی شیری بداتێ.

پێنجەم- نەفەقەی دایەنی: ئەمەیش پاش جیابوونەوە لەسەر مێرد واجب دەبێ تا ماوەی دایەنی تەواو دەبێ، بەردەوامیش دەبێ تا دایەنیکراو (المحضون) لە

[1] مارەیی هاوشان مارەیی کەسێکی هاوشێوەی ژنەکەیە لە هەموو سیفەتەکانیدا و لە چەند حاڵەتێکدا واجبە، لەوانە:

أ- ئەگەرمارەییەکە هەر لە بنەڕەتدا دیاری نەکرابوو.

ب- ئەگەر بڕی مارەییەکە نەزانراو بوو.

ج- ئەگەر ماڵێکی نابەردەست و بێکەڵك بێ.

د- ئەگەر موڵکی ئەو کەسە نەبوو کە پابەند دەبێ بە دانی.

دایەنەکەی بێنیاز دەبێ و بۆ دابینکردنی پێویستیەکانی ژیان پشت بەخۆی دەبەستێ.

شەشەم- قەرەبووکردنەوەی ژن لە تەڵاقی ملهوڕانە (تعسفی)، واتە ئەو تەڵاقەی هیچ پاساوێکی نیە و لە هەمان کاتدا زیان بە ژنەکە دەگەیەنێ.

تەڵاقدان بە ویستی تاکلایەنە لەلایەن مێرد یان ژن یان قازیەوە ئەو پابەندیانەی لە هاوسەرگیری دەکەونەوە و باس کران ناهێڵێ، لە هەمان کاتدا پابەندیی نوێ لەسەر مێردەکە پەیدا دەکا، ئەویش ئەو شەش پابەندیەن کە باس کران، ئەمە جگە لە پابەندبوونی ژنەکە بە دان بەخۆداگرتن (التربص) لە ماوەی عیددەدا، کە ئەویش تەواوکردنی سێ قورئە[1]، یان دانانی سکەکەی ئەگەر دووگیان بوو، یان تەواوکردنی سێ مانگ ئەگەر لە تەمەنی سوڕی مانگانە (بێنوێژی)دا نەبێ یان چووبێتە تەمەنی نائومێدبوونەوە (اليأس). تەمەنی نائومێدبوونیش لەنێوان (٤٥-٥٥)ساڵیدایە[2].

**دووەم: لەپێشبوون (شەفیعبوون):**

لەڕووی زمانەوانیەوە بریتییە لە خستنەپاڵ (الضم). لە زمانی یاسایی و فیقهیدا بریتییە لە مافی خاوەنداریکردنی بەزۆری ئەو خانوبەرەیەی بە ئیرادەی تاکەکەسی فرۆشراوە بەو نرخ و خەرجییە باوانەی لە کڕیار سەنراون[3].

**ڕەگەزەکانی شەفیعبوون:**

لە گرنگترین ڕەگەزەکانی ئەمانەن:

١- ماڵە شەفیعدار (المشفوع)ەکە خانوبەرەیەکی موڵک بێ، لەبەرئەوەی شەفیعبوون لە گوازراوەکاندا نیە لەبەر نەبوونی ئامانجە هۆ (فەلسەفە) بۆ ڕێپێدان بە

---

[1] شەرعناسان لەبارەی مانای (القرء)ەوە جیاوازیان هەیە، کە لەفزێکی هاوبەشە لەنێوان پاکبوونەوە و بێنوێژی (واتە حەیز)دا، هەندێکیان بە حەیزیان راڤە کردوە.

[2] بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە ئەک کتێبەمان: أحكام الزواج والطلاق في الفقه الإسلامي المقارن، دراسة مقارنة بالقانون.

[3] یاسای مەدەنیی عێراقی (م/١١٢٨).

شەفیعبوون، ئەویش وەك روخسەت و هەڵاوێراو لە رێسای (ضرورة توافر التراضي في المعاوضات) (واتە: زەرورەتی بوونی رەزامەندیی دووسەرە لـە ئاڵوگۆڕەکانـدا). ئـەو هۆیەیش بریتییە لە لادانـی ئـەو زیانـە چاوەڕوانکراوەی لەوانەیـە دووچـاری بـەهۆی شەریکە نوێکەوە شەریکەکەی پێشوو ببێ.

٢- شەفیعەکە شەریك بێ، شەفیعبوون بۆ دراوسێ نیە جا لە تەنیشتەوە بێ یان بەرانبەر.

٣- لە زیانیشدا شەریك بـێ نـەك تـەنها لـە سـوودا، هەربۆیـە نـە ئـەو کەسـەی سوودەکەی بەکرێ گرتووە و نە ئەو کەسەی وەسێتی بۆ کراوە سوودەکەی بـدرێتێ چ بەکاتی بێ یان هەمیشەیی، نابنە شەفیع.

٤- بـەخاوەنبوونی شـەریکە نوێکـە لـە بـەخاوەنبوونی شـەریکەکەی پێشـوو دواکەوتووتر بێ، ئەگەر دوو کەس بەیەکەوە خانوویەکیان کڕی، هیچکامیان شەفیعی بەسەر ئەویتریاندا نابێ.

٥- ئـەو خانوبەرەیـەی شـەفیعبوونی تێکـەوتووە بفرۆشـرێ و پایـە و مەرجـە یاساییەکانی تێدا هاتبێتە دی.

٦- گرێبەندەکە ئاڵوگۆڕ بێ و ئەگەر شەریکە نوێکە لەڕێی مـیرات یـان وەسێت یان خێر و ئەو جۆرە بەخشینانەوە بوو بە خـاوەنی خانوبەرەکـە ئـەوا شـەفیعبوون لەئارادا نابێ، جا ئەگەر یەکێك لەو دوو کەسـەی خانوبەرەیـەکی شـەریکییان هەیـە، پشکەکەی خۆی بە کەسێکیتر بەخشی، هاوبەشەکەی بۆی نیـە داوای شـەفیعبوونی لێ بکات.

٧- داوای شەفیعبوون پاش دامەزرانی گرێبەندەکە دواکەوتنێکی وا دوانەکەوێ کە عورف بە دەستهەڵگرتن لە مافی شەفیعبوون یان پشتتێکردنی دابنێ.

یاسای مـەدەنیی عێراقـی مـاوەی کۆنبـوونی لـەم بابەتـەدا بـە شـەش مـانگ لـە تەواوبوونی رۆژی فرۆشتنەکەوە (م/١١٣٥) دیاری کردوە.

ئەگـەر ئـەو رەگەزانـە هاتنـەدی و بەربەسـت لەبـەردەم شـەفیعیدا نـەبوو، کـە

گوفتارێکی ئیرادیی تاکەکەسییە، دەبێتە هۆی پەیداکردنی پابەندی لەسەر کەسی شەفیع، وەك پابەندبوون بە دانی ئەو نرخ و خەرجە ئاساییانەی کەوتونەتە سەر کڕیار، هەروەها پابەندبوون بەوەی چ زیادە نرخێك بەهۆی بیناکردن یان چاندنەوە چووەتە سەر نرخی خانوبەرەکە بیداتە کڕیار ئەگەر هاتوو کڕیار بینای لە موڵکە شەفیعدارەکە دروست کردبوو، یان داروباری تێدا چاندبوو بەر لەوەی لەوە ئاگەدار بکرێ کە ئارەزووی شەفیعبوونی لەسەرە[1].

بەڵام ئەگەر ئەو کارە پاش ئاگەداربوون کرا ئەوا کەسی شەفیع مافی هەیە داوای هەڵتەکاندنی بکا ئەگەر زیانی بە خانوبەرەکە نەدەگەیاند، ئەگینا بۆی هەیە بیناکە یان چاندنەکە بەو نرخەی شایستە بە هەڵکەندنە، بهێڵێتەوە[2].

لە هەمان کاتدا شەفیعبوون وەك رەفتارێکی گوفتاریانەی تاکەکەسی دەبێتە هۆ بۆ کەوتنی ئەو پابەندیانەی کڕیار بەرانبەر فرۆشیار کە لە فرۆشتنەکە دەکەونەوە، هەروەها مافی رەفتارکردنی بە موڵکە شەفیعدارەکە نامێنێ پاش ئەوەی ئاگەدار دەکرێ کە ئارەزووی شەفیعبوونی لەسەرە.

**لە رێگرەکانی شەفیعبوون ئەمانەن:**

١- کۆنبوون: ئەگەر ماوەی شەش مانگ بەسەر تەواوبوونی فرۆشتنەکەدا تێپەڕی، مافی دەعوای شەفیعبوون بەسەردەچێ، ئەو ماوەیە بۆ حیجرکراو و غایبەکانیش کاری پێدەکرێ.

٢- ئەگەر فرۆشتنەکە بە زیادکردنی ئاشکراو لە رێگەی قەزا و ئیدارەوە بوو.

٣- ئەگەر فرۆشتنەکە لەنێوان ژن و مێرد یان لەنێوان بنەچە و وەچەکان (ئەسڵ و فەرعەکان) یان دەستوپێوەندا بوو تا پلەی چوارەم[3].

---

[1] مەدەنیی عێراقی (م/١١٤٣).

[2] سەرچاوەی پێشوو.

[3] وەك مام و خاڵ و پوورەکان لەسەری باوك و دایکەوە.

٤- ئەگەر مەبەست لە کڕینی خانوبەرەکە ئەوە بوو بکرێتە شوێنی پەرستن، یان بخرێتە سەر شوێنی پەرستن و لە فەرمانگەی تۆماری خانوبەرە بەو شێوەیە تۆمار کرا.

٥- ئەگەر ئەو کەسەی مافی شەفیعبوونی هەیە راشکاوانە یان بە ئاماژە دەستی لەو مافە هەڵگرت، با بەر لە فرۆشتنەکەیش بێ.

٦- ئەگەر ئەو خانوبەرە شەفیعدارەکە وەقف بوو.

٧- ئەگەر شەفیعەکە داوای بەشێ لە ماڵە شەفیعدارەکەی دەکرد و وازی لە بەشێکیتری هێنا، چونکە شەفیعبوون بەشبەشکردن قبوڵ ناکا.

٨- ئەگەر شەفیعەکە لە ماوەی مانگێك لە راگەیاندنی ئارەزووی کڕینی، دەعوای شەفیعبوونی لەسەر هەریەك لە فرۆشیار و کڕیار بەرز نەکردەوە.

٩- ئەگەر چەردەیەك پارە لە سندوقی ئەو دادگەیەدا دانەنا کە خانوبەرە شەفیعدارەکە لە فەرمانگەکەیدایە، کە یەکسان بێ بە نیوەی ئەو نرخە راستەقینەیەی پێی فرۆشراوە.

ئەگەر ئەم رێگرانە نەبوون و ئەو رەگەزانەی باس کران هەبوون، خاوەنداریتیی شەفیعەکە بۆ ماڵە شەفیعدارەکە جێگیر دەبێ، ئەویش پاش جێبەجێکردنی حوکمی قەزایی یان رێکەوتنی رەزامەندی و تۆمارکردنی لە فەرمانگەی تۆماری خانوبەرە. بەوە شەفیعەکە لە هەموو ماف و پابەندیەکانیدا لەبەرانبەر فرۆشیاردا جێی کڕیار دەگرێتەوە، بەڵام مافی ئەوەی نیە وەك کڕیار ماوەیەکی بدرێتێ بۆ دانی پارەکە، بەڵکو پابەند دەبێ بە دانی پارەکە و هەر مافێکی فرۆشیار کە بەحازری بکەوێتە سەر کڕیار، مەگەر (فرۆشیار) بە مانەوەی وادەکە یان دانانی وادەیەکیتر رازی بێ[1].

---

[1] لە یاسا عەرەبیەکاندا بڕوانە ئەم سەرچاوانە: یاسای مەدەنیی عێراقی مادەکانی (١١٢٨-١١٤٤)، ئوردنی (١١٥٠-١١٧٠)، کوێتی (٨٩١-٩٠٤)، یەمەنی (١٢٣١)، میسری (٩٣٥-٩٤٨).
هەندێ جیاوازی لەنێوان ئەم یاسایانەدا هەیە لەڕووی رەگەز و حوکمەکانی شەفیعیەوە، بەڵام ئەرکی ئێمە نیە بچینە وردەکاریەکان، چونکە ئەوەی لە شەفیعیدا بەلامانەوە گرنگە ئەوەیە ←

# باسی دووەم:
# رەفتاری تاکەکەسیی کرداریی بەسوود
# (فوزالە)

لێکۆڵینەوە لەم بابەتە بەسەر سێ خواستدا دابەش دەکرێ، یەکەمیان تەرخان دەکرێ بۆ چۆنێتیی چارەسەرکردنی خۆهەڵقورتاندن (الفضالة) لە یاساکاندا، دووەمیان بۆ رەگەزەکانی و سێیەمیشیان بۆ حوکمەکانی.

## خواستی یەکەم:
## چۆنێتیی چارەسەرکردنی فوزالە لە یاساکاندا

لە دیارترین پیادەکردنەکانی رەفتاری تاکەکەسیی کرداریی بەسوود (فوزالە).

فوزالە: بریتییە لە هەستانی کەسێك بە کارێکی بەپەلە کە ئەرکی ئەو نەبووە، بەمەبەستی بەرژەوەندیی کەسیتر[1].

---

رەفتارێکی گوفتاریانەی تاکانەیە هەندێ پابەندی پەیدا دەکات و لە هەمان کاتدا هەندێکیتر دەخات.

[1] ئەم پێناسەیەم هەڵبژارد لەبەرئەوەی کورتتر و وردتر بوو لە پێناسەکەی مامۆستا ئەلسەنهوری لە الوسیط ۱۳۸۵/۱ کە لە مادەی (۱۸۸)ی یاسای مەدەنی وەرگیراوە بەوەی فوزالە بریتییە لەوەی کەسێك بەئەنقەست کارێکی بەپەلە بۆ بەرژەوەندیی کەسێکیتر ئەنجام بدات، بەبێ ئەوەی ئەرکی ئەو بێ ئەوە بکا".

یاسا عەرەبیەکان[1] و یاساناسان و شەرحکارانی[2] مامەڵەیەکی پێچەوانەی ڕێساکانی مەنتیقی یاسایی و فەلسەفەی یاسایی فوزالەیان کردوە، لە چەندین رووەوە، لەوانە:

یەکەم: فوزالەیان بە هاوبەشکەی ئیرادەی تاکەکەسی داناوە لە سەرچاوەکانی پابەندیدا، لەکاتێکدا بەشێکە لەو ئیرادەیە و لە گرنگترین پیادەکردنەکانیەتی، بەڵگەنەویستیشە هاوبەشکەی هەر شتێك لەو شتە جیاوازە و هەریەکەیان بەسەر ئەوەدا ناچەسپێ کە ئەویتریان بەسەریدا دەچەسپێ، لەکاتێکدا بەشی شت بەرەهایی لە شتەکە تایبەتترە و لەکوێ بەدیهات دابەشکراو (مقسم)ەکەیش لەتەکیدا بەدیدێ، بەڵام نەك بەپێچەوانەوەی تەواوەتی، چونکە دەشێ دابەشکراو لەگەڵ بەشێکیتری جیا لەو بەدیدی بێ.

دووەم: لە هەندێ یاسادا فوزالە کراوەتە بەشێك لە زەنگینبوون بەبێ هۆ، وەك یاسای مەدەنیی میسریی بەرکار[3]، کە لە فەسڵی چوارەمدا لە سەرچاوەکانی پابەندیدا زەنگیبوون بەبێ هۆی دابەش کردوە بۆ بژاردنی ناشایستە (دفع غير المستحق)[4] و فوزالە[5]. هەروەها وەك یاسای مەدەنیی ئوردنیی بەرکار کە لە فەسڵی چوارەمدا لە سەرچاوەکانی پابەندیدا کرداری بەسوودی بۆ بەدەستهێنان بەبێ هۆ[6] و وەرگرتنی ناشایستە[7] و فوزالە[1] و دانەوەی قەرزی کەسیتر[2] دابەش کردوە.

---

[1] لەوانە یاسای میسری (م/١٨٨–١٩٧)، عێراقی (م/٢٢٣–٢٤٤)، ئوردنی (م/٣٠١–٣٠٨).

[2] لەوانە مامۆستا ئەلسەنهوری، الوسیط، ١٣٨٤/١ و پاشتر/ مامۆستا مرقس، أصول الالتزامات، ص٥٠٣ و پاشتر/ مامۆستا عبدالمنعم الصدة، مصادر الالتزام، ص٦١٩ و پاشتر/ مامۆستا عبدالحي حجازي، النظرية العامة للالتزام، ٦١٦/١ و پاشتر.

[3] مادەکانی (١٨١–١٨٧).

[4] مادەکانی (١٨٨–١٩٧).

[5] مادەکانی (٢٦٣–٢٩٥).

[6] مادەکانی (٢٩٣–٢٩٥).

[7] مادەکانی (٢٩٦–٣٠٠).

ئەم دابەشکردنانە لە ترازووی مەنتیق و فەلسەفەدا رەتکراوەن، لەبەرئەوەی زەنگیبوون بەبێ هۆ ناڕەوایە لەبەر نەبوونی هۆیەکی رەوا، هەر شتێکیش ناڕەوا بێ بەتاڵە، هەروەها بژاردنی ناشایستەیش ناڕەوایە لەبەر نەبوونی هۆکە و ئەویش بەتاڵە، لەکاتێکدا فوزالە کارێکی رەوای ئینسانییە و لە بابی هاوکاریکردنە لەسەر چاکە و دروستە، هەروەها ئەگەر پایە و مەرجەکانی هاتنەجێ، ماف و پابەندیی یاسایی و شەرعی لێ دەکەوێتەوە، ئیتر چۆن رەوایە ئەوەی ناڕەوا و بەتاڵە دابەش بکرێ بۆ بەتاڵی ناڕەوا (بژاردنی ناشایستە) و دروستی رەوا (فوزالە)؟

هەمان شتیش لەبارەی دابەشکردنەکەی یاسای مەدەنیی ئوردنی: دابەشکردنی کەسب بەبێ هۆ کە ناڕەوا و بەتاڵە بۆ بەتاڵی ناڕەوا (وەرگرتنی ناشایستە) و دروستی رەوا بگرە لە هەندێ حاڵەتدا واجب، ئەویش فوزالە و دانەوی قەرزی کەسیترە.

پاشان دانەوەی قەرزی کەسیتر بەشێکە لە فوزالە، ئیتر چۆن دروستە بکرێتە هاوبەشکەی، لەگەڵ ئەوەی هاوبەشکەی شت جیاوازە لە شتەکە، بەشەکەیشی بەرەهایی لەو تایبەتترە.

ئەمە چ گاڵتەجاڕیەکی یاساییە بۆ چارەسەری هەندێ بابەتی گرنگ لە مامەڵە داراییەکاندا؟!

سێیەم: یاسا عەرەبیەکان و یاساناسان زەنگینبوون بەبێ هۆ (یان بەدەستهێنان بەبێ هۆ)یان کردوەتە هاوبەشکەی کاری ناڕەوا (یان کردەوەی ناڕەوا) یان (کردەوەی زیانبەخش) بەپێی دەربڕینە جیاوازەکان لەو یاسایانەدا، لەگەڵ ئەوەی بەدەستهێنان بەبێ هۆ (یان زەنگینبوون بەبێ هۆ) وەك پێشتر باسمان کرد، کارێکی ناڕەوا و زیانبەخشە، جا چۆن دەکرێ بەشی شتێك بکرێتە هاوبەشکەی لەگەڵ ئەوەی بەش بەرەهایی لە بەشکراوەکەی تایبەتترە، هاوبەشکەی شتیش لە شتەکە جیاوازە، بۆیە یەکێکیان بەسەر هەر تاکێکدا ناچەسپێ کە ئەویتر بەسەریدا دەچەسپێ.

---

[1] مادەکانی (٣٠١-٣٠٨).

[2] مادەکانی (٣٠٩-٣١٠).

چوارەم: زاراوەی (زەنگینبوون بەبیٚ هۆ) وەك سەرچاوەیەك لـە سەرچـاوەکانی پابەندی بەگوتەی زانایانی یاسا و بەو شێوەیەی لە زۆریەی یاساکاندا جـێگیر بـووە، زاراوەیەکی هەڵەیە لە زمان و عـورفی عەرەبدا، لەبەرئـەوەی نابێتـە سەرچـاوەیەکی پابەندی تا ئەم چوار رەگەزەی تێدا نەیەتەدی:

١- دەوڵەمەندبوونی ئەو کەسەی بەبیٚ پاساو ماڵی کەسیتری بەدەست هێناوە.

٢- هەژارکەوتنی خاوەنی ئەو ماڵەی ماڵەکەی بەشـێوەیەکی نـاڕەوا بـۆ کەسـیتر گوێزراوەتەوە.

٣- بوونی پەیوەندیەکی هۆیی لەنێوان دەوڵەمەنـدبوون و هەژارکەوتنـدا، بـەوەی دووەمیان لە یەکەمیان بکەوێتەوە.

٤- نەبوونی هۆیەکی دروست و ڕەوا.

هەردوو دەستەواژەی دەوڵەمەندبوون و هەژارکەوتن لە زمـان و عـورفی عەرەبـدا روونن، بەڵگەنەویستە دەوڵەمەندبوون بەبیٚ ماڵێکی بەنرخ یان بڕێکی زۆر پەیدا نـابیٚ بەشێوەیەك دۆخی ئابووری بەشێوەیەکی بەرچاو بگۆڕیٚ، هـەروەها هەژارکـەوتنیش ناکریٚ بەبیٚ لەدەستدان یان لەکیسچوونی ماڵێکی بەنرخ یان بڕێکی زۆری روویدات.

لێکدانەوەی زانایانی یاسا بـۆ زەنگینبـوون بـە زیـادبوونی توخمـە ئەرێنیەکـە لـە ئەستۆی دارایی ئەو کەسەی لەسەر حسابی کەسیتر زەنگین بووە و کـەمکردنی ئـەو توخمـە لـە ئەسـتۆی هەژارکـەوتوودا، پێچـەوانەی شـەرع و مـەنتیقی یاسـاییە، لەبەرئەوەی ئەو کەسەی بەبیٚ هۆیەکی شەرعی ماڵی کەسیتری بەدەست هێناوە ئەو ماڵە نابێتە مـوڵکی، لەبەرئـەوە نابێتـە تـوخمێکی ئـەرێنی لـە ئەسـتۆی دارایـی ئـەو کەسەدا، هەروەها ئەو کەسەی ماڵێك لەدەست دەدات لە موڵکی ئەو دەرناچیٚ و هەر موڵکی ئەوە لە دەستی هەر کەسدا بیٚ، ئـیتر چـۆن دروسـتە هـەردوو دەسـتەواژەی زەنگینبوون و هەژارکەوتن لەم بابەتەدا بەکار بێن.

یاسادانەری عێراقی کارێکی چاکی کردوە کە دەستەواژەی (بەدەسـتهێنان بـەبیٚ هۆ)ی لەباتیی (زەگینبوون بەبیٚ هۆ) بەکار هێناوە، لەبەرئەوەی یەکەمیان هەر بڕێکی

زۆر یان کەم کە مرۆڤ بەشێوەیەکی ناشەرعی دەستی بکەوێ دەگرێتەوە، بۆیە دەبێ دەستبەجێ بۆ خاوەنە شەرعیەکەی بگێڕێتەوە.

دەکرێ بنچینەی ئەم هەڵە یاساییانە و هاوشێوەکانیان بۆ ئەم هۆیانەی بگەڕێنرێتەوە:

١- شارەزانەبوون لە هەردوو زانستی مەتیق و فەلسەفە.

٢- تێکەڵکردن لەنێوان هۆکانی پابەندی و سەرچاوەکانی پابەندیدا.

٣- تێکەڵکردن لەنێوان رەفتارە یاساییەکان (التصرفات القانونیة) و رووداوە یاساییەکان (الوقائع القانونیة)دا و دانانی هەر کردەوەیەك بە واقیعەیەکی یاسایی جا ئیرادی بێ یان نا، هاوکات حەسرکردنی رەفتاری یاسایی لە گرێبەند ویستی تاکلایەنەدا.

٤- هەڵەکردن لە وەرگێڕانی زاراوەکە لە زمانێکی بیانیەوە بۆ زمانی عەرەبی.

٥- گرنگینەدان بە ئیرادەی تاکەکەسی وەك سەرچاوەیەکی پابەندی وەك دەڵێن، یان هۆی پابەندی وەك مەنتیقی یاسایی دەڵێ. ئەمە لەکاتێکدا نزیکەی ٩٠٪ی هۆکانی پابەندییە مەدەنی و جینائیەکان بۆ ویستی تاکلایەنە دەگەڕێنەوە.

# خواستی دووەم:
# رەگەزەکانی فوزالە

وەك پێشتر چەندین جار باسمان کرد رەگەزەکانی هەر شتێك ئەوەیە ئەو شتە لەسەریان دەوەستێ. جا ئەگەر رەگەزەکە بەشێك بوو لە چییەتیەکەی پێی دەوترێ پایە، ئەگینا پێی دەوترێ مەرج. سەرباری ئەوەیش شەرحکارانی یاسا رەگەز و پایە و مەرجەکانیان تێکەڵ کردوە و هەندێکیان لەباتیی ئەویتریان بەکارهێناوە وەك ئەوەی وشەی هاومانا بن.

لەم بابەتەماندا، واتە خۆهەڵقورتاندن (فوزالە) هەندێکیان هەموو رەگەزەکانی فوزالەیان بە پایەی فوزالە داناوە[1] و گوتویانە: پایەکانی فوزالە بەپشتبەستن بە پێناسەکەی کە لە مادەی (١٨٨)ی یاسای مەدەنیی میسریی بەرکاردا هاتووە، سیانن، کە بەدەق دەڵێ: (فوزالە: ئەوەیە کەسێك بەئەنقەست کارێکی بەپەلە بۆ کەسێکیتر ئەنجام بدا بەبێ ئەوەی ئەوە ناچار بێ بەوە).

ئەوانیش ئەمانەن:

١- پایەی ماددی: ئەوەیە کەسی خۆهەڵقورتێن (فزول) کارێکی بەپەلە بۆ کەسێکیتر ئەنجام بدات.

٢- پایەی مەعنەوی: ئەوەیە کەسی فزولْ مەبەستی لە ئەنجامدانی ئەو کارە بەپەلەیە، بەرژەوەندیی خاوەن کار بێ.

---

[1] لەسەرووبانەوە: السنهوري، الوسیط ١٣٨٧/١ و پاشتر، والأستاذ مرقس، أصول الالتزامات، ص٥٥٣ و پاشتر. الأستاذ عبدالحي حجازي، النظرية العامة للالتزام ٦١٢/١ و پاشتر. الأستاذ صلاح الدين الناهي، محاضرات في القانون المدني العراقي، الكسب دون سبب والفضالة كمصدرين للالتزامات، ص٢٠٩ و پاشتر.

٣- پایەی یاسایی: ئەوەیە لە بەرانبەر ئەم کارە بەپەلەیەدا، نە پێ-پابەند، نە تێدا بریکار و نە قەدەغەلێکراوێك نەبێ.

شایانی باسە دەستەواژەی پایەی یاسایی مامۆستای رەحمەتی سەنهوری بەکاری هێناوە و لەو دەربڕینەدا زۆربەی زانایانی یاسا لە وڵاتانی عەرەبی بەبێ سەرنجدان لە ناوەڕۆکی دەربڕینەکە لاساییان کردۆتەوە، لەبەرئەوەی ئەگەر مەبەست لە لەفزی (یاسایی) دانانی یاسا بێ بەم پایەدا، ئەوا ئەسڵ وایە هەموو پایە یان رەگەزێك بەوە وەسف بکرێ، لەبەرئەوەی لەنێوان هەمووان‌دا هاوبەشە.

ئەگەر مەبەستیش لێی رێکخستنی یاسایی بێ، ئەوا رێکخستنی هەموو شتێك بە یاسا پێی ناوترێ رەگەز، لەبەرئەوەی رەگەزەکانی هەر زاراوەیەکی یاسایی لە بووندا پێش رێکخستنی دەکەون.

هەندێکیان[1] هەموو رەگەزەکانی فوزالەیان بە مەرج ناوبردوە و گوتویانە: بۆ ئەوەی فوزالە بێتەدی پێویستە سێ مەرجی تێدا بێتەدی:

١- کەسێك کارێکی بەپەلە بۆ کەسێکیتر ئەنجام بدات، ئەمە رەگەزە مادییەکەیە.

٢- مەبەستی ئەو کەسەی ئەو کارە بەپەلەیە ئەنجام دەدا بەرژەوەندیی کەسەکەیتر بێ، ئەمە پایە مەعنەویەکەیە.

٣- ئەو کەسەی ئەو کارە بەپەلەیە ئەنجام دەدات ناچار نەبێ ئەو کارە بکا، ئەمەیش پایەیێکی یاساییە.

سەیر ئەوەیە خاوەنانی ئەم ئاراستەیە جیاوازی لەنێوان پایە و مەرجدا ناکەن و پێیان وایە دوو لەفزی هاومانان، هەربۆیە لە یەك زاراوەدا دەستەواژەی پایە و مەرجیان بۆ هەموو رەگەزێك بەکارهێناوە.

---

[1] لەپێشیانەوە د.عبدالمنعم فرج الصدة، مصادر الالتزام، ص٦٢، بەندی (٥٧٨)، لەژێر ناونیشانی: شروط الفضالة، (النصوص القانونية شروط ثلاثة).

هەروەها سەیریشە سەنەدی هەردوو ناونانەکە (پایە و مەرج) یاسای مەدەنیی میسریی بەرکارە[1].

**پایە و مەرجەکانی فوزاله لە ترازووی مەنتیقی یاساییدا:**

بەپێی ڕێساکانی مەنتیقی یاسایی پایەکانی فوزاله سیانن، کە بریتین لە: بکەر و کراو و بۆکراو، هەر پایەیێکیش مەرجی تایبەت بەخۆی هەیە، بەم شێوەیە:

**پایەی یەکەم: بکەر (العامل):**

کە پێی دەوترێ خۆهەڵقورتێن (فزولێ) یان چەکەکار (المتفضل):

ئەو کەسەیە بەبێ پابەندیەکی پێشوەخت کارێکی بەپەلە و بەسوودی زەرور بۆ بەرژەوەندیی ئەویتر ئەنجام دەدا. لە مەرجەکانی:

١- لەبەر هۆیەکی پێشتر پابەندکراو (ملزم) نەبێ بەکردنی ئەو کارە.

٢- نوێنەری ئەو کەسە نەبێ کە کارەکە لەپێناویدا دەکا نە نوێنەرایەتیەکی بەرێکەوتن وەك بریکاری، نە نوێنەرایەتیەکی یاسایی وەك ویلایەت و نە نوێنەرایەتیەکی قەزایی وەك ئەو وەسیەی لەلایەن قازیەوە دانراوە و ئەو یاریدەدەرە قەزاییەی دادگە دیاریدەکا و یارمەتی حیجرکراوەکان دەدا لەو ڕەفتارانەی تێیاندا وەسی پێویستی بە مۆڵەتی دادگە هەیە.

٣- شیانی فامکردن (التمییز)ی هەبێ و مەرج نیە شیانی گرێبەنکردنی هەبێ بۆ ئەنجامدانی پابەندییە دووسەرەکان، لەبەرئەوەی ڕەفتاری فزولی لەڕووی ئاکامەوە ئاڵوگۆرە.

٤- مەبەستی لەو کارە بەدیهێنانی بەرژەوەندیی کەسیتر بێ نەك بەرژەوەندیی شەخسیی خۆی.

---

[1] مادەکانی (١٨٨-١٩٠).

٥- ئەوەی دەستی پێکردوە تەولوی بکا تا خاوەن کارەکە بتوانێ خۆی پێی هەستێ.

شایانی باسە شەرحکارانی یاسا ئەو برگەیەیان لە مەرجەکان داناوە و منیش بەگوێرەی ئەوان باسم کرد، بەڵام بە رای لەخۆبوردوانەی ئێمە ئەوانە لە راستی و واقیعدا لە پابەندیەکانی کەسی فزولێن، ئەوەیش روونە جیاوازیەکی دیار لەنێوان مەرج و پابەندیدا هەیە، یەکەمیان پێش شتەکە دێت و دووەمیان پاش شتەکە.

٦- نیازی نەبێ خۆبەخشانە کۆشش بەخەرج بدات و لە ماڵی خۆی بۆ بەرژەوەندیی کەسیتر ببەخشێ، ئەم مەرجەیش لە رێگەی قەرینە و هەلومەرجی بکەر و کارەکەوە دەزانرێ.

٧- گومانی وانەبێ بۆ بەرژەوەندیی خۆی ئیش دەکا پاشان دەربکەوێ بۆ بەرژەوەندیی کەسیتر ئیش دەکا، لەبەرئەوەی نیەت مەرجە، بۆیە بە دەعوای فوزالەوە ناتوانێ (بۆ دەسکەوتنەوەی مافەکەی) بگەرێتەوە سەر خاوەن کار، بەڵکو بە دەعوای زەنگینبوون بەبێ هۆ دەگەرێتەوە[1].

٨- لە کارەکەیدا کۆششی پیاوی ئاسایی بەخەرج بدات.

**پایە ی دووەم: کراو (المعمول):**

ئەو کارەیە کەسێك بۆ بەرژەوەندیی کەسیتر دەیکا وەك رەفتارێکی یاسایی وەك کرین و فرۆشتن، یان کارێکی ماددی وەك دروستکردنەوەی شوورەی تێکچووی دراوسێیەك بەبێ ئاگەداریی خاوەنەکەی.

**لە مەرجەکانی:**

١- کارێکی بەپەلە بێ و بترسێ دواکەوتنی زیانێکی لێبکەوێتەوە کە خاوەنی کارەکە خۆی لەکاتی گونجاودا توانای نیە پێی هەستێ.

---

[1] الوسیط ١/١٣٩٨، مجموعة الأعمال التحضیریة المصریة، ٤٧١/٢.

٢- ئەو کارە بۆ ئەو کەسەی بۆی ئەنجام دەدرێ زەرور بێ تا رێگە لە زیان یان زەرەرێك بگیرێ کە لە دواکەوتنی دەکەوێتەوە، ئەو زەرورەتەیش لەو کاتەی دەستوەردانەکە روودەدا مەزەندە دەکرێ نەك پاش ئەوە، جا چ کارێکی یاسایی بێ وەك فرۆشتنی ماڵێك کە زوو خراپ دەبێ، یان کارێکی ماددی بێ وەك بەرگریکردنی شەرعی لە ماڵی کەسیتر کە تووشی دزی یان داگیرکردن بووە.

٣- بەسوود بێ بۆ ئەو کەسەی بۆی ئەنجام دەدا، بەشێوەیەك گومان لەوەدا نەبێ کە ئەگەر خاوەن کارەکە بیزانیایە پێویستی پێیەتی و لەتوانایدا بووایە بیکا، لە کردنی دوانەدەکەوت.

٤- لەلایەن شەرعدانەر یان خاوەن کارەکەوە نەهی لێنەکرابێ، بۆ نموونە نابێ یارمەتیی کەسیتر بدرێ لەسەر تاوان، وەك ئاسانکاریکردن بۆ کەسیتر بۆ ئەنجامدانی تاوان، هەروەك دروست نیە کچی کەسیتر بەمێرد بدرێ بەبێ مۆڵەتی پێشوەختی خۆی یان وەلیەکەی.

٥- مەبەستی چاکەکردن بێ بە ئەنجامدانی خزمەتێك بە کەسیتر بەشێوەیەك تەنها لەبەر بەرژەوەندیی شەخسیی خۆی نەبێ، بەڵام ئەگەر لە بەرژەوەندیی خۆی و بەرژەوەندیی ئەویتریشدا بوو لە یەك کاتدا لەبەر ئەوەی نەیتوانیوە هەردوو بەرژەوەندیەکە لێك جیا بکاتەوە، وەك نۆژەنکردنەوەی خانوویەکی شەریکی لەلایەن یەکێك لە شەریکەکانەوە، یان دروستکردنی شوورەی ماڵی دراوسێکەی و سوودی لەوە دەبینی، ئەوا کارەکە پارێزگاری لە سیفەتی فوزالە دەکا[1].

[1] یاسای مەدەنیی میسری، مادەی (١٨٩).

**پایەی سێیەم- بۆکراو (المعمول له):**

کە پێی دەوترێ (خاوەن کار) یان (چاکە لەتەککراو) یان (چاکە بۆکراو) یان (سوودمەند): ئەو کەسەیە کابرای خۆهەڵقورتێن (فزول) کارە بەپەلەکەی بۆ بەرژەوەندیی ئەو کردوە.

**لە مەرجەکانی:**

١- ئاگای لە کارەکەی کابرای فزولٚ نەبێ و بەشێوەیەك بێدەنگ بێ کە بەڵگەی ئەوە بێ بە کارەکە رازییە، لەبەرئەوەی لەو حاڵەتەدا کارەکە حوکمی بریکاری یان زەنگینبوون بەبێ هۆ[1] (بەدەستهێنان بەبێ هۆ)ی بەسەردا پەیڕەو دەبێ. بەڵام ئەگەر هیچی وای لێ دەرنەچوو کە بەڵگە بێ لەسەر رازی یان ناڕازیبوون، ئەوا کارەکە بە ملکەچی رێساکانی فوزالە دەمێنێتەوە[2].

٢- خۆی ئامادە نەکردبێ خۆی ئەو کارە بکا کە کابرای فزولٚ کردویەتی، ئەگینا مافی نیە بە دەعوای فوزالە بگەڕێتەوە سەری، بەڵکو لەبەرانبەر ئەو کۆششەی بەخەرجی داوە، بە دەعوای زەنگینبوون بەبێ هۆ (یان بەدەستهێنان بەبێ هۆ) ئەو برە پارەی خەرجی کردوە و کرێی هاوشێوەی بۆ دەگێڕێتەوە.

**گونجاندنی فوزالە:**

زانایانی یاسا ئەم گونجاندنەیان لەژێر ناونیشانی (بناغەی فوزالە)دا چارە کردوە، کە فەلسەفە، واتە پاڵنەر و ئامانجە هۆکەیەتی، بەوەیش (بناغە) و (گونجاندن)یان تێکەڵ کرد و لەژێر ناونیشانی یەکەمیاندا چارەی دووەمیان کرد.

لەو گونجاندنەدا چەند ئاراستەیەکی جیاوازیان گرتەبەر، گرنگترینیان ئەو حەوتەن:

---

[1] سەرچاوەی پێشوو مادەی (١٩٠)، مجموعة الأعمال التحضيرية المصرية ٤٧٠/٢.

[2] مجموعة الأعمال التحضيرية، هەمان سەرچاوە، ٤٧٠/٢.

**ئاراستەی یەکەم:** بە نیمچە گرێبەند گونجاندنی بۆ کردوە، یان وەك یاسای مەدەنیی فەرەنسی[1] دەڵێ گرێبەندی ناڕاستەوخۆ (ضمنی)، بەو ئیعتیبارەی نیمچە گرێبەند کارێکی خۆویستانەی رەوایە و دیارترین پیادەکردنەکانی فوزالەیە[2].

ئەم ئاراستەیە لەژێر کاریگەریی ئەو بیرۆکە کلاسیکییە کۆنەدایە کە پێی وایە سەرچاوەکانی پابەندی بریتین لە: گرێبەند و نیمچە گرێبەند و تاوان و نیمچە تاوان و یاسا. ئەم بیرۆکەیەیش یاسا نوێکان رەفزیان کردوە.

**ئاراستەی دووەم:** بە کاری ناڕەوا گونجاندنی بۆ کردوە، لەبەرئەوەی خۆهەڵقورتێن زیانی پێدەگا، کە لە هەژارکەوتن بەهۆی ئەو خەرجیانەی لە تەواوکردنی کارەکە، یان ئەو دەستکەوتەی لەدەستی چووە، یان ئەو کۆششەی بەخەرجی داوە، کردوونی.

پاشان سەرچاوەکە لەڕاستیدا کردەوەی خۆهەڵقورتێنەکە نیە، بەڵکو نەگێڕانەوەی ئەو خەرجەیە کەسی خۆهەڵقورتێم کردویەتی یان ئەو رەنجەیە داویەتی، لەلایەن خاوەن کارەکەوە، ئەو نەگێڕانەوەیە کارێکی ناڕەوا و سەرچاوەی پابەندییە، یاساناسی فەرەنسی بلانیول[3] سەرکردایەتی ئەم ئاراستەیەی کردوە و بۆ ئەوە چووە سەرچاوەی پابەندی لە فوزالەدا ئەو کارە رەوایە نیە کە خۆهەڵقورتێن (فزولی) ئەنجامی داوە، بەڵکو ئەو کارە ناڕەوایەیە لە خاوەن کارەکە دەکەوێتەوە بەوەی ئامادە نیە ئەوەی خۆهەڵقورتێنەکە شایستەیەتی بۆی بگێڕێتەوە. واتە خاوەن کار بەو نەکردنە هەڵەیەك دەکات و لەڕووی بەرپرسیارێتی کەمتەرخەمیەوە بەرپرسیارە.

---

[1] مادەی (١٣٧٠).

[2] الأستاذ حلمي بهجت بدوي، أصول الالتزامات ٣٦/١ و پاشتر.

[3] الأستاذ صلاح الدين الناهي، هەمان سەرچاوە، ص٧٩.

ئەم ئاراستەیە ئەو رەخنەیەی لێدەگیرێ کە کار هۆی پابەندییە نەك سەرچاوەی پابەندی و لەم هۆبوونەدا هیچ جیاوازی نیە لە نێوان ئەوەی بە کردەوەیەکی سوودبەخشی رەوا یان کردەوەیەکی زیانبەخشی نارەوا بێتە گونجاندن، پاشان ئەم ئاراستەیە لەگەڵ قسەکەی بلانیول تێکدەگیرێ کە سەرچاوەی پابەندی دووانن: گرێبەند و یاسا، هەروەها نیمچە گرێبەند و نیمچە تاوان هەموو دەگێڕێتەوە بۆ یاسا. پاشان یاسا هاوچەرخەکان ئەم دابەشکردنەیان بۆ سەرچاوەکان پشتگوێ خستووە، لەبەرئەوەی پێچەوانەی لۆژیکی یاساییە.

**ئاراستەی سێیەم:** بناغە یان گونجاندن (التکییف)ی گێڕاوەتەوە بۆ دەسەڵاتی ئیرادە یان (ویستی تاکلایەنە)، ئەم ئاراستەیە راستە لەو رووەوە فوزالە شێوەیەکە لە پیادەکردنەکانی ویستی تاکلایەنە، بەڵام وەك خاوەنی ئاراستەکە دەڵێ بناغە نیە، بەڵکو هۆی پابەندییە. پاش ئەوەیش ئەگەر مۆڵەتی خاوەن کارەکەی لەتەك نەبێ خۆهەڵقورتێن بە دەعوای زەنگینبوون بەبێ هۆ یان (بەدەستهێنان بەبێ هۆ) دەگەڕێتەوە سەری نەك بە دەعوای فوزالە.

ئەم ئاراستەیەی سێیەم فقیهی فەرەنسی (جوسران)[1] رابەرایەتی دەکات و ئەو رەخنەیەی لێدەگیرێ کە ویستی تاکلایەنە هۆی پابەندییە نەك سەرچاوەی پابەندی.

**ئاراستەی چوارەم:** پێی وایە فوزالە لەسەر بنچینەی بیرۆکەی نوێنەرایەتیکردن (الانابە) دامەزراوە بەو ئیعتیبارەی پێویستە کاری کابرای فزول بخرێتە بەردەم خاوەن کارەکە تا پەسەندی بکا، ئەم ئاراستەیە یاسای مەدەنیی فەرەنسی[2] لە بابی ئەرکەکانی بریکاردا ئاماژەی پێکردوە.

---

[1] الأستاذ زهدي يكن، أصول الالتزامات، ص٣٦ و پاشتر.

[2] مادەی (١٩٩٨).

**ئاراستەی پێنجەم:** پێی وایە بنچینە ئەوەیە فوزالە لە وێنەکانی دەستکەوتن بەبێ هۆیە و سەرچاوەی پابەندیی کەسی فزول (خۆهەڵقورتێن) ئەو کارە مادییەیە ئەنجامی داوە [1].

ئەم ئاراستەیەیش هەڵەیە، لەبەرئەوەی فوزالە کارێکی رەوای مرۆییانەیە لە بواری هاوکاریکردن لە خێردا، لەکاتێکدا بەدەستهێنان بەبێ هۆ کارێکی ناڕەوایە، بگرە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا تاوانە.

**ئاراستەی شەشەم:** دەڵێ یاسا سەرچاوەیەکی ناڕاستەوخۆیە لە فوزالەدا، لەبەرئەوەی یاسا وەك چۆن بەبێ دەستوەردانی ئیرادەی مرۆڤ دەبێتە سەرچاوەی راستەوخۆی پابەندی، هەروەها دەشبێتە سەرچاوەیەکی ناڕاستەوخۆ کاتێ پەیدابوونی پابەندی لەسەر رەفتارێکی یاسایی یان رووداوێکی یاسایی (واقعة قانونية) دەوەستێ. سەرچاوەی راستەوخۆیش ئەو کارە مادییەیە لەلایەن خۆهەڵقورتێنەوە کراوە[2].

دەستگرتن بەم ئاراستەیەوە سەردەکێشێ بۆ فرەیی یان بەشبەشبوونی سەرچاوە سەبارەت بە یەك حوکم، ئەمەیش مەنتیقی یاسایی و رێساکانی فەلسەفە رەتیدەکەنەوە، لەبەرئەوەی دوو عیللەی تەواو ووناکەنە یەك مەعلول.

**ئاراستەی حەوتەم:** پێی وایە یاسا سەرچاوەی راستەوخۆیە، ئەویش لەسەر بنچینەی گونجاندنی فوزالە بەوەی رووداوێکی مادییە (کارێکی یاسایی) نەك رەفتارێکی یاسایی، لەم ئارلستەیەدا رۆڵی ئیرادە لە فوزالەدا دەچێتەیەك، ئەمەیش هەندێ لە زانایانی یاسا پەسەندیان کردوە[3].

لەم ئارلستەیەدا رەفتاری یاسایی، کە بەقسەی زانایانی یاسا لە گرێبەند و ویستی تاکلایەنەدا کورت هەڵدێ، لەتەك رووداوی یاسایی تێکەڵ کراون، کە

---

[1] الأستاذ صلاح الدين الناهي، سەرچاوەی پێشوو، ص١٩٣ و پاشتر.

[2] الأستاذ صلاح الدين الناهي، سەرچاوەی پێشوو، ص١٩٤ و پاشتر.

[3] لەوانە مامۆستا عبدالحي حجازي، النظرية العامة للالتزامات، ٦١١/١ و پاشتر.

(ئەمەی دووایی) هەموو کارە ئیرادیەکان دەگرێتەوە کە ئەوانیش لە رەفتارە یاساییەکانن. هەروەها هۆی پابەندی و سەرچاوەی پابەندی تێکەڵ کراون ئەگەرچی فوزالە هۆ و یاسا سەرچاوەیە. لە فەسڵی یەکەمی ئەم کتێبەدا ئەو تێکەڵکردنە بەدرێژی باس کرا.

لەڕاستیدا خستنەڕووی بەڵگەکانی ئەم ئاراستانە و هیتر و گەنگەشەکردنیان جۆرێکە لە کات و تەمەن بەفیڕۆدان مادام شیرزی بەسەریاندا زاڵە بە تێکەڵکردن لەنێوان بناغەی فوزالە و گونجاندنیدا، کە ئەم ئاراستانە گونجاندنی فوزالەیان لەژێر ناونیشانی بناغەی فوزالەدا چارە کردوە لەکاتێکدا ئەو دوو زاراوەیە بەڕوونی لێك جیاوازن، چونکە بناغەی هەر شتێك ئەو بزوێنەرەیە پاڵی پێوە دەنێ، یان ئەو ئامانجەهۆیەیە هەموو کارێکی ئیرادیی مرۆڤکردی لەسەر بنیات دەنرێ. لەکاتێکدا گونجاندنی هەر زاراوەیەکی یاسایی بریتییە لە پێدانی سیفەتە یاسایی و سروشتە یاساییەکەی.

هەروەها لە چارەی ئەم بابەتەدا تێکەڵکردن هەیە لەنێوان هۆبوونی فوزالە بۆ پابەندیەکان و سەرچاوەبوونی بۆ ئەو پابەندیانەدا.

**گونجاندنی فوزالە و بنچینەکەی لە ترازووی مەنتیق و فەلسەفەدا:**

فوزالە لە ترازووی مەنتیقدا سەرەتا بە ویستی تاکلایەنە و سەرەنجامیش بە بریکاری دێتە گونجاندن (تەکییف دەکرێ)، لەبەرئەوەی بەر لە مۆڵەتدان رەفتارێکی کرداریی ئیرادیی تاکەکەسی بەسوودە، ئەمەیش روونە و مشتومڕ هەڵناگرێ.

بەڵام پاش مۆڵەتدان لەلایەن خاوەنکار یان نوێنەرێکیەوە بە بریکاری دێتە گونجاندن، لەبەرئەوەی مۆڵەتە داهاتووەکە وەك بریکاری رابردووەکە وایە، ئەمەیش لەلایەن زۆربەی یاساکانەوە بەڕاشکاوی یان بە بەئاماژە ئیقرار کراوە. لە حاڵەتی مۆڵەتنەدانیشدا بە دەعوای زەنگینبوون بەبێ هۆ (بەدەستهێنان بەبێ هۆ) دەگەڕێتەوە سەری.

**بنچینەی فوزالە:**

بنچینەکە بەگوێرەی هەریەك لە بکەر (فزول) و بۆکراو (خاوەنکار) جیاوازە، بەنیسبەت کەسی فزولەوە هاوکاریکردنە لە خێردا ئەگەرچی بەمەبەستی بەخشینیش نەبووبێ وەك قورئان فەرمان دەکا ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى﴾[1]. لەبەرئەوەی تاکەکانی خێزانی مرۆڤایەتی هەموو خوشك و بران وەك خوا دەفەرموێ ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى﴾[2]. رەوشتی برایەتیش هاوکاری و دەستبار و **هاوکارییە** لە هەموو بوار و پێداویستیەکانی ژاندا.

هەرچی بنچینەیەکەیەتی بەنیسبەت خاوەنکارەوە بریتییە لە پاداشتدانەوەی چاکە بە چاکە وەك قورئان پەسەندی کردوە ﴿هَلْ جَزَاء الْإِحْسَانِ إِلَّا الْإِحْسَانُ﴾[3]، لەبەرئەوەی پرسیارە ئینکارییە لێرەدا ئیقراری و لەبابی مامەڵەکردنی هاوچەشنانەیە (المعاملة بالمثل) و وەڵامدانەوە بەچاکەیە وەك لە فوزالەدا، هەروەها وەك وەڵامدانەوە بە خراپە وەك لە دەستدرێژیەکاندا بەگوێرەی ئایەتی ﴿فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾[4].

کابرای فزول کارێکی ئاینی و مرۆیی و ئەخلاقی بۆ سوود و بەرژەوەندیی خاوەنکارەکە ئەنجام دەدا با مەبەستیشی بەخشین نەبووبێ، لەبەرئەوەی لە هەردوو بارەکەدا کارەکە کارێکی ئینسانییە. ئەوە پاداشتی کەسی فزولی چاکەکار نیە کە لەلایەن ئەو کەسەی ئەم چاکەی لەگەڵ کردوە چاکەکەی بەبا بدرێ و پاداشتەکەی فەوتاندنی ماڵەکەی و بەخراپە لەگەڵ کردن پاداشت بکرێ.

شایانی باسە دانەوەی قەرزی کەسیتر بەبێ مۆڵەت یان بەنوێنەرایەتی، بە وێنەیەك لە وێنەکانی فوزالە دادەنرێ و حوکمەکانی بەسەردا دەچەسپێ مەگەر

---

[1] سورة المائدة/٢.

[2] سورة الحجرات/١٣.

[3] سورة الرحمن/٦٠.

[4] سورة البقرة/١٩٤.

قەرزدەرەوەکە بەخشیبێتی. هەڵەیە بە هاوبەشکەی دابنرێ وەك هەندێ یاسا کردوویانە لەوانە یاسای ئوردنیی بەرکار، کە کردەوەی سوودبەخشی دابەش کردوە بۆ بەدەستهێنان بەبێ هۆ و وەرگرتنی ناشایستە و فوزالە و دانەوەی قەرزی کەسیتر[1].

یاسادانەری عێراقیش سەرکەوتوو نەبوو لە چارەی دانەوەی قەرزی کەسیتر بەبێ مۆڵەت یان بە نوێنەرایەتی، ئەویش لە دوو رووەوە:

**یەکەمیان:** دانەوەی قەرزی کەسیتری لە فەسڵی چوارەم لەژێر ناونیشانی بەدەستهێنان بەبێ هۆ (الکسب دون السبب)دا چارەسەر کردوە لەکاتێکدا بەدەستهێنان بەبێ هۆ کارێکی ناڕەوا بگرە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا تاوانە، دانەوەی قەرزی کەسیتریش کارێکی رەوای ئینسانییە لە بابی هاوکارییەوە.

**دووەم:** لە دانەوەی قەرزی کەسیتردا بەخشینی کردۆتە ئەسڵ و قەرزدەرەوەکە مافی نیە داوای ئەو قەرزەی بۆی داوەتەوە لە قەرزارەکە بکاتەوە یان بچێتە جێگەی قەرزارەکە، مەگەر بە بەڵگەیەك یان قەرینەیەك پێچەوانەی ئەوە بسەلمێ. مادەی (۲۹۳)ی یاسای مەدەنیی عێراقی دەڵێ: "ئەگەر کەسێك قەرزی کەسێکیتری بژارد بەبێ فەرمانی قەرزارەکە قەرزەکە لەسەر شانی قەرزارەکە دەکەوێ جا چ قبوڵی بێ یان قبوڵی نەبێ، قەرزبژێرەکەیش بە بەخشەر دادەنرێ و بۆی نیە داوای هیچ لەو قەرزەی لێبکاتەوە کە بەبێ فەرمانی ئەو بۆی بژاردوە، مەگەر لە دۆخەکەوە ئەوە روون بێتەوە کە قەرزبژێرەکە لە دانەوەی قەرزەکەدا بەرژەوەندیەکی هەیە، یان نیەتی بەخشینی نەبووە".

ئەمەیش پێچەوانەیە لەگەڵ ئایەتی ﴿هَلْ جَزَاءُ الْإِحْسَانِ إِلَّا الْإِحْسَانُ﴾.. هەڵەبوونەکەی لەوەدایە بەخشین بە ئەسڵ دادەنێ و ناکرێ شتێکیتر بکرێ مەگەر بسەلمێ کە نیەتی هەیە بگەڕێتەوە گەردنی قەرزارەکە، ئەم ئاراستەیەی یاسادانەری

---

[1] المواد (۲۹۳–۳۱۰).

عێراقی كە لەژێر كاریگەریی رای هەندێ شەرعناساندایە، پێچەوانەی ئەو فەرمانەی خوای گەورە و مەنتیقی یاساییە.

## خواستی سێیەم:
## حوكمی فوزالە

ئەوە روونە حوكمەكانی فوزالە ئەو ماف و پابەندیانەیە وەك هۆیەك لە هۆكانی لێی دەكەونەوە، سەرچاوەی ئەو حوكمانەیش یاسایە، بەپێچەوانەی ئەوەی یاسا و یاساناسان لەسەرین كە گوایە فوزالە سەرچاوەی ئەو حوكمانەیە. ئەوەی لەم لقەدا بەلامانەوە گرنگە خستنەرووی ئەو پابەندیانەیە لێی دەكەونەوە لەرووی ئەوەوە، وەك یاسا و زانایانی یاسا دەڵێن، سەرچاوەیە. هەروەها لەرووی ئەوەوە، وەك مەنتیقی یاسایی دەڵێ، هۆی ئەو پابەندیانەیە. ئەم پابەندیانە لەرووی كەسی پابەندەوە دوو بەشن: پابەندیەكانی خۆهەڵقورتێن (فزول) و پابەندیەكانی خاوەنكار.

**یەكەم- پابەندیەكانی خۆهەڵقورتێن:**

١- پێویستە خۆهەڵقورتێن لەو كارەی دەستی پێكردوە بەردەوام بێ تا خاوەن كارەكە دەتوانێ خۆی بیكا[1].

ئەوە روونە یاسا كەس ناچار ناكا بەبێ نوێنەرایەتیكردن كاروباری كەسێكیتر بگرێتە ئەستۆ، بەلام لەلایەك كەسی دەستێوەردەر خۆی خۆی بەوە پابەند دەكا، لەلایەكیتریشەوە ئەو پابەندییە بۆ دوورخستنەوەی بەسووك سەیركردن و دەستبردنە بۆ كاروباری كەسانیتر. وەك باسمان كرد هەندێ لە شەرحكارانی یاسا ئەم پابەندیەیان بە مەرج داناوە.

---

[1] یاسای مەدەنیی میسری (مادەی ١٩١).

٢- خۆهەڵقورتێن پابەند دەبێ بە ئاگەدارکردنەوەی خاوەنکار بە دەستوەردانەکەی هەرکات توانی[1] تا خاوەنکار خۆی لەباتیی ئەو کارەکە بکا.

٣- لەسەر خۆهەڵقورتێن پێویستە لە ئەنجامدانی کارەکەدا بایەخدانی کەسی ئاسایی بەخەرج بدا، ئەو بەرپرس نیە ئامانجەکە بەدی بێنێ، بەڵکو شوێنی پابەندیی ئەو هەوڵ و بایەخدانە، بەلام لە هەڵەکردنی بەرپرسیار دەبێ ئەگەر لە خەمساردی یان کەمتەرخەمیەوە بوو.

ئەگەر چەند خۆهەڵقورتێنێك کارێکیان ئەنجامدا لە بەرپرسیارێتیدا بەشدار دەبن، لەبەرئەوەی پێویستە خۆهەڵقورتێن لە ئەنجامدانی کارەکەیدا لە رەفتاری باوی کەسی ئاسایی لانەدات، ئەگینا بە هەڵەکار دادەنرێ و بەهۆی بەرپرسیارێتیی کەمتەرخەمی لەسەر هەر زیانێك بەهۆی ئەو دەستوەردانەی ئەوەوە بە خاوەنکار بگا لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێ، ئەگەرچی لەسەری نیە کۆششێکی نائاسایی بکا.

ئەگەر خۆهەڵقورتێن کەسێکیتری کردە نوێنەری بۆ ئەنجامدانی سەرجەم کارەکانی خۆهەڵقورتاندن یان هەندێکیان، نوێنەرەکە وەك جێگری بریکار دەبێ لە رەفتارە یاساییەکاندا، هەروەها وەك بەڵێندەر (مقاول) لە پەنهانەوە دەبێ لە کارە مادییەکاندا. خاوەنکار بۆی هەیە یەخەی فزولی بگرێ لە هەڵەکردنی جێگرەکەی، ئەویش لەو رووەوە شوێنکەوتوو لە کارەکانی شوێنکەوتەکەی بەرپرسە[2].

٤- پێویستە خۆهەڵقورتێن ئەوەی بەهۆی خۆهەڵقورتاندنەوە دەستی بەسەردا گرتووە بیگێڕێتەوە.

٥- رێك وەك وەکیل، پێویستە حساباتی ئەوەی ئەنجامی داوە پێشکەش بکا، ئەگەر خۆهەڵقورتێن بەناوی شەخسیی خۆی رەفتارێکی یاسایی لە

---

[1] سەرچاوەی پێشوو.
[2] یاسای مەدەنیی میسری (مادەی ١٩٢).

بەرژەوەندیی خاوەنكار كرد، ئەو رەفتارە لە مافی خۆیدا جێبەجێ دەكرێ نەك خاوەنكار[1].

**كاریگەریی مردنی خۆهەڵقورتێن یان خاوەنكار لەسەر پابەندیەكانی خۆهەڵقورتێن:**

ئەگەر خۆهەڵقورتێن مرد وەرەسەكەی بەوە پابەند دەبن كە وەرەسەی وەكیل پێی پابەند دەبن، ئەگەر خاوەنكارەكە مرد خۆهەڵقورتێن چ پابەندیەكی بەرانبەر میراتدەرەكە بووە بەرانبەر وەرەسەكەیش دەیمێنێ[2].

سەرچاوەی سەرجەم ئەم پابەندیانە راستەوخۆ یاسایە، فوزالەیش هۆی ئەو پابەندیەیە بەڕەهایی، ئیتر سیفەتە یاساییەكەی هەرچی بێ.

**دووەم- پابەندیەكانی خاوەنكار:**

لە گرنگترینیان:

١- جێبەجێكردنی ئەو بەڵێنانەی خۆهەڵقورتێن (فزول) لەبریی خاوەنكار داونی. لەو رووەوە لایەنێكە تێیاندا پێویستە ئەو پابەندیانەی لەو بەڵێنانەدەكەونەوە جێبەجێ بكا.

٢- قەرەبووكردنەوەی خۆهەڵقورتێن لەو بەڵێنانەی بەناوی شەخسیی خاوەنكارەوە داونی.

٣- گێڕانەوەی ئەو خەرجییە بەسوودە زەرورانەی كەسی خۆهەڵقورتێن كردوونی و پێدانی كرێی هاوچەشن لەبەرانبەر ئەو كۆششەی لە كارەكەیدا كردویەتی، بۆ نموونە ئەگەر كارێكی كرد كە لە چوارچێوەی پیشەكەیدا بوو، وەك پزیشكێك فریای نەخۆشێك بكەوێ، یان ئەندازیارێك دیوارێك راست بكاتەوە، هەمان كرێی دەكەوێ كە كەسێكیتر لەسەر كردنی ئەو كارانە وەریدەگرێ، ئەمە جگە لەو خەرجانەی كردوونی.

---

[1] الأستاذ السنهوري، الوسيط ١٤١٦/١، الأستاذ مرقس، أصول الالتزامات، ص٥٦٨.

[2] یاسای مەدەنیی میسری (مادەی ١٩٤).

٤- قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانەی بەبێ ئەوەی هەڵەی ئەو بێ، بەهۆی ئەنجامدانی کارەکە بۆ بەرژەوەندیی چاکە لەتەك کراو بە فزول گەیشتووە، وەك ئەوەی بابای خۆهەڵقورتێن ئاگرێکی کوژاندبێتەوە کە بەربووەتە ماڵی خاوەنکارەکە، جا ماڵی گوازراوە یان خانوبەرە بێت و بەهۆی کوژاندنەوەی ئاگرەکەوە زیانی پێگەیشتبێ، خاوەنکارەکە پابەند دەبێ بە قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانە.

ئەم پابەندیانە پەیوەندییان بە ئەستۆی خاوەنکارەوە هەیە و بابەتەکەیان مافە کەسیەکانی خۆهەڵقورتێنە، جا ئەگەر خاوەنکار مرد ئەو قەرزانە دەکەونە سەر میراتگرەکانی و پابەند دەبن بە دانەوەی بەر لە دابەشکردنی میراتەکە، لەبەرئەوەی ئەو قەرزانەی لەسەر ئەو میراتەن رێگرن لەوەی بتوانن رەفتاری پێوە بکەن، ئەمەیە مانای ئەو رێسا یاساییەی دەڵێ (لا ترکة إلا بعد سداد الديون). واتە میراتگران ناتوانن دەست بخەنە میراتەکەیان تا قەرزەکانی مردووەکەی لێ دەرنەکەن، یان قەرزدەرەکان مۆڵەتیان پێ بدەن.

لە کۆتاییدا گرنگە ئاماژە بەم خاڵانەی خوارەوە بکرێ:

أ- حوکمەکانی فوزالە بەسەر رەفتارە یاساییەکانی وەکیلدا جێبەجێ دەبن لە یەکێك لەم دوو حاڵەتەدا:

١- ئەگەر لە رەفتارکردنیدا سنووری بریکاریی بەزاند.

٢- ئەگەر پاش لادانیشی و بەبێ ئاگەداریی ئەو، هەندێ رەفتاری یاسایی بریکاردارەکەی ئەنجامدا.

ب- ئەو دەعوایەی لە فوزالە پەیدا دەبێ، بە تێپەڕبوونی سێ ساڵ بەسەر ئەو رۆژەی تێیدا خۆهەڵقورتێن بە مافی خۆی زانیوە، هەروەها بە تێپەڕبوونی پازدە ساڵ بەسەر ئەو رۆژەی مافی خۆهەڵقورتێنی تێدا پەیدا دەبێ، بەسەر دەچێ، واتە دەکەوێ.

ج– ئەگەر خۆهەڵقورتێن سەبارەت بە کەسایەتیی خاوەنکار هەڵەی کرد، ئەو ماف و پابەندیانــەی لــە ئەنجامــدانی کــاری فوزالــە کەوتونەتــەوە لــەنێوان ئــەو و خاوەنکارە راستەقینەکەدا دەبێ.

د– ئەگەر کەسێك لـە بابەتێکدا کـارێکی کـرد و وایـدەزانی هـی خۆیـەتی پاشـان دەرکەوت هی کەسیترە، ئەوا ئەو پەیوەندیانەی لەنێوان ئەو و ئەو کەسەیترەدا پەیدا دەبن ملکەچی رێساکانی بەدەستهێنان بەبێ هۆ، یان زەنگینبـوون بـەبێ هۆ دەبن.

هـ– ئەو خۆهەڵقورتێنەی دەست دەخاتە کاروباری کەسـیتر بەپێچـەوانەی حـەزی زانــراو و گریمانــەکراوی ئــەو کەســە، یــان کارەکــە پێچــەوانەی ئــارەزووی گریمانەکراوی بوو، لەسەر هەر زیانێك لەئەنجامی کارەکەیدا بـەو کەسـیترە بگـا لێی دەپرسرێتەوە، با هەڵەیەکیش نەبووبێ کە بکرێ بدرێتە پاڵ ئەو.

ز– خۆهەڵقورتێن مافی گلدانەوەی شتەکانی خاوەنکاری هەیە وەك گەرەنتیەك بـۆ وەرگرتنەوەی ئەو پارانەی دەکەونە ئەستۆی.

ح– لە حاڵەتێکدا خۆهەڵقورتێنەکان زیاتر لە کەسێك بن، ئەگەر یەکێکیان هەڵەیەکی کرد بەسەر ئەوانیتردا ناشکێتەوە، مەگەر دەقێك هەبێ پێچەوانەی ئەوە بڵێ[1].

---

[1] لە بابەتی فزالەدا بڕوانە ئەم سەرچاوانە: یاسای مەدەنیی میسری (م/١٨٨–١٩٧)، ئوردنی (م/٣٠١–٣٠٨)، کوێتی (م/٢٦٩–٢٧٨)، لوبنانی (م/١٤٨–١٦٤)، مەغریبی (فەسڵەکانی ٩٤٣–٩٥٥)، عێراقی (م/٢٣٦–٢٣٩). ئەم یاسایە بەڕاشکاوی باسی فزالەی نەکردوە بەڵکو باسی هەندێ پیادەکردنی کردوە وەك دانەوەی قەرزی کەسیتر.

هەروەها بڕوانە ئەم سەرچاوانە: الأستاذ السنهوري، الوسيط ١٣٨٤/١ و پاشتر/ الأستاذ عبدالمنعم فرج الصدة، مصادر الالتزام، ص٦١١ و پاشتر/ الأستاذ صلاح الدين الناهي، سەرچاوەی پێشوو، ص١٩٠ و پاشتر/ مجموعة الأعمال التحضيرية المصرية، سەرچاوەی پێشوو، ٤٦٥/٢ و پاشتر.

کاری ناڕەوا (نامەشروع)ی زیانبەخش هۆیەکیترە لە هۆکانی ئەو پابەندییە مەدەنی و جینائیانەی سەرچاوەکەیان یاسایە.

یاسا مەدەنییە عەرەبیەکان لە شێوەی دەربڕینی ئەم هۆیەدا جیاوازن، هەندێکیان هەمان دەربڕینی باسکراویان[1] بەکارهێناوە، هەندێکیان بە (کردەوەی زیانبەخش)[2] دەریانبڕیوە، هەندێکیشیان زاراوەی (زەنگینبوون بەبێ هۆ)[3]یان لێناوە.

دەربڕینی ورد بریتییە لە (کاری ناڕەوا) (العمل غیر المشروع)، لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

أ- لەبەرئەوەی ڕێژەی مەنتیقیی نێوان کردەوەی زیانبەخش و کاری ناڕەوا گشتی (عموم) و تایبەت (خصوص)ی ڕەهایە، هەموو کارێکی ناڕەوا زیانبەخشە لەبەرئەوەی ناڕەوابوونی هەموو شتێك لەسەر لەخۆگرتنی زیان (یان خراپە) دامەزراوە، بەڵام پێچەوانەکەی بەڕەهایی وانیە، لەبەرئەوەی لەوانەیە کردەوەکە بۆ خاوەنەکەی زیانبەخش بێ بەڵام بەلای کەسێکیتری دەرەکیەوە ڕەوا بێ، وەك سزادانی تاوانکار کە ئەمە کردەوەیەکە بۆ ئەو کەسە و خێزان و کۆمەڵگەکەی زیانبەخشە، بەڵام هەموو شەریعەت و یاساکان کۆکن لەوەدا کە ڕەوایە، ئەویش لەبەر ئەو سوودە گشتیەی لێی دەکەوێتەوە لە پاراستنی مافی خەڵك، هەروەها وەك لەناوبردنی داودەرمان و خۆراکی خراپ و ماوەبەسەرچوو، کە بەکەڵکی بەکاربردن نەماون.

ب- زاراوەی (زەنگینبوون بەبێ هۆ) لە دوو ڕووەوە ورد نیە:

---

[1] وەك یاسای مەدەنیی عێراقی بەرکار، مادەکانی (١٨٦-٢٣٢)، سوری (١٦٤-٢٩٨).

[2] وەك یاسای مەدەنیی ئوردنی،مادەکانی (٢٥٦-٢٩٢).

[3] وەك یاسای مەدەنیی میسری، مادەکانی (١٧٩-١٩٧).

یەکەمیان: هەموو بەدەستهێنانێك بەبێ هۆ، هۆیەکە بۆ پابەندبوون بە گێڕانەوەی ماڵە بەدەستهاتووەکە بۆ خاوەنە شەرعیەکەی بەچاوپۆشین لە نرخ و برەکەی و کاریگەریی لەسەر پێگەی ئابووریی ئەوەی لەدەستی چووە لەڕووی هەژارکەوتنیەوە، یان ئەوەی دۆزیویەتیەوە لەڕووی دەوڵەمەندبوونەوە، وەك پێشتر باسمان کرد.

دووەم: ئەو یاسایەی دەستەواژەی زەنگینبوون بەبێ هۆی بەکار هێناوە، دابەشی کردوە بۆ بژاردنی ناشایستە و فوزالە، لەکاتێکدا فوزالە کارێکی بەسوودی رەوایە، جا چۆن دەکرێ بەش رەوا بێ کەچی بەشکراوەکەی (مقسم) نارەوا بێ.

بەکارهێنانی راست و دروست بریتییە لە (کاری نارەوا)، لەبەرئەوەی جگە لەو تێبینیانەی باس کران، دەستەواژەیەکی گشتییە، کردەوە و گوتە و نەکردن دەگرێتەوە.

پاش ئەم دەسپێکە کورتە، سروشتی بابەتەکە (کاری نارەوا) دەخوازێ لێکۆڵینەوەی لە ڕووی شکڵیەوە بۆ چوار خواست دابەش بکرێ. خواستی یەکەم تەرخان دەکرێ بۆ هەندێ پێشەکی پەیوەندار بەبابەتەکە بەمەبەستی روونکردنەوە، دووەمیان بۆ رێسا گشتییە پەیوەندارەکان بە بابەتەکەوە، سێیەم بۆ کارە نارەوا کەسیەکان و چوارەمیش بۆ کارە نارەوا ناکەسیەکان تەرخان دەکرێ.

# باسی یەكەم:
# هەندێ پێشەكیی پەیوەندار
# بە بابەتەكە بۆ روونكردنەوە

یەكەم- كار رەگەزێكە دوو جۆری هەیە: كاری رەوا و كاری ناڕەوا.

یەكەمیان: هەموو كارێكە سەرپێچیی شەرع و یاسا و سیستمی گشتی و ئادابی گشتی نەبێ.

دووەمیان: هەموو كارێكە سەرپێچیی شەرع یان یاسا یان سیستمی گشتی یان ئادابی گشتی بێ.

سەرچاوەی سیستمی گشتی رێسا فەرمانكردوەكانی شەرع یان یاسایە، سەرچاوەی ئادابی گشتیش بەها و ئاكارە جوانەكانن، كە لە كۆمەڵگەكاندا باون.

رەوابوون و ناڕەوابوونیش لەسەر جوانی و ناشیرینیی شەرعی یان عەقڵی دامەزراون، كە ئەوانیش لەسەر سوود و زیان دامەزراون.

**دووەم**- وەك چۆن كاری رەوا هۆی پابەندیەكانە وەك گرێبەند و فوزالە و سەرچاوەكەی یاسا یان شەرعە، بەهەمان شێوەی كاری ناڕەوایش هۆی پابەندییە مەدەنی و جینائیەكانە و سەرچاوەكەی یاسا یان شەرعە.

**سێیەم**- فەلسەفەی پابەندییە مەدەنی و جینائیەكان بریتیە لە بەرژەوەندی (سوودی هێنراو و زیانی دوورخراوە). یاسا لەسەر بناغەی بەرژەوەندی و خواستەكانی، یاسا دادەنێ و هەموار دەكات و هەڵدەوەشێنێتەوە، هەر یاسادانانێك ئەگەر ئامانجی بەدیهێنانی بەرژەوەندیەكانی كۆمەڵگەی ژێر سایەی نەبێ، دەبێتە بێهوودەیی و كارێكی بێنرخ كە عەقڵی ساغ و مەنتیقی یاسایی رەفزی دەكەن.

شەریعەتە ئاسمانیەکان کە گەیاندنیان بە خێزانی مرۆڤایەتی و بانگکردنیان بۆ کارپێکردنیان خراوەتە سەر شانی پێغەمبەران، هەرهەموویان بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی و بەدیهێنانی بەرژەوەندیەکانی هاتوون، لەبەرئەوەی دانەرەکەیان لە جیهانییان و لەو بەرژەوەندیانە، بێنیاز و رەهایە. لە پێشی ئەو شەریعەتانەدا پەیامی محەمەدی دێ کە پەیامەکانی پێشووی هەموار کردوە و ئەرك و فەلسەفەی تەنها بەدیهێنانی بەرژەوەندیەکانی خەڵکە وەك خوای گەورە روو لە پێغەمبەرەکەی محەمەد (ﷺ) دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾[1]..

لە زانستی رەوانبێژیدا هەڵاوێردن (ئیستیسنا) پاش نەفی بۆ سنووردارکردنە وەك لە شایەتماندا (لا إله إلا الله)، ئامانجی پەیامی محەمەدی تەنها رەحمەتە بۆ مرۆڤایەتی، رەحمەتیش بەرژەوەندییە بە هەردوو رووەکەی: لایەنی ئەرێنی (سوودێکی هێنراو) و لایەنی نەرێنی (خراپەی دوورخراوە) جا ئەو بەرژەوەندییە ماددی بێ یان مەعنەوی، دنیایی بێ یان قیامەتی.

**چوارەم:** حەڵاڵ و حەرام لە مامەڵە داراییەکاندا بۆ دوو رێسای گشتی دەگەڕێنەوە، کە پێویستە ئەو دوو رێسایە لە هەموو کات و شوێنێکدا پیادە بکرێن و لە هەموو کارێکی ئیرادیی مرۆڤدا لەبەرچاو بگیرێن:

یەکەمیان: هەر کارێك سوودی تاك یان کۆمەڵگە یاخود هەردووکیانی تێدا بێ رێپێدراو واتە (جائیز) دەبێ، بەو مەرجەی ئەو سوودە لەسەر حسابی زیان یان زەرەری کەسێکیتر نەبێ.

دووەمیان: ئەوەیە هەر کارێك زیانی تاك یان کۆمەڵگە یاخود هەردووکیانی تێدا بێ جائیز نابێ بەو مەرجەی ئەو کارە زیانبەخشە سوودێکی گشتی بۆ بەرژەوەندیی گشتی لێنەکەوێتەوە. کەمێك بەر لەم قسەیە باسمان لەوە کرد سزادانی تاوانکار بۆ

---

[1] سورة الأنبياء/١٠٧.

خۆی و خێزان و کۆمەڵگەکەی زەرەرە، سەرباری ئەوەیش شەریعەت و یاساکان دانیان بە رەوابوونی ئەو سزایەدا ناوە، لەبەرئەوەی پاراستنی مافی خەڵکی تێدایە.

هەروەها لەناوبردنی داودەرمانی خراپ لە دەرمانخانەکان و ئازوقە بەسەرچوو و بێکەڵکەکان لە ئەمبارەکانی بازرگانەکاندا لەلایەن دەسەڵاتدارانی گشتی یان بەرپرسانی خزمەتگوزاریی گشتیەوە، کارێکی رەوا و بگرە واجبیشە سەرباری ئەو زیانە ماددیەی بە خاوەنەکانیان دەگات، لەبەرئەوەی لەناوبردنیان پاراستنی تەندروستیی گشتییە.

پاش ئەزموونی نزیکەی حەفتا ساڵم لەگەڵ شەریعەت و پەنجا ساڵیان لەگەڵ یاسادا ئەم دوو رێسایەم لە ئایەتی ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾ ئەنجامگیر کرد.

**پێنجەم**: پێویستە یاسادانەر لەکاتی یاسادانانیدا، موجتەهید لەکاتی هەڵێنجانی ئەحکام لە سەرچاوەکانیاندا، موفتی لە فتوادان بە رای موجتەهیدەکاندا، رەچاوی ئەو رێسا گشتییە بکەن کە دەڵێ: (لا يُنكر تغير الأحكام بتغير الأزمان)[1]، (واتە: گۆرانی ئەحکام بەپێی کاتەکان سەرکۆنە ناکرێ)، لەبەرئەوەی حوکمە بنیاتنراوەکان لەسەر بەرژەوەندیی مرۆڤایەتی بە گۆرانی ئەو بەرژەوەندیانە لە هەموو کات و شوێنێکدا دەگۆرێن، لەوانەیە حوکمێك بۆ سەردەمێك گونجاو و بۆ سەردەمێکیتر نەگونجاو بێ، جیاوازیی شوێنەکانیش بەهەمان شێوە.

**شەشەم**: زانایانی یاسا ئەو بەرپرسیارێتیەیان بە بەرپرسیارێتیی کەمتەرخەمی داناوە کە لە کاری ناڕەوا دەکەوێتەوە، ئەوە روونە ئەوە جۆرێکە لە بەرپرسیارێتیی مەدەنیی کە دابەشکراوە بۆ ئەوە (بەرپرسیارێتیی کەمتەرخەمی) و بەرپرسیارێتیی گرێبەندی، لەکاتێکدا ئەو بەرپرسیارێتییە وەك دەکرێ مەدەنی بێ، دەشکرێ تاوانکاری بێ بەپێی سروشتی هەڵەکە، کە ئاخۆ هەڵەیەکی تاوانکاری بووە یان هەڵەیەکی مەدەنی.

---

[1] گۆڤاری الأحكام العدلية، مادەی (٣٩).

**هەڵەی تاوانکاری چییە و هەڵەی مەدەنی چییە؟**

أ- هەڵەی تاوانکاری: تێکدانی ئەرکێکی یاساییە کە یاسای سزاکان یان هەر یاسایەکیتری تاوانکاری دیاری دەکات و لە دوو رەگەز پێکدێ: ماددی و مەعنەوی.

١- رەگەزی ماددی: تێکدانی ئەرکێکی یاساییە، کە یاسای سزایی دیاری کردوە.

٢- رەگەزی مەعنەوی: دەرککردنی تێکدەر (المخل)ە بەوەی واجبێکی تێکداوە کە یاسای تاوانکاری دیاری کردوە.

لەم روانگەوە کارە نارەوا تاوانکاریەکان سنووردارن.

ب- هەڵەی مەدەنی: تێکدانی ئەرکێکی یاساییە یاسا بەشێوەیەکی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بەرەهایی دیاری کردوە، وەك ئەو رێسا گشتیانەی دەڵێن لەسەر هەموو مرۆڤێك پێویستە بەبێ پاساو زیان بە کەسیتر نەگەیەنێ.

لەسەر ئەم بناغەیە کارە نارەوا مەدەنیەکان بێسنوورن.

لەبەر تیشکی فیقهی ئیسلامی و ئەو یاسایانەی لەژێر کاریگەریدان لە هەڵەی مەدەنیدا بوونی رەگەزی ماددی بەتەنها بەسە (تێکدانی ئەرکێکی یاسایی)، جا چ تێکدەرەکە بە تێکدانەکەی زانیبێ یان نا.

ئیقرارکردنی بەرپرسیارێتیی کەمتەرخەمیی کەسی نەشیاو لەسەر ئەم ئاراستەیە بینا دەکرێ و پێویستە لە ماڵەکەی قەرەبوو بکرێتەوە، ئەگەر ماڵیشی نەبوو وەلی یان چاودێر یان سەرپەرشتەکەی دەیبژێرێ، پاشان ئەگەر ماڵی پەیدا کرد لێی وەردەگرێتەوە[1].

---

[1] ماددەی (١٩١)ی یاسای مەدەنیی عێراقی بەرکار دەڵێ: "ئەگەر مێرمندالێکی بەفام یان نەفام یان هەر کەسێك حوکمی ئەوانی هەبێ ماڵی کەسیتری لەناوبرد، پێویستە زیانەکە لە ماڵەکەیان بژێردرێ".

بەڵام لە فیقهی خۆرئاوایی و ئەو یاسایانەی لەژێر کاریگەریدان[1] ، لەڕووی زەرورەتی بوونی هەردوو رەگەزی ماددی و مەعنەویەکەوە، جیاوازی لەنێوان هەڵەی مەدەنی و هەڵەی تاوانکاریدا نیە.

ئەوەی کە کەسی **نەشیاو** بەرپرسیارێتی کەمتەرخەمی ناکەوێتە سەر مەگەر یاسا پێچەوانەی ئەوە بڵێ، لەسەر ئەم ئاراستەیە بنیات دەنرێ.

**حەوتەم:** فیقهی ئیسلامی و ئەو یاسایانەی لەژێر کاریگەریدان لەوەدا لەگەڵ فیقهی خۆرئاوایی و ئەو یاسایانەی لەژێر کاریگەریدان کۆکە، کە پێویستە لەم سێ حاڵەتەی خوارەوەدا هەردوو رەگەزە ماددی و مەعنەویەکەی هەڵە، هەبن:

یەکێکیان: ئەوەیە هەڵەکە تاوانکاری بێ، واتە بە تاوان دانانرێ تا هەڵەکردنەکە هەردوو رەگەزەکەی تێدا نەبن.

دووەم: ئەوەیە هەڵەکە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بێ، وەك ئەو کەسەی ئاژەڵێکی خۆی کە بەزیانبەخش ناسرلو بێ پشتگوێ بخات و لەئەنجامدا بچێتە ناو کێڵگەیەك و بیفەوتێنێ. بەڵام ئەگەر خاوەنەکەی خەمسارد یان کەمتەرخەم نەبوو ئەوا نە گەرەنتی و نە پابەندی لەسەر خاوەنەکەی نیە، ئەویش لەبەر ئەو رێسا گشتیەی دەڵێ (جناية العجماء جبار)[2]، واتە تاوانی بێزمان بەفیڕۆدانە.

سێیەم: ئەوەیە هەڵەکە نەرێنی (سلبي) بێ وەك ئەو کەسەی ئاگرێك لە جێیەکدا دەکاتەوە و بەئەنقەست نەیکوژێنێتەوە، بەوهۆیەوە ئاگرەکە درزە بکاتە ماڵی کەسێکیتر و بیسووتێنێ.

---

(1) وەك یاسای مەدەنیی میسری، مادەی (١٦٢) کە دەڵێ "هەر کەسێك کاتێك لە کارە ناڕەواکانی بەرپرسە کە لە بارێکدا بیانکات فامی هەبێ" هەروەها وەك یاسای مەدەنیی یەمەنی ژمارە (١٩)ی ساڵی ١٩٩٢ (مادەی ٣٠٨) کە دەڵێ: "مرۆڤ لە ماڵ و کارە ناڕەواکانی بەرپرس دەبێ ئەگەر لە بارێکدا فامی هەبێ ئەوەی بەرانبەر کەسیتر ئەنجام دابێ..هتد).

(2) گۆڤاری الأحكام العدلية، مادەی (٩٤).

لەم سێ حاڵەتەدا پێویستە هەردوو ڕەگەزە ماددی و مەعنەوییەکە لە هەڵەکەدا هەبن، ئەویش تێکدانی ئەرکێکی یاسایی و هەستکردنی تێکدەرە بەوەی ئەرکێکی یاسایی تێکداوە.

بەم پێیە ڕەگەزەکانی بەرپرسیارێتیی کەمتەرخەمی لە فیقهی خۆرئاوایی و ئەو یاسایانەی لەژێر کاریگەریدان، بریتین لە: (هەڵە + زیان + پەیوەندیی هۆیی). بەڵام لە فیقهی ئیسلامی و ئەو یاسایانەی لەژێر کاریگەریدان جگە لەو سێ حاڵەتەی باس کران، ڕەگەزەکانی بەرپرسیارێتی کەمتەرخەمی بریتین لە (کاری ناڕەوا + زیان + پەیوەندیی هۆیی).

**هەشتەم:** لە پابەندبوون بە قەرەبووکردنەوەدا لەوانەیە ڕەگەزی زیان بەتەنها بەس بێ بەبێ پێویستی بە کاری ناڕەوا یان هەڵەی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، ئەویش بەپێی ڕێسای: (ڕەنج بە گەنج)[1].

ئەم ڕێسایە بە هەمان دەربڕین یان بەماناکەی لە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) وەرگیراوە. شەرعناسانەکان ڕێسایەکیتریان[2] وەك لق لەم ڕێسایە کردۆتەوە کە دەڵێ: (النعمة بقدر النقمة، والنقمة بقدر النعمة). (واتە: نیعمەت بەئەندازەی بەڵایە و بەڵا بە ئەندازەی نیعمەتە).

مانای ڕێساکە ئەوەیە هەرکەس لە سوودی شتێك سوودمەند بێ زیانەکەیشی دەگرێتە ئەستۆ، یان ئەوەی لە زیانی شتێك بەرپرس بێ سوودەکەیشی بۆ ئەو دەبێ. بۆ نموونە، ئەگەر کرێکار لە کارگەیەکدا بەهۆی کارکردنی لەم دامەزراوە ئابوورییە یان بەکارهێنانی ئامێرێك لە ئامێرەکانی تووشی نەخۆشییەکی درێژخایەن بوو، خاوەنەکەی جا چ کەسێکی سروشتی بێ یان مەعنەوی، پابەند دەبێ بە قەرەبووکردنەوەی ئەو کرێکارە لەو زیانەی تووشی بووە با کەسی پابەند بەو قەرەبووە هیچ هەڵەیەکیشی لەوەدا نەبووە، ئەویش لەسەر ئەو بنچینەیەی ئەو لە

[1] گۆڤاری الأحكام العدلية، مادەی (٨٧).

[2] گۆڤاری الأحكام العدلية، مادەی (٨٨).

قازانجی رەنجدانی ئەو كرێكارە یان قازانجی دامەزراوەكە، كـە پێـی دەوتـرێ (غـنم) سوودمەندە، بۆیە پێویستە لەسەری قەرەبوویشی بكاتەوە، كە پێی دەوترێ (الغرم).

لە روانگەی ئەم راستییەوە پێویست ناكا باس لە هەڵـەی گریمانـەكراوی خـاوەنی ئەو دامەزراوە ئابوورییە بكرێ، وەك هەندێ لایەنی یاسایی بۆ ئەوە چوون[1].

**دوویەم:** كاری ناڕەوا مەدەنییە یـان جینـائی، لێـرەوە سروشـتییە پابەندیەكـەیش مەدەنی بێ یان جینائی، پێشتر بەدرێـژی جیاوازییـە جەوهەریـەكانی نێوانیـان روون كرایەوە.

لەو رووەوە شوێنی لێكۆڵینەوە لە پابەنـدیی جینـائی لـە یاسـای سـزادان بەشـی گشتی و بەشی تایبەتدا دەبێ، تەنها لەسەر پابەندیی مەدەنی دەوەستین كە هۆكەی كاری ناڕەوای مەدەنییە و سەرچاوەكەی بریتییە لە یاسا.

[1] لەوانە قەزای فەرەنسی كە حوكمی قەرەبووكردنەوەی لەسەر بنچینەی هەڵەی گریمانەكراوی خاوەن كارگەكە دلوە، پاش بەرپابوونی شۆڕشی پیشەسازی لە ئەورووپا.

# باسی دووەم:
# ڕێسا یاساییەکانی پەیوەندار بە کارک نارەوا

پەیوەندیی ئەم ڕێسایانە بە کاری نارەوا (نامەشروع) ئەوەیە باس لە حوکمەکانی زیانگەیاندن بە کەسیتر دەکەن. بەڵگەنەویستە هەموو زیانگەیاندنێك بە کەسیتر بەبێ پاساوێکی شەرعی یان یاسایی کارێکی نارەوایە.

بەڵام ئەگەر پاساوێکی ماقوڵ هەبوو، ئەوا وەك هەڵاوێردن ( ئیستیسنا) کارەکە لە نارەواوە دەگۆڕێ بۆ رەوا، وەك لە حاڵەتەکانی بوونی هۆیەك لە هۆکانی رێپێدان کە گرنگترینیان بەرگریکردنی شەرعی و جێبەجێکردنی ئەرك بەکارهێنانی مافە. هەرکەس زیانێکی ماددی یان مەعنەوی یان جەستەیی بە دەستدرێژکار بگەیەنێ لە حاڵەتی بەرگریکردن لە مەترسیەکی دەستەویەخە کە مەترسی بۆ سەر مافێك لە مافەکانی خۆی یان کەسیتر هەبوو کە یاسا دەیانپارێزێ، نە لە ڕووی سزایی و نە لە رووی مەدەنیەوە بەرپرس نابێ، ئەگەر هاتوو پایە و مەرجەکانی ئەو بەرگرییە هاتبوونە جێ و ڕێگرەکانی لەئارادا نەبوون.

هەروەها ئەگەر ئەو کەسەی بەرپرسە لە خزمەتگوزاریەکی گشتی بەفەرمانی یاسا یان فەرمانی سەرۆکەکەی، زیانی بەماڵی کەسیتر گەیاند، وەك لەناوبردنی ئازوقە لە ئەمبارەکانی بازرگانێك یان شتێکی لەو شێوە کە بەکەڵکی خواردن نەمابێ، نە لە ڕووی سزایی و نە لە رووی مەدەنیەوە لەو زیانانە بەرپرس نابێ، ئەگەر هاتوو پایە و مەرجەکانی ئەنجامدانی ئەرك هاتبوونە جێ و ڕێگرەکانی لەئارادا نەبوون و ئەنجامدانی ئەرکەکە لەسەر ئەو زیانگەیاندنە دەوەستا.

هەروەها ئەو کەسەی لەئەنجامی بەکارهێنانی مافێك کە شەرع یان یاسا دایناوە زیانێکی ماددی یان جەستەیی بە کەسیتر گەیاند، نە لە ڕووی سزایی و نە لە رووی مەدەنیەوە بەرپرس نابێ، نە بە سزادان و نە بە قەرەبووکردنەوە بەو مەرجەی لەبەکارهێنانی مافدا ملهوڕ نەبووبێ[1].

هەرچی ئەنجامدانی کارە ناڕەواکانە لەژێر گوشاری زەرورەت یان زۆرلێکردندا، ئەوا کاری ناڕەوا ناگۆڕێ بۆ موباح، ئەو دوو رووداوە (زۆرلێکردن و زەرورەت) ناڕەوایی لە کارەکە داناڕنن بەڵکو هەر بە هەڵگری ئەو سیفەتە دەمێنێتەوە، بەڵام وەك روخسەت بەرپرسیارێتیی سزایی هەڵدەگیرێ و بەرپرسیارێتیی مەدەنی دەمێنێتەوە.

بینا لەسەر ئەمە هەر کەس لەژێر فشاری زەرورەت یان زۆرلێکردندا ماڵی کەسیتری تەلەف کرد، پابەند دەکرێ بە بژاردنی زیانەکە، لە شتە هاوچەشنەکاندا لەرێی گێڕانەوەی هاوچەشنەکەی، هەروەها لە شتە بەهاییەکانیشدا بە گێڕانەوەی بەهاکەی بەنرخی رۆژی تەلەفکردنەکەی، لەبەرئەوەی کارەکە لەبەر عوزرێك وەك روخسەت جائیز دەبێ، نەك وەك رێپێدان (ئیباحە)، بەڵام لە حاڵەتی زۆرلێکردندا، بەپێی رای. زاڵ زۆرلێکار بەرپرسیارێتی زیانەکە دەگرێتە ئەستۆ.

**لە گرنگترین ئەو رێسایانە ئەمانەن:**

**یەکەم -رێسای: شتە زەرورەکان قەدەغەکراوەکان موباح دەکەن (الضرورات تبیح المحظورات)[2]:**

مانای ئەم رێسایە ئەوەیە کاری ناڕەوا کە لەبەر ناڕەوابوونی قەدەغە کراوە، لە سیفەتە تاوانکاریەکانی رووت دەبێتەوە و دەگۆڕێ بۆ موباح ئەگەر کەسێك لەژێر فشاری زەرورەتدا ئەنجامیدا .ئەمەیش هەڵەیەکی شایعە و مایەی لێخۆشبوون نیە، لەبەرئەوەی زەرورەت لەو شتانەیە کە رێگرە لە بەرپرسیارێتیی تاوانکاری و

---

[1] بۆ زانیاریی یاتر لەسەر ئەو هۆیانە بڕوانە ئەم کتێبەمان: أسباب إباحة الأعمال الجرمية.

[2] گۆڤاری: الأحكام العدلية، مادەی (٢١).

لێپرسینەوەی سزایی لەسەر هەڵدەگیرێ، بەڵام بەرپرسیارێتیی مەدەنیی کەمتەرخەمی دەمێنێ، لێرەیشەوە پابەندبوون بە بژاردنی زیانەکە و گێڕانەوەی دۆخەکە بۆ باری پێش زیان پێگەیاندنەکە هەر دەمێنێ.

راستیەکەی ئەوەیە ئەم رێسایەی بەم شێوەیە هەموار بکرێ: (الضرورات تجيز المحظورات)، (واتە شتە زەرورەکان قەدەغەکراوەکان جائیز دەکەن) زەرورەت عوزرە بۆ (ئیجازە) نەك (ئیباحە)، لەبەرئەوەی لە حاڵەتی زەرورەتدا وەك روخسەت لەلایەن شەرعدانەرەوە مۆڵەتی پێدەدرێ، بەڵام نەك مۆڵەتی خاوەنی ئەو ماڵەی لەژێر فشاری زەرورەتدا لەناوبراوە.

جێی داخە دەبینین زانایانی فیقه و یاسا بەکۆی دەنگ ئەم رێسایە پەسەند دەکەن و پێیان وایە لەژێر فشاری زەرورەتدا ئەنجامدانی هەموو کارێکی ناڕەوا موباحە، سەرباری ئەو جیاوازییە روونەی لەنێوان هۆکانی ئیباحە و رێگرەکانی بەرپرسیارێتیی تاوانکاریدا هەیە[1].

پاشان ئەم رێسایە لەگەڵ ئەو رێسایەی دوای خۆی هاودژە کە دەڵێ: (الاضطرار لا يُبطل حق الغير)[2]. واتە هەر کەس لەژێر فشاری ناچاریدا کارێکی ناڕەوا بکات و زیانێك بە کەسیتر بگەیەنێ، مافی زیانمەندەکە پوچەڵ ناکاتەوە لە داواکردنی قەرەبووی ئەو زیانەی پێی گەیشتووە، وەك ئەو کەسەی ماڵی کەسیتر بخوات تا ژیانی خۆی پێ رزگار بکا، یان ماڵێك بدزێ تا خەرجی خۆی و ئەوانەی بژێوییان لەسەریەتی پێ دابین بکا، تا ژیان لە مردن رزگار بکا، ئەو کەسە لەرووی جینائیەوە لێی ناپرسرێتەوە بەڵام ئەگەر خاوەنەکەی داوای کردەوە پێویستە ئەو ماڵەی لەناوبراوە یان بەکار براوە قەرەبووی بکاتەوە.

---

[1] يُنظر مؤلفنا: موانع المسؤولية الجنائية في التشريع الجنائي الإسلامي والتشريعات الجزائية العربية.

[2] گۆڤاری:الأحكام العدلية، مادەی (٣٣).

گوتنی ئەوە کە ئەنجامدانی کاری ناڕەوا لەژێر فشاری زەرورەتدا موباحە، لەلایەك تێکەڵکردنی ئیباحە و جەواز، لەلایەکیتریش تێکەڵکردنی ئیباحە و ڕێگرەکانی بەرپرسیارێتی جینائییە.

**ئەم ڕێسایانەی خوارەوەیش لە تەواوکەرانی ڕێسای (الضرورات تجیز المحظورات)ن:**

أ - ڕێسای: ئەوەی لەبەر عوزرێك جائیز بوویێ بە نەمانی بەتاڵ دەبێتەوە (ما جاز لعذر بطل بزواله)[1] لەبەرئەوەی جائیزبوون مۆڵەت و هەلاویرانێك بوو لە ڕێسا گشتیەکە کە پێداگری لەسەر نادروستیی دەستبردن بەبێ پاساو یان عوزر بۆ مافێك دەکا کە یاسا دەیپارێزێ، جا ئەگەر ئەو عوزرە نەما کە ڕێگەی پێدەدا، حوکمەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەسڵەکەی، کە نادروستی (عدم الجواز)ـە.

ب -ڕێسای: ئەگەر ڕێگرەکە نەما قەدەغەکراوەکە دەگەڕێتەوە (إذا زال المانع عاد الممنوع)[2]، لەبەرئەوەی کارکردن بە ڕێگرەکە لە حاڵەتی تێکگیرانی لەگەڵ خوازراو (المقتضي)، بەرەنجامی کارکردن بوو بە ڕێسای (إذا تعارض المانع والمقتضي يقدم المانع)[3] (واتە: ئەگەر ڕێگر و خوازراو تێکگیران ڕێگر پێش دەخرێ)، جا ئەگەر ڕێگرەکە نەما پێویستە کار بە خوازراوەکە بکرێ، لەبەرئەوەی ئامانجەهۆی پێشخستنی کارکردن بە ڕێگرەکە لە کارکردن بە خوازراوەکە بە نەمانی ڕێگرەکە نامێنێ، حوکمیش چ بە بوون و چ بە نەبوون لەگەڵ عیللەکەی دەسوڕێ.

ج -ڕێسای: زەروراتەکان بەئەندازەی خۆیان هەڵدەسەنگێنرێن (الضرورات تقدر بقدرها)[4]، لەبەرئەوەی حاڵەتی زەرورەت حاڵەتێکی نائاساییە لە ئەسڵەکە، بۆیە ئەگەر نەما پێویستە بگەڕێتەوە سەر ئەسڵەکە، هەروەها لەبەرئەوەی زیادکردن

---

[1] گۆڤارەکە، (م/ ٢٣).

[2] گۆڤارەکە، (م/٢٤).

[3] گۆڤارەکە، (م/٤٦).

[4] گۆڤارەکە، (م/٢٢).

لەسەر ئەوەی زەرورەت دەیخوازێ بەبێ عوزرێکی رەوا دەبێ، ئەوا وەك روخسەت جائیزبوون نایگرێتەوە.

**دووەم -رێسای: (إذا اجتمع المباشر والمتسبب يُضاف الحكم إلى المباشر)[1] (واتە: ئەگەر راستەوخۆ و بایس کۆببوونەوە حوکمەکە دەدرێتە پاڵ راستەوخۆکە):**

ئەوە روونە زیانگەیاندن بە کەسیتر بەراستەوخۆیە یان بە ناڕاستەوخۆ. راستەوخۆ ئەوەیە تەلەفکردنەکە کردەی کەسەکە خۆیەتی و کردەیەکیتری هەڵبژێر نەکەوتۆتە نێوان ئەو و تەلەفکردنەکەوە، وەك ئەو کەسەی بیرێك لە شوێنێکی رێگەپێنەدراوی وەك رێگەیەکی گشتی هەڵدەکەنێ، حەیوانێك دەکەوێتە ناوی و لەناو دەچێ، لەم حاڵەتەدا لەناوچوونەکە کردەوەی راستەوخۆی بیرهەڵکەنەکە دەبێ.

ناڕاستەوخۆ (یان بایس) ئەوەیە کردەیەکیتری هەڵبژێر کەوتبێتە نێوان ئەنجامەکە و کردەوەکەی، وەك نموونەکەی پێشوو ئەگەر کەوتنە ناو بیرەکە بەدەستی کەسێکیتر بووبێ، بیرهەڵکەنەکە لێرەدا بووەتە بایس لەبەرئەوەی ئەگەر چاڵەکە نەبوایە کەوتنەناوەکەیش رووی نەدەدا، ئەوەیش خستویەتیە ناوی بکەرێکی هەڵبژێری راستەوخۆیە.

لەسەر بنەمای ئەو رێسایە، بەهۆی زیانی تەلەفەکەوە بەرپرسیارێتیی کەمتەرخەمی دەکەوێتەسەر.

بەبڕوای لەخۆبوردوانەی ئێمە بیرهەڵکەنەکە لە بەرپرسیارێتی قوتار نابێ مەگەر بیرەکەی لە شوێنێکی رێگەپێدراو و رەوادا هەڵکەندبێ، وەك لە باخچەی ماڵەکەی یان بێستانەکەیدا بەمەبەستی ئەوەی بەئاوەکەی دارو درەختەکانی ئاو بدات.

بەڵام ئەگەر بیرەکە لە شوێنێکی ناڕەوادا بوو لە بەرپرسیارێتی قوتار نابێ و لەسەر کارە ناڕەواکەی بژاردنی بەشێك لە قەرەبووەکە یان سزایەکی تەمێکاری دەکەوێتە سەر، قەرەبوویش لە ئەنجامدەری راستەوخۆی کارەکە وەردەگیرێ.

---

[1] گۆڤاری الأحکام العدلیة، (المادة ٩٠)، مەدەنیی ئوردنی (مادەی ٢٥٨).

ئەم ڕێسایە سەرەڕای باوی و بڵاوی لە فیقهی ئیسلامی و یاساکاندا، بەڵام ئەگەر بەو رەهاییە وەربگیرێ ڕێسایەکی ناڕاستە، بۆیە پێشنیار دەکەین بەم شێوەیە هەموار بکرێ: "ئەگەر بایس و ڕاستەوخۆ کۆبوونەوە، حوکمەکە دەدرێتە پاڵ ئەوەیان کە زاڵە، ئەگەر یەکسانیش بوون حوکمەکە لەنێوانیاندا یەکسان دەبێ".

بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- ئەگەر کەسە بایسەکە (المتسبب) زاڵ بوو ئەو دەبێتە دەستەبەر و پابەند بە قەرەبووکردنەوە نەك کەسە ڕاستەوخۆکە، لە پیادەکردنەکانی ئەم وێنەیە:

أ - حاڵەتی زۆرلێکردن (الاکراه): هەرکێ بەزۆر کەسێك ناچار بکا بۆ تەلەفکردنی ماڵی کەسیتر، ئەوا زۆرلێکارەکە بایسە و زۆرلێکراوەکە ڕاستەوخۆیە و بەرپرسیارێتی لەسەر یەکەمە، لەبەرئەوەی ئەو زاڵ بووە و دووەم وەك ئامرازێکی جێبەجێکردن بووە.

ب- حاڵەتی ئەوەی (ئەنجامدەرە) ڕاستەوخۆکە شیاو نەبێ بۆ لەئەستۆگرتنی بەرپرسیارێتی و پابەندی، وەك ئەو کەسەی گوریسێك دەبڕێ کە حەیوانێکی زیانبەخشی پێ بەستراوەتەوە، حەیوانەکە بەردەبێت و دەچێتە کێڵگەیەك و شپرزەی دەکا، یان هەر ماڵێکیتر لەناو دەبا، بەرپرس کەسە بایسەکەیە نەك ڕاستەوخۆکە، ئەویش بەپێی ڕێسای (جنایة العجماء جبار) واتە تاوانی بێزمان بەفیڕۆدانە، لەبەر نەشیانی بۆ پابەندی.

ج - ئەگەر ئەو کەسەی سپاردەیەکی لەلا دانراوە، شوێنی سپاردەکەی پیشانی دزێکدا، ئەویش چوو دزی بەشێوەیەك نەدەتوانرا ماڵە دزراوەکە بگێڕدرێتەوە، دەستەبەری لەسەر ئەو کەسەیە سپاردەکەی لەلا دانراوە، ئەگەرچی بایسێکی ناڕاستەوخۆیە.

٢- نموونە لەسەر ئەوەی ڕاستەوخۆکە بەرپرس و دەستەبەر و پابەندە نەك بایس لەو رووەوە ئەو لە ڕووداوەکەدا زاڵە: ئەو کەسەی بیرێك لە شوێنێکی ڕێپێنەدراو، وەك ڕێگەیەکی گشتی لێدەدات و کەسێك دێت ماڵێکی کەسیتری تێ

فرێدەدا، لەم بارەدا ئەگەرچی کاری هەردووکیان (بایس و راستەوخۆ) ناڕەوایە، بەڵام ئەو کەسەی شتەکەی تێ فرێداوە (راستەوخۆکە) دەستەبەری زیانەکەیە.

بەڵام پێویستە دەسەڵاتی گشتی سزایەکی تەمێکارانەی بڕلێدەرەکە لەسەر کارە ناڕەواکەی بدات.

٣- نموونە لەسەر حاڵەتی یەکسانبوونی بەرپرسیارێتی لەنێوان بایس و راستەوخۆدا :کەسێك دەستی کەسێك بگرێت و کەسی سێیەم پارەکانی کەسە دەستگیراوەکە ببات، لەم بارەدا هەردووك وەك یەك بەرپرسیار دەبن، لەبەرئەوەی ئەگەرچی لە بایسبوون و کردنی راستەوخۆدا جیاوازن بەڵام هەردووکیان بە شەریك لە ئەنجامدانی کارە ناڕەواکە دادەنرێن، وەك کە مادەی (48) لە یاسای سزادانی عێراقیی بەرکار دەڵێ:

"بە شەریکە تاوان دادەنرێ:

١- ئەو کەسەی هانی ئەنجامدانی داوە و بەهۆی ئەو هاندانەوە تاوانەکە رووی داوە.

٢- ئەو کەسەی لەگەڵ کەسیتر لەسەر ئەنجامدانی رێکە کەوتووە و بەهۆی ئەو رێکەوتنەوە رووی داوە".

شایانی باسە زۆر لە شەرحکاران لە زۆر لە نموونەکانیان لەم بابەتەدا کردنی راستەوخۆ و بایسبوونیان تێکەڵ کردوە، لەوانە:

أ -مامۆستا عەلی حەیدەر[١] دەڵێ ئەگەر کەسێك خیگە (زق)ێکی[٢] پڕ لە رۆنی دڕاند، یان حەبلێکی پچڕاند کە قەندیلێکی پێوە هەڵواسرابوو و ئەو زەیتەی

---

[١] شرح مجلة الأحكام العدلية، ٨١/١.

[٢] الزق: پێستەیەکە بۆ هەلگرتنی ئاو بەکاردێ.

(لە گوندەکاندا پێستەی مەڕ و بزن پاش خۆشەکردنی بە چەند قۆناغێکی جیاواز بۆ مەبەستی جیا بەکار دێ، هەریەکەیشیان ناوێکیان هەیە، ئەگەر ئاوی تێ بکرێ پێی دەوترێ کوندە, ئەگەر بۆ ژەندنی ماست و بەرهەمهێنانی دۆ و کەرە بەکار بێ پێی دەوترێ مەشکە، بەڵام ئەگەر رۆنی کوردەواری تێدا هەڵبگیرێ پێی دەوترێ خیگە یاخود هیزە- وەرگێڕ).

تێیدا بوو ڕژا و قەندیلەکە شکا، دەستەبەری دەکەوێتە سەر، ئەگەرچی لەوە دەرنەچووە کە بایس بووە".

ناونانی ئەم شێوەیە بە بایسبوون (بوونەهۆ) هەڵەیەکی ڕوونە، لەبەرئەوەی بایسبوون نابێ تا کردەوەیەکیتری هەڵبژێر نەیەتە نێوان کردەی ئەنجامدەرە ڕاستەوخۆکە و ئەنجامەکە.

ب -شێخ عەلی ئەلخەفیف[1] دەڵێ: "ئەگەر کەسێك پشکۆیەکی دانا و بەهۆیەوە شتێك سووتا، ئەو دەستەبەری زیانەکە دەکا، بەڵام ئەگەر با ئەو پشکۆیەی لە جێیەکەوە برد بۆ جێیەکیتری ڕێگەکە و شتێك بەهۆیەوە سووتا ئەو دەستەبەری ناکا، لەبەرئەوەی شتێك لەنێوان کردەوەکەی ئەو و تەلەفبوونەکەدا هەیە کە ڕێگرە لەوەی بدرێتە پاڵ کردەوەکەی ئەو".

**ئەمەیش هەڵەیەکی ڕوونە لە دوو ڕووەوە:**

یەکەمیان :لەنێوان کردەوەکەی ئەو و ئەنجامەکەدا کردەوەیەکیتری هەڵبژێر نەهاتووەتە ناو.

دووەمیان: بڵاوبوونەوەی ئاگر لە شوێنێکی لەو جۆرەدا بەر لەوەی ڕووبدات شتێکی چاوەڕوانکراوە، وەك ئەو کەسەی بەپێچەوانەی سیستمی هاتوچۆ ئۆتۆمبێلەکەی لێ دەخوڕێ و چاوەڕوان دەکا لە ڕێگەدا زیانێك بقەومێنێ، ئەمەیە زانایانی یاسای جینائی ناویان ناوە (هەڵەی چاوەڕوانکراو).

ج -مامۆستا وەهبە ئەلزوحەیلی[2] دەڵێ: "ئەو کەسەی چەقۆ یان چەکێك بداتە مێردمنداڵێك تا بیگرێ، ئەویش خۆی یان کەسێکیتری پێ بکوژێ، دەستەبەر لەسەر پێدەرەکە نیە، لەبەرئەوەی تەنها بایسە، بەڵکو زەمان لەسەر خودی مێردمنداڵەکەیە لەبەرئەوەی ئەو بکەری ڕاستەوخۆیە."

---

[1] نظرية الضمان، ص٧٦.

[2] نظرية الضمان، ص١٩٠.

ئەمەیش هەڵەیە لەبەرئەوەی کردەوەیەکی هەڵبژێر نەهاتۆتە نێوان، هەربۆیە ڕێسای (بایس و ڕاستەوخۆ) بەسەر ئەم حاڵەتەدا جێبەجێ نابێ، لەبەرئەوەی پێدەرەکە پێی دەوترێ بکەری مەعنەویی ڕاستەوخۆ لەبەرئەوەی مێردمنداڵەکە بەهۆی نەشیانیەوە دەرکی نیە، هەربۆیە پێدەرەکە لە ئەنجامەکە بەرپرسە جا چ خۆی پێ بکوژێ یان کەسێکیتر، لەبەرئەوەی مێردمنداڵەکە لەم بارەدا وەك ئامێری جێبەجێکردن وایە، بەپێچەوانەی ئەوەی ئەگەر بکوژەکە مرۆڤێکی باڵقی ژیر بێ.

بەم شێوەیە زۆر هەڵە دەبینین کە گەورە زانایان لە ئیجتیهادەکانیاندا تێیان دەکەون، بەهۆی ئەوەی لە ئیجتیهادەکانیاندا ڕۆڵی پێویست بە عەقڵ و لۆژیك نادەن.

لەو هەڵە ڕوونانەی پەیوەندیان بە ڕێسای (ئەگەر بایس و ڕاستەوخۆ کۆبوونەوە، حوکمەکە دەدرێتە پاڵ ئەوەیان کە زاڵە)ەوە هەیە بریتییە لە ڕێسای (المباشر ضامن بلا شرط والمتسبب ضامن إذا تعمد أو تعدى)[1] واتە زیانگەیاندنەکە یان بە ڕاستەوخۆ دەبێ یان بە بایسبوون، ئەگەر بە ڕاستەوخۆ بێ بەرەهایی دەستەبەری پێویستە و مەرجی نیە .ئەگەر بە بوونەهۆ (بایسبوون)یش ڕوویدا، مەرجە کە دەستدرێژی یان بەئەنقەستکردنی تێدا بێ، یان کردەوەکە سەرکێشی بۆ زیان.

ئەم هەڵەیە بەرهەمی لێك جیانەکردنەوەی نێوان بەئەنقەستکردن و دەستدرێژی و کاری نارەوایە.

بەئەنقەستکردن (التعمد): واتە مەبەست زیانگەیاندن بێ بە کەسیتر، واتە زیانگەیاندن بە مەبەستی تاوانکارانە یان بە نیەتی خراپەوە.

دەستدرێژی (التعدي): زیادەڕۆییکردنە بۆ سەر مافی کەسیتر بەبێ پاساو و پێی دەوترێ (کاری نارەوا) جا چ بکەرەکە بزانێ کارەکەی نارەوایە یان نەزانێ .ئەگەر هەر ڕووداوێکی زیانبەخش نە بەئەنقەستکردن و نە دەستدرێژی تێدا نەبوو دروست

---

[1] مەدەنیی ئوردنی ، مادەی (٢٥٧).

(جائین) دەبێ و بە كارێكی نارەوا دادەنرێ .لێرەیشەوە كردەوەكە بەهەڵە دادەنرێ، بەو پێیە لە فەرهەنگی مەنتیق و یاسا و فیقهدا بە كارێكی نارەوا دادەنرێ تا هەردوو رەگەزی بەئەنقەستكردن و دەستدرێژی تێدا نەبێ.

**سێیەم -رێسای: نە زیانگەیاندن و نە پەرچە زیانگەیاندن (لا ضرر ولا ضرار)[1]:**

ئەم رێسایە دەقزا (نصی)یە و ساغ بۆتەوە لە سوننەتی پێغەمبەرە (ﷺ) .لە ریوایەتێكیتردا بەم شێوەیە هاتووە (لا ضرر ولا ضرار في الإسلام).

ئەم رێسایە چەند جیاكەرەوەیەكی هەیە، لەوانە:

١- وەك گوتمان رێسایەكی دەقزایە نەك ئیجتیهادی .رێسای ئیجتیهادی بەرهەمی عەقڵی موجتەهیدە وەك (الاجتهاد لا ينقض بمثله)[2]، واتە بەنیسبەت رابردوو و ئەو حوكمانەی لەسەری بینا كراون هەڵناوەشێتەوە ئەویش بۆ رەچاوكردنی سەقامگیریی مامەڵەكان .بەڵام سەبارەت بە ئایندە دەكرێ بە هاوشێوەی خۆی هەڵبوەشێتەوە، لەبەرئەوەی لەسەر بەرژەوەندیەك بنیات نراوە، جا ئەگەر بەرژەوەندیەكە گۆرا ئەویش دەگۆرێ.

٢- رێساكە دوو پابەندی تێدایە :گشتی و تایبەت، گوتراوی بەشی یەكەمی (لا ضرر) ئەوەیە ئەسڵ وایە هەموو مرۆڤێك ئەندامی خێزانی مرۆڤایەتییە، بەڵێن بدات كە بەبێ پاساوێكی شەرعی یان یاسایی زیان بە كەسیتر نەگەیەنێ.

گوتراوی بەشی دووەمی (لا ضرار) ئەوەیە لە زیانە مەدەنیەكاندا مامەڵەكردنی هاوچەشن دروست نیە، بەڵكو ئەو كەسەی بە كردەی كەسێكیتر زیانی پێدەگا، بۆی هەیە داوای برێتی (بدل)ێكی هاوچەشنی لە شتە هاوچەشنەكان، یان نرخی زیانەكە لە رۆژی روودانیدا لە شتە بەهادارەكان، لێ بكاتەوە.

كەواتە ئەو كەسەی كەسێكیتر ماڵەكەی لەناوبردوە بۆی نیە ماڵی ئەو كەسە لەناو ببا، ئەگینا هەریەكەیان تۆباڵی ئەو زیانەیان لەسەرە كە گەیاندویانە.

---

[1] گۆڤاری الأحكام العدلية، (م/١٩).

[2] گۆڤارەكە (م/١٦).

بەڵام لەو تاوانانەی دژی کەسەکان دەکرێن مامەڵەکردنی هاوچەشن دروستە، وەك خوا دەفەرموێ: (وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا[1] أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ وَالْعَيْنَ بِالْعَيْنِ وَالأَنفَ بِالأَنفِ وَالأُذُنَ بِالأُذُنِ وَالسِّنَّ بِالسِّنِّ وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ)[2].

٣- ڕێسایەکی بخواز (اقتضائي)یە[3]، جگە لە گوتراوی دوو بەشەکەی وەك باسمان کرد، لە بابی خواستی دەق یان دیلالەتی خواست دەژمێرێ، لەبەرئەوەی دەخوازێ وەپاڵخراو (ضميمة)یەکی بخرێتە سەر تا مانا ویستراوەکە بگەیەنێ، لەبەرئەوەی دەستگرتن بە ڕواڵەتەکەیەوە ڕاست دەرناچێ، ئەویش ڕوونەدانی زیانگەیاندن یان پەرچە زیانگەیاندنە لە واقیع و هەمان شتدا، لەکاتێکدا ڕوودانیان شتێکی بەڵگەنەویستە.

لەم ڕووەوە مانای ڕێساکە دەبێتە ئەوەی (نە زیانگەیاندن و نە پەرچە زیانگەیاندن دروست نین).

٤- بەشی دووەمی ئەو ڕێسایە ڕێسایەکیتری گشتی تەواوی دەکات و ڕوونی دەکاتەوە کە دەڵێ: (الضرر لا يُزال بمثله)[4]. (واتە زیان بە هاوشێوەی لانابرێ).

٥- ئەم ڕێسایە هەندێ هەڵاوێردراوی هەن لە هەندێ ڕێسایتردا، لەوانە:

أ -ڕێسای: بۆ لادانی زیانێکی گشتی بەرگەی زیانی تایبەت دەگیرێ (يتحمل الضرر الخاص لدفع ضرر عام)[1]: وەك لەم پیادەکردنانەدا:

---

[1] واتە لە تەوراتدا.

[2] سورة المائدة/ ٤٥.

[3] لەوانەیە لە دەقدا وشەیەك یان دەستەواژەیەك فەرامۆش بکرێ کە بوونی بۆ ئاماژەکردنی دەقەکە لە مانا مەبەستەکە گرنگە، بەڵام لەبەر هەڵەیەك یان نەزانیەك یان ڕۆشنیەك یان هەر هۆیەکیتر دانەنراوە، بۆیە پێویستی شەرحکاری دەقەکە یان قازی یان موفتی ڕەچاوی ئەو وشە یان دەستەواژەیە بکا و بوونی لە دەقەکەدا بسەپێنێ. بڕوانە ئەم کتێبەمان: أصول الفقه في نسيجه الجديد، ٢/٤٠٧ و پاشتر.

[4] گۆڤارەکە، (م/٢٥).

١- باجی سەر ماڵی پارەداران زیانێکی تایبەتە بۆ ئەوان، بەڵام ئەم زیانە تایبەتە لەکاتی کورتهێنانی بودجەی گشتیدا مەشروعە، ئەو کورتهێنانە زیانێکی گشتییە و لەبەر بەرژەوەندیی گشتی بە رێگەی ئەو زیانە تایبەتەوە دوور دەخرێتەوە، هەموو یاساکان دانیان بە رەوابوونی ئەمەدا ناوە.
٢- لەناوبردنی داودەرمانی خراپ لە دەرمانخانەکان و ئازوقەی ئەمبارکراوی بازرگانەکان، ئەگەر بەکەڵکی بەکاربردن نەدەهاتن، زیانێکی تایبەتە بۆ خاوەنەکانیان، بەڵام پێویستە بەرگەی ئەم زیانە بگرن بۆ دوورخستنەوەی زیانێکی گشتی، کە تێکدانی تەندروستیی گشتییە.
٣- لە حاڵەتی هێرشی چەکدارانەی دوژمن بۆ سەر وڵات، پێویستە هەر کەس توانای چەکهەڵگرتنی هەبێ دەست لە کارە رۆژانەکەی هەڵبگرێت و بەشداری لە بەرگریکردن لە وڵاتەکەی بکات، لەبەرئەوەی زیانی وڵاتەکە گشتییە و زیانی تاکەکان تایبەتە، هەربۆیە قوربانی بە تایبەت دەدرێ لەپێناو پاراستنی گشتیدا.
٤- لەبەر پاراستنی تەندروستیی گشتی رێگە بە پزیشکی نەشیاو نادرێ چارەسەری نەخۆش بکا، هەروەك بۆ پاراستنی سیستمی گشتیش رێگە بە پیاوی ئاینیی نەشیاو بۆ فتواندان نادرێ فتوا بدات.

ئەو یاسایە ئەوە دەخوازێ ئەگەر زیانێکی گشتی لەگەڵ زیانێکی تایبەت تێکگیران و نەدەکرا کۆبکرێنەوە، پێویستە لە رەچاو و کارپێکردندا گشتیەکە پێش تایبەتەکە بخرێ.

ب- رێسای زیانە توندترەکە بە زیانە سووکترەکە لادەدرێ (الضرر الأشد يُزال بالضرر الأخف)[٢]: بۆ نموونە ئەگەر گەیشتنی ئۆتۆمبێلی ئاگرکوژێنەوە بۆ

---

[١] گۆڤارەکە، (م/٢٦).
[٢] گۆڤارەکە، (م/٢٧).

ئەو شوێنەی ئاگری گرتووە لەسەر رووخاندنی دیوارێك دەوەستا کە موڵکی کەسێك بوو، دروستە بەمەبەستی کوژاندنەوەی ئاگرەکە دیوارەکە برووخێنرێ و قەرەبوویەکی دادپەروەرانە بدرێتە خاوەنەکەی، لەبەرئەوەی زیانی سووتانەکە لە تێکدانی دیوارەکە زیاترە بەتایبەت ئەگەر ماڵی گشتی بوو.

ج- رێسای هەڵبژاردنی ساناترینی دوو خراپە (أهون الشرين)[1]: بۆ نموونە ئەو کەسەی دەستی تووشی نەخۆشیی شێرپەنجە دەبێ، دروستە لەرێی لیژنەیەکی تەندروستیی پسپۆڕەوە دەستەکە ببڕێتەوە تا رێگە لە تەشەنەکردنی نەخۆشیەکە بگیرێ، لەبەرئەوەی زیانی بڕینەوەکە مەترسیی کەمترە.

د- رێسای دوورخستنەوەی زیان لە هێنانی سوود لەپێشترە (درء المفاسد أولى من جلب المنافع)[2]: واتە ئەگەر زیانێك و سوودێك تێك گیران، لە رێگەی وازهێنان لە سوودەکەوە زیانەکە دوور دەخرێتەوە .بۆ نموونە رێگە لە دراوسێ دەگیرێ دیواری ماڵەکەی بەسەر دیواری دراوسێکەیدا بەرز بکاتەوە ئەگەر ئەو دراوسێیەی لە سوودبینین لە تیشکی خۆر یان هەوای پاك بێبەش دەکرد .هەروەها رێگە لە هەر کەس دەگیرێ مافی خۆی بەکار بێنێ ئەگەر هاتوو ئەو کارە ملهوڕیکردنی تێدا بوو.

**چوارەم- رێسای: رێپێدانی شەرعی دەستەبەری هەڵدەوەشێنێتەوە (الجواز الشرعي يُنافي الضمان)[3]:**

گوتراوی ئەم رێسایە ئەوەیە ئەگەر کەسێك کارێکی کرد لەرووی شەرع یان یاساوە رێگەی پێدرابوو و لەو کارەی زیانێك بە کەسێتر گەیشت، ئەو زیانە زەمانی نیە ئەگەر لە بەرکارهێنانی مافەکەیدا ملهوڕ (متعسف) نەبووبێ، بۆ نموونە ئەو کەسەی بیرێك لە

---

[1] گۆڤارەکە، (م/٢٩).

[2] گۆڤارەکە، (م/٣٠).

[3] گۆڤارەکە، (م/٩١).

باخەکەیدا هەڵدەکەنێ بۆ ئاودانی درەختەکانی و حەیوانێك یان ئادەمیزادێك یان ماڵی کەسێکیتری تێکەوت و مرد یان لەناوچوو یان نرخ یاخود سوودەکەی کەمی کرد، هەڵکەندەکە دەستەبەری ئەو زیانە نابێ و بەوهۆیەشەوە پابەند نابێ بە بژاردنی.

شایانی باسە رێپێدانی شەرعی یان ئەسڵییە وەك لەو نموونەیەدا، یان وەك روخسەت نائاسایی (استثنائي)ـە لەبەر عوزرێك وەك خواردنی ماڵی کەسیتر بەبێ مۆڵەتی خۆی لەژێر فشاری هەژاری و نەداریدا. ئەم رێپێدانە شەرعییە، ئیستیسنابیە و دەستەبەری هەڵناوەشێنێتەوە، بۆیە پێویستە ئەو رێسایە بە مەرجی (ئەسڵی)ەوە ببەسترێتەوە لەسەر بنچینەی دیلالەتی خواستن (اقتضاء)، واتە بەم شێوەیەی لێ بێ (رێپێدانی شەرعیی ئەسڵی دەستەبەری هەڵدەوەشێنێتەوە). بەڵام جوازی شەرعیی ئیستیسنایی کە وەك روخسەت رێگەی پێدەدرێ، لەبەر عوزرێك وەك خواردنی ماڵی کەسیتر لەژێر فشاری نەبوونی یان دزینی بۆ رزگارکردنی ژیانی خۆی و ژیانی ئەوانەی خەرجیان لەسەریەتی، ئەوا پێچەوانەی دەستەبەری و پابەندبوون نیە بە قەرەبووکردنەوەی ئەو ماڵەی لەناوی بردوە یان بەکاری بردوە ئەگەر خاوەنەکەی داوای قەرەبووی کرد. لێرەیشەوە تێکگیران لەنێوان هەردوو رێساکەدا نیە، واتە رێسای (الجواز الشرعي ينافي الضمان) و رێسای (الجواز الشرعی لا ينافی الچمان)لەبەرئەوەی یەکەمیان ئەسڵی و دووەمیان ئیستیسنابیە.

# باسی سێیەم:
# بەشەکانی کاری نارەوا

هۆیەکیتر لە هۆکانی پابەندیەکان پاش گرێبەند و کاری بەسوود بریتییە لە کاری نارەوا. ئەوە وەك پێشتر باسمان کرد، هاومانای دەستدرێژی (تعدي)ـە، واتە زیادەڕەویکردنە سەر مافی کەسیتر کە پێچەوانەی شەرع یان یاسا یان سیستمی گشتی یان ئادابی گشتی بێ.

کارە نارەواکان یان سزایی (جزائي)ن ئەگەر رەگەزی هەڵەکە تێیدا جینائی بوو، یان مەدەنین ئەگەر مەدەنی بوو.

بەشی یەکەم یاسا سزاییەکان کاری لەسەر دەکەن و بابەتی لێکۆڵینەوەی ئێمە نیە.

بەشی دووەمی کارە نارەواکان یان بەرەهایی زیانبەخشن یان سوودبەخشێکی نارەوان بۆ لایەنێك و زیانبەخشن بۆ لایەنێکیتر. لەتی یەکەمی ئەم دابەشکردنە یان کاری نارەوای راستەوخۆن (کەسی)، یان ناراستەوخۆن (بایسبوون).

لەو رووەوە دابەشکردنەکانی هۆکانی پابەندی یان سەرچاوەکانی (وەك یاساناسان دەڵێن) بە ترازووی مەنتیق دابەشکردنی هەڵەن، وەك پێشتر باسمان کرد، لەو رووەوە یان ئەوەتا تێهەڵکێشن یان لێك جیاوازن یان لەو جۆرەن دابەشکراو دەکرێتە بەش یان بەپێچەوانەوە.

هەوڵ دەدەین بەپێی توانا ناونیشانی باسی سێیەم بۆ چوار خواست دابەش بکەین، یەکەم تەرخان دەکرێ بۆ ناساندنی دابەشکردن بە ترازووی مەنتیق، دووەم بۆ کارە نارەوا شەخسیەکان (کارە نارەوا راستەوخۆکان)، سێیەم بۆ کارە نارەواکان بە

بایسبوون (ناشەخسی)، چوارەمیشیان بۆ کارە ناڕەوا دووسەرەکان (سوودبەخش و زیانبەخش) تەرخان دەکرێ.

## خواستی یەکەم:
## ناساندنی دابەشکردن بە ترازووی مەنتیق

دابەشکردن (التقسیم) لە زماندا: چاوگی (قسّم)یە لە بابی فعّل (بە تەشدیدی عەین)، لە زماندا بەچەند واتایەك هاتووە، لەوانە: بەشبەش و پەرتکردن، دەگوترێ (قسم الشيء): واتە بەشبەشی کرد. (وقسّم الدهر القوم): واتە زەمانە ئەو قەومەی پەرت کرد. (قسّم فلان أمره): مەزەندەی کرد و سەرنجیدا چی بکا.

دابەشکردنی شتێك لە عەینەکانیش (واتە: شتە هەبووە بەرهەستەکانی دەرەوەی زەین) بەشبەشکردنیەتی.

دابەشکردنی چەمکە هەمەکی (کلّي)ەکانیش لە زەیندا دابەشکردنی هەمەکییە بۆ بەشە لێك جیاواز (المتباین)[1] یان دژیەکەکانی (المتضادة)[2].

لە زاراوەسازیدا توێژەران پێناسەیان کردوە بەوەی میتۆدێکە دەکرێ لە پێناسەکردنی شتە جیاوازەکاندا بەکار بێ، جا یان بە چییەتیەکانیان (خودەکانیان) یان بە جیاکەرەوەکانیان لە وەسف و تایبەتمەندیەکانیان.

وەك زانراوە یەکەم کەس دابەشکردنی بەم مانایە بەکارهێنا فەیلەسوفی یۆنانی ئەرستۆ بوو.

لەڕاستیدا دابەشکردنی شتەکان بەگوێرەی سروشتیان دەگۆڕێ و ناتوانین بگەینە پێناسەیەکی سەرتاپاگیر، کە هەموو دابەشکردنە زەینی و دەرەکیەکان لەخۆ بگرێ.

---

[1] دوو لێك جیاواز (المتباینان) ئەوەیە مانای هەریەکەیان بەسەر شتێکدا، وەك دار وبەرد، ناچەسپێ کە ئەویتریان بەسەریدا دەچەسپێ.

[2] دوو دژیەك (المتضادان): کۆ نابنەوە بەڵام بەرز دەبنەوە وەك رەشێتی و سپێتی.

ئـەوەی لـە بابـەتی هۆکـانی پابەندیـەکان (یـان سەرچـاوەکانی پابەندیـەکان)دا بەلامانەوە گرنگە، ئەوەیە یەك دابەشکراو هەبێ وەك هۆی پابەندی (یان سەرچاوەی پابەنـدی) و لـەنێوان بەشـەکاندا جیـاوازی هـەبێ بەشـێوەیەك یـەکێکیان لەتـەك یەکێکیتریان لە زەین یان دەرەوەی، یان لانیکەم لە زەیندا کۆنەبنەوە و تێهەڵکێشـی لەنێوان بەشەکاندا نەبێ، هەروەها هەر بەشێك بەرەهایی لە دابەشکراوەکەی تایبەتر بێ، دابەشکراویش گشتی و رەها دەبێ لە هـەر بەشـێك لـە بەشـەکانی بەشـێوەیەك هەرکات بەشـەکە بـەدیهات دابەشـکراوەکەی لەگـەڵی بەدیدێ، بـەڵام پێچـەوانەکەی بەتەواوی وا نیە. لەوانەیشـە دابەشـکراوەکە بـەبێ بـەدیهاتنی بەشـەکە بـەدیبێ، بۆ نموونە وشە لە زانستی نەحو و سەرفدا دابەش دەبێ بۆ فەرمان (فعل) و ناو (اسم) و پیت (حرف)، لە هەرکوێ یەکێك لەم بەشانە هاتەدی لەتەکیدا وشـە بەدیـدێ، بـەڵام لەوانەیە وشە بە فەرمان بەدیبێ بەبێ ناو و پیت، یان بە ناو بەبێ دوانەکەیتر، یان بە پیت بەبێ ناو و فەرمان.

**جۆرەکانی دابەشکردن،**

دابەشکردن لە چەند روویەکەوە بۆ چەند جۆرێك دابەش دەبێ، بەم شێوەیە:

**یەکەم- لەڕووی سەرژمێریەوە بۆ عەقلی و سەرپێوکاری (استقرائی):**

**١- دابەشکردنی عەقڵی:** ئەو دابەشکردنەیە لەنێوان نەفی و ئیسپاتدایە:

أ- وەك دابەشکردنی تۆمەتبار بۆ بێتاوان و تاوانبـار (المـدان)، لەبەرئـەوەی یـان ئـەوەتا تۆمەتەکـەی بەبەڵگـەی مـاقوڵ سـاغ دەبێتـەوە یـان سـاغ نابێتـەوە، دووەمیان بێتاوان و یەکەمیان تاوانبارە.

ب- دابەشکردنی شت بۆ جەوهەر و عەرەز، لەبەرئەوەی شت یان ئەوەتا خۆیـان سەربەخۆ هەن وەك ئەو شـتانەی لـە دەرەوەی زەینـی مـرۆڤ هـەن، یـان بـە شـتیترەوە بەنـدن، وەك رەنـگ و بۆنـەکان کـە بـە جەوهەرەکانـەوە بەنـدن، یەکەمیان جەوهەرە و دووەمیان عەرەزە.

ج- دابەشکردنی وشە بۆ بۆ فەرمان و ناو و پیت، لەبەرئەوەی یان ئـەوەتا خـۆی ئاماژە بۆ مانای مەبەست دەکا یان نا، ئەمەی دووەمیان پیتی وەك (مِن، إلى، علـى) و هـیتر، ئەمانـە ئامـاژە بـۆ مانـای مەبەسـت ناکـەن تـا نەدرێنـە پـاڵ وشەیەکیتر وەك (جئت من بغداد إلى أربيل). یەکەمیان یان ئەوەتا بە یەکێك لە سێ دۆخەکەی کات (رابردوو و ئێستا و ئاینده) ئاماژە بۆ مانـا ویسـتراوەکەی دەکات یان نا، یەکەمیان فەرمان و دووەمیان ناوە.

**٢- دابەشکردنی سەرپێوکاری:** دابەشکردنێکە پێوەرەکەی توێژینەوەی مەیدانی و سەرژمێرکردنی بەشەکیەکانە بۆ گەیشتنە حوکمێکی هەمەکی، ئەوەیش یان تـەواوە یان ناتەواو:

أ- سەرپێوکاریی تەواو: ئەوەیە سەرجەم بەشەکیەکان سەرژمێرکردن و حوکمـە گشتیەکە دەیانگرێتەوە، وەك حوکمی ئەوەی هەموو مرۆڤێك دەمرێ.

ب- سەرپێوکاریی ناتەواو: سەرژمێریەکە نـاکرێ بـە توێژینـەوەی مەیـدانی ١٠٠٪ سـاغ بکرێتـەوە، وەك حوکمـدان بـەوەی هـۆی تـەڵاق لـە عێراقـدا ئـابووری، دەستێوەردانی کەسوکار، جیاوازیی تەمەن، جیاوازیی پلەوپایەی رۆشـنبیری یان سیاسی یان کۆمەڵایەتییە و دەکرێ هۆیتریش هەبن، کە جگە لەو کەسەی ژنەکەی تەڵاق داوە کەسیتر نەیزانێ.

**دووەم- لەرووی بوونی دابەشکراو بەشەکانی لە ناوەوە و دەرەوەی زەین یان تەنها لە زەیندا بۆ بەش و بەشەکیەکان دابەش دەبێ:**

١- دابەشکردنی هەموو بۆ بەشەکان (تقسيم الكل الى الاجزاء): وەك دابەشکردنی بەرهەمە تەکنەلۆژیەکان بۆ ئەو بەشانەی لێی پێکهـاتوون، وەك دابەشـکردنی ئۆتۆمبێل بـۆ ئـەو پارچـانەی لێـی دروسـت کـراون و لـەو بابەتانـە. هـەموو و بەشەکانی لە دەرەوەی زەین هەن و دەکرێ لە زەینیشدا وێنا بکرێن.

٢- دابەشکردنی هەمـەکی بـۆ بەشـەکیەکانی (تقسـيم الكلـي الى جزئياتـه): وەك دابەشکردنی مرۆڤ کە لە گیانلەبەرە زیندووەکانە و بـەئیرادە دەبـزوێ بـۆ دوو

پۆل (نێر و مێ). دانانیان بە دوو رەگەز هەڵەیەکی شایعە، لەبەرئەوەی چیەتیی رەگەز و جۆرەکان جیاوازە، بەڵام چیەتیی پۆلەکان وەك یەکە، چیەتیی نێر و مێیەش یەکە.

هەروەها دابەشکردنی پۆلەکان بۆ بەشەکیەکانیان.

٣- دابەشکردنی لزومی نێوان شتەکان تەنها بۆ زەینی: بۆ نموونە وەك هەمەکی بۆ مرۆڤ، هەروەها تەنها بۆ دەرەکی وەك گەرما بۆ ئاگر، یان بۆ هەردووکیان پێکەوە وەك جووت بۆ چوار.

**سێیەم- لەڕووی پێوەرەوە بۆ راستەقینە و وادانان:**

١- **دابەشکردنی راستەقینە (الحقيقي)**: ئەوەیە بەشەکان تێیدا لە ناوە و دەرەوەی زەینیدا لێك جیاوازن، واتە (لە واقیع و هەمان شتدا)، لەسەر ئەو بنچینەیەی عەقڵ حەقیقەت و چییەتێکی جیاوازی بۆ هەر بەشێك دیاری کردوە کە لە حەقیقەت و چییەتیی باقیی بەشەکان جیایە و بەوە لە سەرجەم ئەوانیتر جویێ دەکرێتەوە، بەشێوەیەك نەکرێ شتێك لە دەرەوەی زەین پەیدا ببێ کە بکرێ حەقیقەتە جیاوازەکانی تێدا بەدیبێ با بە ئیعتیباراتی جیاوازیش بێ. بۆ نموونە دابەشکردنی تاوان بۆ جۆرەکانی لە کوشتن و دزی و ناپاکیکردن لە ئەمانەت و سیخوڕی و ساختەکردن و بەرتیل و تاوانەکانیتر، دابەشکردنێکی راستەقینەیە و دوو جۆریان لە یەك رووداو یان یەك رەفتاردا کۆنابنەوە، لەبەرئەوەی چییەتیی هەریەکەیان لە چییەتیی ئەوانیتر جیاوازە.

لە بابەتە ئەندازەییەکاندا گۆشە دابەش کراوە بۆ تیژ و وەستاو و کراوە، عەقڵ بە پێوەری عەقڵیی ئەندازەیی ماهیەتێکی بە هەر بەشێك لەم سێ بەشە داوە کە لە چییەتیی بەشەکەیتر جیایە، بەم جیاوازییە لە چییەتیدا لێکجیاوازیی هەمەکی لەنێوان ئەو بەشانەدا بەدیدێ، بەشێوەیەك هیچکامیان ناچێتە ژێر چەمك و چییەتیی ئەویتریان.

**٢- دابەشکردنی وادانان (اعتباري):** ئەو دابەشکردنەیە بەشەکان تێیدا لەڕووی چەمك و چییەتیەوە تەنها لە زەینی مرۆڤدا جیاوازن بەبێ ئەوەی لەڕووی چییەتی و راستەقینەوە لە دەرەوەی زەیندا جیاواز بن، چونکە دەکرێ دوو بەش لە یەك رەفتاری یاسایی یان یان رووداوی یاساییدا بەدیبێن.

شایانی باسە زۆربەی دابەشکردنە یاساییەکان ئیعتیبارین، لەبەرئەوە لەوانەیە هەندێکیان لەگەڵ هەندێکیتریان کۆببنەوە. بۆ نموونە دابەشکردنی بەرپرسیارێتیی جینائی و مەدەنی دابەشکردنێکی ئیعتیبارییە، لەبەرئەوەی لەڕووی چەمك و چییەتیەوە لە زەین و ئیعتیباری مرۆڤدا جیاوازن.

یەکەمیان لە (هەڵەی تاوانکاری + مەترسی + پەیوەندیی هۆیی) پێکدێ، لەکاتێکدا دووەم لە (هەڵەی مەدەنی + زیان + پەیوەندیی هۆیی) پێکدێ. ئەم پێوەرانە بۆ لێك جیاکردنەوەیان پێوەری عەقڵیی راستەقینە و هەبوو لە دەرەوەی زەینی مرۆڤ نین، بەڵکو زانایانی یاسان وایان داوە، لەبەرئەوە دەکرێ دوو بەرپرسیارێتی لە رووداوێکی یاسایی یان رەفتارێکی یاساییدا کۆببنەوە، وەك لە تاوانەکانیماڵدا، بۆ نموونە تاوانی دزی لەڕووی ئەوەی دەستدرێژییە بۆ سەر مافێکی گشتی (ئاسایش و سەقامگیری) تاوانکارانەیە، لەڕووی ئەوەیش دەستدرێژییە بۆ سەر مافێکی تایبەتی موڵکی کەسی دزی لێکراو، مەدەنییە. سزای یەکەمیان سزایەکی تاوانکارانەیە، سزای دووەمیشیان قەرەبووکردنەوەیە، بەوە هەردوو بەرپرسیارێتییە مەدەنی و جینائیەکە لە یەك رووداودا (تاوانی دزیکردن) کۆبوونەوە.

هەرکەس ئۆتۆمبێلێك بدزێت و لەلای بفەوتێ دوو پابەندی دەکەوێتە سەر: جینائی و مەدەنی. دەستدرێژکار پابەند دەبێ بە ئامادەبوون لەبەردەم قەزادا بۆ رێوشوێنە قەزاییەکان و حوکم لەسەردانی بەپێی سزای بڕیاردراو بۆ تاوانی دزیکردن، پاش حوکمەکەیش پابەند دەبێ بە ملکەچکردن بە جێبەجێکردنی سزاکە تا ماوەی حوکمەکە تەواو دەبێ، بۆی نیە هەوڵی هەڵاتن و خۆدزینەوە لە دادپەروەری بدات،

هەروەك پابەند دەبیّ بە قەرەبووکردنەوەی هاوچەشنی دزراوەکە ئەگەر هاوچەشن بوو، هەروەها بە نرخی رۆژی دەستدرێژیەکە ئەگەر بەهایی بوو.

لە هەندیّ یاسادا دەکریّ یەك دادگەی جینائی خۆبەخۆ بڕوانێتە هەردوو کێشەکە، لە هەندیّ یاسایتریشدا لەسەر داوای دەستدرێژی لێکراو ئەوە دەکات[1].

ئەگەر لەبارەی تۆمەتە جینائیەکە حوکم بەبێتاوانی تۆمەتبارەکە دەرچوو، ئەو بێتاوانبوونە نابێتە مایەی بێتاوانکردنی لە تۆمەتە مەدەنیەکە، ئەویش لەبەر جیاوازیی چییەتیی هەریەکەیان لە زەین و ئیعتیباری مرۆڤدا.

دابەشکردنی بەرپرسیارێتیی مەدەنیش بۆ گرێبەندانە و کەمتەرخەمی لەڕووی جیاوازییان لە چەمك لە زەیندا بەهەمان شێوە. تێکدانی بەرپرسیارێتیەکی گرێبەندانەی تایبەت بەرپرسیارێتی گرێبەندی لێدەکەوێتەوە، هەرچی بەرپرسیارێتیی کەمتەرخەمیکردنە لە تێکدانی پابەندیەکی گشتی دروست دەبیّ، ئەویش زیانگەیاندنە بە کەسیتر بەبیّ پاساوێکی شەرعی یان یاسایی.

بەلاّم لە دەرەوەی زەین ئەم لێکجیابیە هەمەکییە لەنێوانیاندا نیە، چونکە دەکریّ لە یەك رەفتاری یاساییدا کۆببنەوە، وەك جێبەجێکردنی پابەندیی گرێبەندانە بەشێوەیەکی عەیبدار، ئەویش بە جێبەجێکردنی نیوە و ناتەواو، دواخستنی یان خراپی و ئەو شتانە.

یەکێکیتر لە دابەشکردنە ئیعتیباریەکان دابەشکردنی یاسایە بۆ گشتی و تایبەت، لەبەرئەوەی لەئەنجامی دەستوەردانی دەوڵەت لە زۆر شت لەوانەیە لقێکی یاسا وەسف بکریّ بەوەی لە گشتی یان تایبەتە، چونکە پێوەری جیاکردنەوە (التمییز) پێوەرێکی واقیعیی دەرەکی نیە کە نەگۆڕیّ، بەڵکو لەو رووەوەیە کە دەوڵەت لایەنێکە لە یەکێك لە پەیوەندییە یاساییەکاندا وەك خاوەن سەروەری، یان دەستوەردانی وەك کەسێکی مەعنەویی ئیعتیباری. بۆ نموونە دەکریّ یاسای کار لە

---

[1] وەك یاسای عێراقی.

هـەمان کاتـدا بـە گشـتی و تایبـەت دابنـرێ، لەبەرئـەوەی پێوەرەکـە لـە هـەردوو ئیعتیبارەکەدا بەکێش و لاستیکییە. پاشان دەکرێ لقێکی یاسای تایبەت لەئەنجامی پەرەسەندنی ژیان و دەستوەردانی دەوڵەتدا بگۆڕێ بۆ گشتی، پێچەوانەکەیشی رێی تێدەچێ، دابەشکردنی مافیش بۆ ماڵینە (عيني) و کەسی بەهەمان شێوە[1].

ئـەوەی لێـرەدا بەلامانـەوە گرنگـە ئەوەیـە دابەشـکردنی هۆکـانی پابەنـدی یـان سەرچاوەکانی پابەندی، ناچێتە خانەی نە دابەشکردنی راستەقینە و نە دابەشکردنی وادانان، بۆ سەلماندنی ئەمەیش، ئاماژە بە دابەشکردنی سەرچـاوەکانی پابەنـدی لـە هەندێ یاسادا دەکەین:

أ- یاسای مەدەنیی ئـوردنی[2] سەرچـاوەکانی پابەنـدی (مافـە شەخسـیەکان)ی دابـەش کـردوە بـۆ گرێبەنـد (مادەکـانی ٨٧-٢٤٩) + رەفتـاری تاکەکەسـی (٢٥٠-٢٥٥) + کـرداری زیانبـەخش (٢٥٦-٢٩٢)، لەگـەڵ ئـەوەی کـرداری زیانبـەخش دەچـێتە ژێـر خانـەی چـەمکی رەفتـاری تاکەکەسـی، کـرداری سـوودبەخش بەهـەمان شـێوە، لەگـەڵ ئەوەیشـدا هـەردووکیانی کـردوە بـە هاوبەشکەی ویستی تاکلایەنـە + کـرداری سـوودبەخش (٢٩٢-٣١١) لەگـەڵ ئەوەی ئەویش بەشێکە لە ویستی تاکلایەنە.

پاشان کردەوەی سوودبەخشی دابەش کـردوە بـۆ وەرگرتنـی ناشایسـتە لەگـەڵ ئـەوەی کردارێکـی زیانبـەخش و رەفتـارێکی تاکەکەسـییە + فوزالـە (٣٠١-٣٠٨) + دانەوەی قەرزی کەسیتر (٣٠٩-٣١٠) لەگەڵ ئەوەی دانەوەی قەرز بەشێکە لە فوزالە و هاوبەشکەیەکی بۆ داناوە، هەروەها هەردووکیان لە بەشەکانی ویستی تاکلایەنەن.

ب- یاسای مەدەنیی میسری[3] سەرچاوەکانی پابەندی دابەش کردوە بۆ گرێبەند (٨٩-١٦١) + ویستی تاکلایەنە (١٦٢) و بە یەك مادە و یەك نموونـە کۆتـایی

---

[1] بڕوانە ئەم کتێبەمان: المنطق القانوني في التصورات.

[2] رقم (٤٢) لسنة ١٩٧٦.

[3] رقم (١٣١) لسنة ١٩٤٨.

پێهێناوە کە بەڵێندانە بە خەڵات، لەکاتێکدا وەك یاسا و هۆکانی دەڵێن و هەروەها وەك مەنتیق دەڵێ، سەرچاوەکانی پابەندی ٩٠٪ دەچێتە ژێر خانەی ویستی تاکلایەنە + کاری نارەوا (١٦٣–١٧٨) لەگەڵ ئەوەی کاری نارەوا ویستێکی تاکلایەنەیە جا چ کارەکە بەشێوەیەکی راستەوخۆ بێ یان ناڕاستەوخۆ، واتە کردنی بەشی شت بە هاوبەشکەی شتەکە + زەنگینبوون بەبێ هۆ (١٧٩–١٩٧) لەگەڵ ئەوەی زەنگینبوون بەبێ هۆ کارێکی ناڕەوایە و بەشێکە لە ویستی تاکلایەنە نەك هاوبەشکەی بێ.

هەروەها زەنگینبوون بەبێ هۆی دابەش کردوە بۆ بژاردنی ناشایستە (دفع غير المستحق) و فوزالە، لەگەڵ ئەوەی بژاردنی ناشایستە سیفەتی هەژارکەوتوو و زەنگینبوون بەبێ هۆ سیفەتی دەوڵەمەندبووە، فوزالەیش کارێکی رەوایە، جا چۆن کاری رەوا دەکرێتە بەشێك لە کاری نارەوا.

پاشان هەردووکیان (زەنگینبوون بەبێ هۆ و بژاردنی ناشایستە) لە بەشەکانی ویستی تاکلایەنەن کەچی کراونەتە هاوبەشکەی.

بەم شێوەیە ئەم شپرزی و ناهاوسەنگییە نالۆژیکییە لە یاسای مەدەنیی میسریدا دەبینین کە سەرچاوەی سەرەکیی زۆربەی یاساکانە لە وڵاتانی عەرەبیدا.

ج– یاسای مەدەنیی عێراقی کە ٩٠٪ لەژێر کاریگەریی فیقهی ئیسلامی و ١٠٪یش لەژێر کاریگەریی فیقهی خۆرئاواییدایە، لەرێی یاسای مەدەنیی میسریەوە، کەوتۆتە هەمان هەڵە و هاوشێوەی دوو یاساکەی پێشوو سەرچاوەکانی پابەندی بۆ پێنج دابەش کردوە: گرێبەند (٧٣–١٨٣) + ویستی تاکلایەنە (١٨٤–١٨٥) + کاری نارەوا (١٨٦–٢٣٢) + بەدەستهێنان بەبێ هۆ (٢٣٣–٢٤٤)، لەگەڵ ئەوەی هەریەك لە کاری نارەوا و بەدەستهێنان بەبێ هۆ لە بەشەکانی ویستی تاکلایەنەن، ئیتر چۆن بەشەکانی شتێك دەکرێنە هاوبەشکەی ئەو شتە. ئەمە جگە لە کردنی بەدەستهێنان بەبێ هۆ بە هاوبەشکەی کاری نارەوا لەگەڵ ئەوەی بەشێکە لێی. هەروەها دانەوەی

قەرزی کەسیتری بەبەشێك لە بەدەستهێنان بەبێ هۆ داناوە لەکاتێکدا ئەوە ڕەفتارێکی تاکەکەسییە و دەچێتە ژێر ویستی تاکلایەنە کە لە فوزالەدا خۆدەنوێنێ، ئەوەیش وەك پێشتر باس کرا کارێکی ڕەوایە.

دابەشکردنەکانی سەرچاوەکانی پابەندی وەك لە یاسادا، یان هۆکانی پابەندی وەك لە مەنتیقی یاساییدا لە هەمان شپرزی و هاودژی و تێهەڵکێشیدا لەسەر ئەم سێ یاسایە قیاس بکە.

هۆ سەرەکیەکانی ئەم هەڵانەی یاسا مەدەنییە عەرەبیەکان تێی کەوتوون کە وەك تیشکی خۆر لە نیوەڕۆدا ڕۆشنن، سیانن، بریتین لە:

١- شارەزانەبوون لە زانستە ئامێریەکان (مەنتیق، فەلسەفە، ئوسوڵی فیقه و زمان).

٢- تێکەڵکردنی ڕەفتارە یاساییەکان و ڕوداوە یاساییەکان و دانانی هەموویان - جگە لە گرێبەند و ویستی تاکلایەنە - بە ڕووداوی یاسایی و حەسرکردنی ڕەفتارەکان لە گرێبەند و ویستی تاکلایەنەدا.

٣- تێکەڵکردن لەنێوان هۆکانی پابەندی و سەرچاوەکانی پابەندی لەکاتێکدا یاسا تاکە سەرچاوەیە و جگە لەوە لە هۆکانن، لەبەرئەوەی پابەندیەکان حوکمی تەکلیفین و تەنها لە شەرعدانەر یان یاسادانەرەوە دەبن، جگە لەوانە هۆی پابەندین.

٤- هەڵە لە وەرگێڕانی چەمکە یاساییەکان لە زمانە بیانیەکانەوە بۆ زمانی عەرەبی.

**دابەشکردنی دروست:**

دابەشکردنی ڕاست و دروست کە عەقڵی ساغ پێشنیاری دەکات و مەنتیقی یاسایی دەیسەلمێنێت و شەرع یان یاسا بەگوێرەی دابەشکردنی عەقڵیی بزواو لەنێوان نەفی و ئیسپاتدا ڕێکیدەخات، ئەوەیە هۆی پابەندی یان ئیرادییە یان نائیرادی، دووەمیان ڕووداو (واقعة)یە، یەکەمیان لە یەك ئیرادە پێکدێ یان لە

بەیەکگەیشتنی دوو ئیرادە پێکدێ، یەکەمیان ویستێکی تاکلایەنەیە و دووەمیان گرێبەندە.

لە روانگەی ئەو پێوەرە عەقڵییانە بەشە سەرەکیەکانی هۆی پابەندی بۆ سیان دابەش دەبن کە بریتین لە: گرێبەند و ویستی تاکلایەنە و رووداوەکە.

هەرچی سەرچاوەی پابەندییە بە ترازووی لۆژیکی یاسایی تەنها یاسایە، لەبەرئەوەی پابەندکردن داوالێکردن و پابەندی زۆر لەخۆکردنە و بەئیرادەی کەسێکی ئاسایی یان بە رەفتارێکی یاسایی پێکنایەن، بەڵکو سەرچاوەکەیان گوتاری دەسەڵاتی یاسادانانە، کە لە داوا شەرعیەکاندا لە شەرعدانەر و لە تەکلیفە یاساییەکاندا لە یاسادانەردا خۆ دەنوێنێ.

لەبەر تیشکی ئەم راستییە عەقڵییە لۆژیکیەدا سەرچاوەی پابەندی لە یاسادا حەسر دەبێ.

# خواستی دووەم:
# کارە ناڕەوا راستەوخۆکان (کەسییەکان)

کارە ناڕەوا مەدەنیەکان لە ژمارە نایەن، لەبەرئەوەی حوکمەکانیان بە دەقە یاساییەکان بەشێوەیەکی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ یان بە رێسا گشتیەکان رێك دەخرێن.

پاشان پەرەسەندنی ژیان لەوانەیە وابکا هەندێ کار کە لە رابردوودا رەوا بوون ئێستا یان لەئایندەدا بەهۆی رێکخستنێکی یاساییەوە ناڕەوا بن، وەك سەرپێچیەکانی سیستمی هاتوچۆ و بەقاچاخیبردن لە ناوەوە بۆ دەرەوەی وڵات یان بەپێچەوانەوە و ئەو جۆرە شتانە، بەپێچەوانەی کارە ناڕەوا جینائیەکان کە ژمێردراو و سنووردارن بە رێسای (نە تاوان و نە سزا، بەبێ دەق نیە) و ئەم کارانە لە چوارچێوەی توێژینەوەکەی ئێمەدا نیە کە تایبەتە بە پرسە مەدەنیەکان. لەبەرئەوە هەوڵ دەدەین تەنها لەسەر چەند نموونەیەك لە پرسە مەدەنییە ناڕەواکان بوەستین و ئازادیی ئیجتیهاد و زیادکردن بۆ ئەوانەی پاش خۆمان بەجێدێڵین.

#### ئەهلیەتی زیاندەرەکە:

لە بەرپرسیارێتیی مەدەنیی کەمتەرخەمیدا بۆ بەدیهاتنی شیانی ئەو کەسەی زیانەکەی لەدەست قەوماوە ئەوەندە بەسە خاوەن شیانی تەواوی واجببوونی هەبێ (گونجانی مرۆڤ بۆ ئەوەی مافی هەبێ و پابەندی لەسەر بێ)، هەموو مرۆڤێك راستەوخۆ پاش لەدایکبوونی ئەگەر بەبێ پاساو زیانێکی بە ماڵی کەسیتر گەیاند پێویستە لە ماڵەکەی دەستەبەر بکرێ، جا خۆی یان ئەو کەسەی نوێنەرایەتی دەکا پابەند بێ بە قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانە لەرێی گێڕانەوەی هاوچەشن لە شتە هاوچەشنەکان و بژاردنی نرخەکەی بەگوێرەی نرخی رۆژی زیانەکە لە شتە بەهاییەکاندا. ئەم قەرەبووەیش لە ماڵی خۆی دەدرێ ئەگەر کەسیتر (تەبەروع)ی

نەكرد.

خۆ ئەگەر خۆی ماڵی نەبوو و كەسیش تەبەڕوعی نەكرد بۆ دانەوەی و خاوەن قەرزە زیانلێكەوتووەكەیش دەستی لێ هەڵنەگرت، پێویستە چاوەڕوان بكا تا دەرووی لێدەكرێتەوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ﴾[1].

قەرزار ئەگەر كەمتەرخەم نەبوو نابێ لەسەر قەرزەكە بەند بكرێ.

ئەمە سەبارەت بە شیان تەواو و ناتەواو، بەڵام نەشیاو دادگە بۆی هەیە ئەو كەسەی لەڕووی شەرع و یاساوە نوێنەرایەتی دەكا پابەند بكا بە دانی قەرەبووەكە لە ماڵی تایبەتی خۆی، پاشان لە زیاندەرەكەی وەریگرێتەوە. فیقهی ئیسلامی لەسەر ئەمە گیرساوەتەوە و هەندێ یاسای مەدەنیی عێراقی لێیان وەرگرتووە، لەوانە یاسای عێراقی (م/١٩١).

فیقهی خۆرئاوایی، ئەو یاسا مەدەنییە عەرەبیانەیش لەژێر كاریگەریدان، لەڕووی دادپەروەرییەوە سەركەوتوو نەبوو كاتێ زیانی ئەو كردارە زیانبەخشەی لە كەسی نەشیاو (وەك منداڵی نەفام و شێت و ئەوانەی لە حوكمی ئەوانەدان) قەومابێ، هاوشێوەی ئەو زیانانەی لە رووداوە سروشتیەكان یان لە ئاژەڵ دەكەونەوە، بە بەفیڕۆدانێكی بێ قەرەبوو داناوە، لەكاتێكدا مرۆڤ لە ساتی بەزیندوو لەدایكبوونییەوە كەسایەتی یاسایی و شیانی تەواوی واجببوون بەدەست دێنێ.

هەندێ یاسای عەرەبی[2] هەستیان بەم حوكمە نادادپەروەرانەیە كردوە، لەبەرئەوەی بنچینەی سەرەكیی قەرەبووكردنەوە زیانەكەیە كە روویداوە، لەبەرئەوە وەك هەڵاوێردن بڕیار درا ئەگەر نەدەكرا قەرەبووەكە لە بەرپرسەكە وەربگیرێ، قازی بۆی هەیە ئەو كەسەی زیانەكەی لەدەست قەوماوە ناچار بكا بە دانی قەرەبوویەكی دادپەروەرانە بەرەچاوكردنی پێگەی دژبەرەكان.

---

(١) سورة البقرة/٢٨٠.

(٢) وەك یاسای مەدەنیی میسری (م/١٦٣-١٦٤).

بۆ رەچاوکردنی بەرژەوەندیی زیان پێگەیشتوو و بە پەیڕەویکردن لە رێساکانی دادپەروەری، گرنگە کار بە ئاراستەی یەکەم بکرێ و جیاوازی لەنێوان خاوەن شیان و نەشیاودا نەکرێ و پەنا بۆ کارکردن بەو (ئیستیسنا)یە نەبرێ.

بەلگەنەویستە کارە نارەوا راستەوخۆکان وەك چۆن ئەرێنین (کردنی کارەکە) بەهەمان شێوە نەرێنیشن (خۆلادان لە کردنی ئەوەی پێویستە بکرێ).

وەك باسمان کرد بۆ حەسرنەکردنیان تەنها چەند نموونەیەك لە هەر بەشێك وەردەگرین:

**بەشی یەکەم/ کارە نارەوا کەسییە ئەرێنییەکان (الموجبة):**

لە کارە ئەرێنییە زیانبەخشە کەسییەکان کە سزای مەدەنی یان مەدەنی و جینائی پێکەوە پێویست دەکەن ئەمانەن:

١- هەر کەس قنگە جگەرەکەی فرێدایە شوێنێك تایبەت نەبوو بە زبڵ و خاشاك و ئاگرێکی نایەوە و بەهۆی ئەو کارە نارەوایەوە ئاگرەکە تەنیەوە، جا چ هەلکردنی با یان هەر هۆکارێکیتری یاریدەدەر رۆڵی لە تەنینەوەیدا هەبووبێ یان نا، پێویستە ئەو جگەرە فرێدەرە قەرەبووی ئەو زیانە بکاتەوە کە لە کارە راستەوخۆ نارەواکەی کەوتۆتەوە، ئەویش لەبەرئەوەی رەگەزەکانی بەرپرسیارێتیی کەمتەرخەمیکردنی تێدایە کە بریتین لە (کاری نارەوا + زیان + پەیوەندیی هۆیی).

٢- کەسێك ئۆتۆمبێلەکەی بەپێچەوانەی سیستمی هاتوچۆ لێخوڕی و زیانی بە ئۆتۆمبێلی کەسێکیتر گەیاند یان ماڵێکیتری لەناو برد و ساغ ببێتەوە کەمتەرخەمی کردوە، جگە لە سزای سەرپێچیکردنی سیستمی هاتوچۆ، پێویستە قەرەبووی ئەو زیانەیش بکاتەوە، لەبەرئەوەی شۆفێری کەمتەرخەم لە یەك کاتدا دەستدرێژی دەکاتە سەر دوو ماف: مافێکی تایبەت (خاوەن ماڵە زیانپێگەیشتووەکە) و مافێکی گشتی (رێزگرتنی یاسا و سیستم).

٣- دەرمانسازێك دەرمانێكی لە دەرمانخانەكەیدا بەشێوەیەكی هەڵە گرتەوە و بەكارهێنانی نەخۆشەكەی تووشی نەخۆشیەك كرد بۆ ماوەیەك لە كاركردنی خست، پێویستە قەرەبووی ئەو زیانە مادییە بكاتەوە (زیانی كەسابەت) ئەمە جگە لە خەرجی چارەسەركردن، هەروەها ئەگەر سەلما كەمتەرخەمی كردوە پێویستە لەسەر ئەو سەرپێچییەی سزا بدرێ.

٤- هەر كەس ژنێكی بە هاوسەرگیریەكی بەد (فاسد) هێنا و هێشتا لە عیددەی هاوسەرگیریی پێشوویدا بوو، یان هاوسەرگیریەكە بەبێ ئامادەبوونی دوو شایەت بوو و بەر لەوەی قازی لێكیان جیا بكاتەوە، یان بەر لە مردن چووە لای، مێردەكە پابەند دەبێ بە دانی مارەیی هاوشان (مهر المثل) یان كەمتر لەوە و لە ناونراوەكە[1].

ئەو مارەییە قەرەبووی ئەو زیانە مەعنەویەیە بەو چوونەلایە بە ژنەكە گەیشتوە، لەبەرئەوەی پایەی كەم دەكاتەوە و خەڵك ئیتر زۆر حەز بە خواستنی ناكەن.

٥- هەركەس ژنەكەی بەشێوەیەكی ملهوڕانە تەڵاق بدا، پێویستە قەرەبووی ئەو زیانە بكاتەوە كە بەهۆی ئەو كارە نارِەوایەوە پێی گەیشتووە، بەو مەرجەی قەرەبووكردنەوەكە لە نەفەقەی دوو ساڵی ژیانی هاوسەری زیاتر نەبێ[2].

٦- زیانگەیاندن بەهۆی كشانەوەی یەكێك لە دوو دەزگیران (خطیب)ەكە لە خواستنەكە بەبێ پاساو. خوازبێنی (الخطبة) بریتییە لەوەی پیاو ئارەزووی

---

[1] مادەی (٢٢)ی یاسای باری كەسایەتیی عێراقی بەركار دەڵێ: "ئەگەر لە گرێبەندێكی نادروستدا جیابوونەوە پاش چوونەلا روویدا، ئەگەر مارەییەكە ناونرابوو ئەوا كەمترینی دوو مارەیی لەنێوان مارەیی ناونراو و هاوشان پێویست دەبێ، ئەگەر ناونەنرابوو مارەیی هاوشان پێویست دەبێ".

[2] مادەی (٣/٣٩)ی یاسای ناوبراو دەڵێ: "ئەگەر مێرد ژنەكەی تەڵاقدا و دادگە بۆی دەركەوت مێردەكە لە تەڵاقدانیدا ملهوڕ بووە و ژنەكە لەوە زیانی پێگەیشتووە، دادگە لەسەر داوای ژنەكە بڕیار دەدا تەڵاقدەرەكە قەرەبوویەكی شیاوی بكاتەوە كە لەگەڵ باری دارایی و پلەی ملهوڕیەكەی بگونجێ، كە بەگشتی وا مەزەندە دەكرێ كە لە رادەی نەفەقەی دوو ساڵی ژنەكە بكا، جگە لە مافە جێگیرەكانیتری".

خۆی بۆ خواستنی ئافرەتێکی دیاریکراو دەربڕێ کە هیچ ڕێگرێکی شەرعی نەبێ و ئەویش قبوڵی بکا، بەوە پیاوەکە دەبێتە بخواز (خاطب) و ئافرەتەکەیش دەبێتە خوازراو (مخطوبة).

خوازبێنی گرێبەند نیە تا ماف و پابەندیەکانی لێبکەوێتەوە، هەروەها نە لەڕووی شەرع و نە لەڕووی یاساوە بۆ تەواوکردنی هاوسەرگیری پابەندکار نیە، بەڵام پاشەکشەلێکردنی بەبێ پاساوێکی شەرعی پێچەوانەی ئەخلاق و بەها و ڕەفتاری دروستە، لەبەرئەوەی خوای گەورە فەرمانی کردوە بە پاراستنی گفت و بەڵێن و دەفەرموێ: ﴿وَأَوْفُواْ بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْؤُولاً﴾[1].

**لە ئاسەوارەکانی پاشەکشەکردن:**

أ- ئەگەر ژنەکە بەشێك لە مارەیی بڕد پێویستە بیگێڕێتەوە، لەبەرئەوەی لە جێکەوتەکانی گرێبەندە، کە ڕوونەداوە.

ب- پێویستە ئەو کەسەی لە خوازبێنی پاشەکشە دەکا ئەو دیاریانە بگێڕێتەوە کە بەبۆنەی خوازبێنی و هاوسەرگیری وەریگرتوون.

بەڵام ئەوەی بۆ بۆنەی ئاهەنگی خوازبێنی خەرج کراوە، ناگەڕێنرێتەوە.

ج- ئەگەر پاشەکشەکردنەکە زیانێکی بە لایەنەکەیتر گەیاند، وەك ئەوەی یەکێك لە دوو دەزگیرانەکە وەك ملکەچکردن بۆ خواستی لایەنەکەیتر لە مەرجی ڕازیبوونی بە هاوسەرگیریەکە، وازی لە خوێندن یان پرۆژەکەی هێنابێ، لەڕووی بەرپرسیارێتیی کەمتەرخەمیەوە پێویستە ئەوەیان بووەتە بایسی ئەو کارە، ئەو زیانە قەرەبوو بکاتەوە[2].

٧- باقیی کارە نارەوا کەسییە زیانبەخشەکان کە قەرەبووکردنەوە و بژاردنی زەرەر و زیان پێویست دەکەن، لەسەر ئەو نموونانەی باس کران قیاس دەکرێن.

---

[1] سورة الإسراء/ ٣٤.

[2] بۆ درێژەی ئەم بابەتە بڕوانە ئەم دانراوەمان: أحكام الزواج والطلاق في الفقه الإسلامي المقارن - دراسة مقارنة بالقانون، ص٢٢ و پاشتر.

**بەشی دووەم/ کارە نارەوا نەرێنییە کەسییە زیانبەخشەکان:**

لە گرنگترین وێنەکانی کارە نارەوا نەرێنییە کەسیەکان ئەمانەن:

١- خۆبواردنی خۆهەڵقورتێن (فزول) لە بەردەوامبوون لەو کارەی دەستی پێکردوە تا ئەوکاتەی خاوەنکار دەتوانێ خۆی بیکا، یان خۆبواردنی لە ئاگەدارکردنەوەی خاوەن کارەکە لەو دەستوەردانەی کاتێ دەتوانێ ئەوە بکا، بەهۆی یەکێك لەم دوو خۆبواردنەیشەوە زیانێکی ماددی بە خاوەنکارەکە بگا، لەسەر بنچینەی پابەندیی کەمتەرخەمی پابەند دەبێ بە قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانانەی بە خاوەنکار دەگەن[1]، وەك لە باسی پابەندیی خۆهەڵقورتێندا بەدرێژی باسمان کرد.

٢- خۆبواردنی خاوەنکار لە بژاردنی خەرجیەکانی کەسی خۆهەڵقورتێن لەو کارەی بۆ بەرژەوەندیی خاوەنکار کردویەتی. پێویستە لەسەر بنچینەی بەدەستهێنان بەبێ هۆ (زەنگینبوون بەبێ هۆ) و بەرپرسیارێتیی کەمتەرخەمی ئەو خەرجیانەی بۆ بگێڕێتەوە، لەبەرئەوەی فوزالە بەر لە رازیبوونی خاوەنکار لەسەر ئەوەی خۆهەڵقورتێن کردویەتی بە گرێبەند دانانرێ، بەڵام پاش ئەوە حوکمی بریکاریی بەسەردا جێبەجێ دەبێ و بەرپرسیارێتیەکە کەمتەرخەمی دەبێ.

٣- خۆلادان لە شایەتیدانێکی واجب بەبێ عوزرێکی رەوا، ئەو شایەتینەدانەیش زەرەر یان زیان یان لەکیسدانێکی لێ بکەوێتەوە بۆ ئەو کەسەی پێویستی بەو شایەتیدانە هەیە.

ئەم شایەتینەدانە کارێکی نارەوای سەلبییە و قورئان نەهی لێکردوە وەك خوا دەفەرموێ ﴿وَلاَ تَكْتُمُواْ الشَّهَادَةَ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ﴾[2].

---

[1] مەدەنیی میسری (م/١٩١)، ئوردنی (م/٣٠٣)، سوری (م/١٩٢).

[2] سورة البقرة/٢٨٣.

٤- نەگێڕانـەوەی وەرگیراوێکـی ناشایسـتە یـان دەسـکەوتێك بـەبێ هـۆ، هـەموو وەرگیراو یان دەسکەوتێك بەبێ هۆ بەتاڵە و نابێتـە موڵـك وەك لـە حاڵەتـەکانی نەبوونی هۆ لەبنەڕەتدا، وەك ئەو کەسەی قەرزی میراتدەرەکەی داوەتەوە یـان وەسێتەکەی جێبەجێ کردوە، پاشان دەرکەوتووە میراتدەر قەرزار نەبووە یان لە ژیانی خۆیدا قەرزەکەی داوەتەوە، یان لە وەسێتەکەی پەشـیمان بووەتـەوە یان دەرکەوتووە وەسێتەکە بەتاڵە، یان بە هۆیەکی بەتاڵ پەیـدا بـووە وەك لـە گرێبەندی بەتاڵدا.

بۆیە پێویسـتە هەرکـەس لـە گرێبـەندی بەتاڵدا بـاتیی وەرگرتـوە پابەنـد بـێ بەگێڕانەوەی، لەبەرئەوەی هۆکەی یان بەتاڵە، یان ناڕەوایە وەك لە زەوتکردن و و دزیدا، پێویستە زەوتکەر زەوتکراو بۆ لێ زەوتکـراو بگێڕێتـەوە. پێویسـتە دز دزراوەکە بۆ دزی لێکراوەکە بگێڕێتەوە. نەگێڕانەوەی ئەمانە یـان دواخسـتنیان کـارێکی نـەرێنیی ناڕەوایـە و زەوتکـەر یـان دز ماڵـە زەوتکـراو یـان دزراوەکـە دەستەبەر دەکەن، ئەمە جگە لە پابەندبوون بە قەرەبووکردنەوەی هەر زیانێـك لە نەگێڕانەوەکە یان دواخستنی دەکەوێتەوە.

یان هۆیەکی راست و رەوای هەبێ بەڵام بەهۆی هەڵوەشـاندنەوەی گرێبەندەکـە یـان هەڵوەشـانەوەیەوە نـەما، لـە گرێبەنـدی جێبـەجێکردنی فەوریـدا هـەردوو گرێبەندوان دەگەڕێنەوە سەر ئەو دۆخەی پێش گرێبەندکردنەکـە تێیـدا بـوون، بـەڵام لـە گرێبەنـدی جێبـەجێکردنی بەردەوامـدا وەك گرێبەنـدی بەکرێـدان، ئەسەرەکە بۆ ئایندە دەبێ.

٥- بەجێنەگەیاندنی گفتی خـەڵاتکردن پـاش ئـەوەی گفتپێـدراو ئـەو کـارەی لێـی داواکرابوو بەتەواوی یان هەندێکی جێبەجێ کرد، بۆ بەدیهێنانی ئەوەیش پارەی خەرج کردبوو یان زەحمەتی کێشابوو. ئەوە روونە گفتدان بـە خـەڵات ویسـتی تاکلایەنەیە و گرێبەنـد نیـە، قەرەبووکردنـەوەی زیانەکـەیش لەسـەر بنچینـەی بەرپرسیارێتی کەمتەرخەمییە.

ئەم بابەتە لە شوێنی خۆیدا بەدرێژی باس کرا و روونمان کردەوە ئەو کەسەی لەبەردەم خەڵکدا بەڵێنی بەخشینی خەڵاتێك بۆ ئەنجامدانی کارێك رادەگەیەنێ، خۆی پابەند دەکا و پابەند دەبێ بە بەخشینی خەڵاتەکە بەو کەسەی بەو کارەکە هەڵدەستێ، با ئەو کەسە بەبێ ئەوەی چاوی لە بەڵێنی خەڵاتەکە بووبێ یان ئاگای لێی بووبێ، کارەکەی کردبێ[1].

٦- پابەندنەبوون بە گفتی گرێبەند لەگەڵ کردن: گفتدان بە گرێبەند لەگەڵ کردن ئەوەیە گفتدەر بەرانبەر گفتپێدراو پابەند دەبێ بە بەستنی گرێبەندێك لە ئایندەدا ئەگەر لە ماوەیەکی دیاریکراودا ئارەزووی پیشاندا. بۆ نموونە ئەگەر کەسێك پرۆژەیەکی لە زەویەکدا دامەزراند کە پێشبینی دەکرد پێویستی بە پارچە زەویەکەی تەنیشتیشی دەبێ، بۆی هەیە لەگەڵ خاوەنەکەی رێك بکەوێ لە ئایندەدا بە نرخێکی دیاریکراو و لە ماوەیەکی دیاریکراودا پێی بفرۆشێ، جا ئەگەر ئەم رێکەوتنە کرا پابەندبوونی گفتدەر بە فرۆشتنی لێ دەکەوێتەوە بەبێ ئەوەی گفتپێدراو بەهیچ شتێك پابەند بێ بەرانبەری، لەبەرئەوەی بەڵێندان بە کردنی گرێبەند، گرێبەند لەگەڵ کردن نیە، جا ئەگەر گفتدەر ئەم پابەندیەی شکاند و رازی نەبوو پارچە زەویەکەی بەو نرخەی لەسەری رێك کەوتوون پێ بفرۆشێ و بەو هۆیەوە زیانێك بە گفتپێدراو گەیشت، لەسەر بنچینەی بەرپرسیارێتیی کەمتەرخەمی پابەند دەبێ بە قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانە[2].

٧- نەدانی زانیاریی پێویست بەر لە گرێبەندکردن. لە گرنگترین بوارەکانی جێبەجێکردنی ئەم حاڵەتە گرێبەندی بیمەکردنە (التـأمين)[3]، کە بریتییە لە گرێبەندێك بەو پێیە بیمەکار بەرانبەر بیمەکراو یان ئەو سوودمەندەی

---

[1] مەدەنیی میسری (م/١٦٢)، عێراقی (م/١٨٥)، ئوردنی (م/٢٥٥)، سوری (م/١٦٣).

[2] سەبارەت بەبەڵێندان بە گرێبەندکردن بروانە یاسای مەدەنیی عێراقی (م/٩١)، ئوردنی (م/١٠٥-١٠٦)، میسری (م/١٠١-١٠٣)، سوری (م/١٠٢) و کوێتی (م/٧٢).

[3] بروانە: مەدەنیی عێراقی مادەکانی (٩٨٣-١٠٠٧)، میسری (٧٤٧-٧٧١)، سوری (٧١٣-٧٣٧)، ئوردنی (٩٢٠-٩٤٩).

بیمەکردنەکە بۆ بەرژەوەندیی ئەوە، پابەند دەبێ بەوەی چەردەیەك پارە یان داهاتێکی رێکوپێك یان هەر باتیەکی دارایی‌تری بداتێ لە حاڵەتی قەومانی رووداوێك یان بەدیهاتنی ئەو مەترسیەی لە گرێبەندەکەدا روون کراوەتەوە، ئەوەیش لەبەرانبەر قیستێك یان هەر برە پارەیەك کە بیمەکراو دەیداتە بیمەکار[1].

ئەوە روونە ئەو بنەما هونەریانەی بیمەکردنیان لەسەر دەوەستێ ئەوەیە بیمەکار بەوردی سنووری چوارچێوەی ئەو پابەندییە بزانێ کە لە ئەستۆی دەگرێ، ئەویش ئەو مەترسیەیە کە بیمەکردن دەیەوێ ئاسەوارەکانی زەمان بکا، لەبەرئەوە گرنگە و لە پابەندیەکانی بیمەکراوە بەر لە گرێبەندکردنەکە بیمەکار لە هەموو هەلومەرجە شەخسی و گشتیەکان ئاگەدار بکا، هەروەك پێویستە بیمەکاریش بەر لە گرێدانی گرێبەندەکە و ئەو هەلومومەرجانە بزانێ کە کاریگەرییان لەسەر رادەی پابەندییەکەی بەرانبەر بیمەکراو هەیە، ئەویش لەرێی ئەو ئامرازانەی توانای ئاشکراکردنی ئەو هەلومەرجانەیان هەیە.

بەڵام پشکنینەکانی بیمەکار چەندە ورد بن هەر ناتوانێ وێنەیەکی راستەقینە لەبارەی ئەو مەترسیەی دەستەبەری دەکا دەست بکەوێ تا ئەو کەسەی داوای بیمەکردن دەکات لەو رووەوە هاوکاری نەکا. بۆ نموونە لە بیمەکردنی ژیاندا بیمەکار ناتوانێ ئەو نەخۆشیانە بزانێ کە ئەو کەسەی بیمەی ژیانی لەلای دەکا هەیبوون، یان ئاخۆ نەخۆشیی ویراسی لە خێزانەکەیدا هەیە یان نا؟!

بەلگەنەویستە پابەندبوونی بیمەخواز بە ئاشکراکردنی زانیاریی پێویست بەر لە بەستنی گرێبەندەکە، پابەندیەکی گرێبەندوانانەی تایبەت و زادەی گرێبەندی بیمەکردنەکە نیە، لەبەرئەوەی ئەسڵ وایە گرێبەندەکە هێشتا نەکراوە و پابەندبوونی بە دانی ئەو زانیارییانە گشتی و پێش گرێبەندەکەیە و سەرچاوەکەی یاسایە، کە

---

[1] بیمەکار ئەو کەسەیە ئەو پابەندیانە جێبەجێ دەکا بەرانبەر پابەندیەکانی بیمەکراون. سوودمەند ئەو کەسەیە بیمەکار نرخی بیمەکردنەکەی دەداتێ. (م ٢/٩٨٣ یاسای مەدەنیی عێراقی).

شکاندنی بەرپرسیارێتی کەمتەرخەمی و قەرەبووکردنەوەی بیمەکار لە هەر زیانێك لە ئەنجامی زانیارییە درۆ و ناواقیعیەکان پێی بگا، دەخاتە ئەستۆی پابەند.

**سزای ئەو بیمەکراوەی زانیاریی پێویست نادات:**

یاساکان لە دیاریکردنی ئەم سزایەدا، لەرووی چەند و چۆنەوە، جیاوازن، ئەویش بەگوێرەی جیاوازییان لە گونجاندن (دیاریکردنی سیفەتی یاسایی)ی ئەو هەڵەیەی بیمەکراو لەبارەی زانیاریەکان کردویەتی و رادەی کاریگەریی ئەو نەدانی زانیارییە لەسەر بەرژەوەندیی بیمەکار و بڕی ئەو پارەیەی پابەند دەبێ بە دانی بە بیمەکراو یان سوودمەند پاش روودانی ئەو مەترسیەی بیمەکەی بۆ کراوە، هەروەها لەسەر بڕی ئەو قیستانەی پێویستە بیمەکراو بە بیمەکاریان بدات.

سزاکە هەروەها بەپێی جیاوازیی نیەتپاکیی بیمەکراو دەگۆڕێ ئەگەر نەدانی زانیارییە پێویستەکان بەئەنقەست نەبووبێ، بەڵکو بە هەڵە یان لەبیرکردن یان نەزانینی گرنگیەکەی و رادەی کاریگەری لەسەر قەبارەی پابەندیەکانی هەردوولا بێ.

هەروەها نیەتخراپی لە بەئەنقەست شاردنەوەی ئەو زانیاریانەی کاریگەریان لەسەر قەبارەی پابەندیەکانی بیمەکار و ئەندازەی قازانج و زەرەری هەیە. یان بەئەنقەست زانیاریی درۆ و ناڕاست بدات، ئەوەیش کاریگەری لەسەر ئاسەواری گرێبەندەکە هەبووبێ و لەباریدا بێ بابەتی مەترسیەکە بگۆڕێ یان لە بایەخەکەی لەبەرچاوی بیمەکار کەم بکاتەوە، هەروەها کاریگەری لەسەر بڕیاری، کە ئاخۆ بیمەکردنەکە قبوڵ یان رەفزی دەکا.

سزاکەیش لەنێوان هەڵوەشاندنەوەی گرێبەندی بیمەکردنەکە لەلایەن بیمەکارەوە ئەگەر کرابێ، کە نەمانی ئەسەری گرێبەندەکەی بۆ ئایندە لێدەکەوێتەوە، لەبەرئەوەی لە جۆری گرێبەندە لە جێبەجێکردن بەردەوامەکان و کەوتنی مافی بیمەکراوە لە قەرەبووکردنەوەدا ئەگەر هەڵوەشاندنەوەکە پاش بەدیهاتنی ئەو رووداوە بوو کە بیمەی بۆ کرابوو.

بەڵێ سزاکە لەنێوان ئەم هەڵوەشاندنەوەیە یان مانەوەی گرێبەندەکە و مافی بیمەکار لە داواکردنی ئەندازەی قیستەکاندایە بەشێوەیەك لەگەڵ قەبارەی

مەترسیەکەدا بگونجیّ، ئەگەر بیمەکار راستیی ئەو بارودۆخەی بۆ دەرکەوت کە بەر لە بەدیهاتنی ئەو رووداوەی بیمەی بۆ کراوە رانەگەیەنرابوو، یان بە ناڕاستی راگەیەنرابوو، ئەوکاتە گرێبەندەکە دەمێنیّ لەگەڵ مافی بیمەکار لە داوای زیادکردنی ئەندازەی قیستەکان بەشێوەیەك لەگەڵ قەبارەی مەترسیەکەدا بگونجیّ، یان ئەو بڕە پارەیە کەم دەکرێتەوە کە بیمەکار پێی پابەند بووە بەنیسبەت ئەو قیستەی پێویست بووە بدریّ ئەگەر بیمەکار بە راستیی مەترسیەکەی بزانیایە.

ئەوەی لێرەدا بەلامانەوە گرنگە روونکردنەوەی رادەی بەرپرسیارێتیی کەمتەرخەمیی ئەو بیمەکراوەیە زانیاریی پێویستی نەداوە و ناڕەوایی ئەم نەدانە و لێرەیشەوە هۆبوونی بۆ پابەندی. مەبەستمان نیە پایە و مەرج و ئەسەرەکانی گرێبەندیی بیمەکردن روون بکەینەوە. ئەوەی درێژەی ئەو بابەتەی بەلاوە گرنگە با بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەکانی بابەتەکە لە یاسا عەرەبیەکان و شەرحەکانیاندا[1].

---

[1] لەوانە یاسای مەدەنی عێراقی بەرکار (م/٩٨٣ و پاشتر)، میسری (م/١٧٨ و پاشتر)، ئوردنی (م/٩٣٠ و پاشتر). هەروەها: الالتزام بإعلان الخطر في التأمين، دراسة مقارنة في القانون الألماني والفرنسي للدكتور عبدالودود.

# خواستی سێیەم:
# کارە کەسییە ناڕەوا دووسەرەکان

لە گرنگترین پیادەکردنەکانی ئەم حاڵەتە لە یاسا عەرەبیەکاندا، بریتییە لە (بەدەستهێنان بەبێ هۆ) وەك لە دەربڕینی یاسای مەدەنیی عێراقی[1] و ئوردنی[2]، (زەنگینبوون بەبێ هۆ) لە دەربڕینی یاسادانەری میسری و یاساناسە میسریەکان[3] و مەدەنیی سوریی بەرکار[4] و دەربڕینی (کرداری سوودبەخش) لە مەدەنیی یەمەنیی بەرکار[5] و مەدەنیی کوێتیی بەرکاردا[6].

تێبینی دەکرێ هەندێ یاسای عەرەبی خۆیان نە لە قەرەی سەرچاوەکانی پابەندی و نە بەکارهێنانی ئەم دەستەواژە و زاراوانە نەداوە، وەك یاسای مەدەنیی مەغریبیی بەرکار.

ئەوەی لێرەدا بەلامانەوە گرنگە هەڵبژاردنی ناونیشانە راستەکەیە، کە بریتییە لە (بەدەستهێنان بەبێ هۆ) و دەرخستنی ئەوەی دوو دەستەواژەکەیتر واتە (زەنگینبوون بەبێ هۆ) و (کرداری سوودبەخش) هەڵەن.

---

[1] فەسڵی چوارەم: بەدەستهێنان بەبێ هۆ، سەرچاوەی چوارەمی پابەندیەکان پاش گرێبەند و ویستی تاکلایەنە و کاری ناڕەوا. یاسای مەدەنیی عێراقیی بەرکار (مادەکانی ٢٣٣-٢٤٤).

[2] مادەکانی (٢٩٣-٣١١).

[3] مادەکانی (١٧٩-١٩٧).

[4] مادەکانی (١٨٠-١٩٧).

[5] ژمارە (١٩) لسنة ١٩٩٢، مادەکانی (٣٢٢-٣٢٨).

[6] مادەکانی (٢٦٢-٢٩٧).

**یەکەم: زاراوەی (زەنگینبوون بەبێ هۆ) هەڵەیە**

لەم ڕووانەوە:

١- سەرچاوەیەکی چوارەم لە سەرچاوەکانی پابەندی بەکارهێناوە، کە پێچەوانەی زمان و عورفی عەرەبە. بەڵگەنەویستە پێویستە یاسای هەر وڵاتێك بەزمانی خۆیان کاروباری ژیانی ئەو خەڵکە ڕێك بخات کە لەژێر سایەیدان. ئەم زاراوەیە ئەگەر لە زمانێکیتری ناعەرەبیدا ڕاست بێ لە زمان و عورفی عەرەبدا هەڵەیە، لەبەرئەوەی لەفزی زەنگینی (الثراء) بە مەد زۆریی ماڵە، دەوترێ (فلان نو ثروة ونو ثراء) و (أثرى الرجل) واتە پیاوەکە ماڵ و سامانی زیادی کرد، (ثراء) و (ثروة) زۆریی ماڵن. (أثرى الرجل) (پیاوەکە زەنگین بوو) کە لەسەروو دەوڵەمەندبوون (الاستغناء)ەوەیە[1].

لە زمان و عورفی عەرەبدا هەژار (الفقیر) ئەو کەسەیە ئەوەندە پارەی نیە بەشی ژیانی بکا، نەدار (المسکین)یش ئەوەیە هەر هیچی نیە، یان پێچەوانەی ئەوە، یان هەردووکیان لە ئاتاجی و نەبوونی هیچ سەرچاوەیەکی بژێویدا یەکسانن.

لەم ڕووەوە ناچێتە عەقڵەوە کەسێك ماڵێکی لەکیس بچێ هیچ کاریگەری لەسەر پێگەی دارایی نەبێ، یان ئەوەی دەیدۆزێتەوە کاریگەری لەسەر دەوڵەمەندبوونی نەبێ، لەگەڵ ئەوەیشدا پێویستە هەر کەس بەبێ هۆ ماڵی کەسیتری دەستکەوت، جا قەبارەکەی چەند و چۆن و بەها و سوودی هەرچەند بێ، دەستبەجێ بۆی بگێڕێتەوە.

٢- وەك زانایانی یاسا دەڵێن بۆ ئەوەی زەنگینبوون بەبێ هۆ بە سەرچاوەی چوارەمی پابەندی دابنرێ، مەرجە ئەم چوار پایەی تێدا بێ:

أ- ئەستۆی ئەو کەسەی ماڵی کەسیتری دەست کەوتووە، بەبێ پاساو دەوڵەمەند ببێ.

---

[1] بروانە: لسان العرب، فصل الثاء، حرف الیاء. مختار الصحاح، مادة (ثری). المنجد في اللغة والأدب والعلوم، مادة (ثری).

ب– ئەستۆی ماڵ لەکیسچووەکە هەژار بکەوێ.

ج– پەیوەنـدیی هـۆیی لـەنێوان زەنگینبـوون و هەژارکەوتنـدا هـەبێ، بـەوەی دووەمیان لە یەکەمیان بکەوێتەوە.

د– نەبوونی هۆیەك پاساوی پێ ببەخشێ[1].

شایانی باسە هەندێ لە یاساناسەکان[2]پایەکانی زەنگینبوون بـەبێ هـۆ–یـان بـە سێ پایە داناوە، کە بریتین لە:

أ– زەنگینبوونی قەرزارەکە.

ب– هەژارکەوتنی قەرزدەر کە لەو زەنگینبوونە کەوتۆتەوە.

ج– نەبوونی هۆی یاسایی بۆ ئەو زەنگینبوونە.

٣– پابەندبوونی ئەو کەسەی بەبێ هۆیەکی پاساوبەخش مـاڵی کەسـیتری دەسـت کەوتووە بە گێڕانەوەی بۆ ئەو کەسەی شایستەیەتی، لەسەر نەبوونی هۆیـەکی شـەرعی یـان یاسـایی ئـەو لەلابوونـە دامـەزراوە، بەوهۆیەیشـەوە بـە کـارێکی نامەشروع دادەنـرێ بەچاوپۆشـین لـە بـڕ و جـۆری خـودی ماڵـە لەلابووەکـە و گواستنەوەی لە ئەستۆیەکەوە بـۆ ئەسـتۆیەکیتر و کاریگـەری لەسـەر گـۆڕینی هەردوو ئەستۆکە.

٤– گوتنی ئەوەی مەبەست لە دەوڵەمەندبوون زیادبوونی رەگەزە ئەرێنیەکەیـە لـە ئەستۆی دارایی، هەروەها مەبەست لە هەژارکەوتن رەگەزە نەرێنیەکەیـە، واتـە کەمکردنە لە ئەستۆی داراییدا[3]، لە مەنتیقی یاساییدا رەتکراوەیە، لەبەرئەوەی هەموو بەدەستهێنێکی ماڵی کەسیتر بەبێ هۆ، بە شەرع و یاسا بە خاوەنی ئـەو شتە دانانرێ تا لە رەگەزە ئەرێنیەکانی ئەستۆی دارایی زیاد نەکا، هەروەها ماڵ

---

[1] الأستاذ صلاح الدين الناهي، الكسب دون سبب والفضالة كمصدرين للالتزام، ص٩٤ و پاشتر.

[2] لەوانە مامۆستا السنهوري، الوسيط ١٢٦٨/١ و پاشتر.

[3] الأستاذ صلاح الدين الناهي، سەرچاوەی پێشوو، ص٩٠ و پاشتر.

لەکیسچووەکەیش خاوەندارێتیی ماڵەکە لەدەست نادات تا ئەوە کار لە پێگەی دارایی نەکا.

٥- رەحمەتی مامۆستا سەنهوری سەرۆکی لیژنەی پرۆژەی یاسای مەدەنیی عێراقیی بەرکار[1] بوو دەستەواژەی (بەدەستهێنان بەبێ هۆ)ی هەڵبژارد، لەبەرئەوەی ئەوکات هەستی بە هەڵەبوونی زاراوەی (زەنگینبوون بەبێ هۆ) لە یاسای مەدەنیی میسری و ئەو یاسا عەرەبیانەیتر کە رێچکەی ئەویان گرتووە، کردبوو.

**دووەم: رووەکانی هەڵەبوونی دەستەواژەی (کرداری سوودبەخش):**

١- سوودبەخش ئەو شتەیە لەبارە بۆ ئەوەی ئەو کەسەی بەشێوەیەکی شەرعی و یاسایی بەدەستی هێناوە سوودی لێ ببینێ، بەڵگەنەویستە هەر شتێك بەبێ هۆیەکی شەرعی و یاسایی بەدەست بهێنرێ وا نیە، جا چۆن سیفەتی سوودی شەرعی دەدرێتە پاڵ ئەو شتەی شەرعی نیە؟.

٢- ئەو یاسایەی ئەم زاراوەیەی بەکارهێناوە[2] دابەشی کردوە بۆ بەدەستهێنان بەبێ هۆ + وەرگرتنی ناشایستە + فوزالە + دانەوەی قەرزی کەسیتر و هەموو ئەم بەشانەی لەژێر ناونیشانی کرداری سوودبەخشدا کۆکردۆتەوە، ئەمەیش بەڵگەیەکی روونە لەسەر ئەوەی کردارەکە سوودبەخشێکی پەتی نیە، بەڵکو بۆ لایەنێك سوودبەخش و بۆ لایەنەکەیتر زیانبەخشە.

لە روانگەی ئەوەی باسمان کرد، زاراوەی راست و دروست بریتییە لە (بەدەستهێنان بەبێ هۆ)، لەبەرئەوەی مەنتیقی یاسایی ئەوە پەسەند دەکا، یاسادانەری عێراقی چاکی کردوە کە ئەم دەستەواژەیەی هەڵبژاردوە.

---

[1] رقم (٤٠) لسنة ١٩٥١.

[2] وەك مەدەنیی ئوردنی، مادەی (٢٩٣) و پاشتر.

**چەند نموونەیەک لە بەدەستهێنان بەبێ هۆ:**

**یەکەم- نەبوونی هۆیەك بۆ بەدەستهێنان لە بنەڕەتەوە، وەك لەم حاڵەتانەدا:**

١- یەکێك لە دوو قەرزاری هاوکار قەرزێك بداتەوە کە ئەویتریان پێشتر دابوویەوە، پێویستە خاوەن قەرزە وەرگرەکە ئەوەی وەریگرتووە بیگێڕێتەوە، لەبەرئەوەی بەدەستهێنان بەبێ هۆیە.

٢- میراتگرێك قەرزێك بداتەوە کە باوەڕی وابووە پەیوەندی بە میراتەکەوە هەیە، پاشان بۆ وەرەسەکە دەربکەوێ ئەو قەرزە لە بنەڕەتدا نەبووە، یان مردووەکە لە ژیانی خۆیدا داویەتیەوە، بۆیە پێویستە وەرگرەکە دەستبەجێ بیگێڕێتەوە، لەبەرئەوەی بەدەستهێنان بەبێ هۆیە.

٣- دوای جێبەجێکردنی وەسێتی میراتدەر لەلایەن وەرەسەوە بۆیان دەربکەوێ وەسێتەکە پایە و مەرجەکانی دامەزرانی تێدا نەهاتوونەتە جێ، یان بۆیان دەربکەوێ وەسێتکار لە ژیانی خۆیدا لێی پاشگەز بووەتەوە.

شایانی باسە وەسێتکردن ڕەفتارێکی تاکەکەسیی ناسەپێن (نالازم)ـە و وەسێتکار بۆی هەیە هەرکات ویستی بە ویستی تاکلایەنەی خۆی لە ژیانیدا لێی پاشگەز ببێتەوە.

لێرەوە پێویستە ئەو کەسەی وەسێتی بۆ کراوە بەشتێك، دەستبەجێ بیگێڕێتەوە، لەبەرئەوەی بەدەستهێنان بەبێ هۆیە.

٤- کەسێك قەرەبوویەك بداتەوە بەرانبەر زیانێك کە گومانی وایە ئەو لێی بەرپرس بووە، پاشان بۆی دەربکەوێ ئەو لەوەدا بەرپرس نەبووە، بۆیە دەبێ وەرگرەکە دەستبەجێ بۆی بگێڕێتەوە، لەبەرئەوەی بەدەستهێنان بەبێ هۆیە.

٥- فەرمانگەی باج باجێکی ناواجب لە باجدەرێك وەربگرێ، یان زیاد لەوەی لێ وەربگرێ کە پێویستە، لەم بارەدا پێویستە لایەنی وەرگر وەرگیراوەکە بگێڕێتەوە، لەبەرئەوەی بەدەستهێنان بەبێ هۆیە.

٦- قـەرزارێك پـتر لـەوەی لەسـەریەتی بداتـەوە، زیادەکـە دان و وەرگرتنـی ناشایسـتەیە و پێویسـتە لەسـەر وەرگرەکـەی دەسـتبەجێ بیگێڕێتـەوە، لەبەرئەوەی بەدەستهێنان بەبێ هۆیە[١].

٧- هەندێ لە یاساناسان لەپێشیانەوە مامۆستا سەنهوری[٢] گومانیان وابوو "قەرز لە بنەڕەتەوە وجودی نابێ ئەگەر سەرچاوەکەی گرێبەندێکی بەتاڵ بێ جا هۆی بەتاڵییەکە هەرچی بێ، یان قەرزەکە قەرزێکی مەدەنی نـەبوو بـەڵکو قـەرزێکی سروشتی بوو".

لەگەڵ رێزمان بۆ پێگەی زانستیی رەحمەتی مامۆستا سەنهوری، لەم بۆچوونەیدا سەرکەوتوو و ورد نەبوو، لەبەر ئەم هۆیانە:

أ- پابەندیی سروشتی ئەو پابەندیەیە کە تەنها رەگـەزی داواکردنـی کەمـە، واتـە سیفەتی بەرپرسیارێتی لەدەست دەدات و سیفەتی قەرزاری دەمێنێتەوە، یان وەك زانایانی یاسا دەڵێن رەگەزی بەرپرسیارێتی دەکەوێت و رەگەزی قەرزاری بۆ پابەندی دەمێنێتەوە. پەیوەستیەکی یاساییە بەو پێیـە مافەکـە دەمـێنێ، بەڵام قەرزدەر سەرپشـك ناکـا داوا لـە قـەرزار بکـات بیداتـەوە، لەبەرئـەوەی رەگەزی پاراستنی یاسایی لەدەست دەدات.

ب- ناچارنەکردنی قـەرزار بـۆ جێبـەجێکردن هـیچ رۆڵێکـی نیـە لـە بریـاردان لـە دروستی یان بەتاڵیی دانەوەکە، لەبەرئەوەی دانەوە تەنها بە بـوونی هۆیـەکی دروست و بەرپای مافەکە دروستە و بە کۆنبوون ناکەوێ.

ج- یاسای مەدەنیی میسریی بـەرکار (م/٢٠١)، سـوری (م/٢٠٣)، لـیبی (م/٣٠٤) دەڵێن قەرزی سروشتی هەیە، لەبەرئەوەی "قەرزار ئەو (ماڵ)ـە ناگێڕێتەوە کە بە ویستی خۆی جێبەجێی کردوە و مەبەستی بووە پابەندیەکی سروشتی یان

---

[١] بۆ زانیاریی زیاتر سەیری ئەم کتێبەمان بکرێ: نظرية الالتزام برد غير المستحق، ص٧٨ و پاشتر.
[٢] الوسيط، ١/١٣٤٣، نبذة ٨٢١.

ئەدەبیی رووت جێبەجێ بکات، جێبەجێکاریش لانیکەم لەکاتی دانەوەکەدا بە راستیی دۆخەکەی دەزانی".

د- ئەوە لە شەریعەت و یاساکاندا باوە کە کۆنبوون ماف ناخات، بەڵکو دەعواکە و ناچارکردنی قەرزار بە دانەوەی، دەخات.

**دووەم- ئەوەی هۆکە نادروست بێ وەك لە گرێبەندی بەتاڵ یان ویستی تاکلایەنەی بەتاڵدا:**

لەم حاڵەتەدا هۆ بە وێنە هەیە بەڵام دروست (صحیح) نیە و وا دادەنرێ وەك ئەوەی لە بنەڕەتدا نەبێ، جا هەر کەسێك شوێن (محل)ی رەفتارێکی بەتاڵ وەربگرێ وەك فرۆشراو و نرخ لە گرێبەندی فرۆشتنی بەتاڵدا، یان بەخشراو لە بەخشینی بەتاڵدا وەك لە حاڵەتی ئەوەی بەخشەرەکە نەفام (غير ممين) بێ، پێویستە کەسی پێبەخشراو دەستبەجێ بۆ بەخشەرەکە یان نوێنەرەکەی بگێڕێتەوە، لەبەرئەوەی بەدەستهێنان بەبێ هۆیە.

**سێیەم: بەر لە وەرگرتن هۆکە نەمێنێ:**

ئەگەر گرێبەندەکە دروست بوو، ئەنجا پاش هەڵوەشاندنەوەی لەبەر پاساوی ئەوەی یەکێك لە لایەنەکان بەر لە هەڵوەشاندنەوەکە باتی (عوض)ەکەی خۆی کە شایستەی بوو برد، وەك وەرگرتنی نرخەکە لەلایەن فرۆشیارەکە و وەرگرتنی ماڵە فرۆشراوەکە لەلایەن کڕیارەوە پاش هەڵوەشاندنەوەی فرۆشتنەکە، وەرگر پابەند دەبێ بە گێڕانەوەی ئەوەی وەریگرتووە، لەبەرئەوەی بەدەستهێنان بەبێ هۆیە. هەروەها لەبەر ئەو رێسا گشتیەیش کە دەڵێ هەردوو گرێبەندوان پاش هەڵوەشاندنەوەی گرێبەندەکە دەگەڕێنەوە دۆخی پێشوویان بەر لە ئیمزاکردنی گرێبەندەکە.

**چوارەم: هۆ هەبێ بەڵام نارەوا بێ:**

وەك لە حاڵەتەکانی زەوتکردنی ماڵی کەسیتر، یان دزینی یان بردنی لەڕێی ناپاکیکردن لە ئەمانەت و ئەو جۆرە شتانە.

شایانی باسە سزای ئەم حاڵەتەی دووایی (چوارەم) سزایەكی مەدەنی و جینائییە لە یەك كاتدا، لەبەرئەوەی لە هەر وێنەیەكیدا دوو دەستدرێژی هەیە، دەستدرێژیەك بۆ سەر مافێكی تایبەت، چونكە ماڵە زەوتكراوەكە مافێكی تایبەتی كەسە لێ زەوتكراوەكەیە و ماڵە دزراوەكەیش مافێكی تایبەتی دزی لێكراوەكەیە، هەروەها ماڵی براو لەڕێی ناپاكیكردن لە ئەمانەتەوە دەكرێ ماڵێكی تایبەت بێ و دەشكرێ لە ماڵی گشتی بێ.

سزای دەستدرێژیكردنی مەدەنی بۆ سەر ئەم مافانە، ئەوەیە پێویستە مافەكە خۆی بگێڕدرێتەوە ئەگەر مابوو، لەگەڵ قەرەبووكردنەوەی ئەو زیانەی بەهۆی دەستدرێژیەكەوە كەوتۆتەوە. ئەگەر ماڵەكە نەشمابوو پێویستە لەبریدا هاوچەشنی بدرێتەوە ئەگەر ماڵەكە لە شتە هاوچەشنەكان بوو، هەروەهاڵە بەهاییەكانیشدا بەرزترین نرخ لە سەرەتای دەستپێكردنی ماوەی دەستدرێژیەكەوە بۆ مەزەندەكردنی بەهاكەی، بەپێی رایەك. بەهاكەیش لەڕێی قەزا و كەسانی شارەزاوە مەزەندە دەكرێ.

ئەو مافی گشتیەی لە تاوانەكانی ماڵدا دەستدرێژی دەكرێتە سەر هەمان مافی گشتییە لە هەموو جۆرەكانی تاواندا، كە بریتییە لە (رێزگرتنی یاسا و سیستمی گشتی و ئادابی گشتی، ئەمە جگە لە پاراستنی ئاسایش و ئاشتی و سەقامگیری).

سزای دەستدرێژیكردنە سەر مافە گشتیەكانیش ئەوەیە دەقەكانی یاسای سزاكان بەپێی رێسای (نە تاوان و نە سزا، بەبێ دەق نیە) دیاری كردووە. (بەدەستهێنان بەبێ هۆ)یش بەلای مەنتیقی یاساییەوە لە هۆكانی پابەندی و بەلای یاساناسانیشەوە سەرچاوەیەكە لە سەرچاوەكانی پابەندی، بە دوو تایبەتمەندی لە باقیی هۆكان جیا دەكرێتەوە:

یەكەمیان: سوودی ناڕەوای دەستدرێژكار كە هەندێ لە زانایانی یاسا ناویاننـاوە (زەنگینبوون بەبێ هۆ)، لەتەك زیانی دەستدرێژی لێكراو بەبێ هۆ، كە هەندێ یاسا بە (هەژاركەوتن بەبێ هۆ) ناویان بردوە، لە خۆیدا كۆ دەكاتەوە.

دووەمیان: بەزۆری پابەندیی مەدەنی بەنیسبەت گێڕانەوەی بەدەڵ یان قەرەبوو، لەتەك پابەندیی جینائی بەنیسبەت تەسلیمبوون بەوەی یاسای سزایی و داگەکان بڕیاری لەسەر دەدەن و ملکەچکردن بۆ جێبەجێکردنی، جا چ سزاکە سزایەکی جەستەیی بێ وەك بەندکردن یان سزایەکی مالّی بێ وەك غەرامەکردن، لە خۆیدا کۆدەکاتەوە.

## خواستی چوارەم:
## بەرپرسیاریێتی لە کاری ئەویتر

زانایانی یاسا و هەندێ لە شەرعناسانی ئیسلامی چارەسەرێکی ناورد و ناسەرکەوتووی ئەم بابەتەیان لە هەندێ رەگەز و ئەحکامیدا کردوە، لەبەر ئەم هۆیانە:

یەکەم- لەم ناونیشانەدا هیتر یاخود کەسیتر (الغیر)یان دابەش کردوە بۆ مرۆڤ و ئاژەلّ و شتەکان و پاسەوانی و ئامێرەکان و ئەو جۆرە شتانە، ئەوەیش لە ترازووی مەنتیق و فەلسەفەدا دابەشکردنێکی هەڵەیە، لەبەرئەوەی شتەکان (الاشیاء) کۆی شت (شيء)ـە و لە زمانی عەرەبیدا لە وشەی (مشیئة) وەرگیراوە بەمانای ئیرادە، واتە ئەوەی مرۆڤ دەیەوێ و بیری لێدەکاتەوە.

لە زاراوەی فەلسەفیشدا هەر شتێکە کە بکرێ بزانرێ و هەواڵی لەبارەوە بدرێ، واتە (مرۆڤ) بەدوای کاروبارەکانیدا بگەڕێ، جا چ لە دەرەوەی زەینی مرۆڤ هەبێ یان نەبێ. رەگەزێکی باڵایە و دوو رەگەز دەگرێتەوە، ئەوانیش گیانلەبەر و بێگیانن.

گیانلەبەریش دوو رەگەزی ناوەند دەگرێتەوە، لەبەرئەوەی ئەگەر بە ئیرادە بجولێ ئاژەڵە، ئەگینا رووەکە بەمانا گشتییە گشتگیرەکەی کە درەختەکان دەگرێتەوە. گیانلەبەری بە ئیرادە جولاویش مرۆڤ و هەموو جۆرەکانی ئاژەڵ دەگرێتەوە.

سەرباری ئەوەیش لە دابەشکردنە یاساییەکاندا (شت) کراوەتە هاوبەشکەی مرۆڤ و ئاژەڵ، ئەم دابەشکردنەیش بەتاڵە، لەبەرئەوەی لە جۆری دابەشکردنی شتە بۆ خۆی و غەیری خۆی لە باقیی بەشەکانی. دابەشکردنی مەنتیقیی راست دابەشکردنە بۆ گیانلەبەر (بونەوەری زیندوو) و بێگیان، دابەشکردنی ئەوەی یەکەمیش بۆ مرۆڤ و ئاژەڵ. دابەشکردنەکە بەئیجمال دوانینە (گیانلەبەر و بێگیان) و بەتەفسیل سیانینەیە (مرۆڤ و ئاژەڵ و بێگیان). بۆیە دەبوو زانایانی یاسا و یاساناسەکان بەرپرسیارێتی لە کاری کەسیتر لەسەر بنچینەی ئەم دابەشکردنە سیانینەیە چارەسەر بکەن.

دووەم: زۆربەیان بەرپرسیارێتیی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی مرۆڤیان بە ئیدراك و عەقڵەوە بەستووە و هەمان حوکمی کاری زیانبەخشی ئاژەڵیان داوەتە کاری نارەوای مرۆڤی نەشیاو، لەسەر ئەو بنچینەیەی کردارەکەی وەك کرداری ئاژەڵ نە بە رەوا و نە بە نارەوا وەسف ناکرێ. ئەمە ئەگەر بۆ بەرپرسیارێتیی تاوانکاری راست بێ لە بەرپرسیارێتیی مەدەنیدا بە هەردوو بەشی گرێبەندی و کەمتەرخەمی راست نیە، لەبەرئەوەی یەکەمیان لە حوکمە تەکلیفیەکانە (واجب، حەرام، موباح)، کەسی نەشیاو لەڕووی جینائیەوە لێی ناپرسرێتەوە ئەگەرچی کارەکەی لە خۆیدا نارەوایە و بە نامەشروعیەت وەسف دەکرێ.

بەڵام دووەمیان لە حوکمە دانراو (وضعي)ەکانە (هۆیی و مەرجی و رێگری)، نەشیاو لەسەر کارە نارەواکەی پرسیاری لێدەکرێ و پێویستە لە ماڵەکەی دەستەبەر بکرێ، جا ئەگەر ماڵی هەبوو دەستبەجێ و ئەگەر لەکاتی ئەنجامدانی تاوانەکەدا ماڵی نەبوو پاشتر، لەبەرئەوەی ئەوە لە بابی بەستنەوەی بەرهۆکانە بە هۆکانیانەوە بەچاوپۆشین لە شیانی ئەو کەسەی هۆکەی لەدەست قەوماوە، کاری نارەوا هۆیە و دەستەبەری یان قەرەبووکردنەوەیش بەرهۆن.

سێیەم- هەندێ فیقه وەك فیقهی خۆرئاوایی و ئەو یاسایانەی لەژێر کاریگەریدان بەرپرسیارێتیی مرۆڤ بەرەهایی، جا چ جینائی بێ یان مەدەنی، بە شیانی ئەنجامدان بە هەردوو بەشەکەی (تەواو ناتەواو)ەوە دەبەستنەوە.

ئەمە هەڵەیە، لەبەرئەوەی شیانی پابەندی و دەستەبەری بە شیانی واجببوون (شیانی مرۆڤ بۆ ئەوەی مافی هەبێ و پابەندی لەسەر بێ)ەوە بەستراون، کە لەگەڵ بەزیندوویی لەدایکبوونی مرۆڤدا لەدایك دەبێت و بەمردنی دەمرێ، ئەم شیانە بۆ حوکمی وەزعی دەگەڕێتەوە نەك تەکلیفی وەك باسمان کرد و هیچ بەربەستێك لە بەربەستەکانی شیان (ئەهلیەت) کاری تێناکەن، جا ئەگەر دوای لەدایکبوون مرد ئەم شێتبوونە کار نە لە مافە دارایی و نادارایییەکانی وەك مافی هاوسەری و نە لە پابەندیەکانی رابردوو و داهاتووی ناکا.

چوارەم: فیقهی خۆرئاوایی و ئەو یاسایانەی لەژێر کاریگەریدان بەرپرسیارێتیی جینائی و بەرپرسیارێتیی مەدەنییان تێکەڵ کردوە. ئەوەی ئەهل بێ بۆ بەرپرسیارێتیی جینائی بۆ بەرپرسیارێتیی مەدەنی ئەهل نابێ ئەگەر کارێکی نارەوای زیانبەخشی ئەنجامدا، ئەمەیش هەڵەیە لەبەرئەوەی وەك باسمان کرد حوکمی شەرعی و هەروەها یاسایی دوو جۆرن: حوکمی تەکلیفی کە تەنها دەکەوێتە سەر ئەوانەی باڵق و ژیر و هەڵبژێر و بەهۆشن + حوکمی وەزعی کە دابەش دەبێ بۆ هۆیی و مەرجی و رێگری، بەبێ جیاکاری لەنێوان شیان تەوا و نەشیاودا. کاری نارەوای زیانبەخش هۆی پابەندی و دەستەبەرییە، جا چ لە کەسی ژیرەوە قەومابێ یان شێت، لەبەرئەوەی لە بابی بەستنەوەی بەرهۆکانە بە هۆکانیانەوە. وەك باسمان کرد مادام هۆکە هەبێ بەرهۆکەیش دەبێ.

پێنجەم: هەڵەی بایس (المتسبب) و هەڵەی ئەنجامدەری راستەوخۆیان تێکەڵ کردوە و یەك حوکمیان داونەتێ و گوتویانە: ئەگەر بایس و راستەوخۆ کۆبوونەوە حوکمەکە دەدرێتە پاڵ راستەوخۆکە ئەگەر دووەم باڵق و ژیر و ناشوێنکەوتە بێ، دەشدرێتە پاڵ بایس ئەگەر راستەوخۆکە ناکام و لەژێر سەرپەرشتی و چاودێریی کەسێکی باڵقی ژیردا بوو، یان شوێنکەوتەی بوو یان لەژێر پاسەوانیدا بوو. پێشتر هەڵەیی ئەم رێسایەمان روون کردەوە، راستی ئەوەیە بگوترێ (ئەگەر بایس و راستەوخۆ کۆبوونەوە بەرپرسیارێتیەکە

بـەگوێرەی سروشـتی بەشـداربوون و کاریگـەری لـە روودانـی زەرەرەکـەدا، بەسەریاندا دابەش دەبیٚ).

بۆ نموونە ئەو کەسەی برینێکی نەکوژ بخاتە جەسـتەی کەسـێکەوە و بەهۆیـەوە گوێزرایەوە بۆ نەخۆشخانە، بەڵام لە ڕێگە بەهۆی پێکدادان یان بـەهۆی کەوتنـەوەی ئاگر لە نەخۆشخانە، یان بەهۆی هەڵەی پزیشکەی چارەکارەوە مرد، ئەسـڵ ئەوەیـە پرسیار لە یەکەم بکریٚ لەسەر ئەو دەستپێشخەریەی، لەبەرئەوەی کـارە ناڕەواکـەی ئەو بووە هۆ یاخود بایسی گواستنەوەی بۆ نەخۆشخانە. ئەگەر بریندارکردنەکە لەبەر هۆیەکی ڕێپێدراو بوو وەك دەستگیرکردنی زیندانیەکی هەڵاتوو بـۆ نموونـە لەرێگـەی بریندارکردنی قاچیەوە، ١٠٠٪ پرسیار لە بەرپرسیاری ڕاستەوخۆ لەکاتی گواستنەوەی بۆ نەخۆشخانە دەکریٚ ئەگەرچی گواستنەوەکە بەهۆی برینەکەوە بووە، لەبەرئەوەی بریندارکردنەکە ڕێپێدراو بووە، چونکە ڕاپەڕاندنی ئەرك بووە.

ئەگەر کەسێك بیرێکی لە شوێنێکی ڕێپێنەدراودا هەڵکەند و کەسێکیتر ماڵێکی تیٚ خست و فەوتا، لەرووی سزاییەوە لە یەکەمیان دەپرسرێتەوە و سزایەکی تەمێکارانە دەدریٚ، لەبەرئـەوەی نـاڕەوابوونی کارەکـەی سـەربەخۆیە لـە کـاری ئـەو کەسـەی شتەکەی خستە بیرەکەوە، بۆیە نـابیٚ لەبـەر دوو هـۆی نـاڕەوا سـزاکە یـەك بخـریٚ، هـەروەها کەسـە ڕاسـتەوخۆکەیش لەسـەر فەوتاندنـە گشـتی یـان بەشـەکیەکە لێـی دەپرسرێتەوە. خۆ ئەگەر چاڵەکە لە شوێنێکی ڕێگەپێدراودا بوو وەك باخچـەی مـاڵ یـان بـاخی هەڵکەنەکـە، بەرپرسـیارێتی دەکەوێتـە سـەر ئـەو کەسـەی ڕاسـتەوخۆ خستویەتیە ناوی.

شەشـەم: وردنـەبوون لـە تەفسـیرکردنی ئەنقەسـتکردن (التعمـد) و دەسـتدرێژی (التعـدي) و ڕادەی پەیوەنـدییان بـە بەرپرسـیارێتیی کەمتەرخەمیکردنـەوە و دەڵێن: ئەگەر بایس و ڕاستەوخۆ کۆبوونەوە، پرسیار لە بایس دەکریٚ ئەگـەر بەئەنقەست کارەکەی کرد یان دەستدرێژی کرد، بەڵام پرسیار لـە ڕاسـتەوخۆ

دەکریٚ با بەئەنقەستیش نەیکردبیٚ یان دەستدریٚژی نەکردبیٚ[1]. ئەمە هەڵەیە، لەبەرئەوەی مەبەست لە بەئەنقەستکردن ئەوەیە مەبەستی لە کارە ناڕەواکە گەیاندنی زیانێك بوویێ بە ئەویتر با پاساویشی نەبیٚ، لەم هەڵەیەدا مەرجە دوو رەگەز هەبن: ماددی (تێکدانی ئەرکێکی یاسایی) و مەعنەوی (دەرککردنی تێکدەر بەوەی ئەرکی یاسایی خۆی تێکداوە).

مەبەست لە دەستدرێژیکردنیش کارە ناڕەواکەیە و لەمەدا تەنها بوونی رەگەزە مادیەکە (تێکدانی واجبێکی یاسایی) بەسە جا چ رەگەزە مەعنەویەکە هەبیٚ یان نەبیٚ، ئەوکاتە رەگەزەکانی بەرپرسیارێتیی کەمتەرخەمی بریتی دەبن لە (کاری ناڕەوا + زیان + پەیوەندیی هۆیی).

بەم پێیە، هەموو کارێکی لە خۆیدا ناڕەوا ئەگەر هەردوو رەگەزی (تعمد) و (تعدي) تێدا نەهاتە جیٚ، لە سیفەتی ناڕەوابوون دادەماڵریٚ و دەگۆڕیٚ بۆ رێپێدراو (موباح)، وەك لە حاڵەتەکانی بەرگریکردنی شەرعی و ئەنجامدانی واجب و بەکارهێنانی ماف، بکەرەکە نە لەڕووی جینائی و نە لەڕووی مەدەنیەوە پرسیاری لێناکریٚ. هەربۆیە بوونی هەردوو رەگەزی (تعمد) و (تعدي) لە بەرپرسیارێتیی کەمتەرخەمیدا بەڕەها زەروریە، جا چ بکەرەکە بایس بیٚ یان راستەوخۆ.

حەوتەم: داهێنان (استحداث)ی بیرۆکەی هەڵەی گریمانەکراو هەڵەیە، ئەم داهێنانە دەدرێتە پاڵ قەزای فەرەنسی پاش بەرپابوونی شۆڕشی پیشەسازی لە ئەورووپا و تووشبوونی هەندیٚ لە کرێکارانی کارگەکان بە نەخۆشیی درێژخایەن لەئەنجامی بەکارهێنانیان بۆ دەزگا و ئامێرەکانی کارکردن و بەرهەمهێنان، بۆیە وا گریمانەی کرد کە خاوەنی دامەزراوە ئابووریەکە هەڵەی کردوە، تا کرێکارە تووشبووەکە شایستەی

---

[1] وەك لە مەدەنیی ئوردنی مادەی (٢/٢٥٧)دا هاتووە کە دەڵیٚ: (ئەگەر زیانگەیاندن بە راستەوخۆ بوو دەستەبەری پێویست دەکات و مەرجی نیە، ئەگەر بە بوونەهۆ (واتە بایسبوون) بوو ئەوا مەرجە دەستدرێژی یان بەئەنقەستکردنی تێدا بیٚ، یان کردەوەکە سەرێکێشیٚ بۆ زیان).

قەرەبووکردنەوە بیٚ لەلایەن خاوەنەکەیەوە لەسەر بنچینەی: (هەڵەی گریمانەکراو + زیان + پەیوەندیی هۆیی).

هەڵەی گریمانەکراویش بیرۆکەیەکی وەهمییە و چنراوی خەیاڵی قـەزا و خـەیاڵاتی قازیەکان یان پیاوانی یاسایە و راستییە یاساییەکان (قەرەبووکردنەوەی زیانـەکان)ی لەسەر بینا ناکریٚ، واتە لەئەستۆگرتنی ئەنجام و لێکەوتەی کارە ناڕەواکە سـەرباری نەبوونی هەڵەی راستەقینە.

**لە ترازووی مەنتیقدا راست ئەوەیە تۆباڵی کارە ناڕەواکانی مرۆڤ لەسەر یەکێك لەم سیٚ بنچینەیە دادەمەزریٚ:**

بنچینەی یەکەم/ بوونی هەڵەی راستەقینەی جینـائی یـان مـەدەنی، وەك پێشـتر پیادەکردنەکانیان باس کران.

بنچینەی دووەم/ رێسای: رەنج بە گەنج (الغرم بـالغنم)، وەك لـە بەرپرسـیارێتیی خاوەنی دامەزراوە بەرهەمهێن و ئابووریەکەدا ئەگەرچـی هەڵـەی بەرپرسـەکەی تێـدا نیە. وەك چۆن بەرپرسە لە چاککردنەوەی ئامێرێکی دامەزراوەکە ئەگەر لەکار کەوت و خەرجی چاککردنەوە یان گۆڕینی لەسەرە، بەهـەمان شـێوە ئەگـەر کرێکـارێکیش تووشی نەخۆشیەکی درێژخایەن بوو و توانای کارکردنی نەما، بە رێسـای (رەنـج بـە گەنج) پێویستە لەسەری قەرەبووی ئەو زیانە بەگوێرەی قەبارەکەی بکاتەوە.

بنچینەی سێیەم/ بنەمای سەرخستن و هاوکـاریکردنی یـەکتر سـەرباری نـەبوونی هەڵەی بەرپرس، وەك لـە بەرپرسـیارێتیی عاقیلـە (هـۆز و خـزم و خـوێش یـان ئـەو دامەزراوەیەی تاوانکار تێیدا ئەندامە) لە دانی خوێنبایی کوشتنی بەهەڵە لەگەڵ بوونی بنەمای ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾[1]. واتە کەسی بێتـاوان تۆبـاڵی کەسـی تاوانکـار هەڵناگریٚ. بنەمای دووەم ئەسـڵە و یەکـەمیان (خوێنبـایی لەسـەر عاقیلـە) ریزپـەڕە (ئیستیسنا) و فەلسەفەکەی یەکتر سەرخستن و هاوکارییە لەسـەر خێـر کـە ئـەویش

---

[1] سورة الأنعام/١٦٤

فەرمانی پێکراوە وەك خوای گەورە دەفەرموێ ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى﴾[1]. جا بە بنەمای یەکتر سەرخستن و هاوکاری لە ئایەتی ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى﴾، گشتیبوونی بنەمای ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾ی تایبەت کرد.

هەشتەم: شەرعناسانیش وەك یاساناسان یەکقسە نین لە دیاریکردنی بەرپرسیارێتیی کەسی نەشیاو، بەڵکو بەسەر سێ رادا دابەش بوون:

رای یەکەم/ مێردمنداڵ و ئەوەی لە حوکمیدایە دەستەبەریئەو شتە دەکا کە فەوتاندویەتی، جا ئەو کەسە بەفام بێ یان نەفام، هەروەها شێت و دەبەنگ (المعتوه) لەوەدا وەك کەسانی ژیر و باڵق وان[2]. یاسادانەری عێراقیش ئەم رایەی وەرگرتووە[3]، لەوەیشدا چاکی کردوە. تەلەفکردن و دەستبەسەرداگرتن بۆ بەدیهاتنی دەستبەری (الضمان) وەك یەکن، لەبەرئەوەی ئەم کارە نارەوایە دەبێتە هۆ بۆ گێرانی ئەستۆی دەستبەسەرداگر بە گێرانەوەی هەمانماڵی دەست بەسەرداگیراو، یان هاوچەشن یان بەهاکەی لە حاڵەتی فەوتانیدا.

رای دووەم/ بەفام و نەفام لێك جیادەکاتەوە، واتە لەنێوان ئەوەی ئاوەزی هەیە و ئەوەی ئاوەزی نیە و لە دەستەبەریدا حوکمی باڵق بەسەر بەفامدا جێبەجێ دەکا، بەپێچەوانەی نەفام (مێردمنداڵی بێ ئاوەز) و ئەوەی لە حوکمیدایە،کە لەسەر ئەو گیان یان ماڵەی لەناوی بردوە هیچی لەسەر نیە[4].

---

[1] سورة المائدة/٢

[2] المبسوط في الفقه الحنفي للسرخسي (شمس الدين)، ٨٦/٢٦.

[3] لە مادەی (١٩١)دا.

[4] ئیبن جەزی لە (القوانين الفقهيه) ل٣٣٢دا دەڵێ: (خۆ ئەگەر باڵق نەبوو، لە دەستدرێژیکردنە سەر ماڵدا حوکمی باڵقی لەسەر دەدرێ ئەگەر ئاوەزی هەبوو بەوەی لەناوی دەبرد ئەگەر ماڵی هەبوو، ئەگەر نەیشیبوو لەسەری دەوەستێ تا دەرووی لێ دەکرێتەوە، هەرچی ئەو مێردمنداڵەیە کە ئاوەزی نیە، وەك بێزمان لەسەر ئەو گیان یان ماڵەی لەناوی دەبا هیچی لەسەر نیە. گوتراویشە ماڵەکە بەفیرۆچوونە و خوێنبایش –هاوشێوەی شێت– لەسەر کەسوکارەکەیەتی).

رای سـێیەم/ نابـالْق هـیچ بەرپرسـیارێتیەکی نیـە جـا چ بـەفام بـێ یـان نـەفام، لێرەیشەوە لەو ماڵەی دەیفەوتێنێ دەستەبەری لەسەر نیە[1].

رای زاڵ بگرە راست رای یەکەمە، لەبەرئەوەی گەرەنتیکردنی شتە تەلەفکراوەکان لە بابی حوکمی وەزعییە (بەستنەوەی بەرهۆکان بە هۆکانیانـەوە)، نـە بـالْقبوون نـە عەقڵ و نە ئیدراك مەرج نین، مادام هۆکە هەبێ (کارە نارەوا زیانبەخشەکە) بەرهۆکە هەیە، ئەویش قەرەبووکردنەوە یان گێڕانەوەی ماڵ (عین)ەکەیـە ئەگـەر مـابوو، یـان دانی بەدەڵ لە هاوچەشن یان بەها.

دوویەم– بۆ دوورکەوتنەوە لە هەڵەی دابەشکردنی شت بۆ خۆی و غـەیری خـۆی، وەك پێشتر باسمان کرد، لێکۆڵینەوەی بەرپرسیارێتی لە کاری کەسیتر بەسەر سێ لقدا دابەش دەبێ، یەکەمیان ئەوەیە ئەگەر ئەو کەسیترە مرۆڤ بێ، دووەم ئەوەیە کاتێ ئاژەڵ بێ و سێیەمیان ئەگەر بێگیان بێ.

[1] المحلی لأن حزم الظاهري، ١٠/٢٤٤. تێیدا هاتووە وفیە: (نە ئەو شێتەی لە شێتیەکەیدا زیان دەدا، نە ئەو سەرخۆشەی لە سەرخۆشیەکیدا کە عەقڵی تێدا لەدەست دەدات و زیانێك دەگەیەنێ و نە ئەو کەسەی بالْق نەبووە، هیچ لەوانە نە خوێنبایی و نە دەستەبەریان لەسەر نیە، ئەوانە و ئاژەڵ وەك یەکن).

## لقی یەکەم:
## لە بارێکدا ئەویتر مرۆڤ بێ[1]

ئەم حاڵەتەیش دوو بەشە: یەکەمیان دامەزراندنی بەرپرسیارێتییە لەسەر بناغەی ئاگالێبوون (الرعایة) و چاودێریکردن (الرقابة)، دووەمیشیان دامەزراندنیەتی لەسەر بناغەی شوێنکەوتەیی:

**بەشی یەکەم/ بەرپرسیاریتیی دامەزراو لەسەر بناغەی ریقابە:**

شایانی باسە زانایانی یاسا و یاسادانەران هەردوو زاراوەکەیان پێکەوە وەك هاومانا (مترادف) بەکار هێناوە، لە ترازووی مەنتیقیشدا ئەم کردەیە هەڵەیە، لەبەرئەوەی لەرووی چییەتی و ئەرکەوە جیاوازن.

چییەتی چاولێبوون بریتییە لە پەروەردە و رێنوێنیکردن بەرەو رەفتاری دروست و ئەخلاقی جوان، چونکە چاودێریکردنی وەلی و سەرپرس یان مامۆستایان، بەر لەوەی ئەرکێکی شەرعی و یاسایی بێ کە ملکەچی رێکخستنەکانیان بێ، لەرووی عەقڵ و سروشتەوە لە کرۆکی ئەرکەکانیانە، بەپێچەوانەی چاودێریکردن کە بریتییە لەو رێکارە خۆپارێزیانەی دژ بە ئازاری هیچ کەسێك، جا چ شیان تەواو یان ناتەواو یان نەشیاو بێ، ناگیرێنە بەر تا نیشانەکانی لادان یان کەتنکردن یان ئەنجامدانی کارێکی نارەوای لێ دەرنەکەوێ.

یاسای سزاکان ئەم راستیەی جێگیر کردوە، لەوانە یاسای سزاکانی عێراق مادەی (١/١٠٣) کە دەڵێ: "نابێ هیچ رێکارێکی خۆپارێزی کە یاسا باسی کردوون دەرهەق

---

[1] لەم بابەتەدا تەماشای ئەم یاسا مەدەنیانە بکرێ:
مەدەنیی عێراقی بەرکار (م/٢١٨-٢٣١)، میسری (م/١٧٣-١٧٤)
ئوردنی (م/٢٨٨-٢٩٢)، کوێتی (م/٢٣٨-٢٤١)
سوری (م/١٧٤-١٧٩)، لوبنانی (م/١٢٩-١٣٣) و ئەو یاسایانەیتر کە ئەم بابەتەیان رێکخستوە.

بە كەسێك بگیرێتە بەر بێ ئـەوەی سـەلمابێ كـارێكی ئـەنجام داوە یاسـا بـە تـاوانی دادەنێ و حاڵەتەكەی بەمەترسی لەسەر سەلامەتیی كۆمەڵگە دادەنرێ".

لــە بارێكــدا چــاودێریكردن پێویســت بــوو، ئەگــەر ئــەو كەســەی ئــەركی چـاودێریكردنەكەی پـێ سـپێردرابوو پابەنـدی خـۆی تێـدا لـە هەسـتان بـە ئـەركی سەرشانی لەو بوارەدا تێكدا، دەستەبەری ماڵی لە ماڵی ناكامەكە دەبێ.

هەرچی چاودێرەكەیە (المراقب) سزاكەی جینائییە و سزایەكی تەمێكارانە دەدرێ كە لەگەڵ قەبارەی تێكدانی پابەندیەكـە بگـونجێ، بەپێچـەوانەی ئاراسـتەی بـاو لـە زۆربەی یاساكان و شەرحەكانیاندا كە دەستەبەری لەسەر ئەو كەسەیە بەرپرسـە لـە چاودێریكردن[1]. جا یەكخستنی بەرپرسیارێتی بەوەی بخرێتە سەر شانی چاودێرەكە بەتەنها وەك لە هەنـدێ یاسـادا هەیـە، یـان بخرێتـە سـەر شـانی كەسـی راسـتەوخۆ بەتەنها، پێچەوانەی مەنتیقی یاساییە، لەبەرئەوەی سـزاكە نـە مـەدەنیی رووت و نـە تاوانكاریی رووتـە، بـەڵكو بـۆ چـاودێرەكە سـزایەكی تاوانكارانەیـە كـە پابەندیەكـەی تێكداوە، بۆ ئەو كەسەیش كارێكی نـاڕەوای كـردوە بووەتـە مایـەی زیانگەیانـدن بـە كەسیتر، مەدەنییە و دەستەبەری لە ماڵی ئەو دەبێ ئەگەر ماڵی هـەبوو، ئـەگینا لـە ماڵی ئەو كەسەی لە چاودێریكردنەكە بەرپرسە ، بەو مەرجـەی مـافی هـەبێ ئـەوەی بۆی بژاردوە لێی وەربگرێتەوە.

---

[1] لەوانە مەدەنیی عێراقی (م/٢١٨)، كە دەڵێ: (باوك ئەنجا باپیر مولزەمن بە قەرەبووكردنەوەی ئەو زیانەی منداڵ دەیقەومێنێ). ئەسڵ وابوو ماف بدرێتە ئەو كەسەی قەرەبووەكەی داوە بگەڕێتەوە سەر ئەو كەسەی زیانەكەی بە كەسیتر گەیاندوە بۆ وەرگرتنەوەی ئەوەی بۆی داوە. دادپەروەری دەخوازێ قەرەبووكردنەوەكە لە ماڵی ناكامەكە یان نەوجەوانەكە بێ ئەگەر ماڵی هەبوو، لەبەرئەوەی ئەهلە بۆ پابەندیی مەدەنی. ئەگەر ماڵی نەبوو ئەو كەسە بۆی دەبژێرێ كە لە چاودێریكردنی بەرپرسە و پاشتر دەگەڕێتەوە سەری و لێی وەردەگرێـەوە.
هەروەها لەوانە یاسای مەدەنیی میسریی بەركار (مادەی ١٧٣).

بەڵام ئەو کەسەی لە چاودێریکردن بەرپرسە ئەگەر سەلماندی ئەو بە ئەرکی چاودێریکردن هەستاوە، یان بیسەلمێنێ کە ئەگەر ئەو وەك پێویست بەو ئەرکە هەڵبستایە، بەدڵنیاییەوە زیانەکە رووی دەدا، لە بەرپرسیارێتی قوتار دەبێ.

هەروەها دەتوانێ کەسی راستەوخۆ و ئەنجامدەری کارە ناڕەواکە و قەومێنەری زیانەکە رزگار بکا ئەگەر سەلماندی زیانەکە بە کردەوەیەکی بێگانە لە بەلایەکی بێئامانەوە، یان رووداوێکی لەناکاو یان کەمتەرخەمیی زیانپێگەیشتوو و ئەو جۆرە شتانەوە بووە.

بینا لەسەر ئەوەی باسمان کرد، بۆ بەدیهاتنی هەردوو بەرپرسیارێتیەکە (سزایی و مەدەنی) لە یەك کاتدا، مەرجە ئەمانە هەبن:

١- بوونی کەسێکی ناکام لەژێر چاودێریی کەسێکیتردا بەگوێرەی یاسا یان رێکەوتن.

٢- رووداني کارێکی ناڕەوا، کە زیان بە بەرژەوەندیی کەسیتر دەگەیەنێ و پەیوەندی لەنێوان کار و ئەنجامەکەیدا هەیە.

٣- رووداني زیانەکە لەکاتی ماوەی چاودێریکردنەکەدا بێ.

٤- ساغبوونەوەی کەمتەرخەمیکردنی بەرپرس لە چاودێریکردن، لەبەرئەوەی بەرپرسیارێتیەکە کەمتەرخەمیکردنە و ئەسڵ نەبوونیەتی.

٥- یەکنەخستنی سزا بەوەی بخرێتە سەر چاودێر بەتەنها یان نەشیاو بەتەنها، لەبەرئەوەی هۆکەی دەگۆڕێ، هۆی پابەندیی کەسی بەرپرس لە چاودێریکردن تێکدانی پابەندیەتی پێیەوە و هەڵەکەی پێویستە هەردوو رەگەزە ماددی و مەعنەویەکەی تێدا بێ. هۆی پابەندیی کەسی راستەوخۆیش کارە ناڕەوا زیانبەخشەکەیە و لە هەڵەکەیدا تەنها بوونی رەگەزە مادديەکە (تێکدانی واجبێکی یاسایی) بەسە.

**بەشی دووەم: بەرپرسیارێتیی دامەزراو لەسەر بناغەی شوێنکەوتەیی:**

ڕۆژ بەڕۆژ بەرپرسیارێتی لەسەر بناغەی شوێنکەوتەیی زیاد دەکا، ئەویش لەئەنجامی پەرەسەندنی ژیان لە کارلێکی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگە لەسەر هەردوو ئاستی ناوخۆیی و نێودەوڵەتی بەهۆی پێشکەوتنی ئامرازەکانی پەیوەندیکردنی تەکنەلۆژیەوە، لەکاتێکدا لە بەرانبەر ئەوە پەرەسەندنێك لە یاسا دانراو (وەزعی)یەکان و راکانی یاساناسان و شەرعناسانی ئیسلامی لە چارەسەرکردنی تیۆری بەرپرسیارێتیی شوێنکەوتوو لە کارە زیانبەخشەکانی شوێنکەوتە نابینین، بەڵکو بیرۆکەی هەڵەی گریمانەکراوی[1] شوێنکەوتوو پارێزگاری لە رۆڵی خۆی لە پابەندبوونی شوێنکەوتوو بە قەرەبووکردنەوەی زیانمەند و بژاردنی زیانەکەی کردوە، لەگەڵ ئەوەی هەڵەی گریمانەکراو وەك باسمان کرد چنراوی خەیاڵە، بۆیە دروست نیە راستییە کردارییە واقیعییە یاساییەکانی لەسەر بنیات بنرێ.

پاشان بەرپرسیارێتی لەسەر بناغەی شوێنکەوتەیی تەواو جیاوازە لە بەرپرسیارێتی لەسەر بنچینەی چاودێری (ریقابە) لەم رووانەوە:

١- بەرپرسیارێتیی چاودێری لەسەر هەڵە بنیات دەنرێ، بەڵام بۆ ئەو کەسەی بەرپرسە لە چاودێریکردن پێویستە هەردوو رەگەزە ماددی و مەعنەویەکەی تێدا بێ، بەڵام سەبارەت بە ناکام، هەڵە هاومانای دەستدرێژی یان کاری ناڕەوایە و تەنها رەگەزە ماددیەکە (تێکدانی ئەرکێکی یاسایی) بەسە، بە دەربڕینێکیتر کارەکەی هەڵگری سیفەتی ناڕەوابوون بێ، لەکاتێکدا بەرپرسیارێتی شوێنکەوتوو لە کاری ناڕەوا و زیانبەخشی شوێنکەوتەکەی، لەسەر رێسای (رەنج بە گەنج) دامەزراوە.

شوێنکەوتوو چ کەسێکی مەعنەوی بێ، وەك ئەو زیانەی سوپای سەر بە وەزارەتی بەرگری لە پرۆسە سەربازیەکاندا بە تاکەکانی دەگەیەنێ، یان کەسێکی سروشتی بێ وەك بەرپرسیارێتیی خاوەنی دامەزراوەیەکی ئابووری لەو زیانانەی بە

[1] بروانە: مجموعة الأعمال التحضيرية للقانون المدني المصري، ٢/٤٢١.

کرێکاری کارگەکە دەگات، بەرپرسیارێتییە مەدەنیەکە کە قەرەبووکردنەوە و بژاردنی زیانی زیانمەندەکە دەبێ. لەسەر بناغەیە دامەزراوە کە سوودمەند لە کارەکانی شوێنکەوتە کەسی شوێنکەوتووە و سوودیش دەسکەوتە، بۆیە ئەوەی لێی سوودمەندە بەرپرسە لە تۆباڵی ئەو زیانەی شوێنکەوتە لەبەرانبەر ئەو دەسکەوتەدا دەیقەومێنێ. هەڵەیش بەهیچ شێوەیەك نادرێتە پاڵ شوێنکەوتە نە هەڵەی راستەقینە، نە هەڵەی گریمانەکراو، نە هەڵەی وەستاو لەسەر بوونی هەردوو رەگەزەکەی و نە ئەو هەڵەیەی یەك رەگەزی بەسە (رەگەزی ماددی).

٢- پەیوەندیی نێوان شوێنکەوتە و شوێنکەوتوو ئەوە ناسەپێنێ کە شوێنکەوتوو شیان تەواو بێت و بەوە شوێنکەوتەییەکە راست و دروست بێ با شوێنکەوتوو نابالّق یان نەفام بێ، بۆ بەرپابوونی بەرپرسیارێتیی شوێنکەوتە (التابع) ئەوەندە بەسە ملکەچی دەسەڵاتی ئەو کەسە بێ لەرووی یاساوە یان بە رێکەوتن نوێنەرایەتی دەکا.

٣- شوێنکەوتەیی لە چاودێریکردن جیایە، لەوەدا یەکەمیان لەوانەیە گرێبەندی بێ وەك پەیوەندیی نێوان خاوەنکار و کرێکار. لەوانەیشە وەزیفی بێ وەك پەیوەندیی نێوان دەوڵەت و فەرمانبەر، هەروەك دەکرێ خزمەتی گشتیی زۆرەملێ بێ وەك سەرباز کە لە سوپادا بەرپرسە لە خزمەتکردنی زۆرەملێ بۆ بەرگریکردن لە وڵات،. هەروەها دەکرێ ئەدەبی بێ وەك ئەوەی هاورێیەك تەکلیف لە هاورێکەی بکات کارێکی بەبێ بەرانبەر بۆ بکا، یان مێرد تەکلیف لە ژنەکەی بکا کارێك بۆ بەرژەوەندیی ئەو بکا، یان بەپێچەوانەوە.

ئەمە لەکاتێکدا چاودێریکردن بەزۆری لەسەر ویلایەتی تایبەت دامەزراوە لە رێگەی خزمایەتیەوە، یان (ویصایە) وەك ئەو چاودێرەی لەلایەن وەلییەوە هەڵبژێردراوە، یان ئەو چاودێرەی لەلایەن قەزاوە دیاری کراو.

٤- سروشتی پەیوەندی لە دوو حاڵەتەکەدا جیاوازە، لەو رووەوە بەرپرسیارێتیی شوێنکەوتوو هەمیشە مەدەنییە و لەبارەی تاوانی شوێنکەوتە پرسیاری لێناکرێ، ئەویش لەسەر بنەمای کەسیبوونی سزا، کە قورئان سەدان ساڵ بەر لە یاسا لە

چەندین ئایەتدا دالیناوە، لەوانە ئایەتی ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾.. شوێنكەوتە بەتەنها خۆی لە تاوانكاریەكانی بەرپرسە، جگە لەوەیش، پێویستە هەمیشە بالّق و ژیر بێ، لەكاتێكدا ئەوەی لە چاوبێریكردن بەرپرسە لەبەر كەمتەرخەمی و تێكدانی ئەركی چاوبێریكردن، سزاكەی تاوانكارانەیە، بەلام بەرپرسیارێتیی مەدەنی تەنها دەكەوێتە سەر نەشیاو و زەمانكردن لە ماڵەكەی دەبێ ئەگەر ماڵی هەبوو، ئەگەر بەرپرس لە چاوبێریكردن لەباتیی ئەو بژاردی، پاشتر لێی وەردەگرێتەوە، وەك لە مادەی (١٩١)ی مەدەنیی عێراقیی كارپێكراو، كە ئەم مادەیە بەرەهایی هاتووە و حاڵەتی چاوبێریكردن و هیتریش دەگرێتەوە.

لە هەموو بارەكاندا بۆ بەرپرسیاربوونی شوێنكەوتوو لە قەرەبووكردنەوەی ئەو زیانەی لە دەستی شوێنكەوتەكەی قەوماوە؛ مەرجە:

أ- قەوماندنی زیانەكە لەكاتی كاركردنیدا بووبێ بۆ بەرژەوەندیی شوێنكەوتە، بەلام لە دەرەوەی ئەو چوارچێوەیە شوێنكەوتوو نە لەرووی جینائی و نە لە رووی مەدەنیەوە لە كاری نارەوای زیانبەخشی شوێنكەوتەكەی بەرپرس نابێ، لەبەرئەوەی هیچ پەیوەستیەك لەنێوان شوێنكەوتەیی و كارە نارەوا زیانبەخشەكەی شوێنكەوتەكەدا، وەك شوێنكەوتە، نیە.

ب- زیانەكە بە كردەوەیەكی بێگانە یان بەهۆی كەمتەرخەمیەكی زیانمەند نەبێ.

شایانی باسە زۆربەی یاسا دانراوەكان[1] لە چارەسەركردنی بەرپرسیارێتیی شوێنكەوتوو لە كاری شوێنكەوتەكەی سەركەوتوو نەبوون، لەبەرئەوەی ئەو بەرپرسیارێتیەیان لەسەر بناغەی رەگەزی هەڵەی گریمانەكراوی شوێنكەوتوو لە بەرپرسیارێتیی كەمتەرخەمی بینا كردوە، بەشێوەیەك تێكەڵییان كردوە لەنێوان

---

[1] لەوانە یاسای مەدەنیی عێراقی بەركار (م ٢١٩/٢):
"خزمەتكراو دەتوانێ خۆی لە بەرپرسیارێتی رزگاری ببێ ئەگەر سەلماندی بایەخی خۆی بەخەرج داوە بۆ رێگرتن لە رووداني زیان، یان ئەو زیانە هەر روویدەدا ئەگەر ئەو بایەخەیشی بەخەرج بدایە".

بەرپرسیاریتی لەسەر بناغەی چاودێریکردن و بەرپرسیاریتی لەسەر بناغەی شوێنکەوتەییان لە زۆر رەگەز و حوکمدا لەلایەك و لەنێوان بینا لەسەر هەڵە و رێسای (الغرم بالغنم)دا لەلایەکیترەوە.

یاساکان بەشێوەیەکی تایبەت مافیان داوەتە شوێنکەوتوو تا بگەرێتەوە سەر شوێنکەوتە و ئەو قەرەبووەی لەبەرانبەر ئەو زیانەی بە زیانمەند گەیشتووە[1] بۆی داوە، لێی وەربگرێتەوە. مەبەست لە بەرپرس لێرەدا شوێنکەوتووە، ئەویش بە قەرینەی مادەی (١/٢١٩)[2].

[1] لەوانە یاسای مەدەنیی عێراقی کە لە مادەی (٢٢٠) دا دەڵێ "ئەو کەسەی لە کاری کەسیتر بەرپرسە مافی گەرانەوە سەر ئەوکەسەی هەیە کە زەمانی کردوە". مەبەست لە بەرپرس لێرەدا شوێنکەوتوو.

یاسای مەدەنیی میسریش (م/١٧٥) رێك وەك ئەمەیە.

[2] کە دەڵێ: "حکومەت و دامەزراوەکانیتر کە خزمەتێکی گشتی پێشکەش دەکا، هەروەها هەر کەسێك دامەزراوەیەکی پیشەسازی یان ئابووری بقۆزێتەوە، بەرپرسن لەو زیانەی کارگوزارەکانیان دەیدەن ئەگەر ئەو زیانە بەهۆی دەستدرێژییەکیانەوە بووبێ لەکاتی ئەنجامدانی خزمەتەکانیان".

## لقی دووەم:
## بەرپرسیاریتی لە کاری ئەویتر ئەگەر ئاژەڵ بێ

بنەما گشتیەکانی ئەم دابەشکردنە:

١- بەرپرسیاریتی لە زیانەکانی حەیوان دەخوازێ هەڵەی راستەقینەی بەرپرسەکەی بەهەردوو رەگەزە ماددی و مەعنەویەکەوە تێدا بێ، لەبەرئەوەی ئەسڵ نابەرپرسبوونە.

٢- ئەو ئەویترەی ئاژەڵە لە هەموو بارەکاندا نە لەرووی جینائی و نە لەرووی مەدەنیەوە پرسیاری لێناکرێ، لەبەرئەوەی ئاژەڵ هی ئەوە نیە شیانی واجببوونی هەبێ (بۆ ئەوە بشێ مافەکان بەدەست بێنێت و تۆباڵی کارە زیانبەخشەکان بگرێتە ئەستۆ).

٣- بنچینەی بەرپرسیاریتی لە زیانەکانی ئاژەڵ موڵکایەتییە ئەگەر خاوەنی بوو، یان گرێبەندە ئەگەر هۆی پابەندیەکە گرێبەند بوو.

٤- هەڵەیەکی شایع لە یاسا وەزعیەکاندا ئەوەیە بەرپرسیاریتی لە زیانەکانی حەیوان دەکرێتە هاوبەشکە بۆ بەرپرسیاریتی کارە زیانبەخشە کەسیەکان، لەبەرئەوەی کاری زیانبەخشی کەسی یان کردنە وەك تەلەفکردنی ماڵی کەسیتر یان داگیرکردنی یان دزینی یان هیتر، یان نەکردنە، وەك خەمساردی لە وەرگرتنی وریایی و گرتنەبەری رێوشوێنی خۆپارێزی بۆ رێگرتن لەو حەیوانەی وا ناسراوە لەرووی جەستەیی یان ماددیەوە زیان بە خەڵك دەگەیەنێ. کردن و خۆلادان لە ئەنجامدانی ئەرك و پشتگوێخستن و کەمتەرخەمی هەموو کاری شەخسین، بۆیە ئەسڵ وابوو بابەتەکە (بەرپرسیاریتی لە کارەکانی ئاژەڵی زیانبەخش) لەژێر ناونیشانی (کارە کەسیەکان)دا چارەسەر بکرێ، ئیتر پشتگوێخستن و نەگرتنەبەری رێوشوێنی خۆپارێزی و چاکسازی بۆ بینایەك کە

ڕووبەڕووی مەترسیی داتەپینی تەواوەتی یان بەشەکی دەبێتەوە و هەڕەشەی مەترسی و زیان بە ئەویتر دەگەیەنێ، لەسەر ئەوە قیاس بکە.

دیراسەکردنی زیانەکانی حەیوان و بێگیان لەژێر ناونیشانی (بەرپرسیارێتی لە کاری کەسیتر) هەڵەیەکی زەق و ڕوونە، لەبەرئەوەی بەرپرسیارێتی لە کاری کەسیتر لەژێر ئەم ناونیشانانەدا چارەسەر ناکرێ مەگەر لەو حاڵەتەدا نەبێ کە ئەو کەسیترە مرۆڤێکی ناکام یان عەقڵ لاواز یان جەستە لاواز بێ وەك لە شێوەی ڕیقابەدا.

٥- مرۆڤ بەرپرس نابێ لە زیانەکانی حەیوانی ئاسایی کە بە زیانبەخش نەناسراوە، یان بۆ نموونە چاوەڕوان دەکرا بچێتە ناو کێڵگە یان باخێك، مەبەست لە ڕێسای (جنایە العجماو جبار) واتە بەفیڕۆدانە، ئەمەیە و لەکاتی لەوەڕاندندا زیانی پێ بگەیەنێ.

## لقی سێیەم:
## بەرپرسیاریتی لە کاری ئەویتر ئەگەر بێگیان بێ

هەموو ئەو بنەما گشتی و تێبینیانەی سەبارەت بە بەرپرسیاریتی لە کاری کەسیتر ئەگەر ئەو کەسە ئاژەڵ بوو خستنمانە روو، لێرەیشدا هەن. لە هەڵە شایعەکان لە یاسا وەزعیەکاندا دیراسەکردنی ئەو بەرپرسیاریتیەیە لەژێر ناونیشانی بەرپرسیاریتی لە کەسیتردا، لەبەرئەوەی شوێنی چارەسەرکردنی رەگەز و حوکمەکانی زیانەکانی بێگیان یان حەیوان ناونیشانی بەرپرسیاریتییە لە کارە کەسیەکان.

بەرپرسیاریتیی رووداو و زیانەکانی هاتوچۆ وشکانی و دەریایی و ئاسمانی و تەلدار و بێتەلەکان بۆ ئەوانەی لە بەردەوامیی چاککردنەوە و پشکنینیان بەر لە بەرکارهێنانیان و دڵنیابوون لەوەی هیچ کێشەیەکیان نیە، بەرپرسن، هەروەها بەرپرسیاریتیی بەڵێندەر یان ئەندازیاری تەلارساز لە دڵنیابوون لە گونجاویی یەکەی نیشتەجێبوون، بەرپرسیاریتیی خاوەنی ئەو باڵەخانەیەی مەترسیی روخانی گشتی یان بەشەکی بۆ سەر کەسیتر هەیە و پابەندبوونی بە چاککردنی و گرتنەبەری هەموو رێوشوێنێکی خۆپارێزیی پێویست بۆ رێگرتن لە رووداني مەترسی، هەر هەموو ئەمانە بەرپرسیاریتین لە کارە کەسیەکان، هەڵەیەکی شایعە کە یاسا وەزعیەکان ئەمە لەژێر ناونیشانی بەرپرسیاریتی لە کاری ئەویتردا چارەسەر دەکەن[1].

---

[1] وەك لە یاسای مەدەنیی عێراقی مادەکانی (٢٢١–٢٣٢)، میسری (١٧٦–١٧٨)، ئوردنی (٢٨٩–٢٩٥)، لوبنانی (١٢٩–١٣٣)، یەمەنی (٣١٩–٣٢١)، سوری (١٧٤–١٧٩)، کوێتی (٢٤٢–٢٥٤)، بەم شێوەیە باقیی یاسا مەدەنییە عەرەبیەکان کەوتونەتە ناو ئەم هەڵە روونە و بەرپرسیاریتی لە زیانەکانی ئاژەڵ و بێگیانیان لەژێر ناونیشانی (بەرپرسیاریتی لە کاری ئەویتر)دا چارەسەر کردوە، لەکاتێکدا ئەوانە بەرپرسیاریتین لە کاری کەسی.

پاشان هەموو ڕووداوێك کە لە ئاژەڵ یان بێگیان بقەومێ بە ناڕەوا وەسف ناکرێ، لەبەرئەوە دەستەواژەی (ناڕەوابوون) بۆ ڕووداوێك بەکار دێ کە بکرێ بە ڕەوابوون وەسف بکرێ، لەبەرئەوەی بەرانبەرکردنیان لە ڕووی فەلسەفیەوە بەرانبەر بە نەبوون و شاژن (العدم و الملكة)یە[1] وەك کوێری کە تەنها ئەوەی پێ وەسف دەکرێ کە بکرێ چاوی هەبێ، نەزانی بەکارنایەت بۆ کەسێك نەبێ توانای زانین و فێربوونی هەبێ، بۆیە ناوترێ ئەم دیوارە کوێرە، یان ئەو بەردە نەزانە.

لە هەموو ئەو بارانەی باسمان کرد کە پەیوەندی بە داوای قەرەبووکردنەوەی زیانەوە هەیە، بە تێپەڕینی سێ ساڵ بەسەر ئەو کاتەی بە زیانەکە و بە لایەنی بەرپرس لێی دەزانرێ، دەعواکە دەکەوێ.

لە هەموو بارەکاندا داواکە بە تێپەڕینی پازدە ساڵ لە ڕوودانی زیانەکەوە دەکەوێ.

**ئەنجامگیری:**

هەرکەس بەقووڵی و بەوردی سەرنج بداتە دەقەکانی یاسا مەدەنییە هاوچەرخەکان و لەوەدا ترازووی لۆژیك و پێوەری فەلسەفی بەکار بێنێ بۆ زانینی چۆنێتیی چارەسەرکردنی ئەوەی پێی دەوترێ سەرچاوەی دووەم (ویستی تاکلایەنە) و سێیەم (کاری ناڕەوا یان کردەوەی زیانبەخش) و چوارەم (بەدەستهێنان بەبێ هۆ یان زەنگینبوون بەبێ هۆ یان کردەوەی سوودبەخش) بەجیاوازی لە دەربڕیندا، لە زۆربەیاندا دژیەکی و شپرزی و زیاد و کەمی بەرچاو دەکەوێ، ئەمانەی خوارەوە چەند نموونەیەکن لەوانە:

**یەکەم**– ئەو سێ سەرچاوەیەی پابەندی لە ڕاستیدا هۆی پابەندین، ئەوەیشمان بە بەڵگەی عەقڵی و لۆژیکی و نەقڵی سەلماند.

**دووەم**– نزیکەی ٨٠٪ی هۆکان (یان وەك دەوترێ سەرچاوە)ی پابەندییە مەدەنی و جینائیەکان، لە سەرجەم یاساکانی وڵاتانی دنیادا، گوفتار و کرداری

[1] المصطلح الفلسفي عند العرب، للدكتور عبدالأمير الأعسم، ص٣٧٩.

تاکەکەسین جا چ ئیرادی بن یان نائیرادی، هەموویشیان دەچنە ژێر ناونیشـانی (ویستی تاکلایەنە) یان (رەفتاری تاکەکەسی).

هەروەها ٢٠٪ی پابەندیەکان هۆکانیان یان سەرچاوەکانیان بەیەکگەیشتنی دوو ئیرادە یان زیاترە بەشێوەیەك یاسا ئەسەرێکی لیٚ بخاتەوە، وەك گرێبەنـدەکان بەهەموو جۆرەکانیانەوە و رێکەوتنامە و پەیماننامەکان و ئەو جۆرە شتانە.

سەرەڕای ئەم رۆڵە گرنگەی ویسـتی تاکلایەنـە، یاسـا عەرەبیـەکان گرنگیـەکی ئەوتۆیان پیٚ نەداوە، بگرە لە هەندیٚ یاسادا بە یەك مادده و یەك نموونە لەکۆڵ کراوەتەوە، ئەویش گفتدانە بە خەڵات وەك لە یاسای مەدەنیی میسری[1]، یـان بە دوو مادده[2]، یان بـە چـەند ماددەیـەکی زۆر کـەم کـە لەگـەڵ بایەخەکەیـدا ناگونجیٚ وەك مەدەنیی ئـوردنی[3] و یەمـەنی[4]. بـاقیی یاسـا عەرەبیـەکان لـە بایەخنەدانیان بە ویستی تاکلایەنە هەمان شتیان کردوە.

سێیەم– بەرپرسیاریٚتی لە کاری نارەوا[5] دابەش کراوە بۆ بەرپرسیاریٚتی لە کـارە کەسیەکان و بەرپرسیاریٚتی لە ئەویتر[6]. پاشان ئەم ئەویترە دابەش کـراوە بـۆ مرۆڤ و حەیوان و بێگیـان، لەکاتێکدا بەرپرسـیاریٚتی لـە کـارە زیانبەخشـەکانی حەیوان و بێگیان دەچێتە ژێـر خانـەی کـارە کەسـیەکان نـەك کـاری ئـەویتر، لەبەرئەوەی کارەکانی جگە لـە مـرۆڤ، وەك وتمـان، نـە بـە رەوابـوون و نـە بـە رەوانەبوون وەسف ناکریٚن.

---

[1] ژمارە (٣١)ی ساڵی ١٩٤٨، مادەی (١٦٢).

[2] وەك لە مەدەنیی عێراقی ژمارە (٤٠)ی ساڵی ١٩٥١، هەردوو مادەی (١٨٤–١٨٥).

[3] ژمارە (٤٣)ی ساڵی ١٩٧٦، مادەکانی (٢٥٠–٢٥٥).

[4] ژمارە (١٩)ی ساڵی ١٩٩٢، مادەکانی (٣٠٤–٣٠٦).

[5] وەك لە مەدەنیی عێراقی، فەسڵی سێیەم مادەی (١٨٦) و پاشتر.

[6] مادەی (٢١٨) و پاشتر.

**چوارەم**– كاري سوودبەخش[1]دابەش كراوە بۆ كاري ناڕەوا (وەرگرتني ناشايستە) و كاري ڕەوا (فوزاله)، كە ئەمە لە بابەتي دابەشكردني شتە بۆ خۆي و جيا لە خۆي، ئەمەيش بەتاڵە و مەنتيقي ياسايي ڕەتي دەكاتەوە.

**پێنجەم**: كاري ناڕەوا (زەنگينبوون بەبێ هۆ)[2] كە كارێكي ناڕەوايە دابەش كراوە بۆ كاري ناڕەوا (داني ناشايستە)[3] و كاري ڕەوا (فوزالە)[4]، ئەمەيش لە بابەتي دابەشكردني شتە بۆ خۆي و جيا لە خۆي، لەبەرئەوەي هاوبەشكەي هەموو شتێك لە هاوبەشكەكەيتر جياوازە، كە ئەوەيش لەڕووي لۆژيكي و عەقڵيەوە ڕەتكراوەيە.

**شەشەم**– لە زيانگەياندن بە ئەويتردا، نە بەئەنقەستكردن (التعمد) و نە دەستدرێژي (التعدي) نەكراوەتە مەرج ئەگەر ڕاستەوخۆ بوو، وەك لە ياساي مەدەني ئوردني مادەي (٢٥٧)دا كە دەڵێ:

(١– زيانگەياندن بە ڕاستەوخۆ دەبێ يان بە بوونە بايس.

٢– ئەگەر ڕاستەوخۆ بوو دەستەبەري پێويست دەكات و مەرجي نيە، ئەگەر بە بوونە بايسيش ڕوويدا دەستدرێژي يان بەئەنقەستكردن مەرجە، يان ئەوەي كردەوەكە سەربكێشێ بۆ زيان).

ئەمەيش دەخوازێ زيانگەياندني ڕاستەوخۆ بە خەڵك لە دۆخي بەرگريكردني شەرعي يان بەجێهێناني ئەرك يان بەكارهێناني ماف، دەستەبەر و قەرەبووكردنەوە واجب بكەن سەرباري نەبووني (تعمد) و (تعدى) لەو حاڵەتانەدا، ئەمەيش لەتەك كۆدەنگيي ياساكاني دەوڵەتاني جيهاندا جياوازە، لەبەرئەوەي هەريەكێك لەو حاڵەتانەي باس كران لە هۆكاني ئيباحەن كە

---

[1] وەك لە فەسڵي چوارەمي ياساي مەدەنيي ئوردني (م/٢٩٢–٢٩٥).

[2] وەك لە فەسڵي چوارەمي ياساي مەدەنيي ميسري مادەي (١٧٩–١٨٠).

[3] مادەي (١٨٨) و پاشتر.

[4] مادەي (١٨٨) و پاشتر.

بەرپرسیارێتیی مەدەنی و جینائی لە هەر کارێکی زیانبەخش کە لە خودی خۆیدا ناڕەوایە دوور دەخەنەوە، ئەمەیش هەڵەیەکی زەق و پێچەوانەی مەنتیقی یاسایی و کۆدەنگیی یاساکانە لە دنیادا.

**حەوتەم**– یاسا هاوچەرخەکان لە جیهانی عەرەبی مافیان داوەتە شوێنکەوتوو تا بگەڕێتەوە سەر شوێنکەوتەکەی[1] و ئەو قەرەبووەی بۆی داوە لێی وەربگرێتەوە، ئەمەیش هەڵەیەکە پێچەوانەی مەنتیقی یاساییە و لەسەر تێکەڵکردن لەنێوان بەرپرسیارێتی لەسەر بناغەی هەڵەی گریمانەکراو و بەرپرسیارێتی بەپێی ڕێسای (ڕەنج بە گەنج) لەلایەك و لەنێوان بەرپرسیارێتی لەسەر بناغەی چاودێریکردن و بەرپرسیارێتی لەسەر بناغەی شوێنکەوتەیی لەلایەکیتر دامەزراوە، کە لە حاڵەتی یەکەمدا باسی گەڕانەوە هاتووە بۆ سەر ئەو کەسەی قەرەبووی ئەو زیانەی بۆ کراوە کە داویەتی، بەڵام حاڵەتی دووەم وانیە، ئەویش لەبەر جیاوازیی سروشتی هەردوو بناغەکە و ئەو بەرپرسیارێتی لە زیانەی لەسەری بنیات دەنرێ.

**هەشتەم**– یاسا عەرەبییە هاوچەرخەکان و شەرحەکانیان هەڵەی گریمانەکراو – وەك ڕەگەزێك لە ڕەگەزەکانی بەرپرسیارێتیی کەمتەرخەمییان، لەگەڵ ڕێسای (ڕەنج بە گەنج) لە بەرپرسیارێتیی خاوەنی دامەزراوە ئابوورییەکان و کرێکارەکانیان لە حاڵەتی زیانپێکەوتنیان، تێکەڵ کردوە.

**نۆیەم**– تێکەڵکردن لەنێوان سزای جینائی و سزای مەدەنیی کەسی بەرپرس لە چاودێریکردن ئەگەر پابەندییەکەی لە چاودێریکردن تێکدا، کە پابەند کراوە بە قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانەی لەدەست ئەوەی لەژێر چاودێریی ئەودایە

---

[1] وەك لە مەدەنیی عێراقی (م/٢٢٣)، مەدەنیی میسری (م/١٧٥)، سوری (م/١٧٦)، لیبی (م/٣١٨) و یاساکانیتری وڵاتانیتری عەرەبی.

دەقـەومیّ[1]. ئەمـەیش پێچـەوانەی ئـەو یاسـا جینائیانەیـە کـە چارەسـەری حوکمەکانی نەوجـەوانانیان کـردوە لـە چوارچێوەی یاسـای سـزاکاندا یـان بـە یاسایەکی تایبـەت وەك لـە یاسـای چـاودێریکردنی نەوجـەوانانی عێراقـی[2] کـە سزای ئـەو کەسـەی بـە ئـەرکی چـاودێریکردنی خـۆی هەڵنەسـاوە سـزادان بـە غەرامـەکردن[3] یـان بەندکردنـە[4] ئەگـەر ئـەم سـزایە واجبکـەرێکی هـەبێ کـە بارتەقای قەبارەکەی بێ.

بەڵام سزای مـەدەنی لـە مـاڵی ناکامەکـە دەبـێ ئەگـەر هـەیبوو، ئـەگینا دەبـێ چاودێرەکە بیـدات و پاشـتر مـافی ئـەوەی هەیـە بگەڕێتـەوە سـەر ناکامەکـە و ئەوەی بۆی داوە لێی وەربگرێتەوە.

**دەیەم**– گرنگە چاو بە یاسا مەدەنییە عەرەبیەکاندا بخشێنرێتەوە تا لەبەر تیشکی مـەنتیق و پێـوەرە فەلسـەفیەکاندا ئـەو هەڵـە شـکڵی و بابەتیانـەی تێیانـدان چارەسەر بکرێن، بۆ ئەوەی ویستی تاکلایەنە رۆڵی خۆی لە هۆبوونی پابەندیدا پێبدرێ کە هەندێ لە زانایانی یاسا گومانیان پیشان داوە لەوەی هیچ رۆڵێکی لە دروستکردنی پابەندیدا هەبێ، ئەوەتا ئەوەی پێی دەوترێ تیۆری فەرەنسی بۆ ئەوە چووە کە ویستی تاکلایەنە ناتوانێ هیچ پابەندیـەك دروسـت بکـات و ئـەو

---

[1] وەك مەدەنیی عێراقی کە لە مادەی (١/٢١٨)یدا دەڵێ: (باوك ئەنجا باپیر مولزەمن بە قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانەی منداڵ دەیقەومێنێ". هەروەها لەوانە یاسای مەدەنیی میسری کە لە مادەی (١٧٣)دا دەڵێ: (هەر کەسێك بەپێی یاسا یاخود رێکەوتن لەسەری بێ چاودێریی کەسێك بکا کە بەهۆی ناکامی یان بەهۆی باری عەقڵی یان جەستەییەوە پێویستی بە چاودێریکردن بێ، مولزەم دەبێ بە قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانەی ئەو کەسە بە کارە نارەواکەی بە کەسیتری دەگەیەنێ).

[2] ژمارە (٧٦)ی ساڵی ١٩٨٣ی هەموارکراو لە فەسڵی سێیەم لەژێر ناونیشانی: بەرپرسیارێتیی بەخێوکەران (مسؤولية الأولياء)دا.

[3] وەك لە مادەی (٢٩).

[4] وەك لە مادەی (٣٠).

پابەندیەی لە کارێکی یاسایی پەیدا دەبێ سەرچاوەکەی سازانی هەردوو ئیرادەکەیە، وەك پێشتر باسمان کرد.

شایانی باسە ئەو دژیەکی و شپرزیەی لە یاسا مەدەنییە عەرەبیەکاندا هەیە و ئاماژەمان بە هەندێکیان کرد، زادەی تێکەڵکردنی رەفتارە یاساییەکان و رووداوە یاساییەکان و حەسرکردنی یەکەمیانە لە گرێبەند و ویستی تاکلایەنە و دانانی سەرجەم کارە یاساییە ئیرادی و نائیرادیەکانە لە خانەی رووداوە یاساییەکاندا (الوقائع القانونیة).

# بەشی نۆیەم

## ڕووداوە سروشتیەکان و
## پابەندییە پاسایییەکان

سروشتی ئەم بابەتە لەڕووی لۆژیکیەوە دەخوازێ دیراسەکردنی وەك فۆرم بەسەر پێنج باسدا دابەش بکرێ، لە باسی یەکەمدا بابەتەکە دەناسێنین، لە دووەمدا ڕووداوە سروشتیەکان و پابەندییە خێزانیەکان، لە سێیەمدا ڕووداوە سروشتیەکان و پابەندییە مەدەنیەکان، لە چوارەمدا ڕووداوە سروشتیەکان و پابەندییە جینائیەکان، لە پێنجەمیشدا ڕووداوە سروشتیەکان و پابەندییە نێودەوڵەتیەکان باس دەکەین.

# باسی یەکەم:
# ناساندنی بابەتەکە

رووداو (الواقعـة): رووداو (یـان قەوماو)ێکـە پەیـدا بـووە دوای ئـەوەی نـەبوو، بەڕەهاییش لە لەفزی شت (الشيء) تایبەتترە کە هەبوو و نەبوو (الموجود والمعدوم) دەگرێتەوە، لەڕووی فەلسەفیەوە پێناسە دەکرێ بـەوەی: هـەر شـتێکە کـە بکـرێ بزانرێ و هەواڵی لەبارەوە بدرێ، واتە (مرۆڤ) بەدوای کاروبارەکانیدا بگەڕێ.

شـت رەگـەزێکی باڵایـە کـە رەگـەزێکیتری لەبانـەوە نیـە، دوو رەگـەزی ناوەنـد لەژێردان، کە بریتین لە (هەبوو) و (نەبوو).

هـەبوو کـاری رەوا و کـاری نـاڕەوا دەگرێتـەوە، هەردووکیشـیان دوو جۆریـان لەژێردایە: رەفتار (التصرف) و رووداو (الواقعة). رەفتار: گوفتار و کردار دەگرێتەوە. رووداویش: رووداوی یاسایی و رووداوی سروشتی دەگرێتەوە.

**١- رووداوی سروشتی لە بواری یاسادا:**

هەموو رووداوێکە ئیرادەی مرۆڤ دەستێکی راستەوخۆی لە روودانیدا نەبێ، بـەڵکو خواکرد بێ، وەك ژیـان و مردنـی گیانلەبـەران، بومەلـەرزە و گـەردەلولی ئاسـمـانی و گەردەلولی خۆڵین و باقیی بێگانەکان.

ئەم جۆرە رووداوە بابەتی باسەکەی ئێمەیـە، لـەو رووەوە لـە هۆکـانی پابەنـدیی مرۆڤە.

**٢- رووداوی یاسایی:**

هەموو رووداوێکـە مـرۆڤ بەشـێوەیەکی راسـتەوخۆ یـان ناڕاسـتەوخۆ رۆڵێکـی لـە روودانیدا هەبێ، جا چ رۆڵێکی ئیرادیی نائازاد بێ وەك ئەو کارانەی مرۆڤی باڵق و ژێـر

لەژێر فشاری زۆرلێکردن یان زەرورەتدا دەیانکات، یان نـائیرادی رەهـا بـێ وەك ئـەو کارانەی شێت و مێردمنداڵی نەفام و ئەوانەی حوکمی ئەوانیان هەیە دەیانکەن.

مەبەست لە نائیرادی ئەوەیە بکەری کارەکە لەکاتی کردنیدا ناتوانێ ئەنجامەکانی کردەوەکەی لە رووی خێر یان شەڕ، چاك یان خراپەوە هەڵبسەنگێنێ.

پێشتر روونمان کردەوە زانایانی یاسا سەرکەوتوو نـەبوون لـە دانـانی پێـوەرێکی لـۆژیکی بـۆ لێـك جیاکردنـەوەی رەفتـاری یاسـایی و رووداوی یاسـایی و پێناسـەی رەفتاری یاساییان کردوە بەوەی، رووکردنی ئیرادەیە بەرەو قەوماندنی ئەسەرێك کە یاسا حسابی بۆ دەکا، واتە ماف و پابەندی لێ دەخاتەوە.

ئەم رەفتـارە یاسـاییەیان لـە رەفتـارە گوفتاریەکانـدا کـورت کـردەوە، هـەروەك رەفتاری گوفتاریشیان لە گرێبەند و ویستێ تاکلایەنەدا کورت کردەوە و باقیی گوفتار و کردارە ئیرادی و نائیرادیەکانی مرۆڤیان بە رووداوی یاسایی (یان رووداوی مـاددی) داناوە.

پێشتر خەوشەکانی ئەم پێوەرەمان روون کردەوە، بەڵام لەبەر گرنگیـی پێـوەرە مەنتیقیەکان لە جیاکردنەوەی رەفتاری یاسایی و رووداوی یاسایی، لێرەدا بابەتەکـە بەروونتر و گشتگیرتر دووبارە دەکەینەوە:

**رەفتاری یاسایی**: هەموو قسە یان کردەوەیەکە لە مرۆڤێکی باڵقی ژیری هەڵبژێر و بەهۆشـەوە دەربچـێ، بەشـێوەیەك یاسـا ئەسـەرێکی لـە مـاف و پابەنـدی لەسـەر دابمەزرێنێ.

**لە روانگەی ئەم پێناسەیەوە بۆ بەدیهاتنی رەفتاری یاسایی مەرجە ئەم شەش رەگەزە هەبن:**

١- رووداوەکە (الحدث)، جا قسە بێ یان کردەوە لە مرۆڤەوە روویدات، هەرچی لە سروشتەوە روویدات لە گەردەلول و لافـاو و بومەلـەرزە و ئـەو شـتانە، یـان لـە ئاژەڵەوە وەك ئازارگەیاندن بە مرۆڤ لەرووی جەستەییەوە یان لەناوبردنی ماڵێك و ئەو جۆرە شتانە، (واقیعە)یە.

٢- لە مرۆڤێکی باڵق یان بەفامەوە بێ، هەر قسە و کردارێك لە نەفام بوەشێتەوە (واقیعە)یە.

٣- لە کەسێکی باڵقی ژیرەوە بێ، هەرچی لە شێت و ئەوەی حوکی شێتی هەیە بوەشێتەوە (واقیعە)یە.

٤- لە مرۆڤێکی باڵقی ژیری هەڵبـژێرەوە بێ، هەرچی لە زۆرلێکراو یان ناچار بوەشێتەوە (واقیعە)یە.

٥- لە مرۆڤێکی باڵقی ژیری هەڵبژێری بەهۆشەوە بێ، هەرچی لە کەسی خەوتوو، یان بێئاگا ،یان سەهوکەر، یان لەهۆش خۆچوو، یان سەرخۆشی عەقڵ وەستاو و ئەو جۆرانە بوەشێتەوە (واقیعە)یە.

٦- بەجۆرێك بێ بکرێ یاسا ئەسەرێکی مەدەنی لەسەر بینا بکا وەك ماف و پابەندییە مەدەنیەکان، یان ئەسەرێکی سزایی وەك لێپرسینەوەی تاوانکاری و سزایی، لەم روانگەیشەوە هەرچی لە مرۆڤ دەوەشێتەوە لە موجامەلەکردن و لێکخشانی کۆمەڵایەتی و جموجوڵ و ئەو شتانە کە یاسا هیچ ئەسەرێکیان لە ماف و پابەندی لەسەر دانامەزرێنێ، (واقیعە)ن، بەڵام ملکەچی رێکخستنی یاسایی نین.

ئەوەی لەم باسەدا بەلامانەوە گرنگە لێکۆڵینەوەیە لەو رووداو (واقیعە) سروشتیەی کە پەیوەندی بە مرۆڤەوە هەیە بەشێوەیەك یاسا ئەسەرێکی لە ماف و پابەندی لەسەر بینا بکا.

هەرچی ئەو پابەندی و مافانەن کە لە رووداوە یاساییەکان دەکەونەوە، پێشتر بەدرێژی لە سێ باسەکەی پێشوودا لێیان کۆڵینەوە.

# باسی دووەم:
# ڕووداوی سروشتی و پابەندییە خێزانیەكان

مەبەست لە پابەندییە خێزانیەكان ئەو پابەندیانەن لە ڕووداوێكی سروشتی دەكەونەوە، لە كەسێكدا ئەندامی خێزانێك بێ، جا ئیتر پێگە كۆمەڵایەتیەكەی هەرچی بێ.

هەوڵ دەدەین لەم باسەدا چەند نموونەیك لەو پابەندیانە باس بكەین، لەوانە:

**یەكەم- ڕووداوی لەدایكبوون:**

ئەگەرچی مرۆڤ ڕۆڵێكی ناڕاستەوخۆی لە لەدایكبووندا هەیە، وەك لە جووتبوونی ژن و مێرد كە بەهۆیەوە سپێرمی پیاو و هێلكۆكەی مێ بەیەك دەگەن و ڕۆڵی دایك لە پاراستنی كۆرپەلەكە تا لەدایكبوونی، بەڵام لەدایكبوونی كۆرپەلە بەزیندوویی لە كاتێكی دیاریكراودا شتێكە بەدەست ئیرادەی ڕووتی خودایە كە خولقێنەری ڕاستەقینەی هەموو مرۆڤێكە، لەبەرئەوە لەدایكبوون بە ڕووداوێكی سروشتی دادەنرێ.

ئاشكرایە لەدایكبوون هۆیەكە بۆ پابەندییە هاوبەرانبەرەكانی نێوان بنەچە و وەچەكان لە ڕۆڵی جیاوازدا، وەك خوارەوە:

أ- پابەندبوونی دایك بەشیردان بە منداڵە تازەبووەكەی بۆ ماوەی دوو ساڵ ئەگەر عوزرێكی ڕەوای نەبوو.

ب- پابەندبوونی باب بە خەرجیكێشانی شیردەر و دایەن پاش جیابوونەوە یان مردن. بەڵام لە باری بەردەوامیی هاوسەریدا هۆی خەرجیكێشان هاوسەرییە.

ج– پابەندبوونی واریسی منداڵ بەو خەرجییە لە ماڵی خۆی لە حاڵەتی مردنی باوك، یان کاتێك باوکەکە دەستکورت بێ و توانای ژیاندنی نەبێ.

د– پابەندبوونی باوك و دایك بە زیان نەگەیاندن بە یەکتر لەڕێی منداڵەکەوە.

سەرچاوەی ئەك پابەندیانە قورئانە وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ وَعلَى الْمَوْلُودِ لَهُ[1] رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ لاَ تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلاَّ وُسْعَهَا لاَ تُضَآرَّ وَالِدَةٌ بِوَلَدِهَا وَلاَ مَوْلُودٌ لَّهُ بِوَلَدِهِ وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالاً عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا وَإِنْ أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُواْ أَوْلاَدَكُمْ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُم مَّا آتَيْتُم بِالْمَعْرُوفِ وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾[2].

ئەم ئایەتە کە سەرچاوەی ئەو پابەندیانەی سەرەوەن کە هۆکانیان رووداوی سروشتییە (لەدایکبوون)، ئاماژەیە بۆ شازدە حوکم، هەشتیان بەڕاشکاوی دەربڕاون، هەشتیشیان بە ئاماژە، ئاماژەیان بۆ کراوە:

**أ– ئەو حوکمانەی بەڕاشکاوی دەربڕاون:**

١– دایکان پابەند دەبن شیردان بە منداڵەکانیان ئەگەر عوزرێکی رەوایان نەبوو.

٢– ماوەی شیردان دوو ساڵی تەواوە.

٣– باوکی کۆرپە پابەند دەبێ بە دابینکردنی خەرجی شیردەر لە شیرخانە و دایەن لە دایەنخانە جا چ دایك بێ پاش لێك جیابوونەوە بە تەڵاق یان مردن، یان کەسیتر.

٤– پابەندبوونەکە، لە سنووری توانای ماڵیدا، بە چاکە دەبێ ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا﴾.

---

[1] واتە باوك، پیتی لام (لە) راستیەکە لە موڵکایەتیدایە، لەبەرئەوەی ئەم راستەقینەیە مەحاڵە لەو رووەوە مرۆڤ ناکرێ ببێتە موڵك، بەنزیکترین مانا لە موڵکایەتی وەرگیراوە ئەویش نەسەبە.

[2] سورة البقرة/٢٣٣.

٥- دایك و باب پابەند دەبن بەوەی کەسیان بەهۆی منداڵەکەیانەوە زیان بەویتر نەگەیەنێ، دایکەکە پابەند دەبێ بەوەی لەبەر زیانگەیاندن بە باوکەکە رەتینەکاتەوە شیر بە منداڵەکە بدات، باوکەکەیش پابەند دەبێ بەوەی لەپێناو زیانگەیاندن بە دایکەکە، رێی لێنەگرێ شیر بە منداڵەکەی بدات.

٦- ئەگەر باوکی منداڵەکە مرد یان دەستکورت بوو و نەیدەتوانی خەرجی شیردەر یان دایەن بدات، واریسی منداڵەکە پابەند دەبێ بەوەی لەباتیی باوکی ئەو خەرجییە بدات، ، واتە لەسەر واریسی منداڵ، لەبەرئەوەی میراتگری منداڵەکەیە، بەوە قورئان خەرجکردن (انفاق)ی بە میراتەوە بەستەوە.

٧- دروستە باوك و دایك بەرەزامەندیی هەردوولا لەسەر کۆتاهێنان بە شیرپێدانی منداڵ بەر لە تەواوبوونی دوو ساڵەکە رێك بکەون، بەو مەرجەی زیان بە تەندروستیی منداڵەکە نەگەیەنێ.

٨- دروستە شیردەر کەسێکیتر بێ جگە لە دایك لە حاڵەتی مردن یان نەبوونی توانای شیردانیدا. لەم بارەدا باوك هەمان پابەندی کە بەرانبەر دایك هەیەتی بەرانبەر ئەو شیردەرەیش دەیبێ.

**ب- ئەو حوکمانەی بە ئاماژە ئاماژەیان بۆ کراوە:**

١- نەسەبی منداڵ بۆ باوکی دەبێ، لەبەرئەوەی پیتی (ل) لە (المولود لە) راستیەکە لە بابەتی موڵکایەتیدایە، مرۆڤیش ناکرێتە موڵك، واتە مانا راستەقینەکەی مەحاڵە، ئەگەر راستەقینە مەحاڵ بوو بە مەجاز وەردەگیرێ[1]، نزیکترین مانایش لە مانا راستەقینەکە نەسەبە.

٢- لە بەرانبەر ئەوەی نەسەبی وەپاڵ ئەو دەدرێ، باوك تا لە ژیاندا بێ و توانای ماڵی هەبێ بەتەنها خەرجیی منداڵ دەکێشێ، ئەویش لەسەر بناغەی رێسای (رەنج بە گەنج).

---

[1] گۆڤاری: الأحکام العدلیة، مادەی (٦١).

٣- شیری دایك بەچاکتر دەزانرێ لەبەرئەوەی هەم لەڕووی تەندروستیەوە باشتر و هەمیش لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە، واتە لەڕووی سۆز و بەزەییەوە، لەپێشترە، چونکە ئەو منداڵەی لەکاتی شیرداندا چێژ لە سۆز و بەزەیی دایکی وەردەگرێ، لێیەوە سۆز و بەزەیی بەرانبەر کەسانیتر فێر دەبێ، کاتێ پاشتر لە ژیانیدا لەگەڵیان تێکەڵ دەبێ.

٤- تەنها باوك مافی ڕەفتارکردن بە ماڵی منداڵەکەی هەیە لەبەرانبەر ئەوەی هەر ئەوە خەرجی دەکێشێ، ئەویش لەسەر بناغەی ڕێسای (ڕەنج بە گەنج).

٥- ئەگەر باوك منداڵی خۆی کوشت کوشتنێك قیساسی واجب دەبوو، ناکوژرێتەوە بەڵام لەباتیی ئەوە سزایەکی تەمبێکارانە دەدرێ وەك بەندکردن، لەبەرئەوەی ئەو هۆی بوونی منداڵەکەیە و نابێ بەهۆی کوشتنی ئەوەوە بکوژرێ.

٦- وەك چۆن لەدایکبوون هۆیە بۆ پابەندبوونی باوك بە دابینکردنی خەرجی منداڵەکەی، خزمایەتیش هۆیە بۆ پابەندبوونی واریسی خزم، ئەگەر دارا بوو، بە دابینکردنی خەرجی میراتدەرە نەدارەکەی، لەبەرئەوەی خودا خەرجکردن (الانفاق) بە میراتەوە بەستۆتەوە و دەفەرموێ: ﴿وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ﴾. ئاشکرایە خزمایەتیش ڕووداوێکی سروشتییە.

٧- دایك لە هەموو کەس لەپێشترە بۆ دایەنیکردنی منداڵەکەی پاش جیابوونەوە لە مێردەکەی بە تەڵاق یان مردن، لەبەرئەوەی ئەو زیاتر مافی شیرپێدانی هەیە.

٨- ژنی دەوڵەمەند پابەند دەبێ بە خەرجیکێشانی مێردە هەژارەکەی، لەبەرئەوەی میراتگری مێردەکەیەتی ئەگەر پێش ژنەکە مرد، خوای گەورەیش خەرجکردنی بە میراتەوە بەستۆتەوە ﴿وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ﴾[1].

---

[1] بۆ زانیاری زیاتر لەم بابەتەدا تەماشای ئەك كتێبەمان بكرێ: أصول الفقه في نسيجه الجديد، ٢/٣٩٩ و پاشتر.

جگە لەو پابەندییە دارایانە، دایك و باوك پابەندیی مەعنەویشیان لەسەرە، کە پەروەردەکردنی منداڵە لەڕوی تەندروستی و ڕۆشنبیری و ئەخلاقی و ڕەفتارەوە، سەرچاوەی ئەم پابەندییەیش قورئانە لە چەندین ئایەتدا، لەوانە ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَاراً﴾[1]. مەبەست لە (النار) هەموو سزایەکە لەسەر کارێکی ناڕەوا، خۆپاراستنیش لەوە بە ڕەفتاری ڕاست و دروست دەبێ لەژیاندا.

**ب– لە پابەنیەکانی وەچەکان (الفروع) بەرانبەر بنەچەکان (الاصول) ئەمانەن:**

١– پابەندبوون بە ڕێزگرتنی دایك و باوك و نرخاندنیان، سەرچاوەکەیشی قورئانە لە چەند ئایەتێکدا، لەوانە: ﴿وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْناً وَإِن جَاهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾[2] هەروەها ئایەتی ﴿وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْناً عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ﴾[3]

٢– وەچەکان بەهۆی ویلایەتەوە خۆ دوور دەگرن لە ئازاردانی ماددی یان مەعنەویانەی باوك و دایکیان، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَلاَ تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيماً﴾[4]. خوای گەورە مرۆڤی پابەند کردوە بە خۆ دوورگرتن لە هەر ئازاردانێکی ماددی یان مەعنەویانەی باوك و دایکی یان بنەچەکانی بەشێوەیەکی گشتی، تەنها باسی لای خواری ئازاردانیشی کردوە کە ئۆفکردنە بەدەستیانەوە. بەڵگەنەویستیشە ئازاردان لەوە توندترە و حەرامبوونی لەپێشترە.

---

[1] سورة التحريم/٦.

[2] سورة العنكبوت/٨.

[3] سورة لقمان/١٤.

[4] سورة الإسراء/٢٣.

**دووەم - رووداوی مردن:**

بەڵگەنەویستە ژیان و مردن هەردووك تەنها و تەنها خوا دروستی کردوون و مرۆڤ هیچ دەستێکی تێیاندا نیە. بەم مانایە دوو رووداوی سروشتین، لەبەرئەوەی روونمان کردەوە مەبەست لە (سروشتی) ئەوەیە ئیرادەی مرۆڤ هیچ رۆڵێکی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆی لەروودانیدا نەبێ. وەك چۆن لەدایکبوون هۆیەکی سروشتییە لە هۆکانی ئەو پابەندییانەی لە برگەی (أ)دا باس کران، بەهەمان شێوە مردنیش هۆیەکە بۆ پابەندبوونی میراتگر بە جێبەجێکردنی ئەوەی پەیوەندی بە میراتی مردووەکەوە هەیە ئەگەر هەبوو، ئەگەریش نەبوو لە شتیتردا، لەم پابەندیانە:

١- پابەندبوونی وەرەسە بە گواستنەوەی میراتدەر بۆ دوا مەنزاڵی خۆی و خەرجی ئەوە لە میراتەکەی دەردەکرێ بەر لە دابەشکردنی، لە بارێکیشدا میراتی نەبوو وەرەسەکەی لە باخەڵی خۆیان ئەو ئەرکە دەگرنە ئەستۆ، خۆ ئەگەر وەرەسەی نەبوو یان نەدار بوو، موسڵمانان یاخود دەوڵەت ئەو ئەرکە جێبەجێ دەکا.

٢- وەرەسە پاش دەرکردنی خەرجی گواستنەوەی مردووەکە بۆ دوا مەنزڵی، پابەند دەبن بە جێبەجێکردنی وەسێتەکەی لە میراتی وەسێتکارەکە بەو پێیەی لە ژیانیدا بڕیاری لەسەر داوە، ئەگەر وەسێتی کردبوو.

٣- وەرەسە پابەند دەبن بە دانەوەی قەرزەکانی میراتدەرەکەیان ئەگەر قەرزی لەسەر بوو لەو میراتەی لە دوای بەجێماوە و پابەند نابن بە دانەوەی لە ماڵی تایبەتی خۆیان. ئەگەر دایانەوە ئەوە خۆبەخشی و بەخشینە، لەبەرئەوەی ئەستۆی میراتگر درێژکراوەی ئەستۆی میراتدەرەکەی نیە، هەروەها لەبەرئەوەی لە شەریعەتی ئیسلامیدا پابەندیی میراتگران لە پابەندیی میراتدەر سەربەخۆیە، بەپێچەوانەی فیقهی خۆرئاوایی و ئەو یاسایانەی لەژێر کاریگەریدان کە واریس ناچار دەکەن قەرزەکانی میراتدەرەکەیان بداتەوە ئەگەر میراتەکە بەشی دانەوەی قەرزەکەی نەدەکرد، بەڵام واریس بۆی هەیە لەبەردەم دادگەدا

دەست لە مافی خۆی لە میرات هەڵبگرێ، ئەوکاتە پابەند نابێ بە دانەوەی قەرزی میراتدەرەکەی.

ئەو قەرزانەی پەیوەندییان بە میراتەکەوە هەیە رێگر نابن لە گواستنەوەی ئەو میراتە بۆ وەرەسە، بەڵام رەفتاریان تێیدا کارپێکراو نیە، واتە لەسەر مۆڵەتی قەرزدەر یان دانەوەی قەرزەکان وەستاوە، ئەمەیە مانای رێسای (لا ترکة إلا بعد سداد الدين)، واتە بەهیچ شێوەیەك دەست لە میراتەکە بدرێ تا قەرزەکە نەدرێتەوە، یان قەرزارەکە مۆڵەت بەوە نەدات.

هەندێ کەس[1] ئەم حوکمەیان لەم چەند بەیتەدا هۆنیوەتەوە:

| | |
|---|---|
| والدين لا يمنع من أن يملكا | ورثة الميت ما قد تركـــــا |
| لكن به علق كالمرهــــون | لأنه أحوط للمدفـــــــون |
| فلم يكن تصرف فيه نفـذ | من وارث إذن الغريم ما أخذ |

٤- پابەندبوونی هەر میراتگرێك بەو پشکەی شەرع بۆی دیاری کردوە و دەستنەبردنی بۆ پشکی میراتگرانیتر، وەك ئەو نەریتە دزێوەی لای هەندێ خەڵکی دەستڕۆیشتوو باوە کە دەست بەسەر پشکی مێینەکاندا دەگرن لە کچ و خوشك و ئەوانیتر و لەو بەشەیان بێبەرییان دەکەن کە قورئان و سوننە، بەگوێرەی پلەی خزمایەتی و نزیکییان لە مردووەکە، لە هەموو میراتەکە یان بەشێکیدا بۆی دیاری کردوون، وەك کە لە سەردەمی نەفامیی پێش ئیسلامدا باو بوو.

### سێیەم - نەخۆشیی مەرگ:

یەکێك لە رووداوە سروشتیەکان لە چوارچێوەی خێزاندا نەخۆشیی مەرگە، کە نەخۆش پابەند دەکا لەکاتی نەخۆشیەکەیدا بەشێوەیەك دەست بۆ میراتەکە نەبات زیان بە میراتگرانی بگەیەنێ. هەروەها مێرد پابەند دەکا لە نەخۆشیی مەرگدا

---

[1] شێخ مارفی نۆدی لە کتێبی: قطر العارض.

بەمەبەستی بێبەشکردنی لە میرات ژنەکەی تەلاق نەدات. ئەگەر وای کرد بەپێچەوانەی مەرامە خراپەکەی مامەڵەی لەتەك دەکرێ و ژنە تەلاقدراوەکە پشکی تەواوی خۆی دەبات وەك پێش ئەوەی تەلاق بدرێ. هەروەها پێویستە وەرەسەیش پابەند بن بەوەی لە میراتەکە بێبەشی نەکەن بەبیانوی ئەوەی بەیەکجاری تەلاق دراوە.

**چوارەم - خزمایەتی:**

خزمایەتی کراوەتە هۆیەك بۆ پابەندبوونی خزمی دەوڵەمەند بە نەفەقەکێشانی خزمی هەژاری کە توانای کارکردنی نیە، لە برا و خوشك و منداڵەکانیان، مام و پور (خوشکی دایك و خوشکی باوك) و خاڵ و منداڵەکانیان، لەوانەی میراتگری خزمە هەژارەکەن ئەگەر هاتوو بەر لەوان مرد وماڵێك یان مافێکی لە شوێن بەجێما کە هی ئەوە بوو بە میرات بگوێزرێتەوە.

هۆی ئەو پابەندیانەیش باس کران رووداوە سروشتییە خێزانیەکانن و سەرچاوەیان قورئانی پیرۆزە.

# باسی سێیەم:
# ڕووداوە سروشتیەکان و پابەندییە مەدەنیەکان

ڕووداوە سروشتیەکان لە هۆکانی پابەندییە مەدەنیەکانن لە زۆر مەسەلەدا، لێرەدا تەنها چەند نموونەیەکیان دێنینەوە:

**یەکەم - بەڵای بێئامان:**

بەڵای بێئامان هەر ڕووداوێکە ناتوانرێ پێشبینی بکرێ و ئەگەر لە ڕووداندا بوو بەر بە ڕوودانی بگیرێ.

زانایانی یاسا لە بابی بەرپرسیارێتیی مەدەنی و تاوانکاریدا دەستەواژەکانی بەڵای بێئامان و زۆرلێکردنی ماددی و ڕووداوی لەناکاو و زەرورەتیان بەکار هێناوە. دەبێ پەیوەندیی نێوان ئەم زاراوانە چی بێ؟

بۆچوونەکان سەبارەت بە ڕادەی پەیوەندییان جیاوازن، هەندێ[1] وای بۆ چوون بەڵای بێئامان و ڕووداوی لەناکاو یەك چەمکن واتە هاومانان، ئەمەیش ڕاست نیە، چونکە سەرباری لێکچوونیان لەوەدا هەردووك لە ڕێگرەکانی بەرپرسیارێتیی سزایین، بەڵام لە بەرپرسیارێتیی مەدەنیدا جیاوازن، بەڵای بێئامان ئەگەر ئەو مەرجانەی تێدا بوون باس کران (چاوەڕواننەکراوی و نەتوانینی لادانی) لە هۆکانی ڕێپێدان (ئیباحە) دەبێت و هەردوو بەرپرسیارێتی (جینائی و مەدەنی) ناهێڵێ، لەبەرئەوەی ئیرادە

[1] لەوانە مامۆستا رؤوف عبید، مبادئ القسم العام من التشريع الجنائي، ط ۱۹۷۹، ص٦٠٢.

دەسرێتەوە، بەپێچەوانەی رووداوی لەناکاوی چاوەڕواننەکراو کە ئیرادە ناسرێتەوە بەڵکو کار لە ئازادیی ئیرادە دەکات و کردەوەی تاوانکارانە لە سیفەتە تاوانکارانەکەی دادەماڵێ.

بۆ نموونە ئەو شۆفێرەی بە ئۆتۆمبێلەکەی لە کەسێك دەدات لەپڕ لە رێگەیەکی لابەلایەوە دێتە بەردەمی و خۆ لێلادانی مەحاڵ بووە، لەڕووی جینائیەوە لێی ناپرسرێتەوە، بەڵام ئەگەر هاتوو ئۆتۆمبێلەکەی بەرەو دیواری حەوشەی ماڵێك بادایەوە و رووخاندی، لەڕووی مەدەنیەوە لێی دەپرسرێتەوە و پابەند دەبێ بە قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانەی لەو داڕوخانە کەوتۆتەوە.

سەبارەت بە پەیوەندیی نێوان بەڵای بێئامان و زۆرلێکردنی مادیش، هەندێ[1] گوتویانە زۆرلێکردنی مادی و بەڵای بێئامان دوو دەستەواژەی هاومانان، سەرباری ئەوەی گوتویەتی دەشێ سەرچاوەکەی مرۆڤ بێ.

لەڕاستیدا پەیوەندیی نێوانیان پەیوەندیی گشتی و تایبەتی رەهایە، هەموو بەڵایەکی بێئامان زۆرلێکردنی مادییە، بەڵام پێچەوانەکەی بەتەواوی وا نییە. زۆرلێکردنی مادی ئەگەر سەرچاوەکەی حەیوان یان بێگیانێك بێ لەتەك بەڵای بێئاماندا بەیەك دەگا، ئەگەریش سەرچاوەکەی مرۆڤ بوو ئەوا بەبێ ئەو بەدیدێ، وەك ئەو کەسەی بەزۆر دەستی کەسێك بگرێت و ناچار بە ئیمزاکردنی قەواڵەیەکی ساختەی بکا کە بەوپێیە بەشێوەیەکی نامەشروع دان بە مافێکی زۆرلێکەر یان کەسیتردا بنێ.

هەروەها پەیوەندی لەنێوان بەڵای بێئامان و زەرورەتدا پەیوەندیی گشتی و تایبەتی رەهایە، چونکە لە حاڵەتی بەدیهاتنی بەڵای بێئاماندا زەرورەت بەدیدێ، بەڵام پێچەوانەکەی بەتەواوی وانیە. زەرورەت لەوانەیە نەگاتە ئاستی بەڵای بێئامان،

---

[1] لەوانە مامۆستا محمود نجیب، الموجز في شرح قانون العقوبات، القسم العام، ص٤٥٥.

لەبەرئەوە ئەگەر نەگەیشتە ئەو ئاستە بە رێگری بەرپرسیارێتیی سزایی دادەنرێ، نەک مەدەنی.

لە دیارترین نموونەکانی بوونی بەڵای بێئامان بە هۆی پابەندی: بریتییە لە حاڵەتی هەڵوەشانەوەی گرێبەند لەبەر مەحاڵیی جێبەجێکردنی بەهۆی لەناوچوونی شوێن (محل)ی گرێبەندەکەوە بەر لە جێبەجێکردنی. بۆ نموونە ئەگەر ماڵە فرۆشراوەکە بەهۆی بەڵایەکی بێئامانەوە فەوتا بەپێی یاسا گرێبەندەکە خۆبەخۆ هەڵدەوەشێتەوە و پێویستە فرۆشیار پارەکە بۆ کڕیار بگێڕێتەوە، ئەمە ئەگەر هاتوو بەرپرسیارێتیی فەوتانەکەمان خستە سەر شانی ئەو لەو رووەوە پابەندیەکەی هێشتا بەتەواوی تەواو نەبووە و خاوەندارێتیی کڕیار بۆ فرۆشراوەکە بەر لە وەرگرتنی ناجێگیرە. لەبەرئەوە فرۆشیار پابەند دەبێ بە گێڕانەوەی هەموو یان بەشێك لەوەی وەك نرخی فرۆشراوەکە لە کڕیارەکەی وەرگرتووە. بەڵام ئەگەر لەسەر بناغەی موڵکایەتی و رێسای (المملوك يهلك على مالكه) (واتە: موڵك لە کیسی خاوەنەکەی دەچێ) بەرپرسیارێتیی فەوتانەکەمان خستە سەر شانی کڕیار، ئەوا پابەند دەبێ بە نەگێڕانەوەی نرخەکە لە فرۆشیارەکە.

ئەم بابەتە لە شوێنی خۆیدا بەدرێژی باس کرا و حاڵەتی ناوەڕاستمان پێ باش بوو، واتە لەئەستۆگرتنی بەرپرسیارێتیەکە نیوە بەنیوە دەبێ، فرۆشیار نیوەی پارەکە بۆ کڕیارەکە دەگێڕێتەوە، لەبەرئەوەی کڕیارەکە هیچ قازانجێکی لە گرێبەندەکە دەست نەکەوتووە، بەڵام نیوەکەیتری لەسەر خۆی (واتە فرۆشیارەکە) دەبێ لەبەرئەوەی بەهۆی رادەستنەکردنی ماڵەکەوە پابەندیی خۆی تەواو نەکردوە.

**دووەم - برسیتیەک هەڕەشەی مردن لە برسی بکا:**

ئاشکرایە برسێتی رووداوێکی سروشتییە مرۆڤ هیچ رۆڵێکی لە روودانیدا نیە، جا ئەگەر برسێتی هەڕەشەی مردنی لە مرۆڤ کرد، دوو پابەندی لێدەکەوێتەوە:

پابەندبوونی برسیەکە بە رزگارکردنی ژیانی خۆی و ئەوانەی بژێوییان لەسەریەتی لەرێی دەستکەوتنی ماڵی کەسیتر بەبێ مۆڵەتی خۆی.

پابەندیەکیتر بە قەرەبووکردنەوەیماڵە براوەکە یان خوراوەکە ئەگەر خاوەنەکەی داوای کردەوە، لەبەرئەوەی حاڵەتی زەرور رێگە بە کردنی قەدەغەکراو دەدا بەڵام ئیباحەی ناکا، ئەو رێسا بەناوبانگەیش کە دەڵێ (الضرورات تبیح المحظورات)[1] هەڵەیەکی شایعە، ئەو زەرورەتەی لەو رووداوەدا خۆ دەنوێنێ لە رێگرەکانی بەرپرسیارێتیی جینائییە نەك لە هۆکانی ئیباحە، رێسا گشتیەکەی شەرع و یاسا جەخت دەکەن لەوەی (الاضطرار لا یبطل حق الغیر)[2]. (واتە: ناچاربوون مافی کەسیتر پوچەڵ ناکاتەوە).

سێیەم- مردن:

لەوانەیە مردن ببێتە هۆیەك بۆ کۆتاهێنان بە گرێبەند و لەوێشەوە بۆ ئەو پابەندیەی لەو گرێبەندە دەکەوێتەوە، وەك ئەوەی کەسایەتیی گرێبەندوان جێی ئیعتیبار بێ، وەك ئەو کەسەی گرێبەند لەتەك پزیشکێکی پسپۆڕ دەکا تا نەشتەرگەریەکی بۆ ئەنجام بدا، یان لەتەك هونەرمەندێکی پسپۆڕدا بۆ دروستکردنی پەیکەری شتێکی ، یان کەسایەتیەکی مێژوویی یان شتێکی لەو جۆرە و ئەو گرێبەندوانە بەر لە جێبەجێکردنی بمرێ، وەرەسەکەی پابەند دەبن بە گێڕانەوەی ئەوەی مردووەکە لەکاتی ژیانیدا وەریگرتووە.

چوارەم- رووداوی هاوسێیەتی:

هەر هاوسێیەك پابەند دەبێ بەوەی تعسف نەکا لە بەکارهێنانی مافی خۆی لە رەفتارکردن بە خانووەکەی بەشێوەیەك زیان بە هاوسێکەی بگەیەنێ، بەوەی سنووری پێویستی و زەرورەتی خۆی تێبپەڕێنێ. بەڵگەنەویستە هاوسێیەتی رووداوێکی سروشتییە.

---

[1] گۆڤاری: الأحکام العدلیة، مادەی (٢١).

[2] سەرچاوەی پێشوو، مادەی (٣٣).

هەروەها هەر هاوسێیەك لە خانوو یان کێڵگە پابەند دەبێ بە رێگەدان بە لایەنەکەیتر کە پێویستی بە مافێك لە مافەکانی هاوشانی (الارتفاق) هەیە، بەوەی رێگە لە دراوسێکەی نەگرێ ئەو مافە بەکار بێنێ، وەك مافی هاتوچۆ و مافی ئاوەڕۆ و ئەو شتانە.

سەرچاوەی هەموو ئەم پابەندیانەیش یاسایە.

# باسی چواره‌م:
# رووداوه سروشتیه‌کان و پابه‌ندییه تاوانكاریه‌كان

رووداوی سروشتی له‌وانه‌یه هۆیه‌ك بیٚ بۆ پابه‌ندیی تاوانكاری هه‌م به سه‌لب و هه‌م به ئیجاب، له نموونه‌كانی:

**یه‌كه‌م - بچووكیی ته‌مه‌ن:**

بچوكیی ته‌مه‌ن رێگره له به‌رپرسیارێتیی تاوانكاری. ئه‌و كه‌سه‌ی منداڵی بچوك ده‌ستدرێژی كردۆته سه‌ر مافی، پابه‌ند ده‌بیٚ به به‌رزنه‌كردنه‌وه سكاڵا له‌دژی، قازیی بابه‌ته‌كه‌یش پابه‌ند ده‌بیٚ به ره‌تكردنه‌وه‌ی سكاڵاكه ئه‌گه‌ر به‌رز كرایه‌وه. ئاشكرایه بچوكیی ته‌مه‌ن رووداوێكی سروشتییه، یاسا جینائیه‌كان له دیاریكردنی لای سه‌رووی بچوكی كه رێگره له به‌رپرسیارێتیی جینائی جیاوازن، بۆ نموونه یاسای سزاكانی عێراقی به‌ركار ته‌واوكردنی حه‌وت ساڵی داناوه و له ماده‌ی (٦٤)یدا ده‌ڵیٚ "ده‌عوای سزایی له‌سه‌ر كه‌سێك به‌رز ناكرێته‌وه كه له‌كاتی ئه‌نجامدانی تاوانه‌كه‌دا ته‌مه‌نی حه‌وت ساڵی ته‌واو نه‌كردبیٚ".

كوێتیی به‌ركار (ماده‌ی ١٨) و یه‌مه‌نیی به‌ركار (ماده‌ی ١/٣٠)یش به‌هه‌مان شێوه.

به‌ڵام سه‌باره‌ت به كێشه سزاییه‌كان، ئه‌م ماده‌یه به ماده‌ی (٤٧) له یاسای چاودێریی نه‌وجه‌وانانی عێراق هه‌ڵوه‌شاوه‌ته‌وه، كه ته‌مه‌نی نه‌بوونی به‌رپرسیارێتیی سزایی بۆ ته‌واوكردنی نۆ ساڵ به‌رز كردۆته‌وه و ده‌ڵیٚ "ده‌عوای سزایی له‌سه‌ر كه‌سێك به‌رز ناكرێته‌وه كه له‌كاتی ئه‌نجامدانی تاوانه‌كه‌دا ته‌مه‌نی نۆ ساڵی ته‌واو نه‌كردبیٚ".

یاساکانی سزادانی عەرەب لە دیاریکردنی ئەوپەڕی سنووریدا جیاوازن و لەوانەیە بگاتە تەمەنی (١٤) ساڵ.

**دووەم - بەڵای بێئامان:**

لە باسی سێیەمدا باسی ئەوەمان کرد بەڵای بێئامان لە هۆکانی ڕێپێدانە و ئەو کەسەی لەژێر فشاری بەڵایەکی بێئاماندا کارێکی ناڕەوا بکا، نە لەڕووی سزایی و نە لەڕووی مەدەنیەوە لێی ناپرسرێتەوە. لە نموونەکانی:

أ- لەهۆش خۆچوونی لەناکاو و چاوەڕواننەکراوی شۆفێر بە بەڵای بێئامان دادەنرێ، بەڵام ئەگەر لە هۆش خۆچوونەکە بەهۆی نەخۆشیەکی پێشوو، یان ڕووداوێك پێشتر لێی قەومابوو، یان بەهۆی خواردنەوەی مەستکەر یان بەکارهێنانی مادەی هۆشبەرەوە بوو، بە بەڵای بێئامان دانانرێ، بگرە لەوانەیە ئەم ڕووداوە هۆیەك بێ بۆ توندکردنی سزاکەی، وەك لە حاڵەتی سەرخۆشیدا.

ب- ڕەشەبای توند بە بەڵای بێئامان دادەنرێ ئەگەر نەتوانرا بەر بە زیانەکانی بگیرێ بەشێوەیەك بۆ نموونە شۆفێرێکی تووشی ئەنجامدانی تاوانێك کرد، ئەوا نە لەڕووی سزایی و نە لەڕووی مەدەنیەوە لێی ناپرسرێتەوە.

ج- گەردەلولی خۆڵین یاخود خۆڵبارین ئەگەر بووە هۆی ئەوەی ڕادەی بینین بگاتە پلەی سفر بە بەڵای بێئامان دادەنرێ و ئەو تاوانکارەی بەو هۆیەوە تووشی تاوانێك دەبێ، نە لەڕووی سزایی و نە لەڕووی مەدەنیەوە لێی ناپرسرێتەوە.

لە هەموو ئەم بارانە و هاوشێوەکانیاندا زیانمەند یان تاوان دەرهەق کراو پابەند دەبێ بە تۆمارنەکردنی دەعوا لەسەر تۆمەتبار، هەروەها دادوەری لێکۆڵینەوەیش پابەند دەبێ بە ڕەوانە (ئیحالە)نەکردنی دۆسیەکە بۆ دادوەری تایبەتمەند، ئەگەر ڕەوانەیشی کرد پێویستە دادوەری بابەتەکە داواکە بداتە دواوە. ئەگەر داواکەیشی قبوڵ کرد پابەند دەبێ بە دەرنەکردنی حوکم لەسەر تۆمەتبار، لەبەرئەوەی بەڵای بێئامان تاوانکردن لە سیفەتە تاوانکاریەکەی دادەماڵێ و دەگەڕێتەوە سەر ئەو حاڵەتی ڕێپێدان (اباحە)یەی بەر لە بەتاواندانان هەیبووە.

**سێیەم - شێتبوونی لەناکاو:**

شێتبوونی لەناکاو پاش ئەنجامدانی تاوان، ئەگەر تاوانکار لەکاتی دادگەییکردندا شێت بوو دادوەری بابەتەکە پابەند دەبێ بە راگرتنی سەرجەم رێکارە جینائیەکان لەدژی، جا ئەو رێکارانە لە هەر قۆناغێکدا بن. ئەگەر شێتبوونەکە پاش دەرکردنی حوکمەکە بوو پێویستە جێبەجێکردنی رابگیرێ، هەروەها ئیدارەی بەندیخانە پابەند دەبێ بە رەوانەکردنی نەخۆشە عەقڵیەکە بۆ نەخۆشخانەی تایبەت بە چارەسەری نەخۆشییە عەقڵیەکان[1].

**چوارەم - تاریکیی شەو:**

دادوەری بابەتەکە پابەند دەبێ بە توندکردنی سزای دزەکە ئەگەر لە تاریکیی شەودا تاوانەکەی ئەنجام دابێ.

یاسادانەری عێراقی لە یاسای سزاکانی بەرکاردا لە چارەسەرکردنی ئەو دۆخە توندەدا سەرکەوتوو نەبووە، کاتێ لە مادەی (٤٤٠) دا دەڵێ "بە بەندکردنی هەتاهەتایی یان کاتی سزا دەدرێ هەرکەس دزیەك بکات ئەم هەلومەرجانەی تێدا بێ: ١- لەنێوان ئاوابوونی خۆر و هەڵهاتنیدا رووی دابێ". هەڵەی ئەم برگەیە لەوەدایە ماوەی زەمەنیی نێوان کەمێك پێش هەڵهاتنی خۆر و کەمێك پاش ئاوابوونی بەنزیکەی چارەکە سەعاتێك، بە کاتی رۆژ دادەنرێ.

بۆیە راست ئەوەیە دارشتنی برگەکە بەم شێوەیە بێ: "رووداني لە تاریکیی شەودا بووبێ"، لەبەرئەوەی فەلسەفەی توندکردنی سزاکە بریتییە لە مەترسیداریی تاریکی لەو رووەوە خۆی لە خۆیدا ترسێنەرە، ئەم فەلسەفەیە لەو دارشتەیەدا بزرە، بەڵگەنەویستیشە شەو یان تاریکیەکەی رووداوێکی سروشتییە.

---

[1] بۆ درێژەی ئەم بابەتە تەماشای ئەم دانراوەمان بکرێ: موانع المسؤولية الجنائية في التشريع الجنائي الإسلامي والتشريعات الجزائية العربية.

**پێنجەم - خزمایەتیی نزیک،**

کوشتنی وەچە لەلایەن بنەچەوە کوشتنێك تۆڵەی شەرعی واجب بکا، بە هەلومەرجێك دادەنرێ کە سزا توند دەکا، یاسای سزادانی عێراقیی بەرکار مادەی (٤٠٦) لە چوارچێوەی هەلومەرجە توندکەرەکاندا داناوە کە سزاکە دەگەیەنێتە رادەی لەسێدارەدان و دادوەری بابەتەکە پابەند دەبێ بەوەی لە حوکمدانەکەیدا لەسەر بکوژەکە ئەو باروبۆخە رەچاو بکا.

ئاشکرایە سیفەتی بنەچەبوون لە خزمایەتیدا رووداوێکی سروشتییە.

ئەو رووداوە سروشتیانەی باسمان کردن لە هۆکانی پابەندییە جینائیەکان دێنە ژماردن و سەرچاوەیان یاسایە.

# باسی پێنجەم:
# رووداوە سروشتیەکان و پابەندییە نێودەوڵەتیەکان

مەبەست لە رووداوە سروشتیەکان (الوقـائع الطبیعیـة) بوونـەوەرە گەردوونیەکانـە بەپێی خیلقەتە ئەسلّییە خوداییەکانیان، یان شوێنە جوگرافیەکانیان کـە مـرۆڤ هـیچ دەسـتێکی لـە بـەدیهێنانی ئـەو رووداو یـان شـوێنە جوگرافیانـەدا نـەبووە. هەرچـی دەسـتێوەردانی مرۆڤـە لـەرووی دیـاریکردنی سـنوورەکانی لـەرێی رێکەوتنامـە یـان پەیماننامـە نێودەوڵەتیەکانـەوە، یـان لـە گـۆڕین و پەرەپێـدانی شـێوەکانیان، وەك گـۆڕینی هـەرێمێکی وشـکانی بـۆ هـەرێمێکی ئـاوی یـان بەپێچـەوانەوە، وەك ئـەو تۆکەندانەی لە ناوچە وشکانیەکانی هەندێ دەوڵەتدا دروست کراون لەوانـە تۆکەنـدی سویس و پەنەما و کییل، ئەم پەرەپێدانە کار لە دانانی بە رووداوی سروشتی ناکا، کە لە رابردوودا بووەتە، یان لە ئایندەدا دەبێتە هۆی پابەندییە نێودەوڵەتیەکان.

دەوڵەت دامەزراوەیەکی هەرێمیی سیاسییە لە هەموو تاکەکان پێکدێ، بـە نێـر و مێوە و پێکەوە گەلەکەی پێکدێنن، ملکەچی دەسەڵاتەکەی دەبن و بـە حوکمـەکانی دەستوور و یاساکەی قسەیان لەتەك دەکرێ و بەو ماف و پابەندیانەی بۆیـان دیـاری دەکا پابەند دەبن[1].

سیسـتمی نێودەوڵـەتی لـە شـێوە واقیعیەکەیـدا لەسـەر دابەشـکردنی خـاکی سەرزەوی بۆ چەند یەکەیەکی هەرێمی دامەزراوە، پێیان دەوترێ دەوڵەت.

---

[1] مامۆستامان حامد سلطان، القانون الدولي العام في وقت السلم، ط٤، ص٣٥١.

دەوڵەتیش وەك باسمان کرد، لە هەرێمێکی دیاریکراو و گەلێکی دیاریکراو پێکدێ کە لە هەرێمەکەدا نیشتەجێیە، سیستمێکی بابەتی کە گەلەکە بەڕێوە دەبات و دانپێدانانێکی نێودەوڵەتی بە سیستمەکەدا.

پاش بەدیهاتنی ئەم رەگەزانە دەوڵەت کەسایەتیەکی مەعنەویی خاوەن سەروەری لە چوارچێوەی سنوورە نێودەوڵەتیەکەیدا بەدەست دێنێت و دەوڵەتانیدی پابەند دەبن بە رێزگرتنی و دەست نەخستنە کاروباری ناوخۆی، دەستوەردانێك سەروەری ببەزێنێ و لەتەك یاسای نێودەوڵەتی و عورفە نێودەوڵەتیەکان تێك بگیرێ. رێکەوتنامە نێودەوڵەتیەکان ئەو حوکمانەیان رێك خستووە، لەوانە رێکەوتنامەی تایبەت بە ماف و ئەرکی دەوڵەتان کە لە ١٩٣٣/١٢/٢٦ بەسترا و لە مادەی یەکەمیدا دەڵێ:

"دەوڵەتان بۆ ئەوەی بە کەسایەتیی مەعنەوی لە کەسایەتیەکانی یاسای نێودەوڵەتی دابنرێن، پێویستە ئەم مەرجانەیان تێدا بێ: ١- گەلێکی هەمیشە ٢- هەرێمێکی دیاریکراو ٣- حکومەتێك (دەسەڵاتێکی سیاسی) ٤- شیانی دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتانیتر".

**هەرێمەکانی دەوڵەت**

هەر دەوڵەتێك دوو هەرێمی هەیە: وشکانی و ئاسمانی، بەڵام هەندێکیان سێ هەرێمیان هەیە و سێیەمیان هەرێمی دەریاییە ئەگەر لەسەر دەریا بوو، وەك لەم روونکردنەوەیەدا:

**یەکەم- هەرێمی وشکانی (توخمی وشکانی):**

ئەو بەشە وشکەی زەوییە کە سنووری دەوڵەتەکە لەخۆی دەگرێ و ئەو کانزا فلزی و نافلزیانەی لەژێریدان و ئەو دەریاچە و رووبار و دەشت و دۆڵ و چیا و بەرزایی و گردانەی لەسەریدان و گیانلەبەر و بێگیانەکانیتر، دەگرێتەوە.

سنوورەکانی ئەم هەرێمە نیشانەی سروشتین لە چیا و دەشت و رووباری نێودەوڵەتی و دەریا و بەگوێرەی رێکەوتنامە یان پەیماننامە و عورفە نێودەوڵەتیەکان

و بەڵگە مێژووییەکان و ئەو شتانە دیاری دەکرێ و پێیان دەوترێ نیشانە جوگرافیەکان، کە ڕووداوی سروشتین و لە هۆکانی پابەندییە نێودەوڵەتیەکان دێنە ژماردن، بەشێوەیەك دەوڵەتانی دراوسێ و نادراوسێ و هاوڵاتیانیان پابەند دەبن بەوەی بەگوێرەی ڕێنماییە نێودەوڵەتی و ناوخۆییەکان نەبێ لەو سنوورانە نەپەڕنەوە، لەوانە ڕەزامەندیی دەوڵەتە خاوەن سەروەریەکە بەسەر هەرێمەکەدا.

هەروەها هاوڵاتیانی هەموو دەوڵەتێك پابەند دەبن بە دوورکەوتنەوە لە بەقاچاخیبردن لە ناوەوە بۆ دەرەوە یان بەپێچەوانەوە، هەموو دەوڵەتێك پابەند دەبێ بە خۆ دوورگرتن لە دەستبردن بۆ سنوورە وشکانیيە دانپێدانراوە نێودەوڵەتیەکان لەڕێی بەکارهێنانیان بۆ بەرژەوەندیی سیاسی یان ئابووری یان سەربازییان، هەروەها هەموو دەوڵەتێك پابەند دەبێ بە خۆ دوورگرتن لە دەست بۆ بردنی ماددی، بە خستنەسەری بەشێك لە هەرێمی دەوڵەتێکی دراوسێ بۆ سەر هەرێمەکەی خۆی، یان بەکارهێنانی بەشێك لە هەرێمەکە بۆ دەستدرێژیکردنە سەر بەرژەوەندیی دەوڵەتانیتر.

سەرجەم ئەو ڕوبار و دەریاچە و تەنگەندانەی بەتەواوی لەناو سنووری هەرێی دەوڵەتێکدان، فیقهی نێودەوڵەتی پێیان دەڵێ (ئاوی نیشتمانی یان ئاوی ناوخۆیی) و جگە لە هاوڵاتیانی دەوڵەتە خاوەن سەروەریەکە بەسەر هەرێمەکەدا، بۆ کەسیتر نیە دەریاوانییان تێدا بکا، یان سوود لە سامانە ئاژەڵی یان کانزاییەکانی وەربگرێ، مەگەر بە ڕەزامەندیی پێشوەختی دەوڵەتەکە.

بەڵام بەرژەوەندییە نێودەوڵەتیەکان و بایەخدان بە کاروباری ئاسانکردنی دەریاوانیی نێودەوڵەتی، وای کردوە هەندێ تەنگەند لەناو هەرێمی وشکانیدا لێبدرێ، وەك تەنگەندی سویس لە هەرێمی میسر بۆ بەستنەوەی دەریاری سپیی ناوەڕاست بە دەریای سوورەوە و دەریاوانی تێیدا بەگوێرەی ڕێکەوتنامەی قوستەنتینیە لە ٢٩ی تشرینی یەکەمی ١٨٨٨ ڕێك خراوە، کە پاشتر چەند جارێك هەموار کراوە و ماف و پابەندییە نێودەوڵەتیەکانی لە بەکارهێنانی ئەو تەنگەندەدا دیاری کردوە.

هەروەها وەك نۆکەندی پەنەما کە هەردوو ئۆقیانووسی ئەتلەسی و هێمن لەڕێی هەرێمی کۆماری پەنەماوە بەیەکەوە دەبەستێتەوە، کە یەکێکە لە کۆمارەکانی ئەمەریکای ناوەڕاست، لە شاری پەنەماوە بۆ شاری کولون، دەریاوانی و ماف و پابەندیی نێودەوڵەتیەکان بۆ بەکارهێنانی ئەم نۆکەندە ڕێکخراوە.

هەروەها نۆکەندی کیل کە دەسەڵاتدارانی ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانی ساڵی ١٨٩٦ لەبەر مەرامێکی جەنگی و بۆ بەیەکگەیاندنی دەریای بەڵتیق و دەریای باکور هەڵیانکەند، بەڵام پاشتر بەپێی ڕێکەوتنامە نێودەوڵەتیەکان سوود لێبینینی گشتی کرا.

بەڵگەنەویستە نۆکەندەکان و هاوشێوەکانیان پاش لێدانیان لە ڕووداوە سروشتیەکانن لەڕووی شوێنی جوگرافیانەوە و وەك باسمان کرد، هۆن بۆ ماف و پابەندییە نێودەوڵەتیەکان.

**دووەم- هەرێمی دەریایی (یان دەریای هەرێمی):**

بەشێکە لە هەرێمی وشکانیی دەوڵەت، بەڵام ئاو دایپۆشیوە و وەك هەرێمە وشکانیەکە لەژێر سەروەریی دەوڵەتەکەدایە. هەموو دەوڵەتێك بۆی هەیە هەموو ئەو مافانەی لە سەروەری و دەسەڵاتەکەی دەبنەوە لەسەر دەریا هەرێمی و بنی ئەو دەریایە سوود لێ ببینێ، بۆی هەیە مافی ڕاوکردن لە چوارچێوەی دەریا هەرێمیەکەی و هەروەها سوودبینینی ئابووری لە بنی ئەو دەریایە و چینەکانی ژێر ئەو بنە، تەنها بە هاوڵاتیانی خۆی بدات.

بەڵام سەروەریی دەوڵەت بەسەر هەرێمە دەریاییەکەیدا ڕەها نیە وەك لە هەرێمە وشکانیەکەیدا، بەڵکو کۆمەڵێ کۆت و بەندی دەکەوێتە سەر لە ڕوانگەی ئەو لەبەرچاوگرتنە سروشتی و جوگرافی و سیاسیانەی عورفی نێودەوڵەتی بڕیاری داون و دەوڵەتان کۆکن لەسەر قبوڵکردنیان و وەك یاسایەکی نێودەوڵەتییان لێهاتووە. لەو کۆت و بەندانە، مافی پەڕینەوەی بێوەی-یە (المرور البريء)، واتە کەشتیی دەوڵەتانیتر و هەروەها دەوڵەتە کەناراویەکان مافیان هەیە بە دەریا هەرێمیەکەدا

تێبپەڕن مادام پەڕینەوەیان بێوەی بێ و سووکایەتی بە دەوڵەتە کەناراوییەکان نەکەن، بەڵکو ئەوە بەپێی ڕێکەوتنامە نێودەوڵەتیەکان پەسەند کراوە، لەوانە مادەی (١/١٤) لە ڕێکەوتنامەی جنێف لە ٢٦ی ئابی ١٩٥٨ کە دەڵێ "کەشتیی سەر بە دەوڵەتانی کەناراوی و ناکەناراوی بۆیان هەیە سوودمەند بن لە مافی تێپەڕبوونی بێوەی بە دەریای هەرێمیدا لە سنووری حوکمەکانی ئەم مادانەدا (مادەکانی ڕێکەوتنامەکە)، سەرجەم دەوڵەتانی ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان لەسەر ناوەڕۆکی ئەم دەقی ڕێکەوتنە رازی بوون، وەك بڕیاردەری ماف نەك بەدیهێنەری".

ئاشکرایە هیچ پێوەرێکی بابەتی جێگیر نیە بۆ دیاریکردنی مەودای هەرێمی دەریایی و بەپێوەری جیاواز دیاری کراوە، لەوانە پێوەری سێ میل یان شەش میل یان دوازدە میلی دەریایی، یان دوورترین ماوە کە تۆپهاوێژەکان لە کەنارەوە بیگەنێ، یان پێوەریتر کە بەپێی جیاوازیی دەوڵەتان و ناوچە جوگرافیەکانیان و فاکتەرە سیاسی و ئابووری و مێژووییەکانیان دەگۆڕێ[1].

**سێیەم- هەرێمی هەوایی (ئاسمانی):**

بریتییە لەو هەوا یان ئاسمانەی دەکەوێتە سەروو هەردوو بەشە وشکانی و ئاویەکەی ژێر سەروەریی دەوڵەتەکە. ئەم هەرێمە لەو سەروەرییە دەبێتەوە کە دەوڵەت بەسەر هەردوو هەرێمە وشکانی و دەریاییەکەیدا هەیەتی، چونکە لە هەرکوێ هەرێمە وشکانی یان ئاویەکە هەبوو هەرێمی ئاسمانیش دەبێ. وەك چۆن سەروەریی دەوڵەت لەسەر ئەوەی لەژێریایەتی تا ئەوپەڕی قووڵاییەکەیەتی، بەهەمان شێوە سەروەری بەسەر ئەو چینە هەوا و ئاسمانەیش دەکەوێتە سەروو هەرێمەکە تا ئەوپەڕی بەرزاییەتی.

[1] سەرچاوەی پێشوو، ص٦٣١ و پاشتر.

ئەم رەگەزە تا سەرەتای سەدەی بیستەم جێگەی بایەخ و گرنگیی دەوڵەتان نەبوو، ئەویش پاش ئەو پێشکەوتنە تەکنەلۆژیەی جیهان لە بواری فرینی ئاسمانی و هاتوچۆی ئاسمانیدا بەخۆیەوە بینی.

رووداوی سروشتیی ئاسمانی بووەتە هۆیەك بۆ پابەندییە نێودەوڵەتیەکان، ئەویش بە خۆبواردن لە بەزاندنی هەرێمی ئاسمانی بەبێ رەزامەندیی ئەو دەوڵەتەی سەروەری بەسەریدا هەیە و بەگوێرەی رێکەوتنامە نێودەوڵەتیەکان نەبێ.

سەرچاوەی ئەم پابەندییانە یاسای نێودەوڵەتییە.

بەڵام بەگوێرەی رێکەوتنامە نێودەوڵەتیەکان کە ماف و پابەندیەکانیان لە بواری هاوچۆی ئاسمانیدا رێك خستووە، سەروەریی دەوڵەت بەسەر هەرێمە ئاسمانیەکەیدا هاوشێوەی هەرێمە دەریاییەکەی رەها نیە، لەوانە رێکەوتنامەی پاریس لە ١٣ی ئۆکتۆبەری ١٩١٩ کە ئەم بنەمایانەی لەخۆ گرتووە:

١- هەموو دەوڵەتێك سەروەریی تەواو و تاکی هەیە بەسەر چینەکانی هەوا کە دەکەونە بان هەرێمە وشکانی و دەریاییەکەی، تا بێکۆتا بەرزایی.

٢- ئەو دەوڵەتانەی رێکەوتنامەکەیان ئیمزا کردوە، پابەند دەبن بەوەی لەکاتی ئاشتیدا رێگە بە تێپەربوونی فرۆکەکانی سەر بە دەوڵەتانی گرێبەندوان بدەن بە هەرێمە هەواییەکەیدا گوزەر بکەن.

٣- دەوڵەتانی لایەن خۆ دووردەگرن لە هەر جیاکاریەك لە مامەڵەکردنی تایبەت بە فرۆکەکانی سەر بە هەر دەوڵەتێك لە دەوڵەتە گرێبەندوانەکان بەهۆی جیاوازی لە رەگەزدا.

٤- هەر دەوڵەتێك لە دەوڵەتە گرێبەندوانەکان مافی هەیە فرۆکەوانیی ئاسمانیی ناوخۆیی تایبەت بکا تەنها بە هاوڵاتیانی خۆی.

٥- هەر دەوڵەتێك لە دەوڵەتە گرێبەندوانەکان پابەند دەبێ بەوەی مافی فرۆکەوانیی ئاسمانی بە هەر دەوڵەتێکیتر بدات کە لایەن نیە لە رێکەوتنامەکەدا و لە ئایندەیشدا ناچێتە ناوی.

٦- دەستەیەکی نێودەوڵەتیی هەمیشەیی بۆ سەرپەرشتیکردنی کاروباری فڕۆکەوانیی مەدەنی پێك دەهێنرێ[1].

**رووبارە ناوخۆییە هاوبەشەکان و پابەندییە نێودەوڵەتیەکان:**

لەبەر بەرتەسکیی بوار بۆ دیراسەکردنی ئەم دواین خواستە بەدرێژی، تەنها باسی کێشەی رووباری فورات و پابەندییە نێودەوڵەتیەکانی ئەو دەوڵەتانەی بەناویاندا تێدەپەرێ دەکەین، لەبەرئەوەی فورات ئێستا بووەتە کێشەیەك لە کێشە هەنووکەییەکان و دەرهاویشتەی خراپی لەسەر چارەنووسی کشتوکاڵ و تەندروستیی عێراقیەکان لە ئێستا و ئایندەدا هەیە.

رووباری فورات لە بەرزاریەکانی تورکیا و لەپشت چیاکانی توروز هەڵدەقوڵێت و ماوەی (٤٢٠ کم) بەخاکی تورکیادا دەڕوات و دەڕژێتە هەرێمی سوریا لای جەرابلوس (تەرابلوس) و ماوەی (٦٨٠کم) بەخاکی ئەو ولاتەدا تێدەپەرێ، پاشان لە بوکەمالەوە دێتە هەرێمی عێراق و ماوەی (١٢٠ کم) بەناویدا تێدەپەرێ و لەوێوە دەڕژێتە شتولعەرەب، کە ئەویش دەڕژێتە ناو دەریای کەنداو.

پەیماننامەی دۆستایەتی و ئەو رێکەوتنامانەی لە رابردوودا لەنێوان عێراق و تورکیا مۆر کراون، چۆنێتیی سوودبینین لە ئاوی رووباری فوراتیان لەنێوان هەردوو دەوڵەت (تورکیا و عێراق)دا رێك خستووە، پاشان چەند رێکەوتن و توێژینەوەیەك لەنێوان (تورکیا و سوریا) و پاشان لەنێوان عێراق و سوریادا سەبارەت بە مافی سوودمەندبوون لە ئاوی رووباری فورات، کران.

شایانی باسە ناکۆکی و ئاڵۆزییە سیاسیەکانی نێوان هەردوو دەوڵەت کاری لەم رێکەوتنامانە کردوە.

شوێنی جوگرافیی رووباری فورات رووداوێکی سروشتییە و هۆیە بۆ پابەندبوونی ئەو دەوڵەتانەی پێیاندا تێدەپەرێ، ئەم پابەندیانە بە رێکەوتنامەکان رێك خراون،

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ص٤٣ و پاشتر.

بەڵام فیقهـ لـە دیاریکردنی بنچینەی ئـەم پابەندیانـە بـۆ ئـەو دەوڵەتانـەی روبـارە نێودەوڵەتییـە هاوبەشـەکان بـە هەرێمەکانیانـدا تێدەپـەڕێ جیـاوازە. دەکـرێ ئـەو جیاوازییە بۆ ئەم سێ بیردۆزەی خوارەوە بگێڕینەوە:

**یەکەم- بیردۆزی سەروەریی هەرێمیی رەها:**

ئـەوە دەگەیـەنێ هـەر دەوڵـەتێك مـافی تـەواوی هەیـە هـەموو ئـەو مافانـەی لـە سەروەریوونی رەهای بەسەر هەرێمەکەی دەبنەوە، بەبێ قەید و شەرت بەسـەر ئـەو بەشـەی روبـاری نێودەوڵـەتی کـە بـە هەرێمەکەیـدا تێدەپـەڕێ، ممارەسـە بکـا. بەگوێرەی ئەم سەروەرییە رەهایە هەموو دەوڵەتێك بۆی هەیە پـرۆژەی بەسـوود بـۆ وڵاتەکەی لەو بەشەی روبارەکە کە دەکەوێتە نێو سنوورەکەی دروست بکا، هەروەك بۆی هەیە رێڕەوی خودی روبارەکـە بەگشـتی یـان بەشـێکی لـەناو سـنووری خۆیـدا بگۆڕێ.

**راستکردنەوەی بیردۆزەکە:**

ئەم بیردۆزە لەڕووی مەنتیقیەوە لەبەر چەندین هۆ رەتکراوەیە، لەوانە:

أ- لەگەڵ دادپەروەریدا ناکۆکە کە گیانی یاساکانە.

ب- لەگـەڵ خواسـتی واقیعـی جـوگرافیی روبـارە هاوبەشـەکەدا نـاگونجێ، بەشێوەیەك هیچ شەریکێك بـۆی نیـە بـەبێ رەزامەنـدیی شـەریکەکانیتر هـیچ دەسکاریەکی بکا.

ج- پێچەوانەی فەسڵی شەشەمی میسـاقی نەتـەوە یـەکگرتووەکانی تایبـەت بـە چارەسەری کێشەکانە بەشێوەیەکی ئاشتییانە، وەك لە مادەکانی (٣٣-٣٥)دا هاتووە.

د- تێکەڵکردنێکی تێدایە لەنێوان رەگەزە زەمینییە جێگیرەکەی هەرێمەکە وەك چیا و دەشت و گردەکان و ئەو جۆرە شتانە، لەگـەڵ رەگـەزی بـزۆز و بگـوێز (متنقل) لە هەرێمێکەوە بۆ یەکێکیتر (ئاو)، لەوەی ملکەچی یەك حوکم کراون لەکاتێکدا سروشتیان جیاوازە.

هـ- ئەم تیۆرە عەقڵی ساغ و لۆژیکی یاسایی رەتی دەکاتەوە، لەبەرئەوەی هیچ کێشێك بۆ مافی دەوڵەتانیتری هاوبەش لە ئاوی رووبارە نێودەوڵەتیەکە دانانێ.

و- ئەم تیۆرە ئەو بنەما گشتیەی لە یاسای نێودەوڵەتیدا هاتووە لەبەرچاو ناگرێ، کە زیانگەیاندن بە مافی دەوڵەتانیتر قەدەغە دەکا، بەشێوەیەك بەرپرسیارێتیی نێودەوڵەتی لەسەر ئەو دەوڵەتە دروست دەکا، کە لەرێگەی کارە ناڕەواکانیەوە پابەندیەکانی تێکداوە.

**دووەم: بیرۆکەی خاوەنداریتیی هاوبەش:**

ناوەرۆکەکەی ئەوەیە بنچینەی رووبارەکە بەتەواوی، لە چاوگەکەیەوە تا رێژگەکەی مولکێکی هاوبەشە لەنێوان هەموو ئەو دەوڵەتانەی رووبارەکە بە هەرێمەکانیاندا تێدەپەڕێ، بەشێوەیەك ماف و ئەرکەکانی یەکسان و تەواوکەر بن، واتە یەکێکیان سەربەخۆ و بەبێ رەزامەندیی دەوڵەتانیتر پرۆژەیەك بۆ سوود وەرگرتن لە ئاوی رووبارەکە لەو بەشەی بە هەرێمەکەیدا تێدەپەڕێ دروست نەکا، مادام ئەم سوود لێوەرگرتنە ببێتە مایەی زیانگەیاندن بە هەرێمەکانیتر.

تێبینی دەکرێ ئەم تیۆرە سەرباری هەندێ لەلایەنە باشەکانی، بەڵام لە فیقهدا لایەنگری زۆری نیە، هەروەها لەنێو دەوڵەتاندا لەسەر ئەو بنچینەیە کار ناکرێ بەتایبەت لەم سەردەمەماندا، کە بەرژەوەندییە نێودەوڵەتیەکان دژ بەیەك دەبنەوە، ئەمەیش وا دەکا سوود وەرگرتن لە ئاوە نێودەوڵەتییە هاوبەشەکان لەسەر بناغەی مولکیەتی هاوبەش ئەگەرێکی دوور بێ.

**سێیەم- بیرۆکەی یەکەی هەرێمایەتیی رەها:**

بەپێی ئەم تیۆرە رووبارەکە هەمووی لە چاوگەکەیەوە تا رێژگەکەی یەك یەکەی هەرێمایەتییە، سنوورە سیاسیەکان کار لەو یەکەیە ناکەن، لە یەکی دانابڕن و هیچ دەوڵەتێك ناتوانێ سەروەریەکیی رەها بەسەر ئەو بەشەی رووبارەکە کە بە هەرێمەکەیدا گوزەر دەکا مومارەسە بکات، چونکە سەروەری بەسەر ئەو بەشەدا رەها نیە، بەڵکو بەستراوەتەوە بەو مەرجەی تاکلایەنانە دەست بۆ رێڕەوی

سروشتیی رووبارەکە نەبات، واتە بەبێ رەزامەندیی لایەنەکانیتر مافی ئەوەی نیە بەنداو و پرۆژەی کشتوکاڵی لەسەر دروست بکات یان رێڕەوی رووبارەکە بەتەواوی یان بەشەکی بگۆڕێ[1].

دەبینین بەرژەوەندیی هاوبەش بناغەیە بەو مەرجەی ئەو هاوبەشییە بە پەیماننامە یان رێکەوتنامە یان هەر میساقێکیتری نێودەوڵەتی دیاری بکرێ.

**سەرچاوەی ماف و پابەندییە نێودەوڵەتیەکان:**

سەرچاوەی ماف و پابەندییە نێودەوڵەتیەکان کە هۆکانیان رووداوە سروشتیەکانن، بریتییە لە یاسای نێودەوڵەتی. میساقی نەتەوە یەکگرتووەکان لە فەسڵی شەشەم (مادەکانی ٣٣-٣٥)ی تایبەت بە چارەسەری ئاشتیانەی کێشە نێودەوڵەتیەکان، داوای لە لایەنە ناکۆکەکانی ئەو کێشەیەی دەکرێ ئاسایش و ئاشتیی نێودەوڵەتی بخاتە مەترسی، کردوە بەشێوەیەکی خۆویستانە ئەو پابەندیانە جێبەجێ بکەن کە جێی کێشە و ناکۆکین لەرێی دانوستان و داوەری و میانگیری و چارەسەری دادوەریەوە.

ئەگەر چارەسەری ئاشتیانە، ئامانج لە جێبەجێکردنی خۆویستانەی پابەندیەکانی بەدینەهێنا، کە بابەتی کێشەکەیە، میساقەکە لە فەسڵی حەوتەمدا کە تایبەتە بە رێوشوێن و کارە پێویستەکان کاتێك بەهۆی شکاندنی ئەو پابەندیانە و پەنابردنی هەندێ لایەن بۆ دەستدرێژی و کاری ناڕەوا، ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی بکەوێتە مەترسی، داوا دەکا رێوشوێنی پێویست بۆ سەلماندنەوە و گێڕانەوەی دۆخەکە بۆ باری ئاسایی خۆی بگێرێتە بەر، وەك لە مادەکانی (٣٩-٥١)دا هاتووە، تا دەوڵەتانی پابەندی شکێن بەزۆر ناچار بە جێکردنیان بکرێن.

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ص٥٣٦ و پاشتر.

**ئەنجامگیری:**

لە خستنەرووی ئەم دواین خواستە، دەگەینە ئەم ئەنجامانە:

١- زۆربەی هۆکانی ماف و پابەندییە نێودەوڵەتییەکان ئەو رووداوە سروشتیانەن، کە لەرووی ئەسڵی سروشتییان یان شوێنی جوگرافییان لە هەرێمەکانیدا هەن پاش بەسەرداهێنانی گۆڕانکاری یان پەرەپێدانیان.

٢- رێکەوتنامە و پەیماننامە و عورفە نێودەوڵەتیەکان ئەو ماف و پابەندیانە بۆ هەر دەوڵەتێکی پابەند و بۆ-پابەند دیاری دەکەن.

٣- سەرچاوەی سەرجەم ماف و پابەندییە نێودەوڵەتیەکان تەنها یاسای نێودەوڵەتییە.

٤- پێویستە لایەنەکانی کێشەیەك کە لەوانەیە پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی بخاتە مەترسی، بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە پەنا ببەنە بەر رێگە ئاشتیانەکانی وەك دانوستان و میانگیری و داوەری و ئەو شتانە. ئەنجومەنی ئاسایشیش وەك لە فەسڵی شەشەمی میساقەکەدا هاتووە، بۆی هەیە داوا بکا لەباتیی بەرکارهێنانی هێز وتوندوتیژی پەنا بۆ رێگەچارەی ئاشتیانە ببەن. ئەگەر رێگەچارەی ئاشتیانە شکستی هێنا، ئەوا وەك لە فەسڵی حەوتەمدا هاتووە، پێویستە ئەنجومەنی ئاسایش یان کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ سڵەماندنەوە و گێڕانەوەی دۆخەکە بۆ باری ئاسایی خۆی، سزای ئەو لایەنە بدات کە پابەندیەکەی شکاندوە.

٥- پێویستە دەوڵەتی عێراق تەنها بەو بەڵێن و موجامەلانەی دەوڵەتانی دراوسێ کە جێبەجێ ناکرێن رازی نەبێ، بەڵکو پەنا بۆ ئەنجومەنی ئاسایش یان کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان ببات، تا ناچار بە جێبەجێکردنی پابەندیەکانیان بکات، کە بابەتەکەیان ئەو مافە ئاویانەیە رێکەوتنامە و پەیماننامە و عورفە نێودەوڵەتیەکان و پێشینە مێژووییەکان دیارییان کردون.

# باسی یەکەم:
# دانەوە[1]

دانەوە (الوفاء) ڕێگەی سروشتیی کۆتاهاتن و ڕەوینەوەی پابەندییە و بریتییە لـە ئەنجامدانی بابەتی پابەندییەکە (واجبە ماڵینەکە یان برێتیەکەی). دانەوە ڕەفتارێکی یاساییە کە ڕەگەز و جۆری خۆی هەیە، لـە دوو خواسـتدا لەسـەر هـەردوو بابەتەکـە دەوەستم:

## خواستی یەکەم:
## ڕەگەزەکانی دانەوە

پێشتر چەندین جار باسمان کرد ڕەگەزی هەر شتێك ئەوەیە ئـەو شـتە لەسـەری دەوەستێ، ئەگەر بەشێك بوو لەو شتە پێی دەوترێ پایە، ئەگینا پێی دەوترێ مەرج.

لەم ڕوانگەوە پایەکانی دانـەوە لـەو ڕووەوە ڕەفتـارێکی یاسـاییە، سـیانن: قـەرز دەرەوە (قەرزار)، پێدراوە (خاوەن قەرز)، دراوە (بابەتی پابەندیەکە) جا چ مافێکی ماڵینە بێ یان مافێکی کەسی.

---

[1] مەدەنیی عێراقی بەرکار (مادەکانی ٣٩٢–٤٠٠)، مەدەنیی میسری (م/٢٢٣–٣٥١)، ئوردنی (م/٣٧٤ و پاشتر)، جەزائیری (فەسڵی ٢٥٨ و پاشتر)، تونسی (فەسڵی ٢٤٨ و پاشتر)، مەدەنیی سوری (م/٣٢٢–٣٤٩)، مۆریتانی (م/٣٣٣–٣٣٧).

**پایەی یەكەم: قەرز دەرەوە (قەرزار):**

بریتییە لە كەسی قەرزار یان نوێنەرەكەی و پێویستە ئەم مەرجانەی تێدا بێ:

١- هەر كە بە یەكجاری پابەندیەكەی كەوتە سەر دەستبەجێ قەرزەكە بداتەوە، ئەگەر رێكەوتن یان دەقێك نەبوو جیا لەوە بڕیار بدات.

لە هەندێ حاڵەتی نائاساییدا ئەگەر دەقێك رێگر نەبوو و حاڵی قەرزارەكە وای خواست، دادوەر بۆی هەیە بۆ ماوەیەكی ماقوڵ یان چەند ماوەیەك مۆڵەت بداتە قەرزار و دانەوەی قەرزەكەی دوا بخات و تێیاندا پابەندیەكەی جێبەجێ بكا، ئەگەر ئەم دواخستنە زیانێكی گەورەی بە قەرزدەرەكە نەدەگەیاند.

٢- بۆ دروستیی دانەوە، مەرجە قەرزدەرەوەكە خاوەنی ئەو شتە بێ كە داویەتیەوە.

٣- شیانی رەفتاركردن بەو شتەی هەبێ، لەگەڵ ئەوەیشدا دانەوەی ئەو شتەی پێویستە بدرێتەوە لەلایەن كەسێكەوە كە شیانی رەفتاركردنی نەبێ، پابەندیەكەی پێ دەڕەوێتەوە، ئەگەر دانەوەكە زیانی بە قەرز دەرەوەكە نەدەگەیاند.

٤- مەرجە قەرزەكە بە قەرزدەرەكە بدرێتەوە، لەبەرئەوەی لەم سێ حاڵەتەدا نەبێ گەردن ئازاد نابێ:

أ- لە حاڵەتێكدا قەرزدەرەكە دان بە دانەوەكەدا بنێ.

ب- لە حاڵەتێكدا بەئەندازەی ئەو سوودە سوود بە قەرزدەرەكە گەیشتبێ.

ج- لە حاڵەتێكدا قەرزدانەوە بۆ كەسێتر بە نیەتپاكی بێ، بەوەی باوەڕی وابێ هەركات ئەو كەسە قەرزەكەی كەوتە دەست، ئەو قەرزدەرە راستەقینەكەیەتی.

٥- قەرزارەكە پابەند بێ بە خەرجیەكانی دانەوە، مەگەر رێكەوتن یان دەقێك هەبێ جیا لەوە بڕیار بدات، بەڵام ئەگەر ئەو خەرجیانە لەبەر هۆیەك كە پەیوەندی بە قەرزدەرەوە هەبوو زیادیان كرد، بەرپرسیارێتیی ئەو زیادەیە لە ئەستۆی قەرزدەرەكەدایە.

شایانی باسە خەرجیەکانی وەرگرتن لەسەر قەرزدەرە، مەگەر ڕێکەوتن یان دەقێك هەبێ جیا لەوە بڕیار بدات.

**پایەی دووەم: پێدراوە (خاوەن قەرز) (الموفى له):**

پێویستە ئەم مەرجانەی تێدا بێ:

١- قەرزی دابێ بە قەرزارەکە یان نوێنەرەکەی، ئەگەر قەرزەکە بە کەسێك بدرێتەوە قەرزدەرەکە یان نوێنەرەکەی نەبێ ئەستۆی قەرزار ئازاد نابێ مەگەر قەرزدەرەکە دانی بەو دانەوەیەدا نابێ یان بەئەندازەی ئەو سوودە سوودی لێی بینیبێ، یان بە نیازپاکی قەرز بۆ کەسێك درابێتەوە کە قەرزەکە لای ئەو بووە.

٢- ئەهل واتە شیاو بێ بۆ وەرگرتنەوەی ئەو ماڵەی دراوەتەوە.

٣- کاتێ لەباتیی قەرزەکە بەرانبەرێك دەدرێتەوە مەرجە کەسی پێدراو بەوە ڕازی بێ، ئەگەر ئەو ڕازی بوو لەباتیی ئەو شتەی لەلایەتی بەرانبەرێکیتر وەربگرێ، بە دانەوە حسێبە[1].

**پایەی سێیەم: دراوە (الموفى به):**

ئەمەیان بابەتی پابەندیەکەیە، ناونانی بە بابەتی پابەندی هەڵەیەکی بڵاوە لە یاسا مەدەنییە عەرەبیەکاندا. پێویستە چەند مەرجێکی تێدا بێ، گرنگترینیان ئەمانەن:

١- دانەوەکە لەلایەن کەسی قەرزدەرەوە خۆیەوە بێ ئەگەر دراوەکە کارێك بوو و بەگرنگ دەزانرا کەسی قەرزدەرەوە خۆی پێی هەستێ.

٢- پێویستە قەرزار پاش وەرگرتنی مۆڵەتی دادگە، دراوەکە بە زیادکردنی ئاشکرا بفرۆشێ ئەگەر لەو شتانە بوو بەزوویی خراپ دەبن، یان هەڵگرتن و پاسەوانیکردنیان خەرجی زۆری دەویست، پێویستە قەرزدار نرخەکە بخاتە گەنجینەی دادگە یان لایەنێکیتری تایبەتمەند.

---

[1] مجموعة الأعمال التحضيرية للمدني المصري، ٣/٢٣٤.

٣- قەرزدەرەوە بۆی هەیە دراوەکە لای لایەنێکی تایبەتمەندا دابنێ ئەگەر خاوەن قەرزەکەی نەدەناسی یان شوێنەکەی نەدەزانی، یان خاوەن قەرزەکە نەشیاو یان شیان ناتەواو بوو و نوێنەرێکی نەبوو رازی بێ قەرزەکەی بۆ وەربگرێتەوە، یان قەرزەکە لەنێوان چەند کەسێکدا ناکۆکی لەسەر بوو.

٤- ئەگەر دراوەکە شتێکی بە خود دیاریکراو بوو و پێویست بوو لەو جێیە رادەست بکرێ کە تێیدایە، قەرزار بۆی هەیە قەرزدەر ئاگەدار بکاتەوە بۆ وەرگرتنی و مۆڵەت لە دادگە وەربگرێ بۆ دانانی بە سپاردە.

ئەگەر قەرزدەر ئاگەدار کرا، بەرپرسیارێتی فەوتانی شتەکە و وەستانی بەردەوامیی سوودەکانی دەکەوێتە ئەستۆ و قەرزار مافی هەیە لەسەر خەرجی قەرزدەر شتەکە بە سپاردە دابنێت و داوای قەرەبووی ئەو زیانەی پێی گەیشتووە بکا.

٥- ئەگەر دراوەکە لەو شتانە بوو بە دیاریکردن دیاری دەکرێ، قەرزار بۆی نیە بەبێ رەزامەندیی قەرزدەر شتێکیتر لەبریدا بداتەوە با ئەو برێتییە هەمان بەهای شتە ئەسڵیەکەیشی هەبێ، یان لەوەیش زیاتر بێ.

٦- قەرزار بۆی نیە قەرزدەر ناچار بکا بە وەرگرتنەوەی بەشێك لە قەرزەکەی ئەگەر رێکەوتن یان دەقێك نەبوو رێگە بەوە بدات.

٧- ئەگەر دراوە شتێکی بەخود دیاریکراو بوو، پێویستە لەو جێیەدا وەربگیرێ کە لە کاتی پابەندیدا تێیدا بووە، مەگەر رێکەوتن یان دەقێك هەبێ بڕیار لە شتێکیتر بدات.

٨- پێویستە قەرزار یان نوێنەرەکەی خەرجی رادەستکردنی بابەتی پابەندیەکە بگرێتە ئەستۆ، مەگەر دەقێك یان رێکەوتن یان عورفێکی جیاواز لەوە هەبێ.

## خواستی دووەم:
## جۆرەکانی دانەوە

دانەوە لە رووی بابەتەوە بۆ چوار جۆر دابەش دەبێ، لەبەرئەوەی بابەتەکەی یان عەینی واجبەکەیە یان برێتیەکەیەتی، دانەوەی عـەینی واجبـیش یـان ئەنجامـدانێکی تەواوە یان ئەنجامدانێکی ناتەواو، دانەوە بە برێتیی عـەینی واجبـیش یـان دانـەوەی هاوشێوەی خۆیەتی دانەوەیەکی تەواو یان دانەوەی بەهاکەیـەتی کـە پێـی دەوتـرێ دانەوەی ناتەواو، وەك لەم روونکردنەوەیەدا:

**جۆری یەکەم / دانەوە بە ئەنجامدانی تەواو:**

بریتیە لە ئەنجامدانی عـەینی واجبەکـە وەك رادەسـتکردنی خـودی فرۆشـراوەکە بەشێوەیەك هەموو ئەو مەرج و تایبەتمەندیانەی تێدا بێ کە لەسـەری رێـك کـەوتوون بەبێ زیاد و کەم.

**جۆری دووەم / دانەوە بە ئەنجامدانی ناتەواو:**

وەك رادەستکردنی عەینی واجبەکە بە بارکراوی بە مافێکی کەسیتر وەك رەهن و بەکرێدان، یان بە عەیبێکەوە کە بەها یان سوودەکەی کەم دەکاتەوە، هەروەها وەك گێڕانـەوەی مالّـە زەوتکـراو یـان دزراوەکـە بـە عەیبـدار یـان نوقسـانی لەگـەڵ لەئەستۆگرتنی قەرەبووکردنەوەی ئەو زیان یان نوقسانییە لەلایەن قەرزارەوە.

**جۆری سێیەم / دانەوە بە قەزای تەواو:**

بریتییە لە دانەوە بە برێتیەکی ماقووڵ، واتە خودی واجبەکە دەنوێنێ، وەك لـەو حاڵەتەی فرۆشراوەکە ماڵێکی هاوچەشن بێ وەك گەنم و برنج و ئەو جـۆرە شـتانە و فرۆشراوەکە بەر لە رادەستکردنی فەوتا و فرۆشیار هاوچەشنەکەی، واتە لە پۆلەکەی

خۆی لە خودی واجبەکە رادەست بکا، مەرجە عەینی واجب و برێتییەکەی دوو پۆل بن لە هەمان جۆر، ئەوە بەس نیە هەردووک لە یەك توخم یان جۆر بن وەك زانایانی یاسا گومانیان بردوە.

**جۆری چوارەم / دانەوە بە قەرزای ناتەواو[1]:**

برێتییە لە دانەوەی بەهای عەینی واجبەکە کە فەوتاوە یان هاوشێوەی ئەوە بەر لە رادەستکردنی لە دەستی خەڵك یان لە بازاڕەکاندا نەماوە. شەرعناسان لە دیاریکردنی کاتی مەزەندەکردنی ئەو بەهایەدا جیاوازن، هەندێکیان پێیان وایە دەبێ نرخی رۆژی لەناوبردن یان نەمانی لە بازاڕ بکرێتە پێوەر، لەبەرئەوەی بەهای کاتی پەیدابوونی پابەندیەکەیە. هەندێکیتر بۆ ئەوە چوون مەحەك بەهای رۆژی کێشمەکێشەکەیە. هەندێکیشیان بەهای رۆژی حوکمەکەیان وەرگرتووە، واتە ئەو حوکمەی قازی داویەتی[2].

بەبۆچوونی لەخۆبوردوانەی ئێمە، بەهای پشت پێبەستراو ئەوپەڕی حەدیەتی لە رۆژی پەیدابوونی پابەندیەکەوە تا رۆژی حوکمدانەکە ئەگەر قەرزارەکە بە ناڕەوا ماڵەکەی لەلا بوو وەك ماڵی دزراو یان زەوتکراو، لەبەرئەوەی ئەو ماوەیە لە زەمانی ئەو کەسەدایە کە لەلایەتی، لەبەرئەوە بەهۆی کەمتەرخەمیکردنی قەرزارەکە، لە بەرژەوەندیی قەرزدەر کار بە ئەوپەڕی دەکرێ.

بەڵام ئەگەر گۆڕانی هاوچەشن بۆ بەها لەسەر بناغەی نەبوونی ئەو ماڵە بوو لە دەستی خەڵك و لە بازاڕەکاندا، ئەوا بەهای رۆژی حوکمەکە لەبەرچاو دەگیرێ، لەبەرئەوەی رەنگە تا ئەو کاتە هاوچەشنەکە دەست بکەوێ.

شایانی باسە هاوچەشن لە پارەدا ئەوەیە لە وێنە و مانادا یەکسانی بێ، وێنەی شت روونە، هەرچی مەبەست لە مانایشە برێتییە لە هێزی کڕینی ئەو شتە

---

[1] بڕوانە: نظرية الالتزام برد غير المستحق، دانەر.

[2] بڕوانە: نظرية الالتزام برد غير المستحق، دانەر.

هاوچەشنە، ئەگەر ئەو هێزی کڕینە بەنیسبەت ژیانی ئابووری لەناو دەستی خەڵك و لە بازاڕەکاندا بەرز یان نزم بوویەوە، ئەو هاوچەشنە لەبەر لەدەستدانی رەگەزە مەعنەویەکەی، سیفەتی هاوچەشنی لەدەست دەدات و خۆبەخۆ دەگۆڕێ بۆ بەهایی، وەك پێشتر باسی ئەم بابەتەمان کرد.

لەم روانگەوە پێویستە لە دانەوەی بابەتی پابەندیدا بەهای رۆژی پەیدابوونی پابەندی لەبەر چاو بگیرێ نەك رۆژی جێبەجێکردنی. بۆ نموونە ئەو کەسەی ژنێك مارە دەکات بە مارەیی سەد دینار کاتێك نرخی مسقاڵی زێڕ لەکاتی مارەکردنەکەدا نیو دینار یان سێ چارەکە دینار بووە، کاتێ پێویست بوو مارەییە دواخراوەکە بدرێتەوە، واتە کاتی مردنی مێردەکە یان تەڵاقدان، پێویستە نرخی دینار بەگوێرەی نرخی زێڕ لەکاتی مارەکردنەکەدا بشکێنرێتەوە نەك بە نرخی رۆژی دانی مارەییەکە.

بەهەمان شێوە ئەگەر لەبەر هەر هۆیەك بڕێك پارە کەوتە ئەستۆی کەسێك، پاشان هێزی کڕینی ئەو پارەیە بەرز بوویەوە یان دابەزی و رەگەزە مەعنەویەکەی لەدەستدا و لە هاوچەشنبوونەوە گۆڕا بۆ بەهایی، پێویستە لەکاتی دانەوەیدا بڕە پارەکە بە نرخی زێڕ یان بە هێزی کڕینی لەکاتی پەیدابوونی پابەندیەکەدا حسێب بکرێ.

سەرەڕای ئەم راستییە، یاسا عەرەبیەکان هێشتا لەسەر عەقڵیەتی دەستگرتن بە ژمارەی بڕە پارەکە لە قەواڵە یان گرێبەندەکەدا بەردەوامن. ئاشکرایە ئەم ئاراستەیە لەگەڵ گیانی مرۆڤایەتی و جەوهەری دادپەروەریدا لێك دەدا، لەبەرئەوە داوا لە یاسادانەرانی جیهانی عەرەبی و ئیسلامی دەکەین چاو بەم حوکمە ستەمکارانەیەدا بگێڕنەوە و لەکاتی دانەوەی قەرزدا کار بە خەملاندنی بڕی پارەکە بە نرخی ئالتون یان هێزی کڕینی لەکاتی پەیدابوونی پابەندیەکە بکەن، لەبەرئەوەی یاسا خۆی ئامانج نیە، بەڵکو ئامرازێکە بۆ بەدیهێنانی ئاماجێکی باڵا کە دادپەروەرییە.

# باسی دووەم:
# گەردن ئازادکردن[1]

گەردن ئازادکردن دەستهەڵگرتنی یەکجاریی کەسێکە لەو مافە کەسیەی خۆی کە لە گەردنی قەرزاردایە بەبێ بەرانبەر، دەستهەڵگرتنێك کە ئیدراك و هۆشی تەواوەتی و ئازادیی ئیرادەی تەواوی لەگەڵ بێ.

گەردن ئازادکردن (یاخود بەخشینی قەرز) وەك قەرزدانەوە رەفتارێکی یاسایی تاکەکەسییە لە سێ پایە پێکدێ، کە بریتین لە: بەخشەر و بەخشراو و لێ بەخشراو، هەر پایەیێکیش مەرجی خۆی هەیە:

**پایەی یەکەم: بەخشەر (المُبرِيء) (قەرزدەر)؛**

بریتییە لە قەرزدەری خاوەن مافی خۆی کە بابەتی پابەندیی قەرزارەکەیەتی، لە گرنگترین مەرجەکانی:

١- بالَق و ژیر بێ، بڕیاری بەخشین (گەردن ئازادکردن) لەلایەن منداڵی نەفام یان شێت یان ئەو کەسەی حوکمی ئەوانی هەبێ دروست نیە، هەروەك هی کەسی شیان ناتەواویش دروست نیە لەبەرئەوەی لە بەخشینە پەتیەکانە، کە لەڕووی مادییەوە زیانبەخشی پەتییە.

[1] مەدەنیی جەزائیری (مادەکانی ٣٠٥-٣٦٠)، قەتەری (٤٠٣-٤١٤)، مۆریتانی (٣٣٨-٣٤٤)، عێراقی (٤٢٠-٤٢٤)، میسری (٣٧١-٣٧٢)، ئوردنی (٤٤٤-٤٤٧)، لوبنانی (٣٣٨-٣٤٠)، یەمەنی (٤٤٥-٤٤٧)، سوری (٣٦٩-٣٨٨) مەغریبی (فەسڵی ٣٤٠-٣٤٦)، تونسی (فەسڵی ٣٥٠-٣٥٦).

٢- بزان و بەهۆش بێ. ئەو کەسەی دەرك بە ئەنجامی کارەکەی ناکات و ناتوانێ قازانج و زەرەر یان سوود و زیانی خۆی لێك جیا بکاتەوە بڕیاری بەخشینی دروست نیە، هەروەك هی کەسی بێهۆش وەك سەرخۆش و لەهۆش خۆچوو و خەوتوو و ئەو جۆرە کەسانەیش دروست نیە.

٣- لەکاتی بڕیاری بەخشینەکەیدا ئازادیی ئیرادەی هەبێ، بۆیە بەخشین لەلایەن زۆرلێکراو یان ناچارەوە دروست نیە، لەبەرئەوەی (لەم حاڵەتەدا) دەستهەڵگرتن لە مافی لێ ناکەوێتەوە مەگەر لەژێر کاریگەریی پاڵەپەستۆیەکی دەرەکیدا، وەك زۆرلێکردن یان زەرورەت و ئەوەی لە حوکمی ئەو دووانەدایە.

٤- بەخشینی یەکێك لە میراتگرانی لەلایەن ئەو نەخۆشەی نەخۆشیی مەرگی هەیە دروست نیە مەگەر باقیی میراتگران، لە بارێکدا باڵق و هەڵبژێر و ژیر بن، دانی پێدا بنێن.

٥- هەروەها دروست نیە ئەو نەخۆشەی نەخۆشیی مەرگی هەیە کەسی ناواریس ببەخشێ لە سنووری سێیەکدا نەبێ، ئەویش پاش دەرکردنی خەرجی گواستنەوەی تەرمەکەی بۆ دوا ئارامگەی و دانەوەی قەرزەکانی، لەبەرئەوەی ئەم گەردن ئازادکردنە حوکمی وەسێت دەیگرێتەوە.

**پایەی دووەم/ بەخشراو (المبرأ) (قەرزار):**

کەسە قەرزارەکە دەگرێتەوە، لە مەرجەکانی:

ئەگەر گەردن ئازادکردن بە (بەموڵککردن) گونجاندنی بۆ بکرێ، پێویستە ئەم مەرجانەی تێدا بێتە دی:

أ- لە بەخشینەکە ئاگەدار بکرێ.

ب- بەخشینەکە قبوڵ بکا.

ج- رەتی نەکاتەوە.

د- بەخشراوەکە زانراو و دیاریکراو بێ، ئەگەر بە دوو قەرزاری گوت گەردنی یەکێکتانم ئازاد کرد بەبێ دیاریکردنی کەسیان، بەخشینەکە بەتاڵە.

ئەگەر بە (بەموڵککردن) گونجاندنی بۆ کرا پێویستە ئەم مەرجانە لە بەخشراودا هەبن، بەڵام ئەگەر بە خستن (الاسقاط) گونجاندنی بۆ کرا، هیچکام لەو مەرجانە پێویست نین.

**پایەی سێیەم/ لێ بەخشراو (المُبرأ منه):**

چەند مەرجێك تێیدا پێویستە گرنگترینیان:

١- مافەکە (بابەتی پابەندیەکە) لەو مافانە بێ کە دەکرێ بخرێن، بۆیە بەخشین لە مافێکی گشتیدا دروست نیە وەك بەخشینی تاوانکار لەلایەن تاوان لەسەرکراوەوە پاش دەرچوونی حوکمی دادگە لەدژی. ئەگەر تاوانەکە دەستدرێژی بوو بۆ سەر مافێکی گشتی یان مافێکی هاوبەش، لایەنی گشتی تێیدا زاڵ دەبێ، وەك تاوانی دزی و تاوانی زینا و ئەو جۆرانە، لەبەرئەوەی مافی گشتی موڵکی کەسێك یان لایەنێکی تایبەت نیە، رێسا گشتیەکەیش دەڵێ (فاقد الشيء لا يعطيه) (واتە: ئەوەی شتێکی نەبێ ناتوانێ ببیبەخشێ).

٢- مافەکە (بابەتی پابەندیەکە) مافێك بێ ساف هی بەخشەر بێ، بۆیە بەخشین لە مافێکدا دروست نیە کە مۆرکی پابەندی هەبێ، هەر مافێك پابەندیەکی لەتەکدا کۆببێتەوە قابیل بە بەخشین نابێ، وەك لەم مافانەی خوارەوەدا:

أ- مافی خاوەنبوون (ویلایە) یان چاودێریکردن (ویصایە)، ئەوانە لە مافە تایبەتەکانی وەلی یان وەصی نین، بەڵکو شەرعدانەر یان یاسادانەر بۆ بەرژەوەندیی منداڵە ناکامەکە کە لەژێر ویلایە یان ویصایەیدایە دایانناون. بۆ نموونە باوك بۆی نیە دەست لە مافی ویلایەت بەسەر منداڵە ناکامەکانیەوە هەڵبگرێ ئەگەر مەرجەکانی ویلایەتی تێدا بوو، لەبەرئەوەی ئەوە بۆ بەرژەوەندیی ناکامەکە دانراوە، ویلایەت سیفەتێکە لە ماف و پابەندی پێك دێت و رەچاوکردنی لایەنی دووەم پێویستترە.

ب- دایەنی (الحضانة): ئەمە مافێکی تایبەتی دایەن نیە چ دایك بێ یان کەسیتر، لەبەرئەوەی لە شەرع و یاسادا بۆ بەرژەوەندیی ناکامەکە دانراوە، بۆیە لە یەك

كاتدا ماف و پابەندییە، لەبەرئەوە ئەو كەسەی شایستەی ئەو دایەنیكردنەیە بۆی نیە بەبێ عوزر دەستی لێ هەڵبگرێ ئەگەر مەرجەكانی دایەنی تێدا بوو، لێرەوە دایەنیی دایك بە مێركردنی بە كەسێكیتر ناكەوێ مادام بەرژەوەندیی دایەنیكراو مسۆگەر بێ، جا چ ئەو مێردە لە خزمانی دایەنیكراوەكە بێ یان نا، لەبەرئەوە دایەنی، ئەگەر مەرجەكانی هاتبوونەجێ، مافێكە هی ئەوە نیە ببەخشرێ، نە لەلایەن دایەن نە هیچ كەسێكیترەوە.

ج- شیردان (الرضاعة): شیردانی دایك بە منداڵەكەی مافێكی تایبەتی خۆی نیە، بەڵكو سیفەتێكە لە ماف و پابەندی پێكهاتووە و بۆ بەرژەوەندیی ناكام دانراوە، بۆیە دایك بۆی نیە بەبێ عوزر دەستی لێ هەڵبگرێ ئەگەر مەرجەكانی شیردان هاتبوونە جێ، لەبەرئەوەی لەڕووی زانستیەوە سەلماوە شیری دایك لەڕووی تەندروستی و كۆمەڵایەتیەوە لە شیریتر باشترە، لێرەیشەوە شیردان مافێك نیە بكرێ نە لەلایەن شیردەر و نە هیچ كەسێكیترەوە ببەخشرێ.

٣- بۆ ئەوەی مافێك قابیل بە گەردن ئازادكردن بێ مەرجە لە مافە ماڵین (عیني)ەكان نەبێ، بەڵكو پێویستە لەو مافە كەسییانە بێ كە پەیوەندییان بە گەردنی قەرزارەوە هەیە، لەبەرئەوەی گەردن ئازادكردن پەیوەندی بە شتە ماڵینەكانەوە نیە. ئەو ماڵانەی بەشێوەیەكی ناڕەوا لەلای كەسیترن، پێویستە ئەوەی ماڵەكانی لەلایە دەستبەجێ بیانگێڕێتەوە بۆ خاوەنەكانیان، وەك ماڵە زەوتكراو و دزراوەكان و ئەو جۆرە شتانە، كە دەبێ ئەو كەسەی لەلاینی بیانگێڕێتەوە بۆ خاوەنە شەرعیەكانیان ئەگەر مابوون، ئەگینا پێویستە قازی حوكمی پێبژاردن (تضمین)ی بەسەردا بدات. (تضمین) بریتییە لە كردنی ماڵە زەوتكراو یان دزراوەكە بە موڵكی كابرای زەوتكار یان دز لە بەرانبەر ئەو قەرەبووەی هاوتایانە.

شایانی باسە هەندێ لە شەرعناسان (وەك حەنەفیەكان) گوتوویانە: بە موڵككردن بە پاشئاسەوار دەبێ لە مێژووی دەستدرێژی و تاوانەكەوە، رای خۆیشیان لەسەر

ئەوە بینا کردووە کە دروست نیە حوکمی قەرەبوو و سزادان لەیەك کاتدا بەسەر دزدا بسەپێندرێ، لەبەرئەوەی وەك سزادانی خاوەن موڵکە لەسەر موڵکەکەی.

بەڵام ئەم ئاراستەیە لەرووی شەرع و یاساوە رەتکراوەیە، لەبەرئەوەی دز لە یەك کاتدا دەستدرێژی دەکاتە سەر دوو ماف، مافێکی تایبەت کە ماڵە دزراوەکەیە + مافێکی گشتی کە دەستدرێژی کردنە بۆ سەر سیستمی گشتی و ئەنجامدانی کارێك کە سەرپێچی یاساو ئادابی گشتییە، هەر بۆیە قەرەبووکردنەوە سزای دەستدرێژییە بۆ سەر ماڵێکی تایبەت، سزاکەیش سزای دەستدرێژییە بۆ سەر مافێکی گشتی.

**گونجاندنی گەردن ئازادکردن:**

زانایان لە دیاریکردنی ئەم گونجاندن (تکییف)ـەدا سێ رای جیاوازیان هەیە:

رای یەکەم: گەردن ئازادکردن گونجاندنی بۆ دەکرێ بەوەی بڕینییە لە خستنی مافێك کە لە ئەستۆی کەسیتردایە.

رای دووەم: گونجاندنی بۆ دەکرێ بەوەی بەموڵککردنێکە لەلایەن بەخشەرەوە بۆ بەخشراو (قەرزار).

رای سێیەم: بەخشین بۆ بەخشەر بەموڵککردن و بۆ لێبەخشراو خستنە[1].

**بەرهەمی جیاوازییەکە:**

ئەو جیاوازییەی باس کرا ئەم ئەنجامانەی خوارەوەی لێدەکەوێتەوە:

١– ئەگەر بەموڵککردن بوو نابێ ببەسترێ بەمەرجەوە، بە پێچەوانەی خستنەوە.

٢– ئەگەر بەخستن نەك بەموڵککردن گونجاندنی بۆ کرا، دەکرێ بەلای بەخشەر یان لێبەخشراو یان هەردووکیانەوە نەزانراو بێ.

٣– ئەگەر خستن بوو بەگێڕانەوەی لێبەخشراو ناگەڕێتەوە، بە پێچەوانەی بە موڵککردن.

---

[1] بڕوانە: المنثور في القواعد فقه الشافعي للزركشي، ١٨/١ وما يليها.

٤- لە خستندا پێویستی بە قبولكردن نیە نەك لە بەمولككردندا، كە لەمەی دواییدا قبولكردنی لێبەخشراو یان رەت نەكردنەوەی مەرجە.

**هەڵوێستی یاسا لە گونجاندنی بەخشین:**

ئاراستە یاساییەكانیش هاوشێوەی ئاراستە فیقهییەكان لە گونجاندنی بەخشیندا جیاوازییان هەیە. لەو یاسایانەی بە بەمولككردن گونجاندنیان بۆ كردووە یاسای مەدەنیی میسری بەركارە[1] كە دەڵێ: "ئەگەر خاوەن قەرز بەویستی ئازادی خۆی قەرزارەكەی بەخشی، پابەندی دەڕەوێتەوە. هەر كات هەواڵی بەخشینەكە بە قەرزارەكە گەیشت بەخشینەكە دادەمەزرێ، بەرەتكردنەوەیشی رەت دەبێتەوە". چەمكی راشكاوی ئەم ماددەیە گونجاندنی بەخشینە بەوەی بریتییە لە بەمولككردن، ئەم ئاراستەیە لە یاسا مەدەنییە عەرەبیەكاندا باڵادەستە.

لەكاتێكدا ئاراستەی راشكاو لە یاسای مەدەنیی عێراقیدا گونجاندنی بەخشینە بە خستن[2]، كە دەڵێ: "ئەگەر قەرزدەر قەرزاری بەخشی قەرزەكە دەكەوێ"، هەروەها دەڵێ[3] "بەخشین لەسەر قبولكردنی قەرزار ناوەستێ"، چونكە ئەوەی لەم دوو دەقەدا هاتووە لە دەستەواژەی كەوتنی قەرز و نەوەستانی دروستبوونی بەخشینەكە لەسەر قبولكردنی قەرزار، لە رواڵەت و سیفەتەكانی خستنن نەك بەمولككردن.

**رای زاڵ:**

بەدیدی لەخۆبوردوانەی ئێمە رای زاڵ گەردن ئازادكردن (واتە بەخشینی قەرزار لە قەرزەكەی) خستنە، لەبەر ئەوەی چییەتیەكەی دەستهەڵگرتنە لە مافێكی جێگیر لە ئەستۆی ئەویتردا. دەست هەڵگرتنیش لەرووی ماناو ئەسەرەوە لە خستنەوە نزیكترە تا بەمولككردن.

---

[1] یاسای مەدەنیی میسری بەركار، مادەی (٣٧١).

[2] مەدەنیی عێراقیی بەركار (مادەی ٤٢٠).

[3] مەدەنیی عێراقیی بەركار (مادەی ٤٢٢).

# باسی سێیەم:
# قەرزشکاندنەوە (لە یەکترخستن)

## المقاصة (المساقطة)

شێوازێکە بۆ لەکۆڵبوونەوەی قەرز، کەوا دادەنێ قەرزارێك لە قەرزێکی دیاریکراودا بووەتە قەرزدەری قەرزدەرەکەی لە قەرزێکیتردا، بەشێوەیەك هەردوو قەرزەکە بە ئەندازەی کەمترینیان دەسڕێنەوە، تا ئەو قەرزارە ناچار نەبێ قەرزی خاوەن قەرزەکەی بداتەوە و لەولایشەوە داوای قەرزەکەی خۆی لە قەرزارەکەی بکاتەوە [1].

هەر کەس بەشوێن پەرەسەندنی مێژوویی قەرزشکاندنەوەدا بڕوا، دەبینێ بە ڕێکەوتنێك دەستی پێکردووە، پاشان ڕێگە بە قەرزشکاندنەوەی قەزایی پێدراوە، لە کۆتایشدا قەرزشکاندنەوە بووە بە شتێکی یاسایی.

لە یاسا نوێکاندا ئیتر مەبەست لە قەرزشکاندنەوە، قەرزشکاندنەوە یاساییە.

**مەرجەکانی قەرزشکاندنەوە[2]:**

قەرزشکاندنەوە (المقاصة) بۆ ئەوەی ببێتە هۆیەك بۆ نەمانی پابەندی پێویستە ئەم مەرجانەی خوارەوەی تێدا بێت:

١- دوو قەرزی بەرانبەر هەبێ بەوەی هەردوو لایەنەکەی قەرزشکاندنەوە، قەرزار و لەهەمانکاتدا قەرزدەری بەرانبەر بن، بەوە قەرزەکان بەرانبەر دەبن و بە (موقاصە) لەکۆڵ دەبنەوە.

---

[1] أصول الالتزامات للدكتور سليمان مرقس، ص٩٢٩ و پاشتر.

[2] الوسيط للسنهوري، ٨٧٣/٣ و پاشتر.

٢- بابـەتی هـەردوو پابەندیەکـە هاوشـێوە بـن بـەوەی هـەردوو قەرزەکـە شـتی هاوچەشن بن لەیەك پۆل و یەك پلە لە چاکی و خراپیدا، هـەر ئـەوە بـەس نیـە لەیەك جۆر بن وەك زۆر لە یاسا مەدەنییە عەرەبیەکان وای بۆ چوون.

گرنگـە شـتە هاوچەشـنەکان لـە پـارەو شـتی تـر تێکـەڵ نـەکرێن، لـەپارەدا هاوچەشنی شت ئەوەیە لە وێنەو مانادا یەکسان بـن، مەبەسـت لـە مانـا هێـزی کڕینە، جا ئەگەر ئـەو هێـزی کڕینـە بـە بەرزبوونـەوە یـان نزمبوونـەوە گۆڕانی بەسـەردا هـات، هاوچەشـن لـە پـارە سـیفەتی هاوچەشـنی لەدەسـت دەدات و دەگۆڕێت بۆ بـەهایی، وەك کـە بەدرێـژی لـە بابـەتی رەوینـەوەی پابەنـدی بـە دانەوەی قەرزدا باسمان کرد.

هەرچی هاوچەشنە لە جگـە لـەپارەدا، ئەوەیـە لـە نێـوان دوو هاوچەشـنەکەدا یەکێتیی پۆل و یەکێتیی باشی و خراپی هەیە، تەنها یـەکێتیی جـۆر بـەس نیـە وەك یاسا عەرەبیەکان گومانیان بردووە، لەبەرئەوەی جۆر ژمارەیەك پۆل لەخۆ دەگرێ کە لە راستەقینەیاندا کۆکن بەڵام لـە پـۆل و تایبەتمەندییانـدا جیـاوازن، بۆیە موقاصە لە نێوان پۆلێـك و پـۆلێکیتردا بـەدی نایـەت وەك لـە نێـوان پـۆلی (بلح) لە خورما و هەر پۆلێك لـە پۆلـەکانیتر، لەبەرئـەوەی لەباشـی و خراپـی و سـیفەتەکانی تـردا جیـاوازن. وەك چـۆن جیـاوازی لـە جـۆردا رێگـرە لـە قەرزشکاندنەوە بەهەمان شێوە جیـاوازیی لـە پۆلیشـدا رێگـرە. یـەکێتیی پـۆل لـەنێوان دوو قەرزەکـەدا بـۆ بـەدیهاتنی قەرزشـکاندنەوە و نـەمانی هـەردوو قەرزەکە، گرنگە.

٣- مەرجە هەردوو قەرزەکە بێ کێشە بن، بەوەی هەردووکیان خاڵی و دوور بن لە کێشـە، ئـەگینا قەرزشـکاندنەوە بەدینایـەت. نـەبوونی کێشـەیش دوو شـت دەخـوازێ: یەکـەمیان ئەوەیـە قەرزەکـە دڵنیـا بـێ و هـیچ گومانێـك لـەبوونی لەئەستۆی قەرزارەکەدا نەبێ، دووەمیان ئەوەیە بڕی قەرزەکە دیاریکراو بێ.

٤- شایستەبوونی هەردوو قەرزەکە بۆ جێبەجێکردن، بەوەی هەردووکیان شایستەی دانەوە بن، لەبەرئەوەی قەرزشکاندنەوە دانەوەیەکی ناچارییە و قەرزار ناچاری دانەوە ناکرێ تا قەرزەکە شایستە نەبێ.

٥- قابیلیەتی هەردوو قەرزەکە بۆ گلدانەوە(حجز). قەرزشکاندنەوە روونادات ئەگەر یەکێك لە دوو قەرزەکە مافێك بێ قابیل بە گلدانەوە نەبێ، لەبەرئەوەی قەرزشکاندنەوە دانەوەیەکی ناچارییە و ئەو مافەی قابیل بە گلدانەوە نەبێ ناکرێ خاوەنەکەی ناچار بکرێ بەو قەرزەکەی بداتەوە.

٦- بابەتی یەکێك لە دوو قەرزەکە گێڕانەوەی شتێك نەبێ کە بەناهەق لەدەستی خاوەنەکەی هەڵپروکێنراوە، وەك ماڵی زەوتکراو و دزراو. شایانی باسە یەکبوونی هۆی دوو قەرزەکە بەمەرج دانانرێ، هەروەك یەکبوونی شوێنی دانەوەی هەردوو قەرزەکە بەمەرج دانانرێ.

٧- بابەتی یەکێك لە دوو قەرزەکە گێڕانەوەی شتێکی سپاردەکراو یان موعار نەبێ.

٨- یەکێك لە دوو قەرزەکە قەرزی نەفەقە نەبێ.

٩- تەنها کەسێك دەستی پێوە بگرێ کە بەرژەوەندی تێیدا هەبێ و نابێ بەر لە سەلماندنی بوونی ماف تێیدا دەستی لێهەڵبگیرێ.

١٠- لەکاتی دەستگرتن بە قەرزشکاندنەوە ماوەی کۆنبوون بەسەر قەرزەکەدا تێنەپەڕێ، قەرزشکاندنەوە لە نێوان دوو قەرزدا نیە کە یەکێکیان قەرزی مەدەنی (پابەندییەکی مەدەنی) و ئەویتریان قەرزێکی سروشتی بێ (واتە پابەندییەکی سروشتی).

١١- لە قەرزشکاندنەوەدا مەرجە زیان بە مافەکانی کەسی تر نەگەیەنێ.

**ئاسەوارەکانی قەرزشکاندنەوە:**

**کاریگەریی قەرزشکاندنەوە بۆ قەرزار:**

قەرزشکاندنەوە (المقاصة) نەمانی هەردوو قەرزەکەی لێدەکەوێتەوە بە ئەندازەی کەمترینیان ئەگەر لە ئەندازە و بڕدا یەکسان نەبوون.

**كاریگەریی قەرزشكاندنەوە بۆ ئەویتر:**

١- نابێ قەرزشكاندنەوە زیانێك بەو مافانە بگەیەنێ كە ئەویتر بەدەستیهێناون، بۆ نموونە ئەگەر قەرزدەر مافەكەی خۆی بۆ كەسێكیتر گواستەوە و قەرزارەكە بەبێ دوو دڵی حەواڵەكەی قبوڵ كرد، ئەو قەرزارە بۆی نیە بەر لەو كەسەی بۆی حەواڵەكراوە پێداگری لەسەر قەرزشكاندنەوە بكا، كە بەر لە قبوڵكردنی حەواڵەكردنەكە ئەو مافەی هەبوو، لەو كاتەدا تەنها مافی ئەوەی هەیە بگەڕێتەوە سەر حەواڵەكار.

٢- بەڵام ئەگەر كابرای قەرزار حەواڵەكەی قبوڵ نەكرد، بەڵام لێی ئاگادار كرا، ئەو حەواڵەیە نابێتە ڕێگر لەوەی دەست بە قەرزشكاندنەوەوە بگرێ[1].

---

[1] لە بابەتی قەرزشكاندنەوەدا بڕوانە ئەم دەقە مەدەنییانەی خوارەوە: مەدەنیی عێراقی (مادەكانی ٤٠٨-٤١٧)، یاسای مەدەنیی میسری (م/٣٦٢-٣٦٩)، یاسای ئوردنی (م/٣٤٣-٣٥٢)، یاسای مەدەنیی جەزائیری (م/٢٩٧-٣٠٣)، یاسای مەدەنیی تونسی (فەسڵی ٣٦٩ و پاشتر)، یاسای مەدەنیی یەمەنی (م/٤٣٦-٤٤٣)، یاسای مەغریبی (فەسڵی ٣٥٧-٣٦٨)، یاسای مەدەنیی سوری (م/٣٦٠-٣٦٧)، یاسای مەدەنیی مۆریتانی (م/٣٥٥-٣٦٦).

# باسی چوارەم:
# ڕێگەیتر بۆ لەکۆڵبوونەوەی پابەندی

هەرکەس بەدواداچوون بۆ پیادەکردنە یاسایی و فیقهیەکان بکا زۆر ڕێگەی بۆ نەهێشتنی پابەندی بەرچاو دەکەوێ. لەبەر زۆریی بەشەکیەکانی ئەو ڕێگانە، لەم باسی چوارەم و کۆتاییەدا بەکورتی تەنها گرنگترینیان باس دەکەین، لەو ڕێگایانە:

**یەکەم- یەکگرتنی ئەستۆ[1]:**

ئەمە کاتێ بەدیدێ کە هەردوو سیفەتی قەرزدەر و قەرزار بۆ یەك قەرز لەیەك کەسدا کۆببنەوە، ئەسڵ وایە تەنها یەك قەرز هەیە و قەرزدەر لە قەرزار یان قەرزار لە قەرزدەر بۆی ماوەتەوە، ناوەڕۆکەکەی ئەوەیە خاوەندارێتیی بابەتی پابەندیی قەرزارەکە، بەهۆیەك لە هۆکانی بەدەستهێنانی خاوەندارێتی وەك میرات و وەسیەت و بەخشین و ئەو شتانە، بۆ قەرزارەکە گوێزراوەتەوە.

پابەندیی قەرزار بەهۆی یەکگرتنی ئەستۆی قەرزدەر و قەرزار لەیەك قەرز و یەك کەسدا دەڕەوێتەوە، بۆ نموونە ئەگەر قەرزدەر باوکی قەرزارەکە بوو و مرد و هەر کوڕە قەرزارەکەی میراتگری بوو، قەرزەکە بەهۆی یەکگرتنی ئەو ئەستۆیەی کە بابەتی پابەندیی قەرزارەکەی پێوە بەستراوە دەڕەوێتەوە، لەبەرئەوەی ئیتر دوو ئەستۆ نەماوە کە یەکێکیان قەرزدەر و ئەویتریان قەرزار بێ.

---

[1] مەدەنیی عێراقی (مادەکانی م/٤١٨-٤١٩)، یاسای مەدەنیی میسری (م/٣٧٠ و پاشتر)، یاسای ئوردنی (م/٣٤٣-٣٥٤)، یاسای مەدەنیی جەزائیری (م/٢٩٧-٣٠٣)، یاسای مەدەنیی تونسی (فەسڵی ٣٨٢ و پاشتر)، یاسای مەدەنیی یەمەنی (م/٤٤٤ و پاشتر)، یاسای مەغریبی (فەسڵی ٣٦٩-٣٧٠).

دەشێ یەكگرتنی ئەستۆ بەتەواوی یان بەشەكی بێ، ئەگەر ئەو هۆیەی بووبووە مایەی یەكگرتنی ئەستۆ نەما، قەرزەكە بەپاشكۆكانیەوە دەگەڕێتەوە و وا دادەنرێ وەك ئەوەی یەكگرتنی ئەستۆكە لەبنەڕەتدا رووی نەدابێ.

**دووەم- مەحاڵیی جێبەجێكردن[1]:**

هەر كات مەحاڵ بوو قەرزار بابەتی پابەندییەكەی جێبەجێ بكا، ئەگەر قەرزارەكە سەلماندی لەبەر هۆیەكی بێگانە كە دەستی ئەوی تێدا نیە دانەوەی قەرزەكە بووەتە مەحاڵ، ئەوا پابەندییەكەی كۆتایی دێ. هەروەها لەبەرئەوەی مەحاڵیی جێبەجێكردنیش بەهۆیەك لە هۆكانی رەوینەوەی پابەندی دادەنرێ پێویستە ئەم دوو مەرجەی خوارەوە هەبن:

١-جێبەجێكردنی پابەندی پاش پەیدابوونی مەحاڵ بێ، مەحاڵییەكی كرداری یان یاسایی.

٢- قەرزار بیسەلمێنێ مەحاڵی جێبەجێكردنی پابەندیەكە بۆ هۆیەكی بێگانە دەگەڕێتەوە كە قەرزارەكە دەستی تێیدا نیە.

ئەم بابەتە لە باسی مەحاڵیی جێبەجێكردن بەهۆی فەوتانی فرۆشراو بەر لە جێبەجێكردنی پابەندی، بە درێژی باس كرا.

---

[1] مەدەنیی عێراقیی بەركار (مادەكانی ٤٢٥-٤٢٨)، مەدەنیی میسری (م/٣٧٣-٤٢٦)، مەدەنیی جەزائیری (م/٣٠٧-٣٠٨)، مەدەنیی قەتەری (م/٤٠٢ و پاشتر)، مەدەنیی یەمەنی (م/٤٤٨ و پاشتر)، مەدەنیی سوری (م/٣٧١)، مەغریبی (فەسڵی ٢٣٥-٣٢٩)، الوسیط، للمرحوم السنهوری (٣/٢٨١ و پاشتر).

**سێیەم - نوێکردنەوە[1]:**

نوێکردنەوە بەهۆیەك لە هۆکانی رەوینەوەی پابەندییە ئەسڵیەکە (کۆنەکە) دادەنرێ، بەیەکێك لەم سێ هۆیەی خوارەوە:

١- **گۆڕانی قەرز:** ئەگەر هەردوولا (قەرزدەر و قەرزار) رێك کەوتن لەسەر گۆڕینی پابەندییە ئەسڵیەکەیان بە پابەندییەکی نوێ کە لە بابەت یان هۆکەیدا جیاواز بوو، پابەندییە ئەسڵیەکە کۆتایی دێ و پابەندییەکی نوێ جێی دەگرێتەوە.

٢- **گۆڕانی قەرزار:** ئەگەر قەرزدەرەکە لەگەڵ کەسێکی بێگانە رێك کەوت کە ئەو کەسە بێگانە لە جێگەی قەرزارە ئەسڵیەکە ببێتە قەرزار، قەرزارە ئەسڵیەکە ئەستۆی ئازاد دەبێ بەبێ ئەوە پێویست بە رازیبوونی بکا.

٣- **گۆڕینی قەرزدەر:** ئەگەر قەرزدەر و قەرزار و بێگانەیەك رێك کەوتن لەسەر ئەوەی ئەو بێگانە ببێتە قەرزدەرە نوێیەکە، پابەندییە کۆنەکە بەیەکجاری کۆتایی دێ ئەگەر هاتوو پابەندییە تازەکە بەدروستی جێگەی گرتەوە.

**مەرجەکانی نوێکردنەوە:**

بۆ ئەوەی نوێکردنەوە بەهۆیەك لە هۆکانی رەوینەوەی پابەندی دابنرێ، دەبێ ئەم سێ مەرجەی خوارەوەی تێدا بێ:

١- بەدوای یەکداهاتنی دوو پابەندی، بەشێوەیەك پابەندیەکی نوێ جێگەی پابەندیەکی کۆن بگرێتەوە.

٢- لێك جیاوازیی دوو پابەندیەکە بە یەکێك لە رەگەزەکان.

٣- نیەتی نوێکردنەوە، لەبەرئەوەی نوێکردنەوە گریمانە ناکرێ، بەڵکو پێویستە راشکاوانە رێکەوتنی لەسەر بکرێ، یان بەڕوونی لە هەلومەرجەکە بخوێنرێتەوە.

---

[1] مەدەنیی عێراقیی بەرکار (م/٤٠١-٤٠٧)، مەدەنیی میسری (م/٣٥٢-٣٦١)، مەدەنیی قەتەری (م/٣٨١-٣٨٩)، مەدەنیی سوری (م/٣٥٠-٣٥٩)، مەدەنی کوێتی (م/٤١٦-٤٢٨)، مەدەنیی جەزائیری (فەسڵی ٢٥٦ و پاشتر)، مەدەنیی مۆریتانی (م/٣٤٥-٣٥٤)، مەغریبی (فەسڵی ٣٤٧-٣٥٦)، سەنهوری، الوسیط (٨١٥/٣).

له گرنگترین ئاسەوارەكانی نوێكردنەوە: بەسەرچوونی پابەندییە ئەسڵیەكە و پەیدابوونی پابەندیەكی نوێیە.

**چوارەم - گواستنەوەی پابەندی لەنێوان زیندووەكاندا:**

گواستنەوەی پابەندی لە پابەندێكەوە بۆ پابەندێكیتر بە دوو رێگە دەبێ، یەكێكیان حەواڵەكردنی مافەكە و دووەمیان حەواڵەكردنی قەرزەكەیە.

**١- حەواڵەكردنی ماف:**

قەرزدەر بۆی هەیە بە باتییەك یان بەبێ ئەوە مافەكەی خۆی حەواڵەی كەسێكیتر بكا، مەگەر دەقێكی یاسایی[1] یان رێكەوتنێكی گرێبەندانە یان سروشتی پابەندیەكە رێگە لەوە بگرێ، وەك ئەوەی كەسی قەرزار جێگەی ئیعتیبار بێ.

ئەو حەواڵەیەیش لە لەلایەن قەرزار یان كەسیترەوە كارپێكراو نابێ تا قەرزارەكە قبوڵی نەكات یان رایبگەیەنێ. بەڵام كارپێكرانی بەر لە كەسیتر بە قبوڵكردنی قەرزارەكە، دەخوازێ ئەم قبوڵكردنە مێژوویەكی جێگیری هەبێ.

بابەتی حەواڵەكرنی ماف مافی قەرزدەرە، ئەم مافە كەسییە بە حەواڵەكردن لە قەرزدەرە ئەسڵیەكەوە بۆ قەرزدەرە تازەكە دەگوێزێتەوە. بەم حەواڵەیە پابەندیی قەرزار بەرانبەر قەرزدەرە ئەسڵیەكە كۆتایی دێ، بەڵام پابەندی بەنیسبەت قەرزدەرە نوێكەوە دەمێنێ.

**٢- حەواڵەكردنی قەرز:**

حەواڵەكردنی قەرز ئەوەیە قەرزارەكە لەگەڵ بێگانەیەك رێك بكەوێ لەسەر ئەوەی ئەو قەرزەی قەرزدەر كە لە ئەستۆیەتی بیگرێتە ئەستۆ، بەوە بێگانەكە لە هەمان

---

[1] مەدەنیی عێراقی (مادەكانی ٤٢٠-٤٢٤)، قەتەری (م/٣٢٤-٣٣٦)، یەمەنی (م/٣٩٠-٤٠١)، یاسای دەوڵەتی ئیمارات (م/١١٠٦ و پاشتر).

قـــەرزەدا، بەهـــەموو مـــاك و تایبەتمەنـــدی و دەســـتەبەری و داوای رەتکردنـــەوە (دفوعات)ەکانیەوە، جێگەی قەرزارەکە دەگرێتەوە [1].

حەواڵە لەوانەیە سنووریەند بێ و لەوانەیشە رەها بێ.

حەواڵەی سنووریەند ئەوەیە دەبەسترێتەوە بە دانەوەی ئەو قـەرزەی حەواڵـەکار کە لە ئەستۆی حەواڵـە بۆسـەرکراودایە، یـان لـەو ماڵـەی ئەمانەتـە لەدەسـتیدا یـان گەرەنتییە، حەواڵەی رەهایش ئەوەیە بە هیچ لەوانە نەبەستراوەتەوە، با هەشبن.

بـۆ دروسـتیی حەواڵـەکردنی قـەرز، رازیبـوونی حەواڵـەکار (المحیـل) و حەواڵـە بۆسەرکراو (المحال علیه) و حەواڵە بۆکراو (المحال له) مەرجە.

قەرزەکـە بـە سـیفەت و پاشـکۆ و تەئمیناتەکانیـەوە بـۆ حەواڵـە بۆسـەرکراو دەگوێزێتەوە.

**پێنجەم- کۆنبوونی بخەر (التقادم المسقط)[2]:**

کۆنبـوونی بخـەر لەسـەر پێویسـتیەکانی بەرژەوەنـدیی گشـتی و لەپێشـیانەوە سەرقامگیریی مامەڵە داراییەکان دەوەستێ.

ماوەی کۆنبوون بەگوێرەی جیاوازیی سروشتی پابەندیەکە لەنێوان پازدە ساڵ و ساڵێکدایە، زۆربەی یاسا عەرەبیەکان روبەری بـەرفراوانیان بـۆ ئـەم بابەتـە تـەرخان کردوە، لەکاتێکدا دەبینین ئەوە تەمەن بەفیڕۆدانـە، لەبەرئـەوەی کۆنبـوون ناچـێتە لیسـتی هۆکـانی رەوینـەوەی پابەنـدی، لەبەرئـەوەی ئـەو مافـە ناخـات کـە بابـەتی

---

[1] الوسیط للأستاذ السنهوري، ٥٥٢/٣. مجموعة الأعمال التحضیریة للمدني المصري ١٣٤/٣ و پاشتر، مەدەنیی میسری (م/٣١٥ و پاشتر)، مەدەنیی سوری (م/٣١٥–٣٢١)، مەدەنیی قەتەری (م/٣٢٤–٣٣٦).

[2] مەدەنیی عێراقی (م/٤٢٩–٤٣٩)، مەدەنیی میسری (م/٣٧٥–٣٨٨)، مەدەنیی سوری (م/٣٧٢–٣٨٥)، مەدەنیی تونسی (فەسڵی ٣٨٤ و پاشتر)، مەدەنیی مۆریتانی (م/٣٦٩ و پاشتر)، مەدەنیی قەتەری (م/٤٠٣–٤١٨)، مەدەنیی جەزائیری (م/٣٠٨–٣٢٢)، مەدەنیی یەمەنی (م/٤٤٩–٤٥٧)، مەغریبی (فەسڵی ٣٧١–٣٩٢).

پابەندیی قەرزارە، چونکە ماف چەندە کاتی بەسەردا تێبپەڕێ، ناکەوێ بەڵکو تـەنها پاراستنە یاسایییەکەی لەدەست دەدات و ئیتر ناتوانرێ لە ڕێگەی دادگەوە بەدەست بێ، چونکە لەڕووی قەزایییەوە بەسەر دەچێ بەڵام لەڕووی ئاینیـەوە هـەر دەمـێنێ، بەبەڵگـەی ئـەوەی ئەگـەر قـەرزار لـە هـەر کاتێکدا ئـەو مافـەی دایـەوە و دەیزانـی پابەندیەکەی بووەتە پابەندیی سروشتی، مافی نیە داوای گێڕانەوەی لە قەرزدەر بکا بە بەپاساوی ئەوەی پابەندیەکەی سروشتی بووە و مەدەنی نەبووە.

پوختـەی قسـان ئەوەیـە کاریگـەریی کۆنبـوونی بخـەر تـەنها کـەوتنی دەعواکـە دەگرێتەوە و ئیتر گوێی لێ ناگیرێ، بەڵام لەڕووی ئاینیەوە هەتا هەتایە دەمێنێتەوە.

رَبِّ زِدْنِي عِلْمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِين

# فەرهەنگۆکی زاراوەکان

خوێنەری بەڕێز!

ئەم کتێبە کتێبێکی زانستیی یاساییە و بەتەبیعەتی حاڵ ژمارەیەکی زۆر زاراوەی یاسایی تێدایە، کە زۆر لەو زاراوانە، هاوشێوەی زاراوەکانی زۆر بواریتری زانستی و مەعریفی نوێ، هاومانای پڕاوپڕیان لە زمانی کوردیدا نیە و تائێستایش وشە عەرەبیەکان لەسەر زاری خوێندەوار و یاساناسانی کورد بەکاردێن. ئەم هەژارییە، کێشەیەکی گەورەیە لەبەردەم هەر وەرگێڕێکدا، کە لە چەند حاڵەتێکدا خۆی دەنوێنێ: لەوانە لە دەقە عەرەبیەکەدا ژمارەیەك زاراوەی جیاواز هەن، کە ئاماژە و مانای لێکجیایان هەیە، بەڵام لە کوردیدا تەنها وشەیەك هەیە کە بۆ مانای هەردووکیان یان هەرسێکیان بەکار دێ، بۆ نموونە:

لە بەرانبەر (الغلط/الخطأ) تەنها وشەی (هەڵە)مان هەیە.

لەبەرانبەر (الجناية/الجريمة) تەنها وشەی (تاوان)مان هەیە.

لە بەرانبەر (الواقعة/الحادثة) تەنها (ڕووداو)مان هەیە.

لەبەرانبەر (الجنس/العنصر) تەنها (ڕەگەز) یان (توخم)مان هەیە کە یەك شتن.

لەبەرانبەر (الرسول/النبي) تەنها (پێغەمبەر)مان هەیە.

لەبەرانبەر (الهبة/التبرع/المنحة) و تەنانەت تارادەیەك (الابراء)یش وشەی (بەخشین)مان هەیە.

لە بەرانبەر (الرعاية/الرقابة/ الوصاية) تەنها (چاودێریکردن) لە ماناکەیان نزیکە.

ئەمە وادەکا بابەتەکان لەکاتی وەرگێڕاندا تێکەڵ ببن، بۆ نموونە کاتێ لە پەرەگرافێکدا ئەو دوو جووتە وشانە هەبن، لە کوردیەکەدا چۆن جیا بکرێنەوە؟!

هەربۆیە بەناچاری لە زۆر شوێندا وشە عەرەبیەکەمان لەنێوان دوو کەوانەدا بەکار هێناوە، یان ناوبەناو وشە عەرەبیەکەمان بە رێنوسی کوردی نووسیوەتەوە، تـا لێـك جیابکرێنەوە.

کێشەیەکیتر نەبوونی زاراوەیە بۆ زاراوە یاساییە پسـپۆڕیەکان، لەوانـە: (الجعالـة، الفضالة، المقاصة، الاعارة، الشفعة، المخالصة، الالتصـاق، التكييـف، المصـادرة علـى المطلـوب، المتقـوم، القسـيم،...هتـد)، کـە بەنـدە بـۆ دۆزینـەوەی مانـای پڕاوپـڕی زاراوەکان و داتاشینی زاراوەی گونجـاو بۆیـان، بـەوردی سێرچـم لـە ئینتـەرنێت بـۆ کردوە.

بۆ ئەوەی خوێنەر بەڕوونی لە دەقەکە تێبگـات، لـە خـوارەوە بەلیسـتێك مانـای وشەکان بەو شێوەیەی لەم وەرگێڕانـەدا بـەکار هـاتووە، دەخەینـە بەردەسـت، کـە ژمارەیەکی بەرچاویان خۆم دامتاشیون و بۆ یەکەم جـارە بـەکار بێن و هێمـای (ع)م لەگەڵیان داناوە، بەهیوای ئەوەم جێ بگـرن و بۆشـاییەك پـڕ بکەنـەوە. ئەڵبـەت بـۆ هەندێکیشیان سوودم لە فەرهەنگێکی یاسایی (د.نوری تاڵەبانی) وەرگرتووە، کە بـە دانانی هێمای (ن. ت) لە تەنیشت وشەکان ئاماژەم پێ کردوون. دیارە هەندێکیشیان وشەی باون و پێویستیان بە فەرهەنگ یان داتاشـین نیـە، دانانیـان لێـرەدا زیـاتر بـۆ بەرچاوڕوونییە.

**وەرگێڕ**

**٨-٤-٢٠١٥ هەولێر**

الالتصاق: پێوەنووسان. مەبەست ئەوەیە كاتێك كەسێك لە گرێبەندێكدا دەبێتە خاوەنی ماڵێك، دەبێتە خاوەنی ئەو شتانەیش كە بەشێوەیەكی سروشتی یان دەستكرد دەبنە پاشكۆی ئەو ماڵە.

الابراء: گەردن ئازادكردن(ع)، بەخشین (ی قەرز).

المخالصة: ئەستۆپاكینامە(ع).

عقد الغرر: گرێبەندی نادڵنیا(ع).

المال المتقوم: ماڵێك بەكەڵك و بەردەست بێت.

المضاربة: ئاڵوێری پارە

المقایضة: شمەك بەشمەك(ع). بۆ نموونە وەك كڕینی گەنم بە هەنار.

الارتفاق: هاوشانی، مافی پێكەوەبوون.

المقاصة: قەرزشكاندنەوە.

القوة القاهرة: هێزی بێئامان(ع).

المغارسة: چاندنكاری.

الفضالة: خۆ تێهەڵقورتاندن(ن ت).

الفضولي: خۆهەڵقورتێن، فزول.

الشفعة: لەپێشبوون (لە كڕینی ماڵێكدا)(ع)، شەفیعبوون.

الفندقة: هۆتێلوانی.

التورید: هێنان.

التكییف: گونجاندن(ع) (بریتییە لە دیاریكردنی سیفەتی یاسایی ڕووداوێك تا بەو پێیە حوكمی لەبارەوە بدرێ).

التقادم: كۆنبوون (ع)، بەسەرچوون.

الفصل: بەش.

المبحث: باس.

المطلب: خواست.

الماهية: چییەتی.

العلة: هۆ.

العلة الغائية: ئامانجەهۆ(ع).

السبب: هۆ.

المسبَّب: بەرهۆ.

المسبب (كسر وتشديد الباء): هۆكار.

المعرِف: ناسێنەر.

المعرَف: ناسێنراو.

المقسم: دابەشكراو.

القسم: بەش.

القسيم: هاوبەشكە(ع). مەبەست هەریەك لەو بەشانەیە هەر شتێكی دابەشكراو پێك دێنن، وەك دابەشكردنی وشە بۆ (اسم + فلع + حرف)، كە هەریەك لەو سیانەی قەسیمی ئەویتریانە و لە یەكتر جیاوازن.

المركب: ئاڵۆز، ئاوێتە.

الفقيه: شەرعزان، شەرعناس (ع).

الشارع: شەریعەتدانەر(ع) (لە چوارچێوەی شەریعەتی ئیسلامیدا مەبەست خودایە).

المشرع: یاسادانەر.

الواجب: پێویست. لە فیقهدا ئەو كارەیە پێویست بكرێ و نەكردنی گوناهە.

المستحب (مندوب): پێخۆش(ع) ، پەسەندكراو، باش. ئەوەیە بكرێ باشترە بەڵام نەكردنیشی گوناه نیە.

المباح: ڕێپێدراو، ڕەوا. ئەوەیە كردن و نەكردنی وەك یەكە.

المكروه: پێناخۆش(ع)، ناپەسەند. ئەوەیە نەكرێ باشترە بەڵام كردنیشی گوناه نیە.

الحرام: قەدەغە. ئەوەیە پێویستە نەكرێ و كردنی گوناهە.

المنطق: لۆژیك.

التعارض: تێكگیران

التناقض: دژیەكی، هاودژی، نەسازی.

الوضعي: دانراو، مرۆڤكرد، نادینی.

النظرية: بیردۆز، تیۆر.

الكلي: هەمەكی.

الجزئي: بەشەكی.

المطلق: رەها.

الاستحالة: مەحاڵبوون، نەكران.

الحق: ماف.

العقد: گرێبەند، گرێبەست.

العاقد: گرێبەندوان(ع).

التعاقد: گرێبەندكردن،رێكەوتن.

المشروع: رەوا.

الجناية، الجريمة: تاوان.

الجنائي: تاوانكارانە(ن.ت).

الجزائي: سزایی(ن.ت).

المصادرة على المطلوب: پێچلێدان بەدەوری داواكراودا(ع).

الملكية: خاوەندارێتی، موڵكایەتی.

ملكية الرقبة: خاوەندارێتیی ماڵ.

المال المثلي: ماڵی هاوچەشن یاخود لێكچوو.

المال القيمی: ماڵی بەهایی یاخود بەهادار.

الواقعة: رووداو، راستی (بەپێی جێبەندی بەكارهێنانی).

انفرادی: تاكەكەسی.

منفرد: تاكلایەنە.

لازم: پێویست، سەپێن، وابەستە.

ملزوم: پێ پەیوەست.

لزوم: پێویستبوون.

الالتزام: پابەندی.

الملتزم: پابەند.

الملزِم: پابەندكار(ع).

الملتزَم له: بۆ—پابەند(ع).

الملتزَم فيه: تێدا—پابەند(ع).

الملتزَم به: پێ—پابەند(ع).

سبب الالتزام: هۆی پابەندی.

التلازم: پێكەوەبەستران.

الاكراه: زۆرلێكردن.

الاضطرار: ناچاركردن.

الغش: گزی.

العيب: خەوش، كەموكوڕی.

الاثر: جێكەوت، ئاسەوار، ئەسەر.

الفعل: كردەوە، كردار، كردە.

الانفعال: هەڵچوون، كارلێك لەگەڵ كردن.

الضمان: دەستەبەر، گەرەنتی.

الذمة: ئەستۆ، گەردن.

موجب: واجبكار.

الحوالة: حەواڵەكردن.

المحيل: حەوڵەكار.

المحال له: حەواڵە بۆكراو(ع).

المحال علیه: حەواڵە بۆسەرکراو(ع).

الحیازة: لەلابوون، لەدەستدابوون، هەبوون.

الرفع: هەڵگرتن، نەهێشتن، لادان، بەرزکردنەوە.

التسدید: دانەوە.

انقضاء: تەوابوون، بەسەرچوون، نەما، رەوینەوە.

الوفاء: دانەوە (ی قەرز).

الاستیفاء: وەرگرتنەوە (ی قەرز).

الاصول والفروع: بنەچە و وەچە (لە خزمایەتیدا)(ع).

المورث: میراتدەر(ع) (ئەو کەسەی دەمرێ و میراتی لە شوێن بەجێ دەمێنی).

الوارث: میراتگر، کەسوکار، واریس.

الوصیة: وەسێتکردن.

الموصی به: وەسێت پێ کراو (شتەکە).

الموصی له: وەسێت بۆ کراو (کەسەکە).

الایجار، الاجارة: بەکرێدان

الاستئجار: بەکرێگرتن

السلف: پێشین، پێشینان، باوباپیران.

الخلف: پاشین، نەوەکان، جێنشین.

البدل: بریتی، جێگرەوە، بەدەڵ.

احتمال: شیمانە

اخلال: تێکدان.

التعدي: دەستدرێژی.

التعمد: بەئەنقەستکردن.

الاسقاط: خستن.

المنقول: ماڵی گوازراوە.

الابطال: بەتالكردنەوە، پوچەلكردنەوە.

فاحش: زەق، توند، خراپ (بەپێی جێبەندی بەکارهێنانی وشەکە).

المميز: بەفام(ع)، هەبوونی توانای جیاکردنەوەی چاك و خراپ.

غير المميز: نەفام(ع). بێ دەرك.

الحجر: دەستبەندیکردن(ن ت). لێسەندنەوەی مافی مامەڵەکردن بە ماڵێك.

الولي: بەخێوكەر، خاوەن. وەلی.

الوصي: پێ سپێراو، چاودێر.

القيم: سەرپەرشت.

الدخول: چوونەلای ژن، سەرجێییکردنی پیاو لەگەڵ ژنەکەی.

الطلاق الرجعي: جیابوونەوەی ناکۆتا(ع).

الطلاق البائن: جیابوونەوەی کۆتا(ع) .

المطاوعة: خەرۆکاری، پێکەوەگونجان، دەستەمۆکردن، بەگوێکردنی یەکتر. دەوترێ (پیر و خەرۆ بن) یانی تا پیر دەبن هۆگری یەکتر و تەبا بن.

الرضاعة: شیردان.

الحضانة: دایەنی.

المحضون: دایەنیکراو (مەبەست کورپەکەیە).

النفقه: دابینکردنی خەرجی، بەخێوکردن، ژیاندن.

الانفاق: خەرجکردن.

الغبن: مافخوران(ن ت)

المغبون: مافخوراو، زیانلێکەوتوو

الاستغلال: قۆستنەوە، خراپ بەکارهێنان.

القولي: گوفتاریانە.

الموهوب: بەخشراو.

الموهوب لە: پێ بەخشراو

الصیغه: دارشتە، شێوە.

الفصل: بەش.

الصنف: پۆل.

العنصر: رەگەز، توخم.

الجنس: رەگەز، زایەند.

البیع: فرۆشتن.

المبیع: فرۆشراو.

البائع: فرۆشیار.

المشتری، الزبون: کریار.

الغریم: قەرزار.

المطل: قەرزکوێر، ئەو کەسەی لە قەرزدانەوە دەستی دەستی دەکا.

الدائن: قەرزدەر.

المدین: قەرزار.

الاثراء: زەنگینبوون، دەوڵەمەندبوون.

الکسب: بەدەستهێنان.

التعسف: ملهوڕی، زۆرداری.

التعسفی: ملهوڕانە، زۆردارانە، خراپ بەکارهێنان.

الاداء: ئەنجامدان، کردن.

الاستقراء: سەرڕێوکردن

التصرف: رەفتار، هەڵسوکەوت.

الرابطة: پەیوەستی.

الفساد: خراپی. قەڵپ، قۆڕی.

الفاسد: خراپ. قەڵپ، قۆڕ.

الاعارة: پێدان بەبێ بەرانبەر بۆ سوودلێبینین بەشێوەیەکی کاتی.

المعبر: پێدەر.

الراهن: رەهنكار.

المرتهن: رەهنگر(ع)

التبعة: لێكەوتە.

العوض: باتی (ع)، شتە ئاڵوگۆڕكراوەكە.

المعاوضات: ئاڵوگۆڕكردنەكان.

العين: ماڵ، خود.

العينی: ماڵینە.

الارادة الباطنة: ئیرادەی نادیار(ع).

الارادة الظاهرة: ئیرادەی دیار(ع).

التطابق: جووتبوون.

الايجاب: پێدان. واجبكردن.

القبول: قبولكردن

السطوة: دەسەلات، هەژمون، سام.

التبرع، الهبة: بەخشین.

المختار: هەڵبژێر. هەڵبژێردراو.

القصاص: تۆڵەی شەرعی(ع).

العاقلة: كەسوكاری بكوژ كە بەرپرسن لە دانی خوێنبایی.

الاحتراز: خۆپارێزی، پارێزكاری.

الرقابة: چاودێریكردن.

الرعاية: ئاگالێبوون.

الواقعة، الحادثة: رووداو.

التدليس: خەڵەتاندن.

الغرر: مەترسی.

التغرير: فریودان.

الاثر الرجعي: پاشئاسەوار(ع).

التضامن: هاوكاری.

المتضامن: هاوكار.

الاهلية: شیان(ع).

أهل: شیاو.

عديم الاهلية: نەشیاو(ع).

كامل الاهلية: شیان تەواو(ع).

ناقص الاهلية: شیان ناتەواو(ع).

المانع: رێگر.

العارضة: بەربەست.

المحل: شوێن.

الفسخ: هەڵوەشاندنەوە.

الانفساخ: هەڵوەشانەوە.

المسؤولية التقصيرية: بەرپرسیارێتیی كەمتەرخەمیكردن.

التأمين: بیمەكردن.